




ژمارە (٣٧) ساڵی ٢٠١٧

باس و توێژینەوە بڵاوکــراوەکان لە گۆڤاری ئەکادیمیای کــوردی دەربــڕی بیــر و بۆچوونــی توێژەرانــن نەک دەستەی نووســەرانی گۆڤار


- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی.
- بەرگ و سەرپەرشتی هونەری: عوسمان پیرداود کواز
- نەخشەسازی: عیسام موحسین.
- پیتچنین: بەشی کۆمپیوتەر
- هەڵەچن: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل.
- چاپ: چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر.
- تیراژ: ٥٠٠ دانە.

## لەم ژمارەیەدا

### بەشی کوردی



### بەشی عەرەبی - القسم العربي



### بەشی ئینگلیزی

# ڕێنماییەكانی بڵاوكردنەوە
# لە گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی

١- گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی، گۆڤارێكی زانستی وەرزییە، باس و توێژینەوەی زانستی لە بارەی كورد و كوردستان، بڵاودەكاتەوە، بە مەرجێ لە هیچ شوێنێكی دیكە بڵاو نەكرابێتەوە یان بۆ بڵاوكردنەوە وەرنەگیرابێت.
٢- زمانی كوردی زمانی سەرەكی بڵاوكردنەوەیە لە گۆڤارەكە، بەڵام لێكۆڵینەوەی زانستی بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزیش بڵاودەكاتەوە.
٣- هەر بابەتێك كە بۆ گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی دەنێردرێت، دەبێت ناوونیشانی باسەكە، ناوی نووسەر، شوێنی كارەكەی، پلە و پایەی زانستی، ئیمێل و ژمارەی تەلەفۆنەكەی لە سەر لاپەڕەی یەكەمی لێكۆڵینەوەكە نووسرابێت.
٤- نووسەر دەبێت پوختەی باسەكەی بە هەردوو زمانەكەی دیكە، جگە لە زمانی نووسینی دەقەكە لە كۆتایی توێژینەوەكە بنووسێت، كە نابێت لە یەك پەڕەی (A4) زیاتر بێت. لەو پوختەیەدا پێویستە گرنگی و ئەنجامە سەرەكییەكانی توێژینەوەكە بخرێنەڕوو.
٥- لە دوای پەسەندكردنی باسەكە لە لایەن هەڵسەنگێنەرانی زانستییەوە، دەستەی نووسەران ڕەزامەندی بڵاوكردنەوەی بە توێژەر دەدات.
٦- بۆ ئەوەی بابەتەكە لەگەڵ ڕێنماییەكانی بڵاوكردنەوەی گۆڤارەكەدا بگونجێت، دەستەی نووسەران مافی سەرلەنوێ داڕشتنەوە و لابردنی هەندێ دەستەواژەی هەیە، بە مەرجێك بیرۆكەی سەرەكی توێژینەوەكە نەگۆڕێت.
٧- ئەگەر باسەكە لە بارەی ساخكردنەوە (پەیدۆزیی، تحقیق) ی دەستنووسەوە بێت، دەبێت پەیدۆزییەكە بە پێی بنەما زانستییەكان بێت و چەند لاپەڕەی كۆپیكراوی دەستنووسەكە و شوێنی وەرگرتنی، كۆد و جۆری دەستنووسەكە (دەستنووس، چاپ، مایكرۆفیلم... هتد) لەگەڵ دابێت.
٨- ئەگەر ڕێبازی لێكۆڵینەوەی زانستی لە هەڵبژاردنی ناوونیشانی باسەكە،

توێژینـەوەی بابـەت، شـێوازی بەکارهێنانـی سـەرچاوە و ڕێکخسـتنی پەراوێزەکان ڕەچاو نەکرابێتن، ئەوا باسەکە لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی بڵاوناکرێتەوە. هەروەها ئەو لێکۆڵینەوانەش کە بە زمانێکی پاراوی زانستی نەنووسرا بێتن فەرامۆش دەکرێن.

٩- دەبێت باسـەکە دانەیەکی لەسـەر (CD) لەگەڵ (٣) دانەی چاپکراوی سـەر کاغەز (A4) بە فۆنتی یۆنیکورد بێت، ناوونیشـانی سـەرەکی بە قەبارە (١٥) و ناوی توێژەر و ناوونیشانی لاوەکی بە قەبارە (١٤) و ناوەڕۆک بە (١٣) و پەراوێزیش بە (١٢) بێت، بە مەرجێک ژمارەی لاپەڕەکانی بە لیستی پەراوێز و سەرچاوەکانیشـەوە لە (٢٥) لاپەڕە زیاتر نەبێت و لە حاڵەتی ناچاریشـدا تـا (٣٠) لاپـەڕە وەردەگیرێت، بە مەرجێ بۆ هـەر لاپەڕەیەکی زیادە خاوەن بابەت بڕی (٥٠٠٠) پێنج هەزار دینار بدات و پەراوێزەکانیشـی لە ناوەڕۆک و لـە پەراوێـزدا لـە ناو دووکەوانـەی( ) بچوک دابێت و لە کۆتایی باسـەکە دابندرێت.

١٠- ئەگـەر بابەتەکـە وەرگێـڕدراو بوو، دەبێت لە زمانی یەکەمەوە بێت و دەقە ئەسڵەکەشی لەگەڵدا هاوپێچ کرابێت.

١١- گۆڤـاری ئەکادیمیای کوردی ناسـاندن و هەڵسـەنگاندنی ئـەو کتێبانەی لە بارەی کورد و کوردستانەوە نووسراون بڵاودەکاتەوە، بە مەرجێک نووسەر ڕەچاوی پێوەرە زانستییەکانی ئەم بوارەی کردبێت.

١٢- بابەتی نێردراو بۆ گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی بە هیچ شێوەیەک نادرێتەوە بە خاوەنەکەی.

# ڕێنووسی کوردی بەپێی
# بنەما زانستییەکانی ڕێنووسی گشتی

## پێشەکی
### هەندێک تێبینی لەبارەی سروشتی ڕێنووسەوە

سەرەتا زۆر گرینگە ئەوە بزانرێت، کە ئەلفوبێ پێوەندیی بە نەژادی زمانەوە نییە. هەر ئەلفوبێیەک بەدەستەوە بگریت بۆ هەر زمانێک دەشێت و دەگونجێت. گرینگ پێکهاتنی گشتییە لەسەری. زۆربەی هەرە زۆری ئەو ئەلفوبێیانەی ئێستا لە هەموو جیهاندا بەکار دەهێنرێت هیچ کامێکیان لە بنەڕەتدا بۆ ئەو زمانانە دانەنراون، کە بەکاریان دەهێنن. هەموویان لە زمانانی ترەوە وەرگیراون.

ئەلفوبێی زمانی ئینگلیزی و جەرمەنی و فڕەنسی و زۆربەی زمانە ئەوروپییەکانی تر لە لاتینییەوە وەرگیراون. لاتینی لە ئیترۆسکانییەوە و ئیترۆسکانی لە گریکییەوە و گریکی لە فینیقییەوە و فینیقی لە سامییەوە و سامی لە هیرۆگلیفییەوە وەرگیراوە.

ئەلفوبێی ڕووسی لە سیریلیکەوە وەرگیراوە و سیریلیکی لە گریکییەوە و گریکی لە فینیقییەوە و فینیقی لە سامییەوە و سامی لە هیرۆگلیفییەوە.

ئەم ئەلفوبێیەی ئێستا کورد بەکاری دەهێنێت: (لە ڕێی زمانی عەرەبییەوە)، لە ئارامییەوە وەرگیراوە و ئارامی لە سامییەوە و سامی لە هیرۆگلیفییەوە.

هەمان شت بە جۆری ئەلفوبێیەکانی تری هەموو زمانەکانی جیهان، کە ئەلفوبێیەکی  هەر زمانێک بۆ هەر زمانێکی تر وەردەگێڕدرێت دەستکاری دەکرێت و بەرەبەرە دەگۆڕێت و دەسوێ تا سروشتی دەنگەکانی زمانە وەرگرتەکەی لێ دەنیشێت و لەگەڵیدا دەگونجێت بە زیادکردن و لابردنی هەندێک پیت، یان دانانی نیشانە لەسەر هەندێک لە پیتەکان. هەتا ئەگەر دەستکاریش نەکرێت ئیشی خۆی هەر دەکات و دەبێتە ئاسایی. بۆ نموونە

زمانی فارسی، کە زمانێکی زۆر نزیکە لە کوردییەوە، ئەلفوبێی عەرەبیی وەرگرتووە بە (فەتحە و زەممە و کەسرە، سەر و بۆر و ژێر)ـەوە، بێ هیچ دەستکارییەکی ئەوتۆ زمانەکەی خۆی پێ دەنووسێت و زۆر ئاساییە. مادام پێکهاتنی گشتیی لەسەرە هیچ گیروگرفتێک سەرهەڵنادات و باس ناکرێت.

زمان دیاردەیەکی زیندووە هەمیشە لە جووڵە و گۆڕیندایە. سروشتێکی سرکی جیوەیی هەیە. نووسین وشک و وەستاوە. بۆیە هەرگیز نووسین ناتوانێت بەبەردەوامی پڕ بەپێستی زمانەکە بێت. لەکاتی دانانی ئەلفوبێی هەر زمانێکدا، تاڕادەیەکی زۆر نزیکی لەنێوان نووسین و زمانەکەیدا بەدی دەکرێت. زۆری پێ ناچێت زمان و نووسینەکە لێک دەترازێن و گیروگرفتی ڕێنووس پەیدا دەبێت و زیاد دەکات. هیچ زمانێکیش نییە گیروگرفتی ڕێنووسی نەبێت.

## چەند خاڵێکی یەکجار گرنگ،
## کە دەبێت لە ڕێنووسدا ڕەچاو بکرێت

بۆ دەستنیشانکردنی پیتەکان و چۆنیەتی لێکدانیان دەبێت کێشەی زمانەوانی و ڕێزمانی و دەنگسازی بخرێنە لاوە و هەرگیز نەهێنرێنە ئاراوە. ئەگینا ناگەین بە ئەنجامێکی سوودمەند.

نووسین گەلێک جۆری هەیە. فۆنەتیکی و فۆنۆلۆجی و سیلابیکی و ئەرتۆگرافی و تێکەڵ و....، هەریەکە لەمانە لە دەنگسازیدا بواری خۆی هەیە. هەندێ لە زمانەوانەکانمان هەست بە جیاوازیی نێوان ئەمانە ناکەن، هەیە لە ڕوانگەی نووسینی فۆنەتیکییەوە بیر لە ڕێنووس دەکاتەوە، هەیشە لە ڕوانگەی فۆنۆلۆجییەوە و هەیشە لە ڕوانگەی هەردوو ئاستەوە بە تێکەڵی. بۆیە زۆر لەو لایەنانەی، کە بە گیروگرفتی لەقەڵەم دەدەن، بە پێوانەی بناما زانستییەکانی ڕێنووس دانان نابنە گیروگرفت.

ڕێنووس و نووسین، کە لە مێشکدا چەسپان دەبنە بەرنامە. مرۆڤ بەسەر نووسیندا زاڵە و دەسەڵاتی بەسەرییەوە هەیە نەک بەپێچەوانەوە.

نووسین وتن ڕاناکێشێت. بۆ نموونە ئەو چەند دێڕەی سەرەوە بە ڕێنووسێکی شێواو بە فۆنتی عەرەبی دەخەینە بەرچاو :

**(نووسين كەليک جوری هەيە. فونەتيکی و فونولوجی و سيلابيكی و ئەرتوكرافی تيكەل و.....، هەريەكە لەمانە لە دەنكسازيدا بواری خوی هەيە. هەندی لە زمانەوانانمان هەست بە جياوازيی نيوان ئەمانە ناكەن، هەيە لە روانكەی نووسينی فۆنەتيكييەوە بير لە رينووس دەكاتەوە، هەيشە لە روانكەی فونولوجييەوە و هەيشە لە روانكەی هەردوو ئاستەكەوە بە تيكەلی. بويە زۆر لەو لايەنانەی، كە بە كيروكرفتی لەقەلەم دەدەن، بە پيوانەی بناما زانستييەكانی رينووس دانان نابنە كيروكرفت).**

**لەو بڕوایە داین هەر خوێنەرێکی کورد ئەمەی بە ئاسانی بۆ دەخوێنرێتەوە، چونکە ڕێنووسی زمانەکەی لەمێشکیدا چەسپیو و بەرنامێنراوە. ئێستا ئەو نامانەی بە مەسەج و بە کۆمپیووتەر دەنێردرێن بەم ڕێنووسە دەنووسرێن و هیچ کۆسپێک لە خوێندنەوەیاندا نایەتە بەردەم.**

سەدان وتار و لێکۆڵینەوە لەبارەی ڕێنووسەوە بڵاوبوونەتەوە هەر یەکە لە یەکێک لەو ڕوانگانەوە تێبینیی خۆی بۆ گفتوگۆکردن دەخاتە ڕوو. هەموو تێبینییەکان ڕاست و بەجێن بە پێی پێوانەکانی زمانەوانی، بەڵام ناشێت ئەم کێشانە بخرێنە ناو مەسەلەی ڕێنووسەوە، ئەگینا هەرگیز ناتوانرێت ڕێنووسێکی چەسپاو بهێنرێتە بەرهەم.

## هیچ زمانێک نییە ڕێنووسەکەی بێ گیروگرفت بێت

هیچ زمانێک نییە گیروگرفتی ڕێنووسی نەبێت. هەر هەوڵدانێکیش بۆ چارەسەرکردنیان دەبێتە هۆی گیروگرفتی تری زمانەوانی و نازمانەوانی. چ زمانێک بەقەد چینی و ئینگلیزی و عەرەبی گیروگرفتی ڕێنووسیان هەیە، کەچی بڕیاریان داوە دەستکاریی نەکەن، چونکە بە دەستکاری کردنیان گیروگرفتی تری ئاڵۆزتر و دژوارتر سەرهەڵدەدەن، کە لەوانەیە هەرگیز چارەسەر نەکرێن. هیچ زمانێکیش نییە ڕێنووسێکی یەکگرتووی

هەبێ.[١]

بۆ دانانی ڕێنووس بۆ هەر زمانێک، یەکەم: دەبێت فۆنیمەکانی زمانەکە دەستنیشان بکرێت و بە گوێرەی فۆنیمەکانی پیتەکان دابنرێن. مەرجیش نییە و هەرگیز ناکرێت ژمارەی پیتەکان بەقەد دەنگ و فۆنیمەکانی زمانەکەبێت، هەرگیز هیچ زمانێکیش نییە و نەبووە ژمارەی پیتەکانی بەقەد فۆنیمەکانی بێت.

لە نووسینی زۆر لە زمانەکاندا پیت هەیە لە نووسینەکەیدا بەکار دەهێنرێت، کەچی لە ئەلفوبێکەیدا نییە. هەیشە دەنگی وای تێدا هەیە، کەچی پیتی بۆ نییە و هەیە هەمان دەنگ بە چەند جۆرێک دەنووسرێت، یان هەمان پیت چەند دەنگێک دەنوێنێت. زۆر وشە هەیە بەجۆرێک دەنووسرێن و بە جۆرێکی تر دەوترێن.

هەندێ نموونە لە زمانی عەرەبی و ئینگلیزییەوە دەهێنینەوە، کە زۆربەی ڕۆشنبیری کورد ئاشنای ئەم دوو زمانەن. (هەر زمانێکی تر بە دەستەوە بگریت هەمان شتە).

**١ – زمانی عەرەبی:**

أ- ئەلفوبێی نووسینی زمانی عەرەبی ٢٨ پیتی تێدایە، کە لەم وشانەدا کۆکراونەتەوە **(ابجد – هوز – حطي – کلمن – سعفص – قرشت – ثخذ– ضظغ)** کەچی ( ى (الف مقصوره) ـ ة (تێی خڕ) – ئـ (هەمزەی سەر کورسی)- همزه الوصل – الفی مده ـ شده - بزوێنە کورتەکان..... تاد) تێیاندا بەرچاو ناکەون.

ب - ( ظ – ض ) و ( ت – ة ) ( ا – ى) هەر جووتەی هاودەنگن و یەک فۆنیم دەنوێنن.

پ - زۆر وشە هەیە بەجۆرێک دەنووسرێت و بە جۆرێک دەوترێت. کوا پیتی (ا) لە وشەی (هكذا – ذلک – اؤلئک). لەم دوو وشەیە ( دعا، سعى) (ا – ى) هاودەنگن.

جـ - هەر پیتەی بە سێ چوار جۆر دەنووسرێت بۆ نموونە دەنگی (ت) ( تـ ـ ـتـ ـ ـت ـ ت ـ ة)

زۆر جۆری تر لەم شێواوییەی ڕێنووسی زمانی عەرەبی[١].

چ – زمانی عەرەبی بە سەدان وشەی تێدایە بە زیاتر لە جۆرێک دەنووسرێن، وەک:
**مسْئُول ـ مسْؤُول / قرَأُوا ـ قرَؤُوا ـ قرَءُوا ـ قرَؤُا / بناوِه ـ بناءه ـ بنائه / صلاة ـ صلوة**

د- هەمان وشە بە چەند جۆرێک دەخوێنرێتەوە وەک وشەی (علم) بەلای کەمی بەم شەش جۆرە دەخوێنرێتەوە و شەش واتای جیای دەگەیەنێت:

١- (عەلیمە ـ زانیی) ٢- ( عەللەمە - فێری کرد ) ٣- (عولیمە ـ زانرا ) ٤ - ( عوللیمە - فێرکرا ) ٥- ( عەلەم ـ ئاڵا). ٦- (عیلم - زانست).

بەسەدان، بەڵکو هەزاران وشەی لەم جۆرە لەزمانی عەرەبیدا بەرچاودەکەوێت.

**٢- زمانی ئینگلیزی**

أ – لە زمانی ئینگلیزیدا لە ئەلفوبێکەیدا پیت نییە بۆ (ش – چ – ژ ) پیتی (ش) بە پێنج جۆر دەنووسرێت s – sh – t – ss – ch وەک لە she - sugar - machine - mission - station

ب – دەنگی (ف) بە سێ جۆر دەنووسرێت (ph – gh – f ) وەک لە (tough – elephant – knife)

ت – (gh) لە night – through – though هیچ دەنگ نانوێنێت.

جـ – هەر بزوێنێکی زمانی ئینگلیزی بە چەند جۆرێک دەنووسرێت و هەر یەکە بە چەند جۆرێک دەخوێنرێتەوە. بۆ نموونە لەم وشانەدا he – believe – Caesar – see – people – seize – sea – key –: amoeba – busy - machine

( e – ie – ae – ee – eo – ei – ea – ey – oe – y – i) هەموو بە (ی) دەخوێنرێنەوە.

چـ – (oo) لە وشەی book و look دا بە (و) دەخوێنرێتەوە.
لە وشەی boot و poor و , shoot بە ( وو )
لە وشەی blood و flood بە ( ـە )

به سەدان نموونەی تری لەم جۆرانە لە زمانی ئینگلیزی و زمانانی تردا بەرچاو دەکەوێت[٢].

ئەم شێواوی و ئاڵۆزییە و دوورکەوتنەوەی نووسین لە وتن هەموو زمانی ئینگلیزیی گرتووەتەوە و وەک نووسینی ئیدیۆگرامی لێهاتووە. دەبێت سپێل و جۆری نووسینی هەر وشەیەک بە لەبەرکردن لەبەربکرێت. **لەگەڵ ئەمەشا هیچ بایەخێکی پێ نادرێت و بە گیروگرفتی نازانن و هەر باسیشی ناکەن.**

**بە بەراورد کردنی ئەمانە لەگەڵ گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردیی ئێمەدا کوا گیروگرفتمان؟**

**کە ڕێنووسی زۆربەی زمانان ئەمە حاڵیان بێت ئێمە چی بڵێین؟ ئیتر هەبوون و نەبوونی پیتێک، یان چۆنیەتی نووسینی پیتێک، یان لەسەر (و) یێک... بۆ ببێت بە کارەسات و گیروگرفت.**

### هەنگاوەکانی دانانی ڕێنووس بۆ هەر زمانێک

بە دوو هەنگاو ڕێنووس بۆ هەر زمانی دادەنرێت: ١- دەستنیشان کردنی پیتەکان و ٢- چۆنیەتی لێکدانی پیتەکان لەناو چوارچێوەی وشەکاندا.

**هەنگاوی یەکەم : دەستنیشان کردنی پیتەکان:**

بە گوێرەی هەنگاوی یەکەم ئەم ئەلفوبێیەی ئێستامان، کە پێکهاتنێکی گشتیی لەسەرە بەم شێوەیە:

| | |
|---|---|
| وەستاوەکان | ئ ب پ ت ج چ ح خ د ر ڕ ز ژ س ش ع غ ف ڤ ق ک گ ل ڵ م ن هـ و ی |
| بزوێنەکان | ا - ە - و - وو - ۆ - ی - ێ |

ئەمە تا ڕادەیەکی زۆر لەگەڵ سیستەمی فۆنۆلۆجیی و دەنگەکانی زمانی کوردی دەگونجێت. دەستکاری کردنیان بە زیادکردن و کەم کردنی هەندێک پیت گیروگرفتەکان زیاتر و ئاڵۆزتر دەکەن و هەرگیز چارەسەر ناکرێن. بەتایبەتی ئێستا کراونەتە فۆنت و خراونەتە کۆمپیووتەرەوە. تازە چی ئەم فۆنتانە دەگۆڕێت؟

## ڕیزبوونی پیتەکان:

کتێبە ڕێزمانییەکان و ئەو باس و لێکۆڵینەوانەی، کە لەبارەی ئەلفوبێی کوردییەوە ئەنجامدراون، پیتە ( وەستاو)consonant[1] و (بزوێنەکان) vowel لێک جیا دەکەنەوە. واتا بە دوو ڕیز دەیانخەنە ڕوو. ڕیزی وەستاوەکان و ڕیزی بزوێنەکان. سەرباری ئەمەش هەریەکە بە جۆرێک پیتەکان ڕیز دەکات.

جیاکردنەوەی وەستاو و بزوێنەکان تەنیا لە شیکردنەوەی زمانەوانی و بواری فێرکاریدا دەگیرێتە بەر.

بۆ ڕێزمان و فەرهەنگسازی و بەکارهێنانی گشتی دەبێت هەموو پیتەکان بە وەستاو و بزوێنەکانەوە تێک بچڕژێنرێن و بکرێن بە یەک ڕیز و ڕیزکردنەکە بە پێی پێوانەکانی ستانداردی جیهانی بێت، وەک هەر زمانێکی تر.

بۆ بەدیهێنانی ئەمە:

بە لێکدانی هەردوو جۆر (وەستاو و بزوێنەکان) پیتە هاوشێوەکان دەکەونە پاڵ یەک لیستەکە بەم جۆرەی خوارەوەی لێدێت:

| | |
|---|---|
| ئـ | وەستاو |
| ا | بزوێن |
| ب | وەستاو |
| پ | وەستاو |
| ت | وەستاو |
| ج | وەستاو |

| | |
|---|---|
| چ | وەستاو |
| ح | وەستاو |
| خ | وەستاو |
| د | وەستاو |
| ر | وەستاو |
| ڕ | وەستاو |
| ز | وەستاو |
| ژ | وەستاو |
| س | وەستاو |
| ش | وەستاو |
| ع | وەستاو |
| غ | وەستاو |
| ف | وەستاو |
| ڤ | وەستاو |
| ق | وەستاو |
| ک | وەستاو |
| گ | وەستاو |
| ل | وەستاو |
| ڵ | وەستاو |
| م | وەستاو |
| ن | وەستاو |
| هـ | وەستاو |
| ـە | بزوێن |
| و | وەستاو |
| و | بزوێن |
| وو | بزوێن |

| | |
|---|---|
| ۆ | بزوێن |
| ی | وەستاو |
| ی | بزوێن |
| ێ | بزوێن |
| ٣٦ | |

( ئـ ا ب پ ت ج چ ح خ د ر ڕ ز ژ س ش ع غ ف ڤ ق ک گ ل ڵ م ن (هـ - ـە) (و - و) وو ۆ (ی - ی) ێ

بۆ لادان لە دووبارەکردنەوەیە لە(٣) هاوشێوەکاندا لە هەرجووتە یەکێکی لێ لادەبرێت دەمێنێتەوە (٣٣) و ڕیزبوونەکە ئەم شێوەیە دەگرێتە خۆ:

**( ئـ ا ب پ ت ج چ ح خ د ر ڕ ز ژ س ش ع غ ف ڤ ق ک گ ل ڵ م ن هـ و وو ۆ ی ێ )**

ئەمە پێڕەوێکی ئابووری و لۆژیکییە بۆ ڕیزکردنی پیتەکان. سیمایەکی سیستەماتیکی بە ڕێزمانی کوردی و فەرهەنگسازی دەبەخشێت. لەگەڵ سروشتی ڕیزبوونی پیتەکانی جیهانیشدا دەگونجێت و لە هەموو زمانێکیشدا بەمجۆرەیە.

**هەنگاوی دووەم : لێکدانی پیتەکان لەناو چوارچێوەی وشەکاندا:**

بە گوێرەی چۆنیەتی لێکدانی پیتەکانە لەناو چوارچێوەی وشەکاندا.

**١- وشەی سادە**

یەکێ لە ڕووە ئاسانەکانی نووسین و ڕێنووسی کوردی ئەوەیە چۆن دەوترێت ئاوا دەنووسرێت. بۆ بەدیهێنانی ڕێنووسێکی یەکگرتوو دەبێت ئەم خاڵانە ڕەچاو بکرێن:

١ - هەر وشەیەک بە بزوێن دەست پێ بکات،(ئـ)دەچێتە سەر بزوێنەکە:

ئازاد - ئەستێرە - ئێستا - ئۆباڵ - ئومێد - ئێرە

٢ – (و)ی کورت و (وو)ی درێژی بزوێن لێک جیادەکرێنەوە.
گوڵ - کورت – نوست – چوست – توند
موو – پووش – بازوو – بلوور - دوور
٣ – (و)ی وەستاو  لە وشەی سادەدا لەسەرەتای وشە و بڕگەدا بە یەک (و) دەنووسرێت وەک:
وریا – ورد – وشە  - ون – وشک – کاوڕ - هەور - چەور
٤ – (وو)ی بزوێن، کە بە (و)ی درێژ ناو دەبرێت لە (و)ی کورت جیادەکرێتەوە و لە سەرەتای بڕگە و وشەدا دەرناکەوێت.
سنوور – پوور – بازوو –  خەڵووز
دوو – موو – بازوو – بەڕروو – خەسوو
٥ – ئامرازی بەستن (و) کە دوو وشە، یان دوو فرێز و ڕستە لێک دەدات لەناوەڕاستدا دەنووسرێت، چونکە وشەیەکی سەربەخۆیە و  نە سەر بە وشەی یەکەمە، نە بە دووەم:
من و تۆ
هەوری بەرز و ئاسمانی شین
من هاتم و تۆ ڕۆیشتی
٦ – ئامرازی بەستن (ی) بە کۆتایی وشەی یەکەمەوە دەلکێت.
ئاسمانی شین – گوڵی سوور  -  برای تۆ
ئەگەر وشەکە بە (ی) کۆتایی هاتبێت، (ی) ی بەستنی دەبێت پێوە بلکێنرێت لەم حاڵەتەدا دەبن بە دوو (ی)
یاریی منداڵان – دیاریی بەنرخ
٧ – (ـە) ی بەستن لە وشەی لێکدراودا بە وشەی یەکەمەوە دەلکێت سپێس ناکەوێتە دوای وشەکە، چونکە (هـەردوو وشە سادەکە) یەک وشەی تر پێک دەهێنن.
گوڵەگەنم – بەردەباران – بەرزەڕێ – مانگەشەو – گەرمەتا
٨ - (ـە) ی بەستنی ناو بە ئاوەڵناوەوە بە کۆتایی وشەی یەکەمەوە دەلکێت، سپێس دەکەوێتە نێوان وشەکان:
ئەم ژوورە تاریکە  – شارە وێرانەکە -  منداڵە جوانە لاسارەکە
٩ – (ڕ) ی قەڵەو لەهەر شوێنێکی وشـەدا دەرکـەوت وەک خۆی

دەنووسرێت:

ڕزگار ـ ڕوو ـ ڕەنگ ـ بەردەڕەش ـ دەمڕاست ـ بێڕوو ـ پڕ

١٠ – (ی) کورت بێت، درێژ بێت، وەستاو بێت، بزوێن بێت لە نووسیندا لێک جیاناکرێنەوە.

گوڵی سوور – ئاسمانی شین

چیای بەرز – دۆی ترش

یاسای ڕێزمانی – یاریی منداڵان

**٢ – وشەی لێکدراو و داڕێژراو:**

١– پێشگر و پاشگری چ مۆرفۆلۆجی چ سینتاکسی بە وشەکەوە دەلکێن:

ڕاهێنان – هەڵخستن – دۆزینەوە ـ هاتنەوە ـ هەڵکرتنەوە ـ

٢– وشەلێکدراوەکان بە سەریەکەوە بێ سپێس لە نێوانیاندا دەنووسرێن:

دڵپاک ـ دانساز ـ سەرخان ـ ڕووخۆش

**٣– وشەی مۆرفۆسینتاکسی:**

کوردی زمانێکی پەڵۆسینسیتییە لەرووی مۆرفۆسینتاکسییەوە زۆر چالاکە. سروشتێکی سرکی جیوەیی هەیە بە ئاسانی ناگیرێت. هەمان وشە تێیدا دەشێت بە چەند جۆرێک بنووسرێت. بۆ نموونە:

هەڵم گرت / هەڵمگرت

هەڵتان نەسپارد / هەڵتاننەسپارد

ڕایان کرد / ڕایانکرد

لایان نەدا / لایاننەدا

هەڵی ناگرین / هەڵیناگرین

جێ بە جێ کردن / جێبەجێ کردن / جێبەجێکردن

بێ بەش / بێبەش

هیچ پێوانەیەکی زمانەوانی نییە بڵێت کام لەم داڕشتنانە ڕاستە. ئەم

بەشە لە ژوور دەسەڵاتی زمانەوانییەوەیە.

لێکۆڵینەوە دەریدەخات، کە زۆربەی نووسەران پێڕەوی هەردوو جۆر دەکەن. زۆربەی ئەو وشانەی لەدوو بەش پێک دین بەهەردوو جۆر دەیاننووسن و ئەو وشانەی لە زیاتر لە دوو بەش پێک دێن هەندێک جار هەموو بەشەکانی بە جیا دەیاننووسن و هەندێک جار دووبەشی بەسەر یەکەوە و بەشێکی بەجیا. لەم قۆناغەدا ناکرێت هیچ یاسایەک دابنرێت بۆ ئەم لایەنە.

ئێمە وای بە باش دەزانین و وا پێشنیاز دەکەین، چۆن ڕۆیشتووە هەروا بمێنێتەوە، چونکە هەرچۆنێکی بنووسیت لێڵی دروست ناکات و هەموو ئەوانەی باسی گیروگرفتی ڕێنووسی کوردییان کردووە توخنی ئەم لایەنە نەکەوتوون، ئەمە بەڵگەیە، کە ئەم لایەنە نەبووەتە گیروگرفت و بیری لێ نەکراوەتەوە. هەر یاسایەکیشیان بۆ دابنرێت پێڕەو ناکرێت.

نووسینی وشە بە دوو جۆر دیاردەیەکی ئاسایی و باوە لە زۆر زماناندا. لە زمانی عەرەبی[٣] و ئینگلیزی[٤] و هەر زمانێکی تر بەدەستەوە بگریت زۆر وشەیان تێدایە، کە بە دوو جۆر دەنووسرێن. زمانەکە خۆی بە تێپەڕینی کات ئەم لایەنە سەروبەر دەکات.

### ٤ – وشەی لە زمانەکانی تر وەرگیراو:

وشە لەزمانەکانی تر وەرگیراوەکان، دەخرێنە سەر ڕێنووسی کوردی وەک (ئیحتیمال ـ عومەر ـ ئەحمەد – سیڤی...)

## پەراوێزەکان

١- هیچ زمانێک بێ گیروگرفتی ڕێنووس نییە و هیچ زمانێک ڕێنووسێکی یەکگرتووی نییە.

لەبارەی نەبوونی ڕێنووسێکی یەکگرتووی زمانی عەرەبییەوە د. یحیی میر علم لە لێکۆڵینەوەیەکدا بە ناوی **(قواعد الإملاء في ضوء جهود المحدثين)** دا کە پێشکێش بە کۆنگرەی حەوتەمی ساڵانەی کۆڕی زمانی عەرەبیی لە دیمەشق کردووە دەڵێ:

**{وقد حظيتْ قواعد الإملاء بغير قليل من الاختلاف، إذ طال الخُلْف بين المصنِّفين في كثيرٍ من قواعدها قديمًا وحديثًا، ولا تزال الأصواتُ تجأرُ بالشكوى من عُسْرها، ولم تُقَل كلمةُ الفصل في كثير من قضاياها، كما أن الباب ما زال مشرعًا للمجتهدين وصولا إلى كلمةٍ سواءٍ تجمع الكاتبين من أبناء العربية والناطقين بها والدارسين لها على قواعدَ معياريةٍ وموحدة للإملاء العربي، وتحافظ على الأصول والمبادئ، وتتسم بالسهولة والمرونة والتيسير والتجديد، وتتجاوز مواضع الاختلاف الكثيرة، وتلغي تعدّد صور الرسم للكلمة الواحدة.}.**

**من أبحاث المؤتمر السنوي السابع لمجمع اللغة العربية بدمشق**

**٢٠١٢/٣/١٩ ـ ٢٠١٢/٤/٢**

بۆ زانیاریی زیاتر و گیروگرفتە ئاڵۆزەکانی ڕێنووسی زمانی عەرەبی سەیری ئەم ماڵپەڕە بکە:

http://www.alukah.net/Literature_Language/0/5166/#ixzz2bZ5Sa4ZL

لە ساڵی ٢٠٠٩ دا کتێبێک بە ناونیشانی **(مرجع الطلاب في الاملاء)** لە دار ابن الهيثم ـ القاهرە نووسینی ابراهيم شمس الدين ٣٢٠ لاپەڕەیە. هەمووی ڕێنماییە بۆ قوتابییان. **سەیری پاشکۆ ژ ٢ بکە.**

٢- بۆ گیروگرفتەکانی ڕێنووسی زمانی ئینگلیزی سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە.

د.وریا عومەر ئەمین، (٢٠٠٨) ئەلفوبێی جیهانی. ڕۆژنامەی بەدرخان ژ ٨٩ی ٢٠٠٨/١/٢٢

٣ – زمانی عەرەبی بە سەدان وشەی تێدایە بە زیاتر لە جۆرێک دەنووسرێن، وەک:

**مسْئُول ـ مسْؤُول**

**قرَأُوا ـ قرَؤُوا ـ قرَءُوا ـ قرَؤُا**

**بناؤە ـ بناءە ـ بنائە**

**صلاة ـ صلوة**

سەیری ڕێنووسی قورئانی پیرۆز بکە و بەراوردی بکە لەگەڵ ڕێنووسی تری زمانی عەرەبی، دەردەکەوێت، کە زمانی عەرەبی هەرگیز ڕێنووسێکی یەکگرتووی نییە. گیروگرفتەکانی گەلێک لەهی ئێمە ئاڵۆزتر و دژوارترە و ئێمە وای بۆ دەچین، کە گیروگرفتیان نییە.

٤– زمانی ئینگلیزی بە سەدان وشەی تێدایە بە زیاتر لە جۆرێک دەنووسرێن،وک:

aroplane, airplane / analyse, analyze /armour, armor / axe, ax / behaviour, behavior / /catalogue, catalog / colour, color / favourite, favorite / grey, gray / tyre, tire / labour, labor / tumour, tumor

سەیری پاشکۆ ژ ١ بکە

**سەرچاوەکان:**


- **ئەکادیمیای کوردی**، (٢٠٠٩) راسپاردەکانی کۆنفرانسی بەرەو ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی (٤/١٢ و ٨/٩ ی ٢٠٠٩)
- **ئەوڕەحمانی حاجی مارف**، (١٩٧٤) کورتەیێکی مێژووی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی. گ. کۆڕی زانیاریی عیراق. ب٢ ژ١ ز بەغداد.
- ________ (١٩٨٢) گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی. گ. کۆڕی زانیاریی عیراق. دەستەی کورد. ب
- **ئیبراهیم ئەمین باڵدار**، (١٩٨٢) زەنگی کاروانی ڕێنووس. گ. کۆڕی زانیاریی عیراق. دەستەی کورد. ب٩.
- **بەدران ئەحمەد حەبیب**، (٢٠٠١) پڕۆژەی چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی. هەولێر.
- **تاهیر سادق**، (١٩٦٩) ڕێنووسی چۆنیەتیی نووسینی کوردی. چ..شیمال. کەرکووک.
- **توفیق وەهبی**، (١٩٢٩) دەستووری زمانی کوردی. جزمی یەکەم. بەغداد.
- ________ (١٩٢٥) کوردییەکەمان بە چۆن حرووفێک بنووسین. گ. دیاریی کوردستان. ژ ٥ و ٦.
- **جەمال عەبدول**، (١٩٨٥) فەرهەنگی قوتابی (ئینگلیزی – کوردی). چ. دار افاق عربیه. بغداد.
- ________( ٢٠١٠) ڕاسپاردەکانی کۆنفرانسی بەرەو ڕێنووسێکی یەکگرتووی کوردی. لە بڵاوکردنەوەکانی ئەکادیمیای کوردی.
- **جەمال نەبەز**، (١٩٧٦) زمانی یەکگرتووی کوردی. بامبێرگ.
- **حامید فەرەج**، (١٩٧٦) ڕێنووسی کوردی لە سەدەیەکدا. چ..کۆڕی زانیاریی کورد. بەغداد.
- **ڕاگەیاندنامەی کۆتایی سیمیناری زمانی کوردی.**(١٩٩٨) – هەولێر ( ٢٠ و ٢٢ /٩/ ١٩٩٨).
- **شاکر فەتاح ئەحمەد**، (١٩٨٢) گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی. گ. کۆڕی زانیاریی عیراق. ب٩.
- **عومەر عەبدولڕەحیم**، (١٩٨٢) ڕێنووسی کوردی. گ. کۆڕی زانیاریی

عیراق. دەستەی کورد. ب٩.
- **فازل نیزامەدین** (١٩٩٠) ئەستێرە گەشە ـ فەرهەنگێکی کوردی – عەرەبیە.ژ. الفنون. بەغداد.
- **کامیل بەسیر**، (١٩٨٢) خاڵبەندی بۆ ڕێنووسی کوردی. گ. کۆڕی زانیاریی عیراق. دەستەی کورد. ب٩.
- **کوڕی زانیاریی عیراق – دەستەی کورد** (١٩٨٥) ڕاسپێرییەکانی لێدوانی ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی.(١٨و١٩/ ١٢/١٩٨٥) بەغداد.
- **گیوی موکریانی**، (١٩٦١) فەرهەنگی مەهاباد. چ. کوردستان. هەولێر.
- **مستەفا نەریمان** (١٩٨١) ڕێنووسی کوردی لە ڕەگ و ڕیشەوە.دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی. زنجیرەی زمان (٥). بەغداد.
- **مەسعوود محەمەد**، (١٩٧٨) بەرەو ڕاستە شەقامی ئاخاوتنی کوردی. چ..کۆڕی زانیاریی کورد. بەغداد.
- **محەمەد مەعرووف فەتاح**، (١٩٨٢) نووسینی کوردی لە ڕوانگەی فۆنۆتیکەوە. گ. کۆڕی زانیاریی عیراق – دەستەی کورد. ب٩. بەغداد.
- **نووری عەلی ئەمین**، (١٩٧٦) ڕابەرێ بۆ ئیملای کوردی. چ. سلمان الاعزەمی. بەغداد.
- ________(١٩٦٠) ڕێزمانی کوردی. چ. کامەران. سلێمانی.
- **وریا عومەر ئەمین**، (١٩٨٢) ئیملای کوردی و چەن تێبینییەک. گ. کۆڕی زانیاریی عیراق. دەستەی کورد. ب٩
- ________(٢٠٠٨) ئەلفوبێی جیهانی. ڕۆژنامەی بەدرخان ژ ٨٩ی ٢٠٠٨/١/٢٢.
- ________(٢٠١١) گیروگرفتەکانی نووسینی کوردی بە لاتینی. کۆنگرەی زمانەوانی (١٩-٢٠١١/٩/٢٢) ل١٣٨-١٥٢.
- ________(٢٠١٢) بە ستانداردکردنی ڕیزبوونی پیتەکانی نووسینی کوردی. گ. ئکادیمیای کوردی. ژ ٢١ ل ٧٥ – ٨٨.
- ________(٢٠١٣) ڕێنووس و چەند پرسیارێک. ڕۆژنامەی چاودێر. (ژ ٣٧٥ و ٣٧٦) ی (٨/٢٦ و ٩/٢ ی ٢٠١٣.
- **د.وریا عومەر ئەمین، د.شەفیق قەزاز، محەمەد وەسمان، د.شوان یابە.** (٢٠١٠) بیبلیۆگرافیای ئەکادیمیی کوردی – بەشی یەکەم ـ زمان ـ ب ١. چ. سپیرێز. دهوک.

## پاشکۆ ١
## هەندێ لەو وشە ئینگلیزییانەی بە دوو جۆر دەنووسرێن

*aroplane*, airplane
*asthetic*, esthetic
*ageing*, aging
*aluminium*, aluminum
*amœba*, ameba
*anœmia*, anemia
*anœsthesia*, anesthesia
*analyse*, analyze
*analogue*, analog
*annexe*, annex
*apologise*, apologize
*archœology*, archeology
*armour*, armor
*arse*, ass
*artefact*, artifact
*authorise*, authorize
*axe*, ax
*behaviour*, behavior
*caesium* or *cæsium*
*chamomile*, camomile
*cancelled*, canceled,
*carburettor*, carburetor
*catalogue*, catalog
*centre*, center
*cheque*, check
*chequer*, checker
*cypher*, cipher
*civilise*, civilize

*colonise*, colonize
*colonisation*, colonization
*colour*, color
*cosy*, cozy
*counsellor*, counselor
*counselling*, counseling
*defence*, defense
*demagogue*, demagog
*dialled*, dialed
*dialler*, dialer
*dialogue*, dialog
*diarrhœa*, diarrhea
*disc*, disk
*distention*, *distension*
*distil*, distill
*doughnut*, donut
*draught*, draft
*dreamt*, dreamed
*emphasise*, emphasize
*encyclopaedia*, encyclopedia
*anology*, enology
*enrolment*, enrollment
*equalling*, equaling
*asophagus*, esophagus
*astrogen*, estrogen
*oedema*, edema
*favourite*, favorite
*fæces*, feces
*fibre*, fiber
*fœtid*, fetid
*fœtus*, fetus
*flautist*, flutist

*flavour*, flavor
*fulfil*, fulfill
*furore*, furor
*gaol*, jail
*generalise*, generalize
*glycerine*, glycerin
*grey*, gray
*gynæcology*, gynecology
*hæmophilia*, hemophilia
*haematology*, hematology
*haem*, heme
*harbour*, harbor
*harmonise*, harmonize
*harmonisation*, harmonization
*homologue*, homolog
*honour*, honor
*humour*, humor
*instalment*, installment
*italicise*, italicize
*gaol*, jail
*jewellery*, jewelry
*judgement*, judgment
*kerb*, curb
*kilometre*, kilometer
*labour*, labor
*leapt*, leaped
*learnt*,learned
*leukæmia*, leukemia
*licence*, license, but always licensing
*liquorice*, licorice
*light*, lite version of a product
*litre*, liter

*manœuvre*, maneuver
*marvellous*, marvelous
*mediæval*, medieval
*metre*, meter
*modelling*, modeling
*mould*, mold
*mollusc*, mollusk
*moult*, molt
*mum*, mom
*monologue*, monolog
*moustache*, mustache
*moisturiser*, moisturizer
*neighbour*, neighbor
*anology*, enology
*asophagus*, esophagus
*astrogen*, estrogen
*odour*, odor
*offence*, offense
*omelette*, omelet
*organisation*, organization
*orthologue*, ortholog
*orthopædic*, orthopedic
*pædiatric*, pediatric
*pædophile*, pedophile
*pyjamas*, pajamas
*paralyse*, paralyze
*parlour*, parlor
*pedagogue*, pedagog
*plough*, plow
*practise*, practice – as a verb
*pretence*, pretense
*prise*, prize – the verb

*programme*, program
*quarrelled*, quarreled
*quarrelling*, quarreling
*realise*, realize
*realisation*, realization
*rigour*, rigor
*routeing*, routing
savory, *savoury*
*sceptic*, skeptic
show, show or shew
*signalling*, signaling
*skilful*, skillful
*speciality*, specialty
*spelt*, spelled
spoiled, *spoilt*
*sulphur*, sulfur
*theatre*, theater
*tyre*, tire
*tranquillity*, tranquility
*travelled*, traveled
*traveller*, traveler
*travelling*, traveling
*tumour*, tumor
*urbanisation*, urbanization
valor, *valour*
*vice*, vise, *vyce*
*victual*, vittle
vigor, *vigour*

## پاشكۆ ٢

ئەمە لیستەیەكە بە ناونیشانی سەدان لەو كتێب و باس و لێكۆڵینەوانەی لەبارەی
ـوگرفتەكانی ڕێنووسی عەرەبییەوە نووسراون بەڵگەن بۆ زۆری گیروگرفتی ڕێنووسی
ـسینی زمانی عەرەبی، زۆر لە زمانەوانان وای بۆ دەچن، كە زمانی عەرەبی بێ
ـوگرفتە بۆ ئەوەی بزانرێت مەسەلەی ڕێنووس لە هەموو زمانێكدا كێشەدارە. ئەوەی
یانی خستنەڕووە ئەوەیە، كە هیچیان ڕەچاو نەكراون.

### ب و دراسات و مقترحات عن مشاكل املاء اللغة العربية


الأخطاء الإملائية في الكتابة العلمية، د. جمال عبد العزيز أحمد.

الأخطاء الشائعة في الإملاء، حسن شحاتة.

أدب المملي، جمعية تأليف الكتب العربية، مصر ١٣٣٠هـ.

أساسيات في تعلم مبادئ الإملاء والترقيم، سليم سلامة الروسان، ط. ثانية، ١٩٨٩م.

أصول الإملاء، د. عبد اللطيف الخطيب، دار سعد الدين، دمشق، ط. الثالثة، ١٩٩٤م.

أصول الكتابة العربية، الباجقني.

ألف باء في قواعد الإملاء، محمد بن سليمان البلوي وسلمان بن مسلم البلوي، ط. أولى ١٤٢٧هـ/٢٠٠٦م.

الأمالي المبتكرة لتعليم الهمزة، سامي الدهان، المكتبة العصرية، حلب ١٩٣٥م.

الإملاء بين النظرية والتطبيق، أحمد محمد هريدي و أبو بكر علي عبد العليم، مكتبة ابن سينا، القاهرة ١٩٩٦م.

الإملاء التعليمي، د. شوقي المعري، دار الحارث ، ط. أولى، دمشق ٢٠٠٣م.

الإملاء الصحيح، عبد الرؤوف المصري، مكتبة الأندلس، القدس، ١٩٦٨م.

الإملاء العام، إلياس نصر الله حداد، بيروت، المطبعة الشويرية ١٩٥٠م، وطبعة ١٩٩٥م.

الإملاء العربي، أحمد قبش، مطبعة زيد بن ثابت، ط. ثانية، دمشق، ١٣٩٧هـ/١٩٧٧م، دار الرشيد، دمشق وبيروت، ١٩٨٤م.

الإملاء العربي، خالد يوسف، ط. ثانية، دار علاء الدين، دمشق، ١٩٩٨م.

الإملاء العربي، زين العابدين التونسي، المكتبة الهاشمية، دمشق ١٣٤٧هـ.

الإملاء العربي الميسر الشامل المجدول، فيصل حسين طحيمر العلي، مؤسسة علوم القرآن ودار ابن كثير، عجمان وبيروت، ١٩٩٠م.

الإملاء الفريد، نعوم جرجيس زرازير، مطابع النعمان، النجف، ط. الخامسة، ١٩٧٣م.

الإملاء المبسّط، خالدية شيرو، دار ومكتبة الهلال، بيروت، ٢٠٠١م.

الإملاء المبسط، عبد القادر محمد مايو، دار القلم العربي، حلب، ط. ثانية، ١٤٢٥هـ/٢٠٠٤م.
الإملاء الميسّر، زهدي أبو خليل، دار أسامة، عمان، ط. أولى، ١٤١٩هـ/١٩٩٨م.
الإملاء الميسّر، يحيى يحيى، دار ابن حزم، بيروت، ١٩٩٩م.
الإملاء والترقيم في الكتابة العربية، عبد العليم إبراهيم، مكتبة غريب، القاهرة، ١٩٧٥م.
الإملاء وتمرين الإملاء، الشيخ حسن والي، مصر ١٣٢٢هـ.
الإملاء والخط، فهد خليل زايد، دار النفائس، عمان، ط. أولى، ١٤٢٧هـ/٢٠٠٧م.
الإملاء والخطّ في الكتابة العربية، حلمي محمد عبد الهادي، ط. أولى، ١٩٨٥م.
الإيجاز في الإملاء العربي، ريم نصوح الخياط و يوسف علي البديوي، ط. أولى، ٢٠٠٥م.
تأويل ما له أكثر من وجه إملائي في العربية، د. عبد الفتاح الحموز، مجلة الضاد، بغداد، الجزء الثاني ١٤٠٩هـ/١٩٨٩م.
تاريخ الكتابة العربية وتطورها وأصول الإملاء العربي، محمود حاج حسين، وزارة الثقافة، دمشق ٢٠٠٤م.
تحفة المراكز العلمية في القواعد الإملائية ، عبد القوي العديني.
الترقيم، عبد الرؤوف المصري، مكتبة الاستقلال، عمان، ١٩٢١م.
الترقيم: تاريخه وماهيته وتطور علاماته، موريس أبو السعد ميخائيل، مجلة الرياض، مجلد ١٠، جزء ١، ص ١٤٥–١٦٤، شعبان ١٤٦٥هـ/يناير ١٩٩٥م.
الترقيم وعلاماته في اللغة العربية، أحمد زكي باشا، تقديم وعناية عبد الفتاح أبو غدة، مكتب المطبوعات الإسلامية، حلب، ط. الثالثة، ١٤١٦هـ / ١٩٩٥م.
تسهيل الإملاء، عارف النكدي، مجلة مجمع اللغة العربية بدمشق، المجلد ٣٨، ج ٤، ١٩٦٣م ، ص ١١١–١٢١.
تسهيل الإملاء، فهد أحمد الجباوي، دار القلم، دمشق، ط. الثانية، ١٤٢٢هـ / ٢٠٠١م.
تسهيل الإملاء، عمر يحيى وأسعد طلس ولطفي الصقال، مطبعة جريدة الشام، دمشق ١٩٣٨م.
تسهيل قواعد الإملاء العربي، عبد المجيد حسن ولي، بغداد، منشورات مكتب آفاق عربية، ١٩٨٥م.
تطور الكتابة العربية، السعيد الشرباصي، مصر، ١٩٤٦م.
تعلّم الإملاء بنفسك، د. محمد علي الخولي، طبعة دار العلوم، الرياض ١٤٠٢هـ/١٩٨٢م، وطبعة دار الفلاح للنشر والتوزيع، الأردن، ١٩٩٨م.
تعلّم الإملاء وتعليمه في اللغة العربية، نايف محمود معروف، دار النفائس، ط. أولى، والطبعة السادسة، بيروت، هـ ١٤٢٠هـ/١٩٩٩م.

التقرير النهائي لتجربة تيسير الكتابة العربية، المنظمة العربية للتربية والثقافة والعلوم، القاهرة ١٩٧٦م و ١٩٧٧م.
تقويم اليد واللسان، رفيق فاخوري ومحيي الدين درويش، ذكره صلاح الدين زعبلاوي في (معجم أخطاء
كتّاب) في كلامه على "هذا ضَوْءُه" (نقلا عن الصديق الأستاذ مروان البواب).
تيسير الإملاء العربي، محمد بهجة الأثري، مجلة مجمع اللغة العربية بالقاهرة، ج ١٢، ١٩٦٠، ص ١٠٩-١١٤.
تيسير الكتابة، يونس عبد الرزاق السامرائي، مطبعة الرسالة، بغداد ١٩٥٥م.
تيسير الكتابة العربية، مجلة مجمع اللغة العربية، القاهرة ١٩٤٦م.
تيسير الكتابة العربية، مجمع فؤاد الأول ١٩٤٦م. و مجمع اللغة العربية بالقاهرة، ١٩٦١م.
تيسير الكتابة العربية وضبط قراءتها باستعمال الحروف اللاتينية، داود الجلبي الموصلي، مطبعة آل حداد، الموصل ١٩٤٥م.
تيسير كتابة الهمزة، د. عبد العزيز نبوي و د. أحمد طاهر، القاهرة، ١٩٨٩م.
تيسير الهجاء العربي، أحمد الإسكندري، مجلة مجمع اللغة العربية، القاهرة، ج١، ص ٣٦٩-٣٨٠، ١٣٥٣هـ/ ١٩٣٤م.
الجديد في الإملاء، صالح عبد الرحمن الراشد، مكتبة الرياض، السعودية.
الحروف اللاتينية لكتابة العربية، عبد العزيز فهمي باشا، القاهرة، مطبعة مصر، ١٩٤٤م.
حول الألف اللينة، محمد شوقي أمين، مجلة مجمع اللغة العربية بالقاهرة، ج ٤٨، ص ٢١-٢٤، ١٩٨١م.
خلاصة الإملاء، مجيد شاكر، مطبعة النهضة الأدبية، ط. ثانية، القاهرة، ١٣٣١هـ/١٩١٣م.
الخلاصة في قواعد الإملاء وعلامات الترقيم، نبيل مسعد السيد غزي، دار غريب، القاهرة ٢٠٠٠م.
دراسات في علم الكتابة العربية، د. محمود عباس حمودة، مكتبة غريب، القاهرة، بلا تاريخ.
دراسة الأخطاء الإملائية، مجموعة من الأساتذة، وزارة التربية، مركز البحوث التربوية والمناهج.
دراسة في قواعد الإملاء، د.عبد الجواد الطيب، دار الأوزاعي، ط. ثانية، بيروت ١٤٠٦هـ/١٩٨٦م.
دروس إملائية بتخطيط تربوي سليم، فاطمة النجار، دار البيان العربي.
دلائل الإملاء وأسرار الترقيم، عمر أوكان، أفريقيا الشرق، بيروت، ١٩٩٠م .
دليل الإعراب والإملاء، أحمد أبو سعد، بيروت، دار العلم للملايين ١٩٨٤م.
دليل الإملاء وقواعد الكتابة العربية، فتحي الخولي، القاهرة ١٩٧٣م، الطبعة الخامسة، جدة ١٤٠١هـ/١٩٨٢م، مكتبة المنهل، جدة، ومكتبة وهبة، القاهرة ١٩٨٨م.

- دليل الإملاء والكتابة، د. عامر سعيد، مكتبة المنار الإسلامية، الكويت.
- دليل توحيد ضوابط الرسم الإملائي للكتابة العربية، المركز العربي للبحوث التربوية لدول الخليج العربي، الكويت ١٤٢٥هـ/٢٠٠٤م.
- رأي في إصلاح قواعد الإملاء العربي، محمد بهجة الأثري، مجلة المجمع العلمي العراقي، المجلد ٤، ١٩٦٥م، ص ٣٢٠– ٣٢٦ ، وانظر (الدراسات اللغوية في العراق ص ٢١٥–٢١٦) د. عبد الجبار جعفر القزاز.
- رسالة في تيسير الإملاء القياسي، إلياس عطا الله، مكتبة لبنان، ناشرون، بيروت ٢٠٠٥م.
- رسالة في الكتابة العربية المنقحة، أنستاس الكرملي، بغداد، ١٩٣٥م.
- سراج الكتبة شرح تحفة الأحبة في رسم الحروف العربية، مصطفى طموم، مصر، ١٣١١هـ ، مصورة دار البصائر بدمشق عن طبعة بولاق، ط. ثانية، ١٤٠٠هـ / ١٩٨٠م.
- الشامل في الإملاء، د. محمد حسن الحمصي، دار الرشيد، دمشق، ط. الأولى، ١٤٢١هـ / ٢٠٠٠م.
- صوى الإملاء لطلاب الحلقتين الإعدادية والثانوية، محمود الصافي، دار الإرشاد، حمص، ط. ثالثة، ١٩٨٤م.
- طريقة تصحيح الإملاء وتأثيرها في أداء تلاميذ الإملائي، د. أمين الكخن، مجلة دراسات، الجامعة الأردنية،ع ١ ، سنة ١٩٨٣م.
- علم الإملاء، أحمد عبد الجواد، دار الفكر، دمشق، ط. الأولى١٤٠٢هـ/ ١٩٨٢م.
- علم الإملاء: قواعد وأمثال وحكم، مطبعة محمد هاشم الكتبي، دمشق، بلا تاريخ.
- علم كتابة اللغة العربية والإملاء، د. حسني عبد الجليل يوسف، دار السلام للطباعة والنشر والتوزيع، ط. الأولى، القاهرة ١٤٢٧هـ/٢٠٠٦م.
- علّم نفسك قواعد الإملاء، حسن سعد، دار اللطائف للنشر والتوزيع، مصر.
- فاكهة الإملاء العربية، عرفات منصور، مطبعة الإخوان، سنغافورة، ١٣٣٤هـ.
- فن الإملاء في العربية، د. عبد الفتاح الحموز، جزءان، دار عمار للنشر والتوزيع، الأردن، ط. الأولى، ١٤١٤هـ / ١٩٩٣م.
- فنّ الترقيم: أصوله وعلاماته في العربية، عمان، دار عمار للنشر، ط.أولى ١٤١٤هـ، ١٩٩٢م.
- فنّ الكتابة، عبد المعطي شلبي، المكتب الجامعي الحديث، الإسكندرية، ط. أولى، ٢٠٠١م.
- فنّ الكتابة الصحيحة، محمود سليمان ياقوت، دار المعرفة الجامعية، الإسكندرية، ٢٠٠٣م.
- فنّ الكتابة وأساليبها، د. رشدي الأشهب، مؤسسة ابن رشد، القدس، ١٩٨٣م.
- في أساسيات اللغة العربية، الكتابة الإملائية والوظيفية، عبد العزيز نبوي، مؤسسة المختار، القاهرة ٢٠٠٣م.
- في تيسير الإملاء، مجلة مجمع اللغة العربية، القاهرة، ج ١٦، ١٩٦٣م ، ص ٨٧–٩٠.

– في قواعد الكتابة والأخطاء الشائعة فيها، شرف الدين الراجحي، دار المعرفة الجامعية، الإسكندرية ٢٠٠٠م.
– قاعدة الأقوى لكل الهمزات، بشير محمد سلمو، القاهرة، ١٩٥٣م، ومجلة مجمع اللغة العربية بالقاهرة، مجلد ١٢، ص ١٢٠–١٢٢، وانظر نصّ القاعدة وبيانها في كتاب (تيسير كتابة الإملاء) ص٥٥–٦٢.
– القاعدة في تعليم القراءة والكتابة، معمر القدسي.
– قاموس الإملاء، عبد الحميد بدران، مصر ١٣٣٠هـ.
– قصّة الإملاء، أحمد الخوص، المطبعة العلمية، دمشق، ط. أولى ١٩٨٩م، وط. ثانية ١٩٩٢م، وط. ثالثة ١٩٩٥م.
– قصة الكتابة العربية، جمعة إبراهيم، القاهرة، دار المعارف ١٩٤٧م.
– القضايا الإملائية وطرق تدريسها في المرحلة الابتدائية، د. محمود شاكر سعيد.
– قواعد الإملاء، عبد السلام هارون، مكتبة الأمل، الكويت، ط. ثانية، ١٩٦٧م. وط. الثالثة، مكتبة الخانجي ١٣٩٦هـ/١٩٧٦م و ط. الرابعة، مكتبة الخانجي، مصر ، ١٣٩٩ هـ/١٩٧٩م، وطبعة دار إيلاف الدولية، الكويت، ط. الأولى، ١٤٢٥هـ / ٢٠٠٤م.
– قواعد الإملاء، مجمع اللغة العربية، دمشق، ١٤٢٥هـ / ٢٠٠٤م.
– قواعد الإملاء، د. كافية رمضان، وحسن شحاتة، دار المعرفة ، القاهرة، ١٩٨٣م.
– قواعد الإملاء، إبراهيم بن محمد الدوخي، وعبد العزيز بن محمد الفنتوخ، ط. السابعة، مكتبة الملك فهد الوطنية، ١٤١٧هـ/ ١٩٩٦م.
– قواعد الإملاء، حسين والي، مكتبة الأنجلو مصرية، القاهرة ١٩٨٥م.
– قواعد الإملاء، محمود معلا محمد، نشر المؤلف، ط. أولى ١٩٩٧م.
– قواعد الإملاء، د. محمد عبد الغفار حمزة.
– قواعد الإملاء، رشدي عبد الغني المصري، مراجعة محمد علي الموافي، إشراف عبد العزيز بن مانع و د. عز الدين إبراهيم، وزارة التربية والتعليم، قطر، ط. الحادية عشرة، ١٣٩٩هـ/١٩٧٩م.
– قواعد الإملاء العربي، محيي الدين درويش، حمص ١٣٥٢هـ.
– قواعد الإملاء العربي: نظرات في غابرها وحاضرها، د. عمر الدقاق، مجلة مجمع اللغة العربية بدمشق، ج٤، ص ٩٢٣–٩٤٥، ١٤١٩هـ/١٩٩٨م.
– قواعد الإملاء عند القدماء والمحدثين، د. مازن المبارك، دار البشائر، ضمن كتاب (مقالات في العربية) دمشق، ط. أولى ١٤٢٠هـ/١٩٩٩م، ص ١٣– ١٦٣.

- القواعد الإملائية، نبيل المغربي، الكتاب في الشابكة، موقع جمعية الدعوة إلى القرآن والسنة، مراكش، المغرب ٢٠٠٦

٢٠٠٦ وانظر موقع www.darcoran.net

- قواعد التحرير، أمين كيلاني، حماة، ١٣٤٣هـ.
- القواعد الغراء في تتميم خلاصة الإملاء، الشيخ شيخ بن علي بابصيل، دار إحياء الكتب العربية، مصر.
- قواعد الكتابة الإملائية: نشأتها وتطورها، محمد شكري و أحمد الفيومي، دار القلم، ط. ثانية، دبي، ١٩٨٨م.
- قواعد الكتابة العربية، خير الدين الأسدي، حلب، ١٣٤١هـ.
- قواعد الكتابة العربية، لجنة من الأساتذة، الهيئة العامة للتعليم التطبيقي والتدريب، الكويت، ١٩٨٥م.
- قواعد الكتابة العربية والإنشاء، د. عبد الواحد حسن الشيخ، كلية التربية، جامعة الإسكندرية.
- قواعد الكتابة والترقيم، يوسف سحيمات ود. عيسى فارس وياسين عايش، جامعة القديس المفتوحة ١٩٩٢م.
- قواعد الكتابة والترقيم والخط، سليم سلامة الروسان، ١٩٨٢، بلا مكان طبع، وطبعة عمان الأولى ١٩٨٩م.
- قواعد مقترحة لتوحيد الكتابة العربية، د.محمد علي سلطاني، دار الفكر، ط. أولى، دمشق، ١٤١٥هـ/١٩٩٥.
- القواعد الموحدة في الكتابة والإملاء، د. محمد علي سلطاني، مطبعة سفير ، الرياض، ط. أولى ١٤١٠هـ/١٩٨٩م.

و ط. المكتب الإسلامي، بيروت، ودار النفائس، الرياض، ١٩٨٩م.

- الكافي في الإملاء والترقيم، د. جمال عبد العزيز أحمد.
- الكافي في قواعد الإملاء، حسني شيخ عثمان.
- الكامل في الإملاء، كمال أبو مصلح، المكتبة الحديثة، بيروت، ط. أولى، ١٩٧٣م.
- كتاب الإملاء، الشيخ حسين والي، القاهرة ١٩١٣م، ودار العلم، بيروت، ط. أولى، ١٤٠٥هـ/ ١٩٨٥م.
- كتاب الإملاء، كمال اليازجي، دار الكتب العلمية، ودار الجيل بيروت ١٩٨٦م.
- الكتابة الصحيحة، زهدي جار الله، المكتبة الأهلية، بيروت، ط. ثالثة ١٩٧٧م.
- كتابة الهمزة، راضي دخيل، مجلة مجمع اللغة العربية بدمشق، المجلد ٩، ١٩٣٩م.
- الكتابة وقواعد الإملاء، عبد الله علي مصطفى، دار القلم، ط. أولى، دبي، ١٩٩٠م.

- كيف تتعلّم الإملاء وتستخدم علامات الترقيم، ياسر سلامة، دار عالم الثقافة، عمان، ٢٠٠٣م.
- كيف تكتب الهمزة؟ د. سامي الدهان، دار الشروق العربي، بيروت وحلب، بلا تاريخ.
- كيلا نخطئ في الإملاء وعلامات الترقيم ، حسن شيخ عثمان، دار المنارة للنشر والتوزيع.
- لآلئ الإملاء، محمد مامو، اليمامة للنشر والتوزيع، دمشق و بيروت، ط. الرابعة، ١٤٢٦هـ / ٢٠٠٥م.
- لباب الإملاء، عبد الله جاد وعبد الفتاح خليفة، مطبعة أحمد كرارة، القاهرة.
- اللغة العربية أداءً ونطقًا وإملاءً وكتابةً، فخري محمد صالح، المنصورة، دار الوفاء، ط. أولى، ١٤٠٧هـ/ ١٩٨٧م.
- اللغة العربية إملاء وكتابة، فخري محمد صالح، دار الوفاء، المنصورة.
- اللغة العربية ومشاكل الكتابة، البشير بن سلامة، الدار التونسية، تونس، ١٩٧١م، و ط. دار التراث الإسلامي ١٩٧٥م.
- مباحث في الترقيم، صالح بن محمد الأسمري، دار ابن الأثير، الرياض ٢٠٠٢م.
- المبسط في الإملاء، فؤاد فيصل الربيعان، مراجعة د. عبد اللطيف الخطيب، ط. الثانية، ١٤٢٣هـ/٢٠٠٢م.
- مذكرة في قواعد الإملاء، د. أحمد محمد قدور، دار الفكر، دمشق، ط. أولى، ٢٠٠٢م.
- مراقي النجابة، عبد السلام القويسني، مصر، ١٣٢٧هـ.
- مرجع الطلاب في الإملاء، إبراهيم شمس الدين، دار الكتب العلمية، بيروت، ٢٠٠١م.
- المرجع في قواعد الإملاء، راجي الأسمر، جروس برس، ط. أولى، طرابلس، لبنان.
- المرشد إلى معرفة الإملاء، عبد الكريم الدجيلي، بغداد ١٩٤٩م.
- مرشد الطلاب، أحمد عباسي، مصر، ١٣٣٢هـ.
- مرشد الطلبة والباحثين في أعراف الكتابة والرقانة والطباعة، مكتبة المعارف، الرباط، ١٩٨٥م.
- المرشد في الإملاء، محمود شاكر سعيد، ط. ثالثة، دار الشروق، عمان، ١٩٩٨م.
- المرشد في الإملاء، د. نبيل أبو حلتم، دار أسامة، عمان، ط. رابعة، ١٤١٩هـ/١٩٩٨م.
- المرشد في كتابة الهمزات، جلال صالح، دار الزيدي، الطائف، ط. أولى، ١٩٧٩م.
- مسالك التراث في النحو والصرف والإملاء، ياسين طربوش.
- المستشار في الإملاء والخطّ العربي، يوسف بدوي ويوسف الحاج أحمد وأحمد محمد السيد، دار ابن كثير، دمشق، ط. أولى، ١٩٩٤م.
- مشروع تيسير الإملاء، مجلة مجمع اللغة العربية بالقاهرة، ١٩٥٥م، ص ٩٥ - ١٠٥.
- مشكلة الهمزة العربية، د. رمضان عبد التواب، مكتبة الخانجي، القاهرة، ط. الأولى، ١٤١٧هـ / ١٩٩٦م.

- المطالع النصرية في الأصول الخطية للمطابع المصرية، أبو الوفاء نصر الهوريني، دار أضواء السلف للنشر والتوزيع ط. الأولى، ١٤٢٦هـ / ٢٠٠٥م.
- معالم الإملاء، دويدري وسطل، دار الحكمة، دمشق.
- معجم الإملاء، أدما طربيه، مكتبة لبنان، ناشرون، بيروت٢٠٠٠م.
- معجم الإملاء، محمد محيي الدين مينو، دبي ٢٠٠٣م.
- معجم الإملاء العربي، أكرم جميل قنبس، دار الوسام، الشارقة.
- معجم الإملاء العربي، غريد الشيخ، دار الراتب الجامعية، ط. أولى، ٢٠٠٦م.
- المعجم المفصل في الإملاء، ناصيف يمّين، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٩٩٢م و ١٩٩٩م.
- معجم الهمزة، أدما طربيه، مكتبة لبنان، ناشرون، بيروت، ٢٠٠٠م.
- معلّم الإملاء الحديث للطلاب والمعلمين والإعلاميين، محمد إبراهيم سليم، مكتبة القرآن، القاهرة، ١٩٨٧م.
- المغني في قواعد الإملاء، د.خليل إبراهيم، الأهلية للنشر ودار الوراق ودار النيربين، عمان، ط. أولى، ٢٠٠٢م.
- المفرد العلم في رسم القلم، أحمد الهاشمي، مصر، ١٣١٩هـ. والمطبعة التجارية، ط. الخامسة عشرة، ١٩٤٨م، وطبعة بيروت، دار الكتب العلمية، بلا تاريخ.
- مقاربة تاريخية لعلامات الترقيم، عبد الستار محمد العوفي، مجلة عالم الفكر، الكويت، ع ٢، ص ٢٦٥-٣١٨، ١٩٩٧م.
- ملحق قواعد العدد والإملاء، لوحة الهمزة، القاموس المحيط، الفيروزآبادي، مؤسسة الرسالة، بيروت، ط. السادسة، ١٤١٩هـ/١٩٩٨م.
- ملخّص قواعد الإملاء، إبراهيم بن سليم.
- المنار في الإملاء العربي، سعاد الصايغ، مطبعة شوقي، عمان، ١٩٧١م.
- المنصف في الإملاء، عبد الجليل محمد زكريا، دار الإرشاد، حمص، ط. الأولى، ١٤١٩هـ/ ١٩٩٨م.
- الموجز، جميل سلطان، دمشق، ١٣٥١هـ.
- الموجه في الإملاء، فاطمة النجار، جدة، دار البيان العربي، ١٤٠٣هـ/١٩٨٣م.
- المورد في الإملاء، ياسين محمد سبيناتي، مكتبة العبيكان، الرياض، ط. أولى، ١٩٩٧م.
- موسوعة الإملاء العربي، نظام معتمد في أكثر من ٤٥ مدرسة ومعهد في عُمان، (الشبكة العالمية).
- موسوعة الإملاء كتابة ولفظاً، عبد المجيد الحرّ، دار الفكر العربي، بيروت، ٢٠٠١م.
- موسوعة الشامل في الكتابة والإملاء، موسى حسن الهديب، دار أسامة، الأردن، عمان، ٢٠٠٢م.

- معجم الإملاء العربي، غريد الشيخ، دار الراتب الجامعية، ط. أولى ٢٠٠٦م.
- نتيجة الإملاء، مصطفى عناني وعطية الأشقر، مصر ١٣٥٠هـ.
- نتيجة الإملاء وقواعد الترقيم، مصطفى عناني، مطبعة حجازي، القاهرة، ط. الخامسة، ١٩٣٧م. وطبعة دار النفائس، بيروت، ط. الأولى، ١٤٠٤هـ / ١٩٨٤م.
- النجابة في قواعد الكتابة، الشيخ مصطفى السفطي، ١٩٠٣م.
- نحو تقويم جديد للكتابة العربية، د. طالب عبد الرحمن، ط. أولى ١٩٩٩م.
- نخبة الإملاء، عبد الفتاح خليفة، مصر ١٣٤٥هـ.
- (نظرات في قواعد الإملاء) مراجعة لطبعة مجمع اللغة العربية بدمشق ٢٠٠٤م ، د. يحيى مير علم، مقال نشر في مجلة الدراسات اللغوية، مركز الملك فيصل للبحوث والدراسات الإسلامية، الرياض، العدد ٤ ، المجلد ٨ ، شوال – ذو الحجة سنة ١٤٢٧ هـ، أكتوبر – ديسمبر ٢٠٠٦م.
- (نظرات في لوحة الألف) مكتب التوجيه الفني، وزارة الأوقاف والشؤون الإسلامية بدولة الكويت نهاية ٢٠٠٦م، د. يحيى مير علم، الشابكة (الإنترنت) موقع (الألوكة) ٢٠٠٨م وغيره.
- الهداية إلى ضوابط الكتابة، إبراهيم عبد المطلب، ط. السابعة، شركة مركز كتب الشرق الأوسط، القاهرة ١٩٧٢م.
- الهمزة في الإملاء العربي: المشكلة والحلّ، د. أحمد الخراط، ط. أولى، ١٤٠٨هـ/١٩٧٨م و ط. دار القلم، دمشق، ودار العلوم ، بيروت ١٩٨٧م.
- الهمزة في اللغة العربية، دراسة لغوية، مصطفى التوني، القاهرة ١٩٩٠م.
- الهمزة مشكلاتها وعلاجها، د. أحمد شوقي النجار، الرياض ١٩٨٤م.
- الهمزة والألف ومدلولهما عند القدماء، د. مازن المبارك، مجلة كلية الدراسات الإسلامية، الإمارات العربية، ع١٩٩٠،٢م.
- الواضح في الإملاء العربي، محمد زرقان الفرخ، دار هدى وهبة، ط. الأولى ١٤١٣هـ / ١٩٩٣م.
- الواضح في الإملاء وعلامات الترقيم، يوسف عطا الطريفي، دار الإسراء، عمان، ط. أولى ٢٠٠٥م.
- الوجيز في قواعد الكتابة والترقيم، د. توفيق أسعد حمارشة.
- وسائل النهوض باللغة العربية وتيسير قواعدها وكتابتها، د. مصطفى جواد، دمشق، المؤتمر الأول للمجامع اللغوية العلمية

١٩٥٦م، وانظر (الدراسات اللغوية في العراق) ص ٢١٣ د. عبد الجبار جعفر القزاز.
- يسّروا النحو والكتابة، د. طه حسين، مجلة الآداب اللبنانية، السنة الرابعة.

# ڕاگوزەرێك بەڕەوتی مێژوویی چەند وشەیەکی زمانی کوردیدا

**پ. د. فارووق عومەر سدیق**
زانکۆی سلێمانی
ئەندامی کارای ئەکادیمیای کوردی

**سەرەتا:**

وشەیەك لەو وشە هاوبەش و کۆنەسالانەی کە ڕەگ و ڕیشەکەی زۆر قووڵە و جێ و شوێنێکی تایبەتی لە فەرهەنگی زۆربەی زمانە هندوئەوروپاییەکاندا بەتایبەتی لەگرووپی زمانە هندوئێرانییە کۆن و نوێیەکاندا، گرتووەو بەڤەریانتی نزیك لەیەك، چەند هەزار ساڵێکە بەردەوام تا ئەمڕۆ بەکاردێت، فۆڕمە سەرەکییەکەی لە زمانی کوردیدا (ئەسپ)ە.

(ئەسپ) یەکێکە لە وشە بە پێز و بەرهەمدارەکانی زمانی کوردی. لەسەر بناغەی ئەم، چەندەها پێکهاتەی زمانیی، وەك، وشە و فرێزی چەسپاو و ئیدیۆم و پەندی هەمەچەشنە، سازێنراون و لەبەر ئەو بوارە سیمانتیکییەی کە لە مێشکی خەڵکی جاران و ئێستاشدا، گرتوویانە بەزیندوویی و خۆڕاگرییەوە لەکاردان.

وشەیەك کە ئەو دەورو ڕۆڵە بەرچاوەی لە دەوڵەمەندکردن و فراوانکردنی فەرهەنگی کوردیدا، هەبوبێت و بێ وەستان، چست و چالاکانە بەدەم پێویستییەکانی خەڵکییەوە، هاتبێت، ئەوە دەهێنێت و بەڵکو بەپێویستیش، دەزانرێت کە بەپێی گرتنەبەری ڕێبازی لێکۆڵینەوەی مێژوویی بەراورد و وەسفیی کنە لە بنج و بناوانیدا، بکرێت و بەم باسە، پەردە لەسەر لایەنی ئێتمۆلۆژی و تایبەتێتییە لێکسیکی و مۆرفۆلۆژییەکانی کە تەمومژ گرتوونی، لابرێن.

ئەم باسە جگە لە سەرەتا و دەروازە و ئەنجام، (٢) دوو بەش دەگرێتە خۆی:

**یەكەم بەش:**

ئێتمۆلۆژی و شیكردنەوەی مۆرفۆلۆژییانەی وشەی (ئەسپ) لە زمانی كوردی و هاوڤەریانتەكانی لە زمانە هندوئەورووپاییەكاندا.

**دووەم بەش:**

تایبەتێتی لێكسیكیی چەند بەرهەمێكی زادەی ڕەگی (ئەس as) و دەوریان لە گەشەپێدانی فەرهەنگی زمانی كوردیدا.

**دەروازە:**

فەرهەنگی زمان لە فەرهەنگی گشتی (vocabulary) كە سەرجەمی ئەو وشانە دەگرێتە خۆی كە لە زمانێكدا بەكاردێن لەگەڵ فەرهەنگی بنەڕەتیی زمان ( basic word stock) كە بەشێكە لە گشتییەكە، پێكدێت.

بە ڕای (أ. أ. ریفۆرماتسكی) فەرهەنگی گشتی تێكڕای ئەو وشانەی كە لە زمانێكدا بەكاردێن، دەگرێتەوە. لەناو ئەو گرووپە گەورە لێكسیكییەشدا، ژمارەیەكی كەمی، بەڵام دیارو دەركەوتوو لێیان كە هەموو وشەڕەگێكانی زمانیان بەیەكەوە بەستۆتەوە بە (نەواتی زمان) دادەنرێن و بە فەرهەنگی بنەڕەتی ناودەبرێن. فەرهەنگی بنەڕەتی لەچاو گشتییدا، كەمتر فراوانە، بەڵام جیاوازی لەگەڵ ئەودا لەوەدایە كە ئەم زۆرتر دەژی و بەتەمەنترە و سەدەها ساڵە بە بەردەوامی ماوەتەوە و بناغەیە بۆ سازكردنی وشەی نوێ.

بە ڕای (أ. أ. ڕیفۆرماتسكی) بۆئەوەی بتوانرێت، وشەیەك لە زماندا، حیسابی وشەی فەرهەنگی بنەڕەتی بۆ بكرێت، پێویستە (٣) سێ مەرج و نیشانەی تیادا بێت، ئەگەر هاتوو (٣) پرسیاری لێبكرێت، لە توانایدا، هەبێت (٣) وەڵامی پۆزەتیڤی بداتەوە كە ئێمە بەلامانەوە باشە، بەم دیاگرامە، بیانخەینە ڕوو (أ. أ. ریفۆرمانتسكی، ١٩٦٧: ١٢٨)، (فاروق عومەر سدیق، ٢٠١٣: ١٤٩–١٧٨):




بەلای (ل. أ. بولاخۆڤسكی) یەوە، فەرهەنگی بنەڕەتیی زمان بەپێی سەردەم و بەگوێرەی جیاوازیی زمان، دەگۆڕێت، كەم، یا زۆر لە هەموو جێیەكدا، هەبووە و هەیە، ئەگەر بەشێوەیەكی تەسكتریش، بڕوانینە واتاكەی، مەبەست لەو وشانەیە كە زمان بێ ئەوان وجودی نابێت. لە زمانی میللەتانی خاوەن شارستانێتی بەرز و لەوانەشدا كە بە دواكەوتوو، دەژمێررێن لە هەردوو لادا بەكارهێنانیان زەرووریيە و ناكرێت خۆیانی لێ لادەن. بۆ نموونە لە بەڕێوەبردنی ئەركەكانیدا، زمان هیچ كاتێك، ناتوانێت دەستبەرداری وشەی لەم چەشنانە، بێت:

باوك، دایك، برا، خوشك، پیاو، ژن، منالّ، سەر، دەست، شان، پێ، لووت، گوێ، ئاو، زەوی، ئاسمان، خۆر، مانگ، ئەستێرە، ئاگر، ڕۆژ، شەو، باران، تۆو، دار، گیا، دۆست، دوژمن، برین (زام)، دڕندە، باڵندە، بەخشندە، تووڕە، ڕەق، نەرم، بەهێز، بێهێز، نەخۆش، ڕەش، سپی، گەرم، سارد، بەئازار، یەك، دوو، زۆر، كەم، كێ؟، چی؟، لەكوێ؟، ئاوخواردنەوە، خواردن، نووستن، ڕۆیشتن، دانیشتن، پاڵكەوتن، كاركردن، كەوتن، فڕین، بینین، بیستن، لێدان، نەخۆش كەوتن، قسەكردن، هاواركردن، بانگ كردن، كولان، بردن، سەرئاوكەوتن، سەوڵلێدان، هەڵپەڕین، كۆكین.( ل. ا. بولاخۆڤسكی، ١٩٥٣: ٨٤–٨٥)

(ی. م. ئارانسکی)یش، چەندین گرووپ وشەی لە بابەتی: ناوی ئەندامانی خێزان، ناوی ئەندامانی لەش، ناوی ژمارە، ڕەگی فیعل، شتومەك و دیاردەی سروشتی، ناوی گیانداران کە دەچنە فەرهەنگی بنەڕەتیی ژمارەیەکی زۆر لە زمانە ئێرانییە کۆن و نوێیەکانەوە، بەنموونە هێناوەتەوە کە (ئەسپ) یەکێکە لەوان و لەناو ئەوانیشدا، وشەی (ئەسپ)ی زمانی کوردییە.( ای. م. اُرانسکی، ١٣٧٩: ٢٤-٢٥)

**یەکەم بەش:**

**١-١: ئێتمۆلۆژی و شیکردنەوەی مۆرفۆلۆژی وشەی (ئەسپ) لە زمانی کوردی و هاوڤەریانتەکانی لە زمانە هندو ئەوروپاییەکاندا**

ئێستا لە زمانی کوردیدا، بەچەند فۆرمێکی جیاواز و نزیك لەیەکتری، ناو لەو گیاندارە، نراوە کە پێیدەوترێت (ئەسپ).

لە دیالێکتی خوارووداا، بۆ جنسی نێر فۆرمی سەرەکی (ئەسپ)ە. لەپاڵ ئەمدا، (حەسپ، ئەسپ) بەکاردێت (هەژار، ١٣٨٤: ٢٢)، وشەی (ماین)یش[1]، بە مێینەکەی و (جوانوو)ش[2] بە بێچووەکەی دەوترێت.

لە دیالێکتی سەروودا بە (هەسپ، حەسپ) ناودەبرێت، وەك لە (هەسپێ نێر، حەسپێ نێر، هەسپێ بۆز، هەسپێ شێ، هەسپا مێ، حەسپا مێ و هی تریش)( چ. خ. باکایێڤ، ١٩٥٧: ٤٣٢)، (ك. ك. کوردۆێڤ، ١٩٦٠: ٣١٤، ٣٤٤).

لە دیالێکتی گۆراندا (هەورامی)یشدا، (ئەسپ)ی پێدەڵێن.( ئی. ئا. سمیرنۆڤا و ك. ڕ. ئەیووبی، ١٩٩٩، ٣١).

لەناو ئەو فۆڕمانەدا، کۆنترین فۆڕم (وەك لەم لێکۆڵینەوەیەدا، ڕوون دەبێتەوە)، (ئەسپ)ە، هەرچی (هەسپ و حەسپ)یشە، ئەوا بە گۆڕینی فۆنەتیکیی فۆنێمی (هـ و ح)یان بۆ زیادکراوە کە لە ئەسڵدا لەگەڵی نەبوون.

بۆ پێکانی ئامانجی گەیشتن بە ڕەگ و ڕیشە و ئێتمۆلۆژی وشەی (ئەسپ) بەدوو ڕێگا هەنگاوی بۆ دەنێین:

۱-۱-۱: یەکەم ڕێگا:

بەوردبوونەوە و سوودوەرگرتن لەو لێکۆڵینەوە ئێتمۆلۆژییانەی کە لە زمانناسیی ڕۆژئاواییدا بە زمانی: (ئەڵەمانی، ڕووسی، ئینگلیزی) دەربارەی ئەو ڤەریانتانەی کە لە زمانە هندو ئەورووپییە کۆن و نوێیەکاندا، دەشێن، بەرامبەر بە (ئەسپ)ی کوردی، ڕابگیرێن.

لەم کارەشماندا، هەولمان داوە کە بەپێی ڕیزبەندیی مێژوویی کەڵك لەو سەرچاوانە ببینین کە بۆ ئەو مەبەستە لەبەر دەستماندان.

(پاول هۆرن- هایزیش هوبشمان) ڕیشەی وشەی (اسب)ی فارسییان[٣] بەئەسڵ بردۆتەوە سەر (-aspa)ی ئاوێستایی و فارسیی کۆن و (áçva)ی هندی کۆن‌و (asp)ی پەهلەوی (پاول هورن- هایزیش هوبشمان، بێ‌ساڵ: ١٠٤).

(ئی. م. ئارانسکی) لە چەندین شوێندا لە کارە زمانناسییەکانیدا، ئاماژەی بە ئێتمۆلۆژی ڤەریانتەکانی وشەی (ئەسپ)ی کوردی لەناو زمانە هاوگرووپەکانیدا، کردووە، بۆنموونە: وشەی (-a'ssa)ی سکایی کە واتاکەی (ئەسپ)ە، بەوشەیەکی فەرهەنگی بنەڕەتیی ئەو زمانە داناوە و بەرەچەڵەك بە (-aspa)ی ئاوێستایی و (-asa)ی فارسی کۆنەوە بەستوویەتەوە. (ئی. م. ئارانسکی، ١٩٦٣: ٩٢-٩٣).

(ئی. م. ئارانسکی) لە کارێکی تریدا، ناوی گیانداری (ئەسپ)ی لە چەندەها زمانی هندوئەورووپاییدا بەوشەی هاوبەش و پێکهێنەری فەرهەنگی بنەڕەتی لەو زمانانەدا، داناوە کە لەئەسڵدا لەیەك ڕەگەوە بەڤەریانتی جیاواز داکەوتوون، ئەمانەی بەنموونە هێناوەتەوە (-asp)ی ئاوێستایی، (-asa) فارسی کۆن و (aspa)ی سکایی، (asp)ی فارسی ناوەڕاست، (sp')ی سوگدی، (asp)ی تاجیکی ئێستا، (äsp) فارسیی نوێ، (āfsä) دیالێکتی دیگۆری زمانی ئاسی، (ās)ی ئەفغانی، (asp) بەلوچی، (häsp) دیالێکتی کرمانجی زمانی کوردی، (asp) یەغنوبی.( ای. م. ارانسکی، ١٣٧٩: ٢٤-٢٥).

(ئی. م. ئارانسکی) لە کارێکی تریشدا و لە باسی گۆڕینی مێژوویی فۆنەتیکیی زمانە ئێرانییەکاندا، ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە (s//sp)ی ئێرانی کۆن لە ئاوێستادا بووە بە (sp)و لە فارسیی کۆنیشدا بە (s). بۆ نیشاندانی ئەو

گۆڕانكارییەش، وشەی (ئەسپ)ی لە چەندین زمانی ئێرانی كۆن و نوێدا بەنموونە، هێناوەتەوە كە ئەمانە، هەندێكیانن:

لە سەرووی ڕۆژئاوای زمانە ئێرانییەكان: (asp) بەلوچی، (hasp')ی كرمانجی كوردی، (asp)ی موكری، (asp)ی هەورامانی، (asp)// (asb)ی تاڵیشی، (asb)ی مازەندەرانی و........هی تریش.

لە خوارووی ڕۆژئاوا: [(aspa-)/ (asa)]ی فارسی كۆن، (asp)ی فارسی ناوەڕاست، [(äsp)/ (äsb)]ی فارسی نوێ و........هی تریش (ئی. م. ئارانسكی، ١٩٧٩: ١٥٦).

(ل. گ. گێرتسنبێرگ) لەناو ئەو ڕەگە هندوئێرانییانەدا كە ڕەگی تریان لێ كەوتۆتەوە، (AKU)یشی نیشان داوە كە (aspa-, asva-)ی كە بە(ئەسپ) وتراوە لێ پەیدابووە، وەك لە (a's'sa)ی هیتی و سكایی و (asp)ی تاجیكیدا، هەن.

لە ڕەگێكی تریشدا كە (AKU-)یە و واتای (خێرا، یا توند)ی گەیاندووە، وشەكانی (āsu, ās'ú)ی لێ لە دایك بوون، وەك لە (áska-) هیتی و سكایی و (ohu)ی تاجیكیدا كە بە (ئاسك) وتراون، بەرچاودەكەون.( ل. گ. گێرتسێنبێرگ، ١٩٧٢، ١٨١–١٨٢).

لای (بارو) وشەی (ās'u-) لە سانسكریتیدا، ئاوەڵناو بووە واتای (خێرا، توند)ی بەخشیوە. (ōcior)ی لاتینیش، دیسانەوە واتای (زۆر خێرا)ی گەیاندووە.

(بارۆ) ئاماژەی بۆ ئەو خاڵە كردووە كە لە دواین ساڵانی تەمەنی زمانی سانسكریتیدا، وشەی (ghoṯaka-) لەپاڵ (as'va-) بە (ئەسپ) وتراون، بەلام دواتر لەمێژووی زمانە هندوئارییەكاندا، (ghoṯaka-) تەنگی بە (as'va-) هەڵچنیوە.(بارۆ، ١٩٧٦، ٩٨، ٣٤٩).

(ڤ. س. رستەرگۆیێڤا) لە نیشاندانی (مۆدێلی مۆرفۆلۆژی زمانە ئێرانییەكاندا) و لە باسی (پرسەكانی گەشەسەندنی گشتی مۆدێلی مۆرفۆلۆژی)دا، ئاماژەی بۆ ئەو خاڵە كردووە كە كەتیگۆری جنس، كاتێك ڕاستەوخۆ بەسۆفیكسی كۆتایی كەیس، دەربڕابێت، تەنیا بۆ ژمارە تاكی جنسی نێر لە كەیسی نۆمینەتیڤیدا لەو ڕەگانەدا كە بە (a) كۆتاییان هاتبێت لە ئاوێستادا بووە بە (ō)، بەلام بە (Ø) واتە

بە (سفر) ماوەتەوە، وشەی (ئەسپ)یشی لەو دوو زمانەدا بەم چەشنە، بەنموونە هێناوەتەوە:

(aspō) لە ئاوێستادا، (asa) لە فارسی کۆندا.( ڤ. س. ڕەستەرگوێڤا، ١٩٧٥: ١٠٣).

(جان ایتو) بەرامبەر ئێتمۆلۆژی وشەی (horse)ی ئینگلیزی نووسیویەتی: لەپێش مێژوودا لە زمانە هندوئەوروپاییەکاندا بەڕەگی (ekwos*) ناو لە (ئەسپ) نراوە، ئەم وشانەشی لەو زمانانەدا بەنموونە هێناوەتەوە کە بە بەشداری ئەو ڕەگە سازێنراون:

(equus)ی لاتینی لە (equestrian) واتە (ئەسپسواری)، (equine) واتە (ئەسپ ئاسا) کە لە زمانی ئینگلیزیشدا، هەر بەهەمان واتا بەکاردێت، (hippos) گریکییی لە (hippodrome) واتە (مەیدانی ئەسپسواری)، (hippopotamus) واتە (ئەسپی ئاوی) کە لە ئینگلیزیشدا بەکاردێت، (açvás) سانسکریتی و (eoh)ی ئینگلیزی کۆنیشی هەر لەو ڕەگەوە لێکەوتۆتەوە، بەڵام لە زمانە ئەوروپاییە نوێکاندا، ئەمڕۆ لە ناونانی ئەو گیاندارەدا، لەکار کەوتووە و ئەویش دیارە دوای ئەوەی کە وشەی تر و لەڕەگی تر، جێی گرتۆتەوە، لە ئینگلیزیی ئەمڕۆدا (horse) لەدایکبووی (khorsam*)، یا (khorsaz)ە کە لە جەرمەنی پێش مێژوودا بە (ئەسپ) وتراوە. (جان ایتو، ١٣٨٦: ٦٣٢).

**١-١-٢: دووەم ڕێگا:**

بەکەڵك وەرگرتن لەو لێکۆڵینەوانەی لە زمانناسیی ڕۆژهەڵاتیدا بەزمانی فارسی دەربارەی ئێتمۆلۆژی وشەی (اسب و اسپ) یان تیادا کراوە:

(علی أکبر دهخدا) وشەی (اسب)ی فارسی لەڕووی ڕەچەڵەکەوە بەناوی ئەو گیاندارە لەم زمانانەدا، بەستووەتەوە: (أسپَ)ی ئاوێستایی و فارسی هەخامەنشی {(فارسی کۆن)– نووسەر}، (أسپا)، یا (أسَپی)یش بەمێینەکەی، واتە (ماین)، وتراوە، (أسوَ)ەی سانسکریتی، (اکوئوس)ی لاتینی. وشەی (سوار)یش لە فارسیدا، سازبووی وشەی (اسپ باری) فارسی هەخامەنشییە (علی أکبر دهخدا، ١٣٧٧، ٢٠٢١).

بە بۆچوونی (پورداۆد)، ئەمڕۆ ئەو ناوەی کە لەو گیاندارە، نراوە، هەر ئەوە بووە کە ئارییەکان، چەند هەزار ساڵ پێش ئێستا بەو ناوەوە بۆ نموونە لەم زمانانەدا، بانگیان کردووە: لە ئاوێستا و فارسیی کۆندا، نێرەکەی بە ئەسپە (aspa)، مێیەکەشی بە: ئەسپا (aspâ)، یا ئەسپی (aspî). لە سانسکریتیدا بە: ئەسڤە (asva). لە لاتینیشدا بە: (equus).

(پورداۆد) ڕای هەندێ لە زانایانی خستۆتەڕوو کە پێیان وایە، وشەی (اسب) سەرچاوەکەی: {(اك) ak (=اس as)}ی ئاریاییییە کە واتاکەی (تیژڕەو)ی گەیاندووە. بۆ بەرچاوڕوونیی زیاتر، ئەم نموونانەشی هێناوەتەوە کە بە بەشداری ئەو ڕەگە سازێنراون: لە ئاوێستادا: آسواسب (âsuaspa) واتە (خاوەن ئەسپی توندڕەو). کە لە سانسکریتیشدا: آسواسو (asuasva) بەرامبەرێتی، وشەی (آهو)ی فارسی و (آهوك)ی پەهلەویش لە ئاوەڵناوی آسو (âsu) کە لە ئاوێستا و سانسکریتیشدا، واتای تیژ و چستو چالاك و توند و خێرای بەخشیوە، پێکهاتووە. لە ئاوەڵناوی (آسو)دا، (س<ه)و گۆڕینی دەنگی (س)یش، بە (ه) لە زمانە ئارییەکاندا، زۆر بەرچاو دەکەوێت.

دواتر، (پورداۆد) ڕیشەی (سوار)ی فارسی بردووەتەوە سەر وشەی: (ئەسپەباری aspabâri) کۆن و ئاماژەشی بۆ ئەو نووسینە سەر بەردەی زەمانی (سارگۆن)ی پاشای ئاشووری کردووە کە ناوی پاشای میدیای: (ئیسپەبارە Ispabâra)ی لەسەر هەڵکەندراوە. بە ڕای ئەو ڕیشەی بەشی دووەمی ئەو ناوە میدیاییە کە (بەرە bara)یە و بە فارسی (برنده) دەگەیەنێت بەوە دەوترێت کە کەسێك، یان شتێك لە شوێنێکەوە بەرێت بۆ شوێنێکی تر، سەرچاوەی ئەو (بەرە)یەش، (بەر bar) واتە (بردن)ە.( ابراهیم پورداۆد، ١٣٨٦، ٢٢٢، ٢٢٣).

(مەنوچەهر اریان پورکاشانی)یش، ڕیشەی وشەی (اسب) فارسی لە بنجدا، بردووەتەوە سەر ڕەگی (EKOWOS*)ی هندوئەورووپایی کە دوای گۆڕانی فۆنەتیکیی ناوی گیانداری ئەسپی پێلێنراوە، وەك لە: (-ASPĀ)ی ئاوێستای، (-ASA-, AS)ی فارسیی کۆن، (ASP)ی پەهلەوی، (YĀSP, JÄFS)ی ئاسی، (HESP)ی کوردی، (ĀS, AS)ی ئەفغانی (پوشتو)، (ĀSVAS, ĀSVAH)ی سانسکریتی، (IPPOS, HIPPOS)ی گریکی، (EQUUS)ی لاتینی، (ĒSH, ASPō)ی

ئەرمەنی، (EOH)ی ئینگلیزیی كۆن، (-ASPA, EHU)ی ساكسـۆنیی كـۆن، (EPō)ی گالی[٤]، (IAPĀ)ی ڕۆمانی.( منوچهر اریان پورکاشانی، ١٣٨٤، ٨٤).

به وردكردنەوەی سـەرجەمی ئـەو زانیارییانـە كـە بـەهۆی ئـەو دوو ڕێگایـەی لـەپێناو زەمینـە خۆشـكردن بـۆ گەیشـتن بـە بـنج و بنـاوان و ڕەچـەڵەكی، یـا ئێتمۆلۆژی وشەی (ئەسپ) لە زمانە هندوئەوروپاییـە كـۆن و نوێكانـدا، گرتماننـە بەر، دەستمان كەوتن، بێ سڵكردنەوە دەتوانین بڵێین:

آ – ڕەگی (EKOWOS*) لەناو ئەو زمانانەدا كە واتای (توند، خێـرا، تیـژ، یـا تیژڕەو)ی بەخشیوە، بیری سەرەكی و نیشانەی زەق و بەرچاوی خەڵكی بووە، لە هەڵبژاردنیاندا بۆ ناونانی ئەو گیاندارە، واتە (ئەسپ).

ب– بەگۆڕانی فۆنەتیكیی ئەو ڕەگە كۆنە بووە بە: (اك ak)و دواتـریش بـووە بە (اس as)، هەر لـەم ڕەگـەوە چـەندین وشـەی تـری وەك: ئێسـتر، ئاسـك، سـوار و..... هی تریش سازێنراون.

پ– ناوی گیانداری (ئەسـپ) كـە لەسـەر بناغـەی ڕەگـی (ak>as) نـراوە، لـە زمانـە ئەوروپاییـە نوێكانـدا، بەگشـتی لـەكار كـەوتووە، ئـەوەش، دیـارە دوای پەیدابوونی (سینۆنیم) كە جێی پێ‌لەق كردووە و دواتـر كـەناری خسـتووە، بـەڵام لەزمانە ئێرانییە كۆن و نوێكاندا، ناوی ئەو گیانـدارە لەسـەر بناغـەی ئـەو ڕەگـەی سەرەوە، تا ئەمڕۆ سەرسەختانە ڕێگای بەسینۆنیمی تر، نەداوە جێـی بگرێتـەوە، بەڵام لە گرووپی زمانە هیندییەكاندا، وشەی (گهۆتەكە) لـە سانسـكریتیدا، بەسـەر ئەو وشانەی كە لەسەر بناغەی ڕەگی (as) ناویان لەو گیاندارە نابوو، زاڵ بووە.

**١–٢: یەكلاییكردنـــەوەی ئێتمۆلـــۆژی و شـــیكردنەوەی مۆرفۆلۆژییانـــەی (ئەسپ) لە زمانی كوردیدا:**

تائێستا بەو ڕاستییە گەیشتین كە وشەی (ئەسپ)ی كـوردی و ڤەریانتـەكانی لە هاوگرووپەكەیدا، كردەی ڕەگی (ئەس)ن، كاتێك، گوێمان لەم وشـەیە، دەبێـت، لەپێشەوە هەست بە بوونی ڕەگی (ئەس as)، وەك بناغەی پێكهێنانی دەكەین كـە سەرەتای وشەكەی گرتووە و زۆر بەچاكیش، هەست بەدەنگی (پ p)یش دەكـەین كە كەوتۆتە كۆتایی وشەكەوە. ئەم دەنگە واتە (پ)، یەكێكـە لـە پێكهێنـەرەكانی

وشەی (ئەسپ)و بە هیچ جۆرێك و لەهیچ جێ و شوێن و لە هەموو بارودۆخ و بەكارهێنانیدا، بەشێكی جێگیری وشەكەیە و ناكرێ دەستی لێ هەڵبگیرێت.

لە زمانناسیی ئەوروپایی و ئێرانیشدا، ئەوەندەی ئێمە ئاگاداربین تاكو ئێستا شیكردنەوەی مۆرفۆلۆژی مێژوویی ورد، دەربارەی ئێتمۆلۆژی وشەی (ئەسپ) و هاوڤەریانتەكانی لە زمانە هاوگرووپەكانیدا، نەبینراوە. لەو سەرچاوانەشدا كە بنجی وشەی (ئەسپ) لێكدرابێتەوە، تەنیا ئاماژەیان بە دەوری مۆرفێمی (ئەس) لە سازكردنیدا، كردووە كە دەربڕی واتای (خێرا، توند، تیژ) بووە. لەڕووی مۆرفۆلۆژی مێژووییەوە، دەشێت، ڕەگی (ئەس) لەو وشەیەدا، وەك مۆرفێمێك لێی جیابكەینەوە، بەڵام بەپێی لۆگیك و یاساكانی سازكردنی وشەی تازە لە زمانە هندوئەوروپاییە كۆن و نوێیەكاندا، ئەو ڕەگە دەربڕی ئەو نیشانە زەق و بەرچاو و سەرنجڕاكێشە بووە كە خەڵكی لەو گیاندارەدا، هەستیان پێكردووە، هەر ئەو بیركردنەوەیەش، لە ناونانیدا، بووە بە بناغە.

ئەو سیفەتەش كە لە ئەندامێكی لەشی ئەو گیاندارەدا، بەدییان كردووە جێبەجێكەری ئەو (خێرایی و تیژی)یە بووە، كەواتە (ئەس) حسابی ئاوەڵناوێكی كوالیتی لە بەشداربوونی سازكردنی وشەی (ئەسپ)دا، بۆ دەكرێت كە درابێتە پاڵ، ئەو ئەندامەی.

ئێمە لەم لێكۆڵنەوەیەدا، هەوڵ دەدەین، دەست بخەینە سەر ڕیشەی ئەو ئەندامەی كە لە وشەی (ئەسپ)دا بەمۆرفێمێك، نوێنراوە. بۆ گەیشتن بەو ئەنجامەش، دەگەڕێینەوە بۆ ئەو یاسایانەی كە لەمێژووی سازكردنی وشەی نوێ لە زمانە هندوئەوروپاییەكاندا تا ئەمڕۆ پەیڕەوی دەكرێن.

یەكێك لەوانەی كە ناو، یا ئاوەڵناوی پێ سازێنراوە، بریتییە لە مۆدێلی: (ئاوەڵناو+ناو)، واتە (N+A< ناو، یا ئاوەڵناوێكی نوێ لە فەرهەنگی زمانە هندوئەوروپاییە كۆن و نوێیەكاندا، چەندەها نموونەی ناو، یا ئاوەڵناومان لەبەر دەستدایە كە بە گوێرەی ئەو یاسایە، پێكهێنراون، وەك:

لە فارسیی ناوەڕاستدا: (vēh-dēn) واتە: (چاكدین) كە لە {(vēh= چاك)}+{(dēn = دین)} پێكهاتووە، {a£ān(ئەذان) = گێل} + mart (پیاو) دروست كراوە.( ڤ. س. ڕەستەرگۆیڤا، ١٩٦٦، ٣٨).

لە پەهلەویی ئاشكانیدا: (pūrmāh) واتە (مانگ كە لە ئاسماندا، تەواو خڕە) كە لە {(māh) مانگ +(pūr) تەواو} سازێنراوە.( حسن رضایی باغ بیدی، ١٣٨٨: ١٠٤).

لە زمانی فارسیی نوێدا: نوروز، پیرزن، سفیدرود (ع. خیامپور، ١٣٨٩: ٣٩) هەر لە فارسیدا، وشەی (بادپا) بەكینایە، یا ئیدیۆم بە (ئەسپ) دەوترێت. دەربارەی ئەم وشە فارسییە، (حسن عمید) نووسیویەتی: (بادپا—ك. تندرو، تیزرفتار، تیزتك. بیشتر دربارهء اسب میگویند) (حسن عمید، ١٣٤٣: ١٦٤) ئەم وشە فارسییە لە: (باد(با)+پا(پا،یا پێ)، پێكهاتووە. وشەی (باد) لێرەدا بەواتای (خێرا) بەكارهێنراوە.

لە كوردیدا، دەشێت وشەی (باپێ، یا خێراپێ) بەرامبەر (بادپا)ی فارسی ڕابگرین، چونكە وشەی (با) لە كوردیشدا، بەو هەوایە دەوترێت كە توند، یا خێرا هەڵدەكات.(٥)

(ئۆ. د. میشیكۆڤ) لەناوبردنی ئەو یاسایانەی كە لە زمانی ئینگلزیی ئەمڕۆدا بۆ سازكردنی وشەی نوێ سوودیان لێ وەردەگرین، ئاماژەی بە مۆدێلی: (A+N) كردووە، ڕاشی وایە كە ئەم چەشنە مۆدێلە لە سینتاكسەوە داكەوتووە بۆ وشەسازی، چەند نموونەیەكیشی لەسەر هێناوەتەوە، لەوانە: ( blueprint, hotbed, freshman, busybody)( ئۆ. د. میشیكۆف، ١٩٧٦: ٢٢٢، ٢٢٣).

لە زمانی كوردیشدا، هەروەك زمانە هاوگرووپەكانی، دەكرێت چەندین وشە كە مۆدێلی (N+A) پێكهێنراون بە نموونە بهێنینەوە: ڕەشمار، خۆشاو، تاڵاو، گەرماو، سارداو، زەردالّوو، گەورەدێ،... هی تریش. ئێستایش، لە خشتەیەكدا، ناوی (ئەسپ) لە هەندێ زمانی ئەوروپایی كە گومانی تێدا، نییە كاتی خۆیان بە مۆدێلی (A+N) دروست كراون بە نموونە دەهێنینەوە و وشەی (پێ) بەفۆڕمی جیاواز كە هەر هەموویان زادەی ڕەگی هندوئەوروپایی: ( *PED, *PĔD, *POD, *PōD, *PōT)ن بەرامبەریان ڕادەگرین كە بەڕوونی هەست بە بوونیان تاكو ئێستا لەو زمانانەدا كە ئێمە هێڵمان بەژێردا هێناون دەكرێت.

| زمان | ئەسپ | پێ |
|---|---|---|
| گرێکی | IPPOS, HIPPOS | POÛS, PODÓS(٦) |
| لاتینی | EQUUS | PÉS, PEDIS |
| ڕۆمانی | IAPĀ | PICIOR(٧) |

دوای ئەوەی لەڕووی مۆرفۆلۆژیی مێژوویی و ئێتمۆلۆژییەوە، ناوی گیانداری ئەسپمان لە چەند زمانێکی هندو ئەوروپاییدا، نیشان دا، دەتوانین بڵێین:

١- وشەی (ئەسپ) لە ئەنجامی لەیەکدانی ئاوەڵناوە و ناو بەمۆدێلی (ئاوەڵناو + ناو) پێکهێنراوە.

٢- یەکەم کۆمپانێت، مۆرفێمی (ئەس as)ە کە ئاوەڵناوە و بەخشەری واتای (خێرا، توند، تیژ)ە و لەڕووی ئێتمۆلۆژیشەوە بەم شێوە هاتۆتە ئاراوە:(əs <as<ak<*EKWOS).

دووەم کۆمپانێت بە دەنگی (پ P) خۆی دەنوێنێت کە پاشماوە و کورتکراوەی گۆڕانی فۆنەتیکیی مۆرفێمی (پێ)یە.

**دووەم بەش:**

٢-١: تایبەتێتی لێکسیکی چەند بەرهەمێکی زادەی ڕەگی (ئەس as)و دەوریان لە گەشەپێدانی فەرهەنگی زمانی کوردیدا (ئەسپ، سوار، ئێستر، ئاسك).

لە فەرهەنگی زمانە هندوئەوروپاییەکاندا بەگشتی و لە هندوئێرانییەکان بەتایبەتی و لەناو ئەوانیشدا، زیاتر لە گرووپی ئێرانییە کۆن و نوێیەکاندا، چەندین وشەی کۆنەساڵە لە زمانی قسەکردن و زمانی ئەدەبی، چ بە تەنیا و چ لەشێوەی وشەی لێکدراو و دارێژراو و فرێزی چەسپاو و بەواتای ڕاستەوخۆ یا لە چوارچێوەی ئیدیۆم و پەندا کە هەموویان زادەی ڕەگی (ئەس as)و ڤەریانتەکانی ئەون و بەخۆیان و بەرهەمەکانیانەوە کە لێیان کەوتوونەتەوە چست و چالاکانە تا ئەمڕۆ بەپلەی جیاواز، کاردەکەن، بەدی دەکرێن.

بەرهەمەکانی زادەی ڕەگی (ئەس as) زۆرن، بەڵام لەناویاندا لە زمانی کوردیدا وشەی (ئەسپ)و (سوار) لەپلەی یەکەمدانو دواتر ئەوانی تر دەچنە ڕیزەوە، هەربۆیە ئێمە لەم بەشەدا لەبەر سنووردارییی باسەکە ناتوانین وردەکارانە

تیشـك لـە تایبـەتێتی هـەموویان بـدەین، بـەڵكو بـەگوێرەی بـەرزو نزمیـی پلـەی بەرهەمدارییان و ئەكتیڤی و چست و چالاكییان، تەنیا لە (٤)یان دەدوێین لـەپێش هەمووشـیانەوە لــە (ئەسـپ)ەوە دەسـت پێدەكـەین، چـونكە باسـەكەمان تەرخانكراوە بۆ ئەو و هەر لەڕێی گوزەر بەودا، لامان لەو سیانەی تر كردووەتەوە، ئـەگینا لـەناو ئـەو چـوارەدا، ئـەمڕۆ (سـوار) لـەوانیتر، بەرهـەمی زۆرتـرە، بـەڵام لەبەرئـەوەی لـەڕووی ئێتمۆلۆژییـەوە، داكەوتـەی وشـەی (ئەسـپ)ە، بۆیـە هـەر لەوەوە دەستیان دەدەینێ:

**٢-١-١: ئەسپ:**

لە یەكەم بەشی ئەم باسـەدا، ئێتمۆلـۆژی و پێكهاتـەی مۆرفۆلـۆژی مێـژوویی وشەی (ئەسپ) خرانەڕوو. بۆیە جارێكی تر، ناچینەوە سەریان، بـەڵام لەئـەنجامی ئـەم لێكۆڵینەوەیـەدا، چـەند زانیارییـەكی گرنگـی نوێمـان لـە تایبەتێتییـە لێكسـیكییەكانی وشـەی (ئەسـپ) چـەنگ كـەوتوون كـە تـاكو ئێسـتا لەمێـژووی لێكسیكۆلۆژیی كوردیدا بەشاراوەیی ماونەتەوە و ئێمە لەم باسەدا بـۆ یەكـەم جـار دەیانچەسپێنین و پەردەیان لەسەر لادەدەین:

١- یەكێك لە عەشیرەتە گەورە و بەناوبانگەكانی كورد عەشیرەتی (ئاكۆ)یە، كە لە سەرووی ڕانیە و بەدیاریكراوی لەم دیو و ئەودیوی (كێـوەڕەش) تـا دەگاتـە سنووری (وەرتێ) نیشتەجێن و گوندی (ئاكۆیان) كە لـە ڕووی مۆرفۆلۆژییـەوە لـە {(ئاكۆ+(-یان) سۆفیكسی ناوی جێ} پێكهاتووە، دەشێ سەردەمانێك سەنتەری شوێنی ژیانی ئەو عەشیرەتە بووبێت. كە ئێستا خەریكی كشتوكاڵ و بەخێوكردنی مەڕوماڵاتن، بەڵام بەدرێـژایی مێـژوو بـەئازا و جەسـووری و سوارچـاكی بـەناوبانگ بـوون و تـا ئـەمڕۆ لەلایـەن سـەرۆكەكانیانەوە بـەخێوكردنی (ئەسـپ) و بایەخـدان بەخزمەتكردن و ڕاگرتن و سوارچاكی، هەروەك سـەردەمانی پێشـوو، بەشـێكە لـە ژیانیان و فەرامۆشیان نەكردووە.(٨)

بـەڕای ئێمـە، وشـەی (ئـاكۆ) كـە ئـەم عەشـیرەتە لـەخۆیان نـاوە، ڕەگ و ڕیشـەیەكی قـووڵی مێـژوویی هەیـە و ڕاستەوڕاسـت دەچـێتەوە سـەر ڕەگـی: (EKWOS*)ی هندو ئەوروپایی كە بە (ئەسپ) وتراوە، گومانمان لـەوەدا نییـە كـە

لە كۆندا، ئەم عەشیرەتە لە مەیدانی بەخێوكردنی ئەسپ و سوارچاكیدا، زۆر بەناوبانگ بوون، بۆیە بەو ناوەوە ناونراون.

ناونانی خێڵ و عەشیرەت لە كۆندا بەناوی ئاژەڵێكی دیاریكراوەوە، نەریتێكی ئاسایی و باو بووە و نیشانە بووە بۆ ئەو خێڵە كە لە بواری بەخێوكردن و بایەخدان بەگیانداریكی تایبەتی بە بەراورد لەگەڵ خێڵ و عەشیرەتەكانی تردا، جێگایەكی بەرچاویان، هەبووە.

ئێستا بەدڵنیایی و بێ تارمایی، دەتوانین ئەو ڕاستییە لە لێكسیكۆلۆژی كوردیدا، بچەسپێنین كە لەزمانی كوردیدا، وشەی (ئاكۆ) پێش وشەی (ئەسپ) كە ئەمیش، هەر داكەوتەی (ئاكۆ)یە، بەكارهێنراوە، بەڵام لەئەنجامی ململانێیاندا، لە فەرهەنگی زماندا، فۆڕمە تازە و نوێیەكە كە (ئەسپ)ە، بەسەر فۆڕمە كۆنەكەدا كە (ئاكۆ) بووە، زاڵ بووە و لە زمانی كوردیدا (ئاكۆ) بە قەتیسماوی تەنیا لە ناوی ئەو عەشیرەتەدا، ماوە.

٢- پێشتر لەم باسەدا، ئاماژەمان بۆ ئەوە كرد كە لە دوا ساڵانی زمانی سانسكریتیدا، وشەی (-ghoṭaka گهۆتەكە) تەنگی بە وشەی (-as'va ئەسڤە) كە بە (ئەسپ) وتراوە، هەڵچنیوە و دواتر كەناری خستووە. (بارۆ، ١٩٧٦: ٣٤٩).

لە زمانی كوردی بەدیاریكراوی لە دیالێكتی خواروو بەتایبەتیش لە نیمچە دیالێكتی سلێمانیدا، یەكێك لە یارییە فۆلكلۆرییەكان ناوی (یەكەوگۆتەكە)یە. ئەم یارییە لە عەرەبیدا (سنبلة السنبلة)ی پێ دەوترێت لە ئینگلیزیشدا بە (Leap Frog) ناودەبرێت، لەم یارییەدا یەكێك خۆی دەچەمێنێتەوە و ڕیزێكیش، دێن و باز بەسەر پشتیدا دەدەن كە دەبێت قاچیان بەر پشتی ئەو نەكەوێت، ئەگینا بەدۆڕاو دادەنرێت.

بە ڕای ئێمە، ئەو كەسەی كە چەماوەتەوە لە شێوەدا بە (ئەسپ) شوبهێنراوە كە دیارە لەو زەمانەدا: (گۆتەكە)ی پێ وتراوە. بەدڵنیاییەوە، وشەی (گهۆتەكە)ی سانسكریتی و (گۆتەكە)ی كوردی لە بنجدا، دوو فۆڕمی یەك وشەن و ڕیشەیان یەكە.

مانەوەی وشەی (گۆتەكە) بە قەتیسماوی لە دیالێكتی خواروو و تەنیا لەناوی ئەو یارییە فۆلكۆرییەدا، بەڵگە و نیشانەیە بۆ ئەوەی كە سەردەمانێك،

وەك سینۆنیم، (گۆتەكە) بەربەرەكانی (ئەسپ)ی كردووە، بەلام لە خەباتی مانەوەیدا، نەیتوانیوە جێی بگرێتەوە.

لە بواری پێكهاتەی زمانیی هەمەجۆردا، وشەی (ئەسپ) بەشدارییەكی بەرچاوی كردووە، وەك لە: وشەی لێكدراو: ئەسپسوار، ئەسپەكوێت، ئەسپەشێ، ئەسپەئاسنینە، ئەسپەدارینە،

وشەی داڕێژراو: ئەسپسواری، فرێزی چەسپاو: (ئەسپی عەرەبانە) و هی تریش.

وشەی (ئەسپ)، بەشداری لە پێكهێنانی پەندیشدا، كردووە، وەك:

ئەسپ بەڕاكردن ئالیكی خۆی زیاد ئەكا.

ئەسپ پێیەكی ڕەنجە پێیەكی گەنجە.

ئەسپ لەژێر كورتان، كەر لەژێر زین.

ئەسپی لەڕ لە تەویلەیەكی پڕ لە كەر چاكترە.( شیخ محەمەدی خاڵ، ۲۰۰۷: ۲۵، ۲٦).

لە ئەدەبیاتی ڕۆژهەلاتی و كوردیشدا، وشەی (ئەسپ) جێیەكی تایبەتی، چ بەواتای ڕاستەوخۆی، یا وەك ئیدیۆم كە بەم چەشنەی زیاتر، بەرچاو دەكەوێت، بەكارهێنراوە، وەك:

وەها هەستا بە باڵی جاذیبەی قودرەت، لە نـــــیوەی ڕێ
بەجێ ما ئەسپ و پەیك و ڕفرەف و ئەم چەرخی دەورانە (نالی ٥١٤)

بەجێما (نالی) وەك نالێ، بەپاش كەوت كوردی وەك گەردی
كە (حاجی) غاردا ئەسپی لە مەیدانی سوخەندانی (حاجی قادری كۆیی ۱۷۳)

هەموو جل گۆڕیو، سەروڕیش تاشیـــو
لە ئەسپ درابوو ڕەخت و ڕەشوەی زیو (گۆران ۱٤۷)

### ٢-١-٢: سـوار:

یەكێكـە لـە وشـە كۆنەسـاڵە ئـەكتیڤ و بـە بەرهەمـەكانی زمـانی كـوردی و هاوبەشە لەنێوان چەندین زمانی ئێرانیی كۆن و نوێدا. لـە پەهلەویـدا: (asbār)و لـە فارسیشدا (سوار)ە.(محمد معـین، ١٣٨١: ٦٥٧) ئێتمۆلـۆژی (سـوار)ی فارسـی لـە یەكەم بەشی ئەم باسەدا، ڕەگو ڕیشەی بە وشەی (ئەسپەباری aspabâr)ی فارسی كۆنەوە، گرێدراوەتەوە.

بە ڕای ئێمە، دەشێت ئێتمۆلۆژی وشـەی (سـوار)ی كـوردیش، وەك سـەدەها وشەی هاوبەشی تر، سەرچاوەی ڕەگو ڕیشەكەی لەگەڵ ئەو وشە فارسییە كۆنەدا كە هەر بەهەمان واتا تاكو ئێستا بەكاردێت، لەیەك بدرێت.

لەڕووی پێكهاتنی مۆرفۆلۆژییەوە، ئەمڕۆ بە یەك مۆرفێمی سەربەخۆ تەماشـا دەكرێـت، بـەڵام لەبنجـدا، وەك دەركـەوتووە، زادەی لەیەكـدانی دوو مـۆرفێمی سەربەخۆیە و وەك هەموو وشەیەكی تر بەر گۆڕانی فۆنـەتیكی و ئێكۆنـۆمی زمـان كەوتووە و وەك نیشانی دەدەین، بەفۆڕمی (سوار) لە فەرهەنگدا، جێگربووە:

asp + bar > əsbar > əswar >s6war

لـەڕووی واتـاوە، وشـەی (سـوار) گـۆڕانێكی سـەرنجڕاكێش و گرنگـی لـە فراوانبوونی واتاكەیدا، بەسەرهاتووە. یەكەم جار و لە سەرەتادا (سوار) تـەنیا بـۆ ئـەو كـەس و شـتانە بـەكارهێنراوە كـە بـەهۆی ئەسـپەوە لەجێیەكـەوە بـرابن بـۆ جێیەكی تر، بەڵام بەرە بەرە بۆ هەموو ئەو گیاندارانەی تـریش كـە هـەمان دەوری (ئەسـپ) دەبیـنن بـەكارهێنراوە، بۆنموونـە: كاتێـك دەوترێـت: (بەسـواری ئەسـپ چـووین.) دەشـێت بوترێـت: (بەسـواری مـاین، ئێسـتر، كـەر، چـووین) ئـەنجا پەڕیوەتەوە بۆ ئەو هـۆ (وەسـیلە و ئالەت)یـەی كـە كـەس و شـت دەگوێزێتـەوە، وەك: بەسواری ئوتومبیل، یا پاسكیل، یا تەراكتۆر، یا كەشتی، یا بەلەم، یا فڕۆكە هاتین.

لـە وشـەی (سـوار) نـاوی ڕووداوی: (سـواركردن، سـواربوون) سـازێنراون، ئەمانیش، دیسـانەوە لەگـەڵ (ئەسـپ)و گیانـدار و ئالەتـەكانی تریشـدا، وەك یـەك بەكاردێن، بۆ نموونە:

دەوترێت: سواری ئەسپیان كرد.

دەشێت بوترێت: سواری (ماین، ئێستر، كەر، ئۆتۆمبیل)یان كرد.

دەوترێت: سواری ئەسپ دەبم.

دەشێت بوترێت: سواری (ماین، ئێستر، كەر، ئۆتۆمبیل) دەبم.

پێكهاتە زمانییەكانی كە بە بەشداری (سوار) دروست كراون، هەمەجۆرن لەوانە:

وشەی لێكدراو: ئەسپسوار، ئێسترسوار، پاسكیلسوار، سوارچاك، سوارخاس، شۆڕەسوار، سواركردن، سواربوون و .......هی تریش.

وشەی داڕێژراو: سواری، سوارە

فرێزی چەسپاو: پۆلیسی سوارە، تاوڵەی سواری، دوانزە سوارەی مەریوان، سوارەی شەترەنج.

لە چوارچێوەی ئیدیۆمدا: ڕزقی سوارە، من سوار و تۆ پیادە، سواری ملی بووە، بەزۆر سواری ئەو ئیشە بووە، داشی سوارە، سوار لەسەر زین دێنێتە خوار.

لە چوارچێوەی ئەدەبدا:

زابیتەی تەبعم سوارە، ئیدیعای شاهی هەیـــــە
موحتەشەم دیوانە، داوای تەختی خاقانی دەكا (نالی ١٠٢)

كوانێ سوارەی ڕم وەشێنم بۆ لە تیپا دەرچوون
داخی داخانم وەتەن ئەولادەكانت نووستوون (قانع ٢٥٠)

### ٢-١-٣: ئێستر:

لە زمانی كوردیدا بە: (هێستر، هێسر، قاتر)یش، ناودەبرێت. ناوی ئەم گیاندارە لەم زمانە هندوئێرانییە كۆن و نوێیانەدا، بەم شێوەیە خراونەتە ڕوو:

فارسیی كۆن: (-asa-tara*)، واتە لە یەك لاوە (ئەسپ)ە، چونكە لە ئاوێستا وشەكانی (tarə, taro) لا (تەرەف) دەگەیەنن{(لێرەدا مەبەست ئەوەیە ئەم گیاندارە لە باوكەوە كەرە و لە دایكەوە ماینە) نووسەر}

لە فارسیی ناوەڕاستدا: (astar)ە، لە سانسكریتیدا: (-as'vatará)ە، لە خوارزمیدا: (spdyr)، لە بەلوچیدا: (hastal, istal)، لە كوردیدا: (histir, istîr)، لە فارسیدا: (استر)ە.( محمد حسن دوست، ١٣٨٣: ٨٩، ٩٠).

وشـەی (ئێسـتر)یش كـە ئـەمڕۆ بەیـەك مـۆرفێم دادەنرێـت لـە ئەسـڵدا، وەك دەبینین لە مۆرفێمی {ئەسپ + تەر (لا، تەرەف)} پێكهاتووە. وشـەی (قـاتر)یش كە وا دەزانرێت بەئەسڵ توركی بێت بەدڵنیاییـیـەوە، دەتـوانین بڵـێین كـە لەبنجـدا ڕەگو ڕیشەكەی توركی نییە، بەڵكو بەم شێوەیە دروست بووە كە بۆ یەكەم جارە لەم باسەدا، ئێمە بۆ ئێتیمۆلۆژییەكەی چووین:

{خـەر (xar)+ تـەر (tar)} > خەرتـەر (xartar) دەنگـی (خ x) لـە وشـەی (خەر)دا كە فۆڕمی پێشووی وشەی (كەر)ە، لە كوردیدا گۆڕاوە بە (كـ k).

گۆڕینی (خ<ك) لە زمانە ئێرانییەكاندا، وەك لەم چـەند نموونەیـەدا، نیشـانی دەدەین، ئاسایی بووە:

لەفارسیدا: نارخوك = ناركوك (واتە ئەفیۆن، یا تریاك)

خرنا = كرنا (ئالەتێكی مۆسیقاییە)

خمان = كمان (كەوان) [٩]

لــە كوردیشــدا: (خــەنین > كــەنین) بەپێچەوانەشــەوە، ڕووی داوە، وەك (كەندەك > خەندەق).

گۆڕینی دەنگی {(ك k) > (ق Q)} دیسـانەوە هـەر ئاسـایی بـووە، هـەروەك لەم وشانەدا، ڕوویان داوە: كین >قین، كالب > قالب (لە نیمچە دیالێكتی هەولێردا بووە بە (قەلب)، هەڵكەندن > هەڵقەندن.

وشەی (خەر) لە (خەرتەر)دا بووە بە (كەر) ئەمیش، بووە بە قـەر، یـا (قـار) + تەر > قارتەر > قاتر.

وەك زانیمان، وشەی (ئێستر) واتاكەی لەلایەكـەوە (ئەسـپ)ە، بـەڵام (قـاتر) واتاكەی ئەوە دەگەیەنێت كە لەلایەكەوە (كەر)ە، كە ئەویش باوكێتی.

(ئێستر) لەڕووی بەرهەمدارییەوە لە چاو (ئەسپ)و (سوار)دا، بەراورد ناكرێت لەئەدەبیاتیشدا، زۆر كەمتر بەكارهێنراوە، بۆیە تەنیا ئەم نموونەیە، دێنینەوە:

مل عەلەم، شیرین قەلەم، ئاهو شكەم، مەیموون قەدەم
سم خڕ و كلك ئێستر و مەنزل بڕ و عارەق نەڕێژ (نالی ٢٢٥)

**٢-١-٤: ئاسك:**

لەزمانی کوردیدا، جگە لەوشـەی (ئاسـك) بـەم وشـانەش: (جـەیران، کـەژاڵ، مامز) و لە ئەدەبیشدا بەتایبەتی لە دیالێکتی خواروو و لە ئـەدەبی کلاسـیکدا، بـە وشەی (ئاهو)ش، ناو لەم گیاندارە، نراوە. لە یەکەم بەشی ئەم باسەدا، ئاماژە بـۆ ئەوە، کرا کە لە زمانی ئاوێستا و سانسکریتیدا: (ئاسو āsu) ئاوەڵناو بووە و واتای (خێراو توندو تیژ و چستو چالاکی) بەخشیوە.

دوای گـۆڕینی دەنگـی (س s) > (ﻫ h) لـە (āsu)دا، وشـەی (ئـاهو)ی لـێ پەیدابووە، کـە بەتـەنیا، یـا بـە زیـادکردنی (ـك k-) سوفیکسـی داڕێـژەری نـاوی بچووککراوە و ناسك و نازداری بەم شێوە لێ سازبووە:

ئـاهو + (ـك) > ئـاهوك (لـە پەهلەویـدا). بەتـەنیاش بـە (ئـاهو) لـەپاڵ (جەیران)و (غەزال) لە فارسیدا ناوی ئەو گیاندارە دەبرێت.

لەڕووی مۆرفۆلۆژییەوە، وشەی (ئاسك)ی کـوردی لـە ئـەنجامی {ئاسـو +(ـك)> ئاسوك > ئاسك} هاتۆتەئاراوە.

لـە (ئاسـك)یش، بـەزیادکردنی (ـۆل ol-) و (ـەك ak-) سۆفیکسـی ناسـك و نازداری بەجیاجیا لەگەڵیدا، ئەم وشانەی لێ دروست کراوە:

ئاسك + (ـۆڵ) > ئاسکۆڵ

ئاسك + (ـەك) > ئاسکە (دوای پەڕینی دەنگی (ك)ی کۆتایی سۆفیکسەکە)

(ئاسکۆڵ) و (ئاسکە)، وەك مرۆڤ ناو لە ئافرەت دەنرێن. وشەی (جەیران) کە لە فارسی و کوردیدا، سینۆنیمە بۆ (ئاسـك) بەڕەچـەڵەك تورکییـە. (محمـد معـین، ١٣٨١: ٣٩)

بـە بۆچـوونی ئێمـە وشـەی (کـەژاڵ)یش، وەك سـینۆنیمی (ئاسـك) گـۆڕاوی وشەی (غەزال)ە و وشەی (مامز)یش، دیسانەوە هەروەك، سینۆنیمێکی تر گۆڕاوی وشەی (ماعز)ە.

بـە ڕای ئێمـە تـەنیا (ئـاهو) و (ئاسـك) بـە ڕەچـەڵەك ڕیشـەکەیان، ئێـرانین، سینۆنیمەکانی تری ئەو دوو وشەیە لە زمانـەکانی دەوروپشـتەوە، هاتوونەتـە نـاو زمانی کوردییەوە و بوون بە موڵکی فەرهەنگی کوردی.

ئەوەندەی ئێمە ئاگادارین، جگەلە (ئاسكۆڵ)و (ئاسكە)و لە وشەی لێكدراوی (كانی ئاسكان) زیاتر، بەرهەمی ترمان نەكەوتۆتە بەردەست، بەڵام لە ئەدەبدا، بەكارهێنراون، وەك:

بەطوڕڕە وەك پەڕی طاوس، بەگەردەن ئاهووە یەعنی
لەسەر ئاهوی گەردەن هەرد و حەلقەی داوە زولفەینی (نالی ٦٧٧)

ئەگەیتە كۆمەڵێ پیاوانی بەردەمی مـــــــزگەوت
سڵێك ئەكەی وەكو ئاسك لە سێبەری ئەشكەوت (گۆران ٦٠)

لە ڕێگەی كنەكردن و ساغكردنەوەی ئێتمۆلۆژیی وشەی (ئەسپ)ەوە، هەر لەم باسەدا، دەست خراوەتە سەر ڕەگو ڕیشەی ئەم وشانەش:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ئاهو | ئاسك | ئاسكە | ئاسكۆڵ | ئاكۆ |
| ئێستر | پوز | جەیران | خەندەق | سوار |
| گۆتەكە | قاتر | كەژاڵ | كەر | مامز |
| ماین | جوانوو | | | |

**ئەنجام:**

١- لە زمانە هندو ئێرانییە كۆن و نوێیەكاندا، كە زمانی كوردی یەكێكە لێیان وشەی (ئەسپ) لە وشە هاوبەش و كۆنەساڵەكانی فەرهەنگی بنەڕەتیی (basic word)ی ئەو زمانانەیە.

٢- خێرایی و توندی و تیژڕەوی وەك گرنگترین و لەبەرچاوترین نیشانەی سەرنجڕاكێش لە ئەسپدا و هەستكردن و درككردن و هەر زوو پەیبردن بەنرخ و بەها و دەوری ئەو هۆ (وەسیلە) تازەیەی بەرهەمهێنان لە تەوژمدان و گۆڕین و بەرەوپێش بردنی ڕەوتی ژیان و پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان لە بنیاتنانی ناونانی ئەو گیاندارەدا، بیری سەرەكی بوون.

٣- لە زمانناسیدا، ڕیشەی (ئەسپ) براوەتە سەر ڕەگی (EKWOS*)ی هندوئەورووپایی، بەڵام لە مێژووی زمانناسیی ئێرانی بەگشتی و كوردی بەتایبەتی بۆیەكەم جار ئێتمۆلۆژی (ئەسپ)مان ساغ كردووەتەوە و گەیشتووین بەو ڕاستییەی كە ئەم وشەیە لە بنج و بنەڕەتدا بەپێی یەكێك لە یاساكانی وشەسازی پەیڕەویكراو لە زمانە هندوئەورووپاییە كۆن و نوێیەكاندا و بە مۆدێلی (ئاوەڵناو A+ ناوN) لە دوو كۆمپانێنت كە یەكێكیان ڕەگی (ئەس as)ە و ئەوەی تریان، وشەی (پێ)یە، سازكراوە.

٤- لە ڕەوتی مێژوویی وشەی (ئەسپ)دا، وشەی (گۆتەكە) وەك سینۆنیم بەرەنگاری بووەتەوە، بەڵام نەیتوانیوە جێی پێ لەق بكات، بەڵكو (گۆتەكە)ی پووكاندووەتەوە.

٥- ئەمڕۆ وشەی (سوار) كە یەكێكە لە بەرهەمەكانی ڕەگی (ئەس as) و (ئەسپ) لەڕووی پێزەوە لەگشتیان چست و چالاكترە و خاوەنی گەنجینەیەكی بەرچاوە لەپێكهاتە زمانییە هەمە جۆرەكانی فەرهەنگی كوردی.

## سەرچاوە و پەراوێزەکان:

(١) (ماین) لەڕووی ئێتمۆلۆژییەوە، دەشێت بەرامبەر بە (مادییان mādīyān)ی پەهلەوی کە (مادیان)ی فارسیشی براوەتەوە سەر، ڕابگیرێت. ئەو سێ فۆرمە ڕەگو ریشەیان یەکە و لەسەر بناغەی (mādag) واتە: (مێ) سازێنراون. بڕوانە: دیوید نیل مکنزی، فرهنگ کوچك زبان پهلوی، ترجمەء دکتر مهشید میر فخرایی، چاپ چهارم، تهران، ١٣٨٨، ص٢٩٨، ٢٩٩.

(٢) وشەی (جوانوو) لە بنجدا بەم شێوە سازبووە: {(جوان) (بەواتای یەکەمی کە گەنج و لاوە) + (–ووك) (سوفیکسی نازداری) > جوانووك > جوانوو}.

(٣) لە زمانی فارسیی ئەمڕۆدا، دوو فۆرم (اسب)و (اسپ) وەك ئەلۆمۆرفی یەکتری بەرامبەر وشەی (ئەسپ)ی کوردی بەکاردەهێنرێن، بڕوانە: ب. و. میلر، فرهنگ فارسی بروسی، مسکو، ١٩٥٠، ل٤١.

(٤) (زمانی گالی) یەکێکە لە زمانە مردووەکانی لقی (کیلتی) گرووپی زمانە هندوئەورووپاییەکان کە لە سەردەمی پەیدابوونی زمانی فەرەنسیدا، لەناوچووە. ئەم زمانە لە ناوچەی (گالی) کە کەوتۆتە سەرووی ئیتاڵیاوە لە بەلقان و ئاسیای بچووکیشدا، بەکارهێنراوە بڕوانە: – أ. أ. ریفۆرمانتسکی، سەرەتایەك لە زمانناسی، چاپی چوارەم، مۆسکۆ، ١٩٦٧، ٤١٥، ٤١٦.

(٥) (با) واتای بزووتنەوەی توندی هەوا: (بای شەماڵ)یش، دەگەیەنێت، بڕوانە: هەژار، هەمبانە بۆرینە، ل٣٧.

(٦) بە پێویستی دەزانین کە سەرنجتان بۆ ئەوە ڕابکێشین کە تاکو ئەمڕۆ لە دیالێکتی خوارووی زمانی کوردیدا، وشەی (پوز PUZ) کە لەگەڵ ئەو دوو وشە گرێکییەدا کە لە ئەسڵدا، داکەوتەی یەك ڕەگی هندوئەورووپاین و ئێستا ناوە بۆ ئەو بەشەی پێ کە (لە قولەپێوە تا ئەژنۆ)، دەگرێتەوە بەکاردەهێنرێت. گومانی تێدا، نییە کە کاتێك بووە لە کوردیشدا بە هەموو (پێ) وتراوە، جا وەك ڤەریانتێکی ڕەگە بنجییە هندوئەورووپاییەکان لەپێش، یا هاوزەمان لەتەك فۆرمی (پا>پێ)دا بۆئەندامی لەشی هەردوو جنسەکە کاری پێکراوە، بەڵام بەبۆچوونی ئێمە، دواتر سنووری ناونانەکەی تەسك بۆتەوە بۆ نێوان قولەپێ و ئەژنۆ و بەرە بەرەش لە دیالێکتی خوارودا بەتایبەتی لە نیمچە دیالێکتی سلێمانیدا، زیاتر بۆ ئافرەت بەکاردێت، بۆنموونە وشەی لێکدراوی: (پاوپوز) لەکاتی وەسفی ئەو ئەندامە لە ئافرەتدا، دەوترێت.

(٧) بڕوانە: دکتر منوچهر اریان پورکاشانی، ص١٤٨.

(٨) ئەو زانیارییانەی کە تەنیا پەیوەندییان بە ناوبانگ و شوێنی نیشتەجێبوونی ئێستای عەشیرەتی ئاکۆوە هەیە، بەسوپاسەوە بە دەمی (٢٠١٥/٧/٣) لە بەڕێز (دوکتۆر شیروان خۆشناو) وەرمان گرتووە.

(٩) بڕوانە: علی اکبر دهخدا، ج٦، ص٩٢٦٢، دکتر محمد معین، فرهنگ فارسی، ص١٠٩٠، ٨٧٣، ٨٨٥.

## ملخص البحث

هـذا البحـث بعنـوان: ( جولـة في المسـير التـأريخي لـبعض الكلمـات في اللغـة الكوردية)

و قد أجري لأول مرة بحث علمي على هذا النمط في تأريخ علـم اللغـة الإيرانيـة وعلم اللغة الكوردية، حيث سُلِّط الضوء فيه على أصـول وجـذور كلمـة (ئەسـپ = الفَرَس)، التي هـي كلمـة عتيـدة في المعجـم الأسـاس للغـة الكورديـة، وقـد أُزيـلَ عـن خصوصـياتها الدلاليّـة (السـيمانتيكية ) والصَّـرفيّة، مـا التـبس بهـا مـن الغـبش والغموض، لحين كتابة هذا البحث. وكذلك بيّن البحـث الأصـل الاشـتقاقيّ الحقيقـيّ لهذه الكلمة. وانتهج الباحث منهج البحث التاريخيّ والمقارن والوصفي في إجراء هـذا البحث اللغويّ.

يتألف هـذا البحـث مـن مقدمـة ومـدخل وفصـلين، ففـي الفصـل الأول: تنـاول أصول وجذور واشتقاق كلمة: (ئەسپ = الفَرَس)، بالبحث والتحليل والتحقيق.

وفي الفصل الثاني: تناول جميع الخصائص الصرفية والمعجمية لكلمة: (ئەسپ = الفَرَس)، وكلمات أخرى وردت على الجذر: (ئە س as).

## Abstract

This research, entitled (An overview of Historical aspects for some words of Kurdish language). It is the first time in the history of Iranian and Kurdish linguistics, such a scientific research is carried out that has thrown light on the root and basis of the word (əsip/ Horse), which is an old word in basic word of Kurdish language. with its own peculiarities and morphological aspects, reducing the writing of this research made the subject vague, but because of the writing of this would have discovered the true Etymology of this word and its assets.

When writing this paper, the researcher benefited from the method of comparative historical and descriptive research.

Research consists of introduction and two chapters:

Chapter I: finds and proves root and origin of the word (əsip) with its variants in the old and new Iranian languages.

Chapter II: All Lexical and morphological peculiarities of the word (əsip) displays with the other words that were built on the basis of the root (əs).

# بەستانداردکردنی زمانی کوردی

**كازم عەباس عەلى**

مامۆستای قوتابخانەی شادی بنەڕەتی– هەولێر

**پێشەکی:**

ئەم توێژینەوەیە بەناونیشانی (بە ستانداردکردنی زمانی کوردی)یە، هەولێکە یا بیرۆکەیەکە لە شێوەی نەخشەڕێگایەکدا بۆ بە ستانداردکردنی زمانی کوردی.

ئامانج لەم توێژینەوەیەدا ئەوەیە کە زمانی کوردیش هەروەك زمانە خاوەن ستانداردەکان بە تایبەتمەندییەکانی خۆی ڕێگەچارەی گرفتەکانی بۆ بدۆزرێتەوە تاوەکو چیتر تایبەتمەندی هیچ زمانێکی تری بەسەردا تاقی نەکرێتەوە، چونکە زمانی کوردیش هەروەك زمانەکانی تر خاوەن تایبەتمەندیی خۆیەتی، ئەو تایبەتمەندییەش بەپێی ئەو ڕێڕەوە مێژوویییە دروستبووە کە بە درێژایی ڕۆژگاری ڕابوردوو پێیدا تێپەڕیوە و کاریگەری لەسەر سووڕی گەشە و گۆڕانی زمانەکەماندا هەبووە .

ئەم توێژینەوەیە بەسەر سێ تەوەری سەرەکیدا دابەش دەبێت:

**تەوەری یەکەم**: بناغە و هۆکارەکانی بە ستانداردبوون .

**تەوەری دووەم**: پۆلێنکردنی شێوە گفتوگۆکان و دابەشکردنی شێوەزار و بنەزارەکانی زمانی کوردییە بەپێی سەردەمی پەیدابوونیان لە کۆنەوە بۆ کۆنتر و لە کۆنترەوە بۆ نوێ بەگوێرەی دەرکەوتنیان لە بەڵگە مێژووییەکان و دەستووری دروستبوونی چاوگەکان ئینجا بەپێی سەردەمەکان هەر شێوە گفتوگۆیەك بە دەور و ڕۆڵێکی زمانەوانییەوە دەبەستینەوە، شێوە کۆنترەکان وەك بناغەی وشە و بنەما ڕێزمانییەکان، شێوە نوێیەکانیش وەك دوا گۆڕان و گەشەی زمانی کوردی هەژمار دەکەین.

**تەوەری سێیەم**: نەخشەڕێگایەکە بۆ بەستانداردکردن بە بەراوردکردنی دەستەواژە و بنەما ڕێزمانییەکان لە هەردوو شێوەزاری بابانی و بۆتانی و گەڕاندنەوەی بۆ شێوەی گۆڕانی. ئینجا دەستنیشانکردنی چەند پێوەرێك بۆ

هەڵبـــژاردنی دەســـتەواژەکان و هـــەڵهێنجانی بنـــەما ڕێزمانییـــەکان لـــەکاتی بەستانداردکردندا .

لـە کۆتاییـدا لیسـتی پـەراوێز و سەرچـاوەکان و ئـەنجامی توێژینەوەکـەمان لەگەڵ پوختەی توێژینەوەکەدا بە هـەردوو زمـانی عـەرەبی و ئینگلیـزی خسـتۆتە ڕوو.

**دەروازە :**

ئەگەرچـی سـتانداردکردنی زمانـەکان لـە میکـانیزمی جێبـەجێکردن و پراکتیکـدا لـە یـەکتر دەچـن و سـوودیان لـە بەرنامـە و ڕێگەچـارەی ئاریشـەکانی یەکتریش وەرگرتووە، بەڵام لاسـاییکردنەوەی سـەدا سـەدی سـتانداردکردنی هـیچ زمانێـك پـڕ بـە پێسـتی زمـانێکی تـر نابێـت، بۆیـە دەبێـت هـەر زمانێـك بـە تایبەتمەندییەکانی خۆیەوە ئەم ڕێڕەو و شێوازەی بۆ هەڵبژێردرێت کـە دەگـونجێ و دەشێ بۆ بە ستانداردکردنی . چونکە ئەگەر بەراوردی ستانداردبوونی زمانەکان بکـەین، دەبیـنین هـەر زمانێـك زەمینـەی سـتانداردکردنی بـەپێی کاریگـەری و ڕێڕەوی مێژوویی بۆ ڕەخساوە، بۆیە شێوەی سـتانداردبوونیان لەیـەکتر جیـاوازە، بەڵام ئەوەی گرنگ بێت لـەم بابەتـەدا ئەوەیـە کـە ئەگـەر سـتانداردکردن بـە هـەر شـێوەیەك بووبێـت و ببێـت دەرئەنجامەکـەی ئـەو شـێوە زمانەیـە کـە پێیـدەڵێن ستانداردی ئەو زمانە .

**یەکەم** / زمانی کوردی بـە زۆربـوون و تێکـەڵبوونی لەگـەڵ زمانـەکانی تـر و فراوانبـوونی سـنووری نیشـتەجێبوونی، بـە تێپـەڕینی کـات و بـە کاریگەرییـە سروشتی و دەستکردەکان بەردەوام لە گەشە و گۆڕاندا بووە بۆ دەوڵەمەندکردن و گونجانی لەگەڵ پێداویستییەکانی سەردەم، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی لـەهیچ کاتێکدا گەشە و گۆڕانی ئاسایی زمانی کـوردی لـە ژێـر سـێبەری دەسـەڵاتێکی گشـتگیر و بەئاگا لەگرنگیی زماندا نەبووە، بۆیە هەروەك زمانی ئاخاوتن ماوەتـەوە، مێـژووی ڕاستەقینەی نەتەوەکانیش لەو کاتەوە دەست پێدەکات کـە نەتەوەیـەك دەوڵـەتی تایبەتی خۆی دادەمەزرێنێت [1] تا بەم هۆیەوە و لەڕێی خزمـەتکردن و خوێنـدن و نووسینی ئـەدیب و نووسـەران و دامودەزگـای دەسـەڵاتەوە قۆناغـەکانی گـۆڕان و گەشـەی لەیـەکتر جیـا ببێتـەوە و بەرنامـەی بەسـتانداردکردنی زمانەکـە بـە

بالادەستکردنی شێوەزارێك دابڕێژرێت تـا قۆنـاغی پـێش دەسـەلاتەکە وەك زمـانی کۆن بهێڵێتەوە و شێوە زمانی دەسەلات و دواتر وەك شێوە زمانی گەشەسـەندوو گۆڕاو بەدەربخات ئینجـا ئەگـەر ئـەم شـێوەزارە ئـاییني بێـت یـا گەشەسـەندووی ئەدەبی .

خەڵکی کورد لە زێد و ناوچە جۆراوجۆرەکانی ولاتەکەیاندا بەدیالێکتی جیاواز ئاخاوتوون، کوردستان بەدرێژایی سـەدان سـاڵ داگیرکـراوە، زمـانی زاڵ هەمیشـە زمانی نەتەوەی داگیرکەر، عەرەب، تورك، فارس بووە، خوێندن و خوێندەواری بە زمـانی ئـەو نەتەوانـە بـوو[٢]، هـەروەها لەبـەر ئـەوەی کـورد نـەیتوانی دەوڵـەتی سەربەخۆ و تایبەتی خۆی دابمەزرێنێ تا سەردەمێکی درەنگ زمانی کوردی نـەبوو بە زمانی نووسینی ئەدەبی و زمـانی کـوردی نـەبوو بـە زمـانێکی یـەکگرتوو، هـیچ شێوەزارێکیشی لـە هـیچ سـەردەمێکدا نـەبوو بـە زمـانی ڕەسمیـی هـیچ یـەکێ لـە میرایەتییەکانی کورد[٣].

لـە ئـەنجامی ئـەم بێدەسـەلاتییە شـێوەزارەکانی زمـانی کـوردی لـەجیاتی نزیکبوونـەوە و ئاشـنایەتی هـەردەم هـەل و هۆکـاری دوورکەوتنـەوەیان بـۆ ڕەخساوتر بووە، کە شێوەزارێکی لەسەر شێوەزارێکی تر گەشەیکردووە و گـۆڕاوە و جیابۆتەوە، ئـاخێوەری شـێوەزارەکان وەك گـۆڕانی سـەربەخۆ لـەنێو زمـانێکی سەرەکیدا بەدەرکەوتوونە، بۆیە دەبینین بەچەند شێوەزارێکی پەرتەوازە و دوور و نزیك و بێ ئاگا لەیەکتر لـە هەمانکاتـدا هەنـدێ بنـەمای ڕێزمـانی بـە تایبەتمەنـدی شێوەزارەکانیشی بۆ دروستبووە وەك جیابوونەوەی شێوەی دروسـتبوونی دۆخـی بکەری نادیاری لەنێوان کرمانجی ژووروو — خواروو .

**دووەم** / پێویسـتە ئێمـەی کـورد لـە هـەر هـەنگاوێکی چارەسـەریدا بـۆ زمانەکەمان ئەم ڕابردووە لەبەر چاو بگـرین کـە لـە کـەم زمـان و نەتـەوەی تـردا دەبینـرێ، چـونکە بـە بـەردەوامی بـەپێی سـەردەم و سـەرکەوتنی داگیرکـەران کەوتۆتە ژێر کاریگەری زمانە بالا دەستەکان، بۆیە زۆر کەلێنی تاریك و نادیـاری لێ دروستبووە هەروەها لەبەر ئەوەی هەردەم ڕووناکبیر و خوێنەر و تاکی کورد بـێ ئومێدکراون لەلایەن داگیرکەرانەوە، چونکە وا پیشاندراوە کـە زمـانی کـوردی لـە ئاست زمانی داگیرکەرەکاندا نییە، بەلام لە ڕاستیدا زمـانی کـوردی لەسـەر پلـە و پایەیەکی کۆن و ڕەسەنی زماندا دروستبووە، بۆیە بە درێژایی مێـژووی دوو هـەزار

ساڵە لەگەڵ ئەوەی بە بەردەوامی و بەبێ خزمەتکردن لەژێر کاریگەریی زمانی زاڵی داگیرکەراندا بووە لە هەمانکاتدا ئێمەی کورد بێ ئاگاش بووینە لە گرنگیی زمان کەچی هێشتا زمانەکەمان بە کەمترین کارلێکراوی و بە زیندوویی هەر ماوەتەوە .

**سێیەم** / توێژینەوە لە زمانی کوردی وەك زمانێکی جیاواز و خاوەن یاسا و ڕێسای ڕێزمانی تایبەت، بە شێوەیەکی گشتی بە سێ قۆناغی نەپچڕاودا تێپەڕیوە بە تایبەتی لە کوردستانی باشووردا، قۆناغی یەکەم لە پێش سەدەی بیستەم دەست پێدەکات تا نیوەی سەدەی بیستەم، قۆناغی دووەم لە ناوەڕاستەوە تا کۆتایی سەدەی بیستەم، قۆناغی سێیەم لەکۆتایی سەدەی بیستەمەوە.

لەئێستادا بیر و بۆچوونەکانی قۆناغی یەکەم و دووەم زیاتر وەك بناغە پشتی پێدەبەسترێت، چونکە هەندێ لە زمانەوانانی قۆناغی سێیەم وا دادەنێن کە ئەوەی لە قۆناغی یەکەم و دووەم بۆ زمانی کوردی کراوە و داندراوە لەوە زیاتر بوونی نەماوە، بەڵام لە ڕاستیدا زمانی کوردی وەك زمانێکی سەربەخۆ و خاوەن تایبەتمەندی لە قۆناغی یەکەم و دووەم زۆر بەکەمی بیری لێکراوەتەوە، بەڵکو زیاتر توێژینەوە لێی بە بەراوردی یا لاسایی زمانی عەرەبی و فارسی یا زمانی ئینگلیزی و رووسی... هتد کراوەتەوە. بەڵام بە داخەوە لە ئێستادا دووپاتکردنەوەی بیروڕا کۆنەکان ئەگەر ڕاست بێت یا هەڵە بەلای هەندێ کەسەوە بۆتە چوارچێوەیەکی داخراو، هەموو بیر و بۆچوونەکانی خۆیانی لەسەر بنیات دەنێن.

**چوارەم** / زمانی کوردی لە ئێستادا گیرۆدەی چەندین گرفتی زمانەوانی بووە بۆ بەستانداردکردن، هەندێ گرفت دروستکراوی دەستی داگیرکەران و هۆکاری مانەوەمانە بەژێر دەستی، هەندێ گرفتی تر لە ئەنجامی نەدۆزینەوەی ئەو ڕێگەچارەیە کە دەگونجێ بۆ چارەسەرکردنی ئاریشە زمانەوانییەکانمان، بە ڕای ئێمە دۆزینەوەی ئەو ڕێگە چارەیەش لە خوێندنەوەیەکی تری پۆلێنکردنی شێوە گفتوگۆکان و دابەشکردنی شێوەزارەکان بەپێی بەستانەوەیان بە سەردەمەکانەوە دەدۆزرێتەوە، چونکە ئەگەر سەیری زمانە خاوەن ستانداردەکان بکەین دەبینین کە دابەشکردنی شێوەزارەکانیان بەپێی سەردەم و لەسەر بناغەی کۆن و نوێییدا لەیەکتر جیادەکەنەوە ئینجا لەنوێترین شێوەزاریاندا بناغەی ستانداردی زمانەکانیان داڕشتووە، زمانی فارسی کۆن و ناوەڕاست و نوێی هەیە، زمانی تورکی سەردەمی عوسمانی بە کۆن و دوای دامەزراندنی کۆمار بەنوێ

هەژمار دەکەن هەروەها  ئەگەر لە ئێستادا  بەراوردی شێوەی کۆن و نـوێی زمـانی ڕووسی بکەین دەبینین لەو کاتەوەی  کە ئـەدەبی ڕووسـی لـە سـەدەی دوازدەمـدا بەدەرکەوتووە، بە چەند پارچە پەخشانێکی ناوەڕۆك  سادە و سـاکار  بـە زمـانی ڕووسی کـۆن نووسـراوەتەوە، پێویسـتی بـە وەرگێڕانـە تـا خوێنـەرە ڕووسـەکانی ئێستا تێیبگەن، زۆربەی زمانە سلاڤییەکان  و ئەوروپییەکانیش بە هەمان شـێوەن لە کاتێکدا خوێنەر و ڕۆشنبیری کورد لە دوای نزیکەی  هـەزار سـاڵ تـا ڕادەیـەکی زۆر لە چوارینەکانی بابـەتاهیری هەمـەدانی دەگـات[(٤)] کـە بەشـێوە زمـانی کـۆنی کوردی نووسراوە، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە زمانی کوردی زمانێکی سـەربەخۆ و خـاوەن یاسـا و ڕێسـای تایبەتـە، لەسـەر چـەند کۆڵەگەیـەکی پتـەو و بـە یـەکتر بەستراوەی شێوەزارەکان دروستبووە، بە بەراورد لەگـەڵ زمانـەکانی تـر کـەمترین گـۆڕانی بەسـەرداهاتووە لەگـەڵ ئـەوەی هـەردەم لـەژێر کاریگەرییـەکانی ژێـر دەستیشدا بووە .

**پێنجەم** /  تێکەڵکردنی دەستەواژە و شێوەزمانی کۆن و نوێی زمانی کوردی لە دابەشکردن و توێژینەوە زمانەوانییەکاندا، کـە ڕایەڵـەی توێژینـەوەکانی لەسـەر ڕۆنـراوە وایکـردووە، بـۆ هەنـدێ کـەس وا بەدەربکـەوێت کـە چارەسـەرکردنی ئاریشـەکان  لـە تایبەتمەنـدیی شـێوەزارەکانەوە دەگاتـە لووتکـەی ئاشـکرابوونی نهێنییـەکانی زمـانی کـوردی و ڕێگەچـارەی ئاریشـەکانی تێـدا دەدۆزرێتـەوە،  بـۆ هەندێ کەسی تر وا بەدەردەکەوێت کە توێژینـەوەکان  بـە بنبەسـت گەیشـتووە و هـەر بـە تێکئـاڵاوی و نەگەیشـتنە سـەر ڕێڕەوێکـی ڕاسـت دەمێنێتـەوە، هـەردوو دەرکەوتـەش بـەجیا لایـەنگری خـۆی هەیـە و بـیر و بۆچـوون و ڕێگەچـارە و نەخشەڕێگای چارەسەری ئاریشەکان و بـە سـتانداردکردنی زمـانی کـوردی لەسـەر بنیات دەنێن، بەڵام لەڕاستیدا هەردوو دەرکەوتـە، ئاریشـەکان قـووڵتر دەکەنـەوە، چونکە لە چارەسەری و ڕێڕەوێکی ڕاست دوورمان دەخەنەوە، بە بەڵگـەی ئـەوەی زمانە خاوەن ستاندارد و زیندووەکان لـە لێکۆڵینـەوە زمانەوانییەکانیانـدا هـەرگیز شێوەی گۆکردنی دەستەواژەکانیان لە شێوە کۆنەکان تێکەڵ بە شـێوە نوێیـەکان ناکەن، چـونکە  بـە هاوتـا و هـاوبرکێی یـەکتریان نـازانن، بـەڵکو  وەك زانسـتێکی زمـانی کـۆن و بنەواشـەی  وشـە و بنـەما ڕێزمانییـەکان  لـە کۆنـەکان دەڕوانـن، نوێیەکانیش بەپێی سەردەمەکان بەگۆڕان و گەشەی زمانەکەیان دەزانن .

## تەوەری یەکەم
## بناغە و هۆکارەکانی بە ستانداردبوون

هەر زمانێك بەکاریگەری ئەم هۆکارانە بناغەی ستانداردی بۆ دروستبووە .

**یەك:** هەبوونی شێوەزارێك لە دەقێکی ئایینی یا لە گەشەی ئەدەبی .

**دوو:** هەبوونی دەسەلاتێك بە هەستی نەتەوەیی .

ئەم هۆکارانە پەیوەندیی ڕاستەوخۆیان بەیەکترەوە هەیە، چونکە تەواوکەری یەکترن .

لە مێژووی کۆندا زمانی ئایینی زەمینەسازی و ئاسانکاری بۆ دروستکردنی دەسەلات و بناغەی ستاندارد کردووە بۆ ئەو زمانەی کە دەسەلاتی پێگێڕدراوە یا دەقە ئایینییەکەی پێ نووسراوە، بەلام لە مێژووی نوێدا زمانی ئەدەبی شوێنی زمانی دەقی ئایینی گرتۆتەوە، بۆیە هەردەم دەسەلاتەکان پالپشتی ئەو بەرنامەیەیان کردووە کە زمانی ئایینی یا ئەدەبی زەمینەسازییان بۆ بە ستانداردکردنی زمانەکانیان ڕەخساندووە .

کاریگەری ئاین لە کاریگەری دەسەلاتەکان بەهێزترە، چونکە:

**یەك** / کاریگەری لەسەر زمان و کەلتوور و دابونەریتی میللەتەکاندا درێژخایەنترە .

**دوو**/ جیاکەرەوەی قۆناغە مێژووییەکانە، چونکە ئاراستە و شیکردنەوەی مێژوویی جیهانی بۆ دوو سەردەمی جیا گۆڕیوە (سەردەمی پێش زایین و دوای زایین، سەردەمی پێش ئیسلام و دوای ئیسلام).

لەئێستادا بەدەرکەوتووە کە بە تێپەڕینی هەموو سەردەمەکان ئەم هۆکارانە زەمینەسازی و ئاسانکارییان بۆ بیرمەندان و زمانەوانان کردووە کە چ شێواز و ڕێڕەوێك بۆ بە ستانداردکردنی زمانەکانیان هەلبژێرن، چونکە هەبوونی ئەم هۆکارانە بەیەکەوە یا هەر یەکێکیان بەتەنیا بە درێژایی مێژوو بۆتە هۆی ئەوەی کە دەستەواژەکان خاوەنداربن و هەرگیز نەتوانرێت زمانەکە بێ بایەخ بکرێت – ڕێڕەوی گۆڕان و گەشەی بەپێی سەردەمەکان ڕوون و ئاشکراتر بەدەربکەوێت، کە زمانێکیش لە ڕێی دەقێك یا دەسەلاتێك خاوەنداربوو بە بەردەوامی پارێزراو دەبێت و بە زیندوویی دەمێنێتەوە، چونکە ئەگەر توێژینەوە لێی لە هەر

سەردەمێکدا بکرێت، دەیکاتە خاوەن سەرچاوەی گەڕانەوە بۆ یەکلاییکردنەوە و چارەسەرکردنی گرفت و جیاوازییەکانیان بە پێچەوانەی ئەو زمانانەی کە دەسەڵات و دەقی ئایینییان نەبووە هەروەکو ئێمەی کورد، بۆیە زمانی کوردی زیاتر وەك زمانی ئاخاوتن و لەڕێی گەشەی ئەدەبی بەپێی زمانی شیعر و شاعیران دەناسرێتەوە، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە لە بەکارهێنان و نووسیندا بەرەو لاوازی بڕوات – شێوەزارەکان لێکدابڕێن – هەر شێوە گفتوگۆیەکی وەك زمانێکی جودا و سەربەخۆ و بێ ئاگا لەیەکتر گەشە بکات – شێوەزارەکان بۆ یەکتر نامۆبن و دەرفەتی نزیکبوونەوە و یەکترگرتنەوەیان نەبێت، ئەمەش لە ئێستادا چارەسەرکردنی ئاریشە زمانەوانییەکانمانی زەحمەتتر کردووە بە بەراورد لەگەڵ زمانێك کە خاوەنی دەسەڵات یا دەقێکی ئایینی بووبێت .

زمانی عەرەبی و عیبری دوو نموونەی زیندوون، چونکە هەردوو زمان بە دەقە ئایینییەکانیان پارێزراوبووینە، بە پاڵپشتی دەسەڵات ستانداردیان بۆ دروستبووە، نەتەوەی عەرەب بەهۆی ئیسلام دەسەڵاتی بۆ دروستبوو، زمانەکەشیان بەهۆی نووسینەوەی قورئان کە بە شێوەزاری قورەیشییەکان بوو لە داهاتوودا بۆیان بوو بە ستاندارد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر زمانی قورئان نەبووایە بە زمانی دەسەڵات، بۆ چەندین سەدە حوکمی پێ نەکرابووایە، وەك زمانی دامودەزگای فەرمانڕەوایەتی، پەروەردە و خوێندنی پێ نەکرابووایە، گومان لەوەدا نەبوو هەر وەك زمانی تایبەت بە قورئان لە حوجرە و مزگەوتەکاندا دەمایەوە، زمانی عیبریش کە تەنیا لەسەر لاپەڕەکانی تەوراتدا مابووەوە، بەڵام کە جوولەکە حوکم و دەسەڵاتیان کەوتە دەست لە دوای دامەزراندنی ئیسرائیل لەساڵی (١٩٤٨ز) زمانی ئەدەبیی عیبری کرا بە زمانی ستانداردی وڵات، ئەگەرچی زۆرینەی جوولەکەکان بەو زمانە ئاشنا نەبوون، بەڵام لە ڕێگەی دەزگاکانی خوێندن و دەوڵەت و میدیاوە، فێری ئەم شێوە زمانە کران[٥] بە زەمینەسازی و پاڵپشتی دەسەڵات توانرا شێوە زمانی جوولەکەیەکی ئەفریقی و ئاسیایی و ئەورووپی یەکبخرێت .

زمانە ئەورووپییەکان بەر لە شۆڕشی فەرەنسا (١٧٨٩ز) بە شێوەزاری جیاواز و لەژێر کاریگەریی زمانی لاتینی هەروەك زمانی ئاخاوتنی ڕۆژانە بوون،

چونکە زمانی کڵێسا لاتینی بوو، کڵێساش هێز و جڵەوی دەسەڵاتی بەدەستەوە بوو، بۆیە زمانی لاتینی ببووە زمانی دەسەڵات و زانین و زانست و زمانی هاوبەشی خوێندەوار و رووناکبیران بوو[٦] بەڵام لەدوای لاوازبوونی دەسەڵاتی کڵێسا و دروستکردنی دەسەڵاتی نەتەوەیی بە سنووری جیاواز بۆ هەر نەتەوەیەك، زمانەکانیان زیندوو کرانەوە، لە ڕێگەی پەروەردە و خوێندن و توێژینەوە و چاپکردنی دەق و نووسراوی ئەدەبی هەر زمانێك ئاراستەی خزمەتکردنی سەربەخۆی وەرگرت، لە دەرئەنجامدا بە پاڵپشتی دەسەڵاتە نەتەوەییەکانیان زمانە نەتەوەییەکان گەشەیانکرد و زمانی لاتینی پاشەکشەی کرد.

لە سەرەتای شۆڕشی فەرەنسا بەپێی ئامارێك کە لە ساڵی (١٧٩٠ز) کراوە، تەنیا لە سەدا دەی (١٠٪ ) خەڵکی فەرەنسا زمانی ستانداردی فەرەنسییان زانیوە دواتر لە ساڵی(١٨٧٣ز) هێشتا زیاتر لە چواریەکی هاوولاتیانی فەڕەنسا لە زمانی ستانداردی فەرەنسی نەگەیشتوون[٧]لە ساڵی(١٨٦٠ز)کە ئیتاڵیا بوو بە دەوڵەتێکی یەکگرتوو تەنیا ٢،٥ ٪ لە دانیشتوانەکەی لە ژیانی ڕۆژانەیاندا زمانی ئیتاڵییان بەکاربردووە[٨]

گەشەی ئەدەبی پەیوەستە بە هەبوون و پاڵپشتیی دەسەڵات بە پێچەوانەی هەبوونی دەقی ئایینی، چونکە دەقی ئایینی لە نەبوونی دەسەڵاتەوە زەمینەسازی بۆ دروستکردنی دەسەڵاتەکان کردووە، بەڵام دەقی ئەدەبی زەمینەسازی بۆ دروستکردنی دەسەڵات ناکات، چونکە خۆی بەبێ پاڵپشتیی دەسەڵات ئەو ڕۆڵەی نابێت کە کاریگەری لەسەر زمانی نەتەوەییدا هەبێت، بەڵکو هەبوونی دەسەڵاتێکی بەردەوام و سەقامگیر بە هەستی نەتەوەیی وادەکات کە گەشەی ئەدەبی لە شێوەزارێکدا بناغەی ستانداردی زمانەکە دابڕێژێت، دەسەڵات زەمینەی پەروەردە و خوێندن و شۆڕشە کەلتوورییەکان و ئەدەب و ڕۆشنبیری و وەرزش و هونەری.......تاد دەڕەخسێنێت ئینجا لەنێو شۆڕشەکاندا گەشەی ئەدەبی بە خزمەتی زمانی نەتەوەیی ئەنجامەکانی بەدەردەکەوێت، باشترین نموونەش بۆ بەراوردکردن، دەرکەوتنی ستانداردی زمانە ئەوروپییەکان و پاشەگەردانی زمانی کوردییە، ئەوروپییەکان دەسەڵاتیان دروستکرد ئینجا لەژێر سێبەری دەسەڵاتەکانیان شۆڕشی ئەدەبی و ڕۆشنبیرییان خستە خزمەتی

زمانــەکانیان، توانییــان زمانــەکانیان لــەژێر ڕکێفــی لاتینیــدا ڕزگاربکــەن، بــەڵام لەبەرئەوەی ئێمەی کورد دەسەڵاتمان نەبووە بە واتـای دەسـەڵاتێکی گشـتی لـە سـنوورێکی تایبـەت و دیـاریکراودا کـە خزمـەتی کـەلتوور و فەرهـەنگی کـوردی بەگشتی تێدا کرابێت بە هەموو ئـەو تایبەتمەندییانـەی کە دەبـووە هـۆی دانـانی بـەردی بناغـەی بەسـتانداردبوونی زمـان و پاراسـتنی کـەلتووری کـوردی، بۆیـە شۆڕشی ئەدەبی بەکاریگەری سەرتاسەری لە مێژووی ئێمەدا ڕووی نەداوە .

ئەگـەر گەشـەی ئـەدەبی سـەردەمی میرنشـینە کوردییـەکان بـە شۆڕشـی ئـەدەبی هـەژمار بکـەین، دەبیـنین ئـەو کاریگەرییـەی نـەبووە بـۆ ڕێکخسـتنی زمانەکەمان، چونکە هەر شێوەزارێك لە سەردەمێکدا سیفەتی ستانداردی بـۆ ئـەو میرنشینە وەرگرتووە کە حوکمی کردووە، بەڵام لەبەرئەوەی خوێنـدن و نووسـینی پێ نەکراوە و زیاتر پشت بە نووسـینی عـەرەبی و فارسـی بەسـتراوە، بۆیـە زیـاتر هەروەك زمانی ئاخاوتن لە سنوورێکی دیاریکراودا ماوەتەوە و هەرگیز شـێوەیەکی پەلوپۆی بۆ توانـەوەی شـێوەزارەکانی تـر نەهاوێشـتووە، هۆکـارێکی سـەرەکیش لەمـەدا بیرکردنـەوەی دەسـەڵاتدارە بنەماڵـەیی و میرنشـینەکانی کـوردی بـووە، چـونکە ئەگــەر شـێوەی دەســەڵاتەکانیان بــەراوردی دەســەڵاتی بنەماڵــەیی نەتەوەکانی چوار دەورمان بکـەین دەبیـنین ئـەم دەسـەڵاتانە سـیفەتی حـوکم و دەسـەڵاتیان بـە هەسـتی نەتـەوەیی زۆر کـز و لاواز بـووە، هـەرگیز خـەڵکی ژێـر دەسەڵاتەکانیشیان پەروەردەی زمان و خۆ بەکورد زانین نەکردووە، بـەڵکو تـەنیا پـەروەردەی ملکەچـبوونی خۆیـان دەکـردن، نـەوەکانی خۆشـیان فێـرە زمـان و ئامادەی ملکەچی داگیرکەران دەکـرد بـۆ پاراسـتنی دەسـەڵاتە بنەماڵەییـەکانیان هەروەها نا دادپەروەریی کۆمەڵایەتیشیان لە مانەوە بەژێر دەستی داگیرکـەران بـە ئازارتر بووە بەسەر خەڵکەوە، بۆیە تاکی کورد هەردەم لە بێ ئومێدیدا ژیـاوە، لـە کاتێکدا کە تورك و فارس لەگـەڵ عـەرەب لـە ژێـر نـاوێکی یـەکگرتوودا داهـاتووی نەتـــەوەکانی خۆیـــان بـــە بەرژەوەنـــدیی گشـــتی و گـــەورەکردنی حـــوکم و دەسەڵاتەکانیانەوە دەبەستەوە .

**زمانــە باڵادەســتەکان هــەردەم لــە ســایەی حــوکم و دەســەڵاتەوە شــێوە زمانێکیان بۆ ئامادەکراوە تا ببێتە زمانی ستاندارد، چونکە گرفتی ڕێکخستن و**

**چارەسەری زمانەکانیان بە شێوەیەکی سروشتی لە قۆناغێکدا بڕیوە بەبێ ئەوەی ئاخێوەرانیان هەست بە ڕێککەوتنی زمانەکەیان بکەن وەك زمانێکی گۆڕاو و گەشەسەندوو:**

**یەك** / کە خوێندەوارەکانیان بە کاریگەریی خوێندن شێوەی ئاخاوتنیان گۆڕاوە نەخوێندەوارە زۆرترەکان لاساییان کردوونەتەوە، چونکە پلەو پایەی خوێندەواران لە هەموو سەردەمێکدا بەرزتر بووە و پێشەنگی گۆڕانی کۆمەڵگاکانیان بووینە .

**دوو** / بە تێپەڕینی کات کە شێوەزارێکیان بووە بە زمانی فەرمی دەسەڵات هەموو شێوەزارەکانی تر لەم شێوەزارە نزیکبوونەتەوە، چونکە بەرژەوەندییان لە خۆنزیککردنەوەدا بووە بۆ ڕاهیکردنی ژیانی ڕۆژانەیان .

**سێ** / سەپاندنی شێوەزارێك لە ڕێگەی خوێندن و نووسین و دامودەزگای فەرمانڕەوایەتی، نەوەیەکی پەروەردەو ئامادەبووی دروستکردووە بۆ قبوولکردنی ئەو شێوەزارەی کە پێی ڕۆشنبیر بووە ئینجا لە دەرئەنجامدا ئەم ڕۆشنبیرییە ڕەنگدانەوەی لەسەر بیرکردنەوە و نووسینی ئەدەبیداکردووە.

**چوار** / شێوەزارەکانی تر خۆیان بە هاوتا و هاوبڕکێی شێوەزمانی فەرمانڕەوایەتی نەزانیوە، چونکە بەپەروەردەکردنی نەوە دوای نەوە زمانێکی هاوبەشی تێکگەیشتنی ئاسان لە نێوان شێوەزارە جوداکان دروستبووە .

**پێنج** / بەهۆی هەبوونی دەسەڵاتەوە زمانەکان بە چەندین شێوەی تر خزمەتکراون، زمانی عەرەبی بەهۆی ئایینی ئیسلام و ناوەندە فەرهەنگییە بەهێزەکانی قاهیرە و شام و بەغدا و مەککە و مەدینە، زمانی فارسی بەهۆی زیندووکردنەوەی مێژووی ئێران و ناوەندە فەرهەنگییە بەهێزەکانی خوراسان و دواتر تەورێز و شیراز و مەشهەد و ئەسفەهان و تاران، زمانی تورکی لەدوای ئەوان بەهۆی دروستبوونی دەوڵەتی عوسمانی، ئەم زمانانە وەك زمانی کاروباری دەوڵەتداری و زمانی نووسینی ئەدەبی لە ناوچەکەدا بڵاو بوونەوە[(٩)]

نەبوونی ئەم ڕێکەوتانە لە ڕابوردوودا بۆ زمانی کوردی بۆتە ئاڵۆزترین گرفت و ئاریشە لە ئێستادا، چونکە:

**یەك**/ وایکرد کە گەشە و گۆڕانی زمانی کوردی ڕێڕەوێکی ناتەندروست وەربگرێت .

**دوو** / خوێندەوارانی کورد هەردەم بە زمانی دەسەلاَت فێرە نووسین و خوێندەواری بن، زمانی دەسەلاَتیش لە هیچ کاتێکدا کوردی نەبووە، بۆیە زمانی خوێندەوارانی کورد هەردەم کارلێکراو بووە بە زمانی داگیرکەرانەوە نەوەکو شێوەزارێکی دەسەلاَتی کوردی، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە کاریگەری نەرێنییان لەسەر ئاخاوتن و نووسینی خۆیان و لاساییکردنەوەی نەخوێندەوارانـدا هەبێت، هەروەکو مامۆستا تۆفیق وەهبی دەڵێ زمانی کوردی بەم چەشنە بووە تا لەناوچوونی دەوڵەتی عوسمانی، شاگردانی کورد هەر دوای قورئان خەتمکردن و لە قوتابخانەدا فێری زمانی فارسی، لە مزگەوتەکاندا فێری زمانی عەرەبی و لە مەکتەبە ڕەسمییەکانی عوسمانیدا فێری زمانی تورکی دەبوون [١٠]

**سێ** / لە هیچ قۆناغێکی مێژوویی کۆندا خوێندەوارانمان خزمەتکاری زمانی کوردی نەبووینە، چونکە، خاوەن دەسەلاَتێکی سەرتاسەری نەبووینە – فێربوونیان هەردەم بەزمانی داگیرکەران بووە، بەڵکو نەخوێندەواران و حەیرانبێژ و لاوکبێژەکان و ئاخێوەری گوندە لاتەریك و دوورە دەستەکان پارێزەر و هێڵەرەوەی دەستەواژە کوردییەکان بووینە چونکە شێوە زمان و بەکارهێنانی دەستەواژەکانیان بەکەمترین کاریگەری زمانە بالاَدەستەکان و داگیرکەران بووە .

**چوار** / لەهیچ سەردەمێکدا شێوەزارێکی نەبووە بە شێوەزمانی دەسەلاَتێکی گشتی تا بسەپێنرێ بەسەر هەموو شێوەزارەکانی تردا، بۆیە هەرگیز ئاخێوەرانی شێوەزارە جیاوازەکان هەست و بەرژەوەندیی خۆنزیککردنەوەیان بێجگە لە شێوەزاری خۆیان بۆ هیچ شێوەزارێکی تر نەبووە .

**پێنج** / لەمێژووی کۆن و نوێدا هەردەم شێوەزارەکان خۆیان بە هاوتا و هاوبڕکێی یەکتر زانیوە، بۆیە ئێمەی کورد هەر بەشێوەزار پارێزەری ماوینەوە و بەردەوام لە ڕێی شێوەزارەکانەوە خۆمان پاراستووە، ئەوەندەش لە توانەوەی خۆمان و زمانەکەمان ترساوین لە لایەن بالاَ دەستانەوە تا وای لێهاتووە تێکەڵبوون و تێکهەڵکێشانی دەستەواژەی شێوەزارەکانی خۆشمان بەسڕینەوە زانیوە، چونکە هەموو قۆناغەکانمان بە بێ دەسەلاَت و ئاوێتەبوونی شێوەزارەکان

و دروستبوونی زمان و ڕێزمـانێكی هاوبـەش بـەرپێكردووە، بۆیـە لـە ئێسـتادا تـاكی كـورد وەك دەرئـەنجامێكی ئـەم ڕێـڕەوە مێژووییـە زیـاتر بـە هەسـتی شـێوەزار پەرستی بیردەكاتەوە لە جێگای بیركردنەوە بە هەستی زمانی نەتەوەیی.

## وەرگێڕانی ئاڤێستا

شـارەزایانی مێـژوو لـەو بـاوەڕەدان كـە لەناوچـوونی دەسـەڵاتی میدییـەكان لەسەر دەستی كۆرشی هەخامەنشی بەر لە شەش سـەدە پـێش زایـین (٥٥٣ پ . ز) هۆكـاری ئـەو ڕێـڕەوە مێژووییەیـە كـە ئێمـەی كـوردی پێـدا تێپـەڕیوە، وا لێكدەدەنەوە كە گرتنە دەستی دەسەڵات لە لایەن فارسەكانەوە وایكرد:

**یەك** / فارسەكان ببنە خاوەنی زمان و مێژووی سەردەمەكان لەگـەڵ ئـەوەی میدییـەكان و لـە پاشـاندا كوردەكـانیش بەشـداربووینە لـە دروسـتكردنی هـەموو سەروەرییەكاندا .

**دوو** / كورد نەبێتە نەتەوەیەكی یەكگرتوو، نەتوانێت دەسەڵات دروسـتبكات و قەوارەی تایبەتی خۆی بپارێزێت .

**سێ** / گەشەی هەستی نەتەوەیی بە دوابكەوێت .

**چوار** / تاكی كورد بە درێژایی مێژووی دوو هەزار ساڵە و زیاتر بە بەردەوامی خزمەتی دەسەڵات و زمانی نەتەوەی تر بكات .

لە ڕاستیدا لەناوبردنی دەسەڵاتی میدییـەكان بـە تـەنیا ئـەو هۆكـارە ڕەهایـە نییـە تـا هـەموو شكسـتە مێژووییـەكانی پێـوە ببەسـتینەوە، بـەڵكو هۆكارێكـە، چونكە لە كۆن و لە ئێستاشدا، نـەمانی دەسـەڵات و داگیركردنـی خـاك ڕووداوێك بووە لە قۆناغێكدا بەسەر زۆربەی میللەتاندا هاتووە، بەڵام دواتر و لـە قۆنـاغێكی تـردا میللـەتان توانیویانـە خاكـەكانیان ڕزگـار بكـەن و دەسـەڵاتی خۆمـاڵی دابمەزرێننەوە، ئێمەی كوردیش وەك هەر نەتەوەیەكی تر ئەم قۆناغەمان بەسـەردا تێپەڕیوە، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی لـەو سـەردەمدا دوو هۆكـار مایـەی بەدەركـەوتن و سـەركەوتنی نەتـەوەكان بووینـە، یـەكێكیان ئـایین و ئـەوی تریـان هەڵكـەوتنی سـەركردە زانـا و دووربـین و لێوەشـاوەكان بووینـە كـە كاریـان بـۆ سەرخسـتنی نەتەوەكانیان كردووە، كـە ئێمـەی كـورد لـەم دوو هۆكـارە بێبـەش بووینـە، بۆیـە نەمانتوانیوە سوود لەو دەرفەتانە وەربگرین كە بۆشمان هەڵكەوتووە .

بەشێوەیەکی گشتی لە پێش زایینـدا تـا چـەند سـەدەیەکیش دوای هـاتنی ئیسلام ڕۆژگارێك بووە هەموو پێکهاتەکانی لـە سـەروبەندی گـۆڕانێکی ڕیشـەییدا بووە، زمانیش یەکێك بووە لە پێکهاتەکان، چونکە خوێندن و نووسین لە کـەمترین ڕێژەدابووە، تێکەڵبوونی مرۆڤە جیاوازەکان و زاڵبوونی زمانێـك و مردنـی زمـانێکی تر لە ئارادا بووە، ئەو سەردەم مێژووییێکـە، مرۆڤـەکان ئـاڵوگۆڕێکی زۆریـان لـە گــۆڕینی شارســتانیەت و کــەلتوور و شــێوەی دەســەڵات و بــە نەتــەوەبوون و نیشتەجێبوون و لەناوچـوون و لـەناوبردن و سـڕینەوە و کۆچـکردنی بـە کۆمـەڵ و ڕاوەدوونــان و ڕامــاڵین و تێکشــکاندنی یــەکتردا کــردووە هــەروەها ئــەو ســەردەم سەردەمی دانانی بناغەی سەرهەڵدانی هەستی خۆ بەجیا زانـین و هەڵکـەوتنی ئـەو سـەرکردانە بـووە کـە توانییـان ڕێـڕەوی مێـژوو بـۆ بەرژەوەنـدیی نەتـەوەکانیان بگۆڕن، ئەو سەردەم وەك جموجوولێکی بەگەفوگوڕ و شەپۆل و شڵەقانی دەریـا وابووە کە لە هەموو ناوچە و دەوروبەری ئێمەدا ڕووی دەدا، سەرەتا سـەرکەوتن و گۆڕانکارییــەکان لــە بەرژەوەنــدیی میــد و ئاشــوورییەکاندا بــوو، بــەڵام لــە دوای لـــەناوبردنی میدییـــەکان و وەرگێڕانـــی ئاڤێســـتا هاوکێشـــەکە گـــۆڕا و کەوتـــە بەرژەوەندیی زمان و کەلتووری فارس، لە دوای داهاتنی ئیسلام و بە ئیسـلامکردن ئەم جارەیان هەموو ئاراستەکان بۆ بەرژەوەندیی کەلتوور و زمانی عـەرەب گـۆڕا، هاوتەریب و لە هەمان سەردەمیشدا نووسین و ڕێنووس پێشـکەوتن و بووژانـەوە و گۆڕانێکی زۆری بەسەرداهات کە بووە هۆی ئەوەی ئەو زمانـەی کـە دەقـی ئـایینی پێ نووسرابێت پارێزراوتر بێت و زیاتر پێش بکەوێت لە زمانێك کـە دەقـی ئـایینی پێ نەنووسرابێت .

لە دوای بە ئیسلامبوون و لە پاشاندا ئـەو گەفوگوڕانـەی کـە لـە پـێش زایـین دەستی پێکردبوو بەرەبـەرە هـێمن بوونـەوە و کاریگـەری و ڕەنگدانـەوەی لەسـەر هەڵکەوتنی زمان و نەتەوەکاندا بەدەرکەوتەوە، هەندێ زمان و نەتـەوە لاواز بـوون و مردن و سڕانەوە وەك ئاشووری و بابلی و سۆمەری، هەندێ نەتەوەی تر مانـەوە و هاتنە پێشەوە وەك فارس و عەرەب و تورك و کورد .

لە مێژووی کۆندا هەبوون و خاوەنـداری لـە ئایینێـك کۆڵەگـەی دروسـتکردنی دەسەڵاتەکان بووە هەروەها سەرکەوتنەکانیش بە واتـای سـەپاندنی ئـایین بـووە،

چونكە زەمینەی دروستكردنی دەسەڵاتی بۆ نەتەوەكان سازاندووە و قەڵەمڕەوی دەسەڵاتەكانیشی بەپێی پەیڕەوكەرانی ئایینەكان لەیەكتر جیاكردۆتەوە، بۆیە دەبینین هەموو دەقە ئایینییەكان كاریگەری لەسەر شێوەی دەسەڵات و زمانی نەتەوەكاندا بەجێهێشتووە، چونكە ئەو كات بیروباوەڕی ئایینی لە شوێنی ئایدۆلۆجیا و هەستی نەتەوەیی ئێستادا بووە، جیاوازیی سنوور و خاك بەپێی جیاوازیی بیروڕاكان بووە هەروەها ئەو سەردەم خوێندن و خوێندەواریش تایبەت بووە بە چینێك، ئەم چینەش نوێنەرایەتی ئایینەكانیان كردووە لە ڕووی پەروەردەكردنی بیروباوەڕی خەڵكەوە، بۆیە هەردەم زمانی دەقە ئایینییەكان زاڵ دەبوون بەسەر هەموو زمانەكانی تر .

سیفەتی سەركردە مێژووییەكان ئەوەیە كە هەریەكێكیان بەكارێك دەناسرێتەوە كە كاریگەری لەسەر داهاتووی نەتەوەكانیان دەمێنێتەوە و دەبێتە سەلمێنەری دووربینیی ئەو سەركردەیە، بۆ نموونە هۆخشترە (جەمشید) پاشای ماد خزمەتی سەربازی دامەزراند و كۆرشی هەخامەنشی قوتابخانە پیشەییەكانی دامەزراند، داریۆش خوێندنی بۆ هەمووان بەخۆڕایی كرد[11] ئەوەی لێرەدا مەبەستی ئێمەیە سەردەمی داریۆشی یەكەمە (٥٢٠ پ . ز) كە گۆڕانە فەرهەنگییەكانی تێدا ڕوودا، چونكە بەهۆی ئەو ڕێڕەوە مێژووییەی كە لەو سەردەمەوە دەست پێدەكات، لە داهاتوودا كاریگەری لەسەر هەردوو زمانی كورد و فارسدا بەجێهێشت، لەڕێگەی وەرگێڕانی ئاڤێستاوە داریۆش وایكرد كە زەمینەی دەسەڵات بە بەردەوامی بۆ بەرژەوەندیی زمان و نەتەوەی فارس دەستەبەر ببێت، بەنرخترین بەڵگەش سەبارەت بە وەرگێڕانی ئاڤێستا لە زمانی باختەری (باختەران یا كرماشان) بۆ فارسی بریتییە لە كەتیبەیەكی بێستوون كە تیایدا داریۆش دەڵێت: پەرتووكی یاساكانی خوداوەندم (واتە ئاڤێستا) لە زمانی باختەری وەرگێڕا بۆ فارسی تا هەمووان بتوانن بیخوێننەوە و لێی تێبگەن.[12]

لەوانەیە ئەم وەرگێڕانە لەو كاتدا بۆ تێگەیشتنی بنەماكانی ئایینی زەردەشت بووبێت بۆ ئەو كەسانەی كە فارس زمان بووینە، چونكە فارسەكان لە زمانی میدی و ئاڤێستا نەگەیشتوونە، بەڵام لە دەرئەنجامدا و بەتێپەڕینی كات و ڕاهاتنی پەیڕەوكەران ئەم وەرگێڕانە بووە هۆی ئەوەی كە زمانی فارسی

پێشبکەوێت و شوێنی زمانی میدییەکان بگرێتەوە، چونکە زمانی فارسی کردە زمانی دەقی ئایینی و دەسەڵاتیش خاوەنداری لەم زمانە کرد، ئەمەش وایکرد کە هەموو هاوکێشە نەتەوەیی و لێکدانەوە زمانەوانییەکان گۆڕانی بەسەردابێت و تای تەرازووی قازانج بەلای فارسەکاندا بشکێنێتەوە، بە درێژایی مێژووی داهاتوو زمانی فارسی ببێتە زمانی پەروەردە و خوێندن و نووسینی پێبکرێت ئەم هۆکارەش بووە هۆی ئەوەی کە بە بەردەوامی زەمینەسازی بۆ دروستکردنی دەسەڵات لە بەرژەوەندیی پارسەکان و میراتگرە فارسەکانیان بێت نەوەکو میدی و میراتگرە کوردەکان، بە بەڵگەی ئەوەی لە دوای ئەم مێژووەوە ئەگەر نەوەی مادەکانیش لەهەر سەردەمێکدا دەسەڵاتی کەوتبێتەوە دەست هەرگیز نەیتوانیوە لەو زمان و زەمینەیە دابڕێت کە دەقە ئایینییەکەی پێنووسراوە، چونکە بە بەردەوامی خوێندن و نووسینی پێکراوە و زەمینەی گرتنە دەستی دەسەڵاتی بۆ فارسەکان سازاندووە وەك زەندەکان کە لە کوردەکان نزیکبووینە و سەفەوییەکانیش کە تورکزمان بووینە .

ئاڤێستا ئەو کتێبەیە کە پەیامبەر زەردەشت گوتە و ئامۆژگارییەکانی خۆی وەك دەقێکی ئایینی تێدا نووسیوە، بەڵام ئەو بەشە ئاڤێستایەی کە لە ئێستادا ماوەتەوە و لە لەناوچوون ڕزگاری بووە، ئەو ئاڤێستایە نییە کە لەسەر دەستی پەیامبەر زەردەشت خۆی یا لە سەردەمی ئەودا بەخەتی بزماری و زمانی میدییەکان نووسرابێتەوە، بەڵکو ئەو دەقەیە کە وەرگێڕدراوەتە سەر خەتی ئارامی و زمانی پارسەکان، چونکە کە لەسەردەمی داریۆشی یەکەم ئاڤێستا وەرگێڕدرایە سەر زمانی فارسی لە هەمان سەردەمدا خەتی بزماریش گۆڕا، ئەم خەتەش بەهۆی داریۆشەوە هاتە ئێران ماوەیەکی خایاند تا بووە جێگرەوەی خەتی بزماری، هەر ئەو ڕێنووسە دواتر بە ڕێنووسی پەهلەوی ناسرا[١٣] ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە هەموو وردکاری و خەسڵەت و پێکهاتەی دەسەڵات بە کەلتووری ئەو سەردەم و دوایی و ئەو دەستەواژانەی کە لە ئاڤێستادا بەکارهاتووە و ماوەتەوە ئەگەر فارسیش نەبێت هەمووی بە ناوی فارسەوە بڕوات .

لەبەر ڕۆشنایی ئەو سروودانەی کە لە گاتاکاندا هەیە کە کۆنترین بەشی ئاڤێستایە و لە وانە پیرۆزەکانی پەیامبەر خۆیەتی بۆمان دەردەکەوێت کەوا لە

۱۳۰۰ تا ۱۵۰۰ ساڵ پ – ز کۆنترە، دەربارەی ئەو زمانەی کە ئاڤێستای پێنووسراوەتەوە، هیچ جێگای گومان نییە کە زەردەشت بە زمانی مادی یاخود بە زمانی باوك و باپیرانمان قسەی کردووە، ئاڤێستاش هەر بەو زمانە نووسراوەتەوە، بەڵام بە درێژایی ڕۆژگار ئەو زمانە لەناوچووە و وەك زمانێکی وتووێژی نەماوە، بەڵکو تەنیا وەك زمانێکی ئایینی ماوەتەوە(١٤) چونکە لە دوای وەرگێڕانی ئاڤێستا دەقە بنەڕەتییەکە بوونی نەما و لەناوبرا، تەنیا گاتاکان لەسەر زاری مووغەکان و پەیڕەوکەرانی مایەوە، بە تێپەڕینی کات ئەویش لەبیرکرا یا شێوەزمانەکەی گۆڕانی بەسەرداهات .

زمانی ئاڤێستا گرنگترین زمانی دێرینە، زمانێکی تەواو بەهێز بووە و ڕیشەی لەناو زمانی هیند و ئەوروپییە، بەهیچ جۆرێك ناتوانرێت ئەم زمانە بە زاراوەیەکی زمانی فارسی بزانرێت کە زمانی فەرمیی ئێرانییەکان بووە(١٥)

بەپێی لێکۆڵینەوەی زۆربەی زمانناس و گەڕیدە و ڕۆژهەڵاتناسەکان زمانی کوردی ئێستا میراتگر و پاشماوەی ئەو زمانەیە کە پەیامبەر زەردەشت قسەی پێکردووە و دەق و بنەماکانی لە ئاڤێستادا پێنووسیوەتەوە هەروەك مینۆرسکی دەڵێ ئەو زاراوانەی ئێستا کە لە زمانی کوردیدا هەیە گشتیان دەچنەوە سەر ڕەچەڵەکێك، لە سەرچاوە و پایەیەکی بەهێز و کۆنەوە هەڵدەقوڵێن کە ئەویش زمانی مادەکانە(١٦) ڕۆژهەڵاتناسی ناسراو (دارمس تەتر)یش لە پاش لێکۆڵینەوەیەکی ورد لە زمانی کوردی، بەو باوەڕە گەیشت کە زمانی کوردی لقێکی زمانی مادە(١٧).

کەواتە ئاڤێستا بەزمانی میدییەکان نووسراوەتەوە، زمانی میدییەکانیش سەرچاوە و بناغەی ئەو زمانە کوردییەی ئێستایە کە چەندین شێوەزاری لێ دروستبووە و بە ملیۆنان کەسی کورد قسەی پێدەکەن.

– **وەرگێڕانی ئاڤێستا کەمترین گرفتی بۆ فارسەکان دروستکرد،** چونکە هەردوو زمانی میدی و پارسی نزیك و هاوسەرچاوەی یەکتر بوون، بۆیە بە ئاسانی ڕاهاتنی پەیڕەوکەران و ئاخێوەرانی هەردوو زمانەکەی لەسەر دروستبوو، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە لە داهاتوودا فارسەکان خۆیان بە خاوەنی وشە میدییەکانیش بزانن.

– **وەرگێڕانی ئاڤێستا بۆ ئێمەی کورد هەموو نەگبەتییەکانی بەدوادا هات،** چـونکە مێـژووی نەتەوەکـەمانی پڕکـرد لـە کـوێرەوەری و نەهامـەتی و زولمـی داگیرکـەران و تـاریکی مێـژووی زمـان و نەتەوەکـەمان، بـەڵام بـۆ فـارس بـوو بـە نیعمەت، چـونکە کردیـانی بـە خـاوەن و پێناسـەی دەسـەڵات و زمـان و مێـژووی هەموو سەردەمەکان .

– **وەرگێڕانـی ئاڤێسـتا گـرنگترین هۆکـارە کـە ڕێـڕەوی زمـان و مێـژووی نەتەوەکەمانی بەم ئاقارەدا برد کە ئێستاکە دەیبینین،** چونکە بووە هۆی یەکتر نەگرتنەوە و لاوازبوونی هەستی خۆ بە جیازانین بەرامبەر فارس و دەسەڵاتی هەر کەس و چینێك کە حـوکمی بەسـەر ئـەو ناوچـەیەدا گێڕابێـت کـە کوردنشـین و بـە خـاکی کـوردان ناسـرابێت، بـەڵام ئەگـەر ئاڤێسـتا وەرنەگێڕدرابووایـە سـەر زمـانی فارسی، دەق و زمانی ئاڤێستا زەمینەسازی گرتنە دەستی دەسەڵاتی بۆ مادەکان دەکـرد نـەوەکو بـۆ فارسـەکان یـا وایـدەکرد لـە هەرکاتێکـدا ئەگـەر دەسـەڵات بکەوتبایەوە دەستی کەسێك لە ماد و نەوەی مادەکان، ئەو کەسە یـا سـەرکردەیە دەیتوانی سەرلەبەری سەردەم و قەڵەمڕەوی دەسەڵاتەکە بگەڕێنێتەوە سەر ناوی ماددەکان یا دەیکردە هاوبەشی ئەو مێژووەی کـە ئێسـتا فـارس تـەنیا بـە هـی خـۆی دەزانێـت، بـەڵام لـە دوای وەرگێڕانـی ئاڤێسـتا لەگـەڵ ئـەوەی چـەندین دەسەڵات و بنەماڵە گۆڕان، نەوەی مـاد و نـەوەی فـارس دەسـەڵاتیان تێدا گێـڕا، کەچی هیچ دەسەڵاتێك نەیتوانی لەو زمان و ئایینە دابڕێت کە هەموو خـەڵکی پـێ پەروەردە کرابـوو، خوێنـدەواری پـێ فێرببـوو کـە زمـانی فارسـی بـوو تـا هـاتنی ئایینی ئیسلام کە ئایینی زەردەشتی سڕییەوە و زمانی عەرەبی زاڵکرد.

**لێکدانەوە:**

هەروەك بەدەرکەوتووە لە وەرگێڕانی دەقە ئایینییەکاندا، هەندێ دەستەواژە هەیـە وەکـو خـۆی دەمێنێتـەوە و ناتوانرێـت وەربگێڕدرێـت، چـونکە دەبێتـە بەشـێکی بنـەڕەتی بـۆ دەق و بنـەما ئایینییەکـە، بۆیـە تێکـەڵی زمانـە جوداکـان دەبێت، بۆ نموونە: هەندێ وشەی عەرەبی بەهۆی دەقـی قورئـان تێکـەڵی زمـانی نەتەوە موسڵمانەکان بووە وەك (حەج و عومرە و زەکات و شـەهید........تاد) بـە هەمان شێوە دەستەواژەکانی زمانی لاتینیش بۆ زمانی وڵاتە مەسـیحییەکان هـەر

وابووە، بەهەمان لێکدانەوەی لۆژیکیش، کە داریۆش ئاڤێستای وەرگێڕاوەتـە سـەر زمانی فارسی نابێت گومان لەوەدا بکرێت کە چەندین وشەی میـدیش وەك بنـەمای ئـایینی زەردەشـتی تێکـەڵی زمـانی پارسـەکان بـووە، بـەڵام لەبەرئـەوەی کـورد دەوڵەتی نەبوو، بەڵکو نووسینیشی نەبوو، بۆیە وارس خاوەنی دەوڵەتی ئێـران و دینــی ڕەسمــی دەوڵــەت بــوو کــە فارســەکان بــوون[18] بەهــەمان گریمانــە وا لێکدەدرێتـەوە لـە دوای هاتنـە نێـو ئـایینی زەردەشـتی و وەرگێڕانـی ئاڤێسـتاش زمانی فارسی چەندین وشەی میدی وەرگرتـووە هـەروەکو ئـەوەی کـە لـە دواتـر و لەدوای بە ئیسلامبوونیش چەندین وشەی عـەرەبیی تریـان وەرگـرت، بـەڵام لەبـەر ئەوەی وەرگێڕانی دەقی ئاڤێستا ڕێگە پێدراو بوو بە پێچەوانەی دەقی قورئان کە ڕێگەی نەدا بێجگە لە زمانی عەرەبی بۆ هیچ زمـانێکی تـر وەربگێڕدرێـت، ئەمـەش وایکرد کە فارس نەبێتە خاوەنی ئـەو هـەموو وشـە عەرەبییـەی کـە لـە ئێسـتادا کەوتۆتە ناو زمانی فارسی، چونکە ئەگەر بیانتوانیبایە دەقی قورئانیش وەربگێڕن بە بێ گومان دەستەواژە عەرەبییەکانیشیان بـە دەردی میدییـەکان دەبـرد، بۆیـە ئەگەر ئاڤێستا وەرنەگێڕدرابووایە سەر زمانی فارسـی بـۆ ئێمـەی کـورد بەهـەمان شێوەی عەرەب دەبوو.

## شێوازەکانی بەستانداردکردنی زمانی کوردی

هــەر زمانێـك کـە لـە سـەردەمێکدا بـیری زمـانی یـەکگرتوو و بەرنامــەی سـتانداردی بـۆ داڕێـژرابێت، زینـدووترین شـێوەی نووسـینی بـە دەقـی ئـایینی یـا ئەدەبی و نوێترین شێوەزاری سەردەمی بە گوێرەی مێژووی پەیدابوونی کـراوە بـە بناغـەی سـتانداردکردن و بـە دەسـتەواژەی شـێوەزارەکانی تـر دەوڵەمەنـدکراوە، چـونکە ئـەم شـێوە زمانـە یـا ئـەو شـێوەزارە دوا گەشـە و گـۆڕانی زمانەکـەی لێ بەدەردەکەوێت، بۆ نموونە: کە شێوە زمانی پاریسـی کـرا بـە بناغـەی سـتانداردی فەرەنسی، کە شـێوەی ئەسـتەمبووڵی کـرا بـە بناغـە بـۆ سـتانداردی تـورکی، کـە شـێوەی قـوڕەیش قورئـانی پـیرۆزی پێنووسـرایەوە، لـە دواتـردا بـوو بـە زمـانی سـتانداردی عـەرەب، لەوکاتـدا لـەو شـێوانە زینـدووتر نـەبووە، دوا شـێوەزاری گەشەسەندووی سـەردەمی خۆیـان بووینـە، چـونکە ئەگـەر لـەم شێوانە بڕوانین،

دەبینین هەر شێوەیەکیان بۆ زمانی خۆیان، چەند سیفەتێکی هاوبەشیان لەنێواندا بووە، وەك: شێوە زمانێکی پاراوی سەردەم و نزیکی مێژووی پەیدابوون و نووسین و پێشکەوتنی ئەدەبی و ئاسانتر لە تێکگەیشتن بۆ شێوەزارەکانی تر و نزیکایەتی لە شێوەی کۆنی زمانە بنەڕەتییەکە، سەرەڕای ئەم تایبەتمەندییانە هەردەم دەسەڵاتێکیش پاڵپشتی ئەم شێوەزارانەی کردووە .

لەئێستادا چەندین بیرۆکە هەیە بۆ بەستانداردکردنی زمانی کوردی، هەر بیرۆکەیەکیش لایەنگری خۆی هەیە، بەڵام هیچ بیرۆکەیەك بە بەرنامەیەکی سیستماتیکی هەوڵی جێبەجێکردنی بۆ نەدراوە، چونکە زەمینەسازی بۆ دابین نەکراوە، پاڵپشتی دەسەڵاتی بۆ دەستەبەر نەکراوە، بەرنامە و نەخشەڕێگایەکی وەك پڕۆژەیەکی چارەسەری بۆ ساز نەکراوە، بۆیە بە بەردەوامی هەموو بیرۆکەکان هەروەك بیرۆکەی تایبەتی بیرمەندان و زمانەوانان ماوەتەوە .

**بیرۆکەی یەکەم** / هەندێ کەس تەنیا شێوەزاری بابانی بە چارەسەری ستانداردکردنی زمانی کوردی دەزانن، چونکە ئەم شێوەزارە بەپێی بەڵگە مێژووییەکان نوێترین شێوەزارە و دواگەشە و گۆڕانی زمانی کوردی لێ بەدەردەکەوێت هەروەها خاوەن گەشە و مێژوویێکی ئەدەبیی نەپچڕاوەشە لە هەمانکاتدا نزیکەی سەدەیەك دەبێت لە کوردستانی باشووردا وەك زمانی نووسین و خوێندن و دەسەڵات لەکاردایە و چەندین نەوەی پێ پەروەردە بووە، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە زەمینەیەکی لەباری بۆ بڕەخسێت تا ببێتە بناغەی ستاندارد، بەڵام هەروەك لە پێشتردا گوتمان لەبەرئەوەی ئێمەی کورد خاوەن دەسەڵاتی گشتی و سەرتاسەری نەبووینە، هەموو شێوەزارەکان خۆیان بە هاوتای یەکتر دەزانن، بۆیە لە بەرامبەر ئەم بیرۆکەیەدا شێوەزاری تریش ئەو مافە بە خۆیان دەدەن تا ببنە هاوبڕکێی شێوەی بابانی، چونکە شێوەزاری بابانیش وەك شێوەزارەکانی تر لە هیچ سەردەمێکدا نەبۆتە زمانی دەسەڵاتێکی گشتگیر تا کاریگەری لەسەر شێوەزارەکانی تردا هەبێت، لە ڕێگەی خوێندن و نووسین و هەڵسووڕاندنی دامودەزگای دەسەڵات بەسەر شێوەزارەکانی تردا سەپێنرابێت، بەرژەوەندیی خۆ نزیککردنەوەی شێوەزارەکانی تری بۆ دروستبووبێت تا ڕەنگدانەوەی لەسەر زمان و نووسینی خوێندەواران و ئاخێوەران و نووسەر و

ئـەدیب و شـاعیرانی شـێوەزارەکانی تـردا هـەبێت، بـەڵکو لەبـەر ئـەوەی هـەر شێوەزارێك نووسراو و دەسەڵاتی میرنشـینی خـۆی هـەبووە و لـە دابەشکردنیشـدا هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ شێوەی بابانیدا بۆ دەستنیشان نەکراوە، بۆیە بوونـە بـە هـاوبڕکێی لـە ئێسـتادا، بـەڵام لـە ڕاسـتیدا بـە سـتانداردکردنی زمانێـك ئەگـەر شێوەزارێکی دەقی ئایینی پێ نەنووسرابێت، بەڵگەی هـەبوونی میرنشـین و دەق و نووسراوی بۆ نابێتـە مـەرجی ئـەوەی تـا بکـرێ بـە سـتانداردی زمانێـك، بـەڵکو دەبێت ئەم شێوەزارە:

**یەك**/ بەگشتی ڕەنگدانەوەی دواگەشە و گۆڕانی زمانەکەی لێ بەدەربکەوێت .

**دوو**/ شـێوەزارێکی ئاسـان و ڕەوان و پـاراو بێـت لـە ئاخـاوتن و دەربـڕین و تێکگەیشتندا .

**سـێ**/ شـێوەی دەسـتەواژە و بنـەما ڕێزمانییـەکان نزیـك بێـت لـە شـێوە کۆنترەکان .

**چوار** / مێژووی ئـەدەبی و نووسـینی نەپچڕاوە و دوا شـێوەزاری سـەردەم و پەیدابوو بێت  بە گوێرەی بەڵگە مێژووییەکان .

ئەگەرچی ئەم بیرۆکەیە ئـاواتی هـەموو کوردێـك بـووە لـە ئێسـتا و لـە ڕابوردوودا، بەڵام بە داخەوە هـەر بـە ئـاوات ماوەتـەوە، چـونکە نـە بیرکردنـەوەی ئێستامان نە مێژووی ڕابوردوومان یارمەتیدەرمانە، نە هیوای دوارۆژیشمان هێنـدە گەش و لەبەر چاوانە تا بتوانین ئەم ئاواتە بهێنینەدی .

**بیرۆکـەی دووەم** / هەنـدێ کەسـی تـر تێهەڵکێشـکردنی دەسـتەواژەکانی هەردوو شێوە گفتوگـۆی کرمـانجی (ژووروو — خـواروو) کـە بە(سـورمانجی) نـاوی دەبەن بە چارەسـەر دەزانـن، بـەڵام لێـرەدا پرسـیارێك دروسـت دەبێـت، ئـەویش ئەوەیـە ئایـا دەسـتەواژەکانی کامـە شـێوەزار لـەنێو ئـەم دوو شـێوە گفتوگۆیـەدا تێهەڵکێشی یەکتر بکرێن ؟ چونکە هەروەك دەزانین ئەم دوو شـێوە گفتوگۆیـە لـە چەندین شێوەزار و بنەزاری جیاواز پێکدێن، بەگوێرەی دابەشکردنەکانی ئێسـتاش بێت هەموو بنەزار و شێوەزارەکان هاوتای یەکترن، بۆیە بەهیچ پێوەرێك ناتوانرێت دەستەواژەی شێوەزارێك لەنێو ئەم دوو شێوەیەدا  بخرێتـە دەرەوە، چـونکە هـیچ جیاوازییـەکی ڕاسـتی و ناڕاسـتی یـا دوور و نزیکیمـان بـۆ بەدەرناکـەوێت لـە

هەڵبژاردنی دەستەواژەکان و هەڵهێنجانی بنەما ڕێزمانییەکاندا .

ئەگەرچی ئەم بیرۆکەیە لە هەستێکی پاکەوە هەڵقوڵاوە، بەلاّم لەبەرئەوەی میکانیزمی جێبەجێکردنی نەگونجاوە، بۆیە لە سەرەتا و لە ئێستاشدا هەروەك خۆزگەیەك ماوەتەوە .

**دەستەواژەی (سور+مانجی) کورتکراوەی هەردوو دەستەواژەی (سورانی + کرمانجی)یە .**

ئەم ناولێنانە هەڵەیەکی زەقە، چونکە ( سۆر + انی) شێوەزارێکە لەنێو شێوە گفتوگۆی کرمانجی خواروو یا ناوەڕاست، بەلاّم (کر+ مانجی) شێوە گفتوگۆیە و لە چەندین شێوەزاری وەك بۆتانی و بادینی ........تاد پێکدێت .

تێهەڵکێشکردنی شێوەزار و شێوەگفتوگۆی بنەڕەتی بە ڕێگەی چارەسەریماندا نابات، چونکە بەرامبەر و هاوتای یەکتر نینە، هەریەکەیان سەردەمی دروستبوونیان لەیەکتر جیاوازە، شێوەزاری (سۆرانی) شێوەزارێکی نوێیە بە بەراورد بە شێوە گفتوگۆی (کرمانجی ژوورو)، ئەم جیاوازییەش وادەکات هەریەکەیان تایبەتمەندیی خۆی هەبێت لە ڕووی ئەرکە زمانەوانییەکانەوە.

**بیرۆکەی سێیەم/** هەندێ کەسی تر لەجیاتی ستانداردێك دوو ستاندارد و زیاتر بە چارەسەر دەزانن، لەم ڕێگەیەوە بیرکردنەوەی خۆیان بۆ خزمەتکردنی زمانی کوردی بەکار دەهێنن، چونکە وا لێکدەدەنەوە کە هەموو شێوەزارەکان ئەو مافەیان هەیە تا ببنە زمانی ستاندارد، بەلاّم ئەم بیرۆکەیە بیرۆکەیەکی نەزۆکە، چونکە هیچ زمانێك و لەهیچ کاتێکدا هەر شێوەزارێکی ستانداردێکی نەبووە، هیچ کەس و دەسەلاّتێکی نیشتمانپەروەریش پاڵپشتیی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە ناکات مەگەر بەرنامەی دووبەرەکی و مەبەستێکی نابەجێی ناحەز و داگیرکەرانی لەپشتدا نەبێت .

**بیرۆکەی چوارەم/** هەندێ کەسی تر لە بێ ئومێدییان خۆیان بە بیرۆکەیەکی تایبەت دەبەستنەوە، کە دەڵێن چۆن هاتووە با هەر وابێت، زمانی ستاندارد لە خۆیەوە دروست دەبێت، بەلاّم ئایا هیچ زمانێك هەیە لە دنیادا لە خۆیەوە ستانداردی بۆ دروست بووبێت ! ئەگەر دەسەلاّتێك لە ڕێگەی خوێندن و

دامودەزگای دەسەلاتەوە شێوەزارێکی بەسەر شێوەکانی تردا نەسەپاندبێت، پاڵپشتی بەرنامە و زەمینەسازی بۆ شێوەزارێك نەکردبێت ئینجا ئەگەر شێوەکە زمانی دەقێکی ئایینی یا ئەدەبی بووبێت .

بێ گومان هیچ زمانێك نییە ئەگەر زەمینەسازی و پاڵپشتیی ڕێچکە و ڕێسایەکی لە ڕێکخستنیدا بۆ نەکرابێت، زمانی ستانداردی بۆ دروست بووبێت، بەلام لەبەر ئەوەی شێوەی جێبەجێکردنی پێداویستییەکانی بەستانداردکردن بۆ هەر زمانێك لێکدانەوەیەکی تایبەتی هەیە، بۆیە جیاوازیشی خستۆتە نێوان لێکدانەوەکان، چونکە لە هەندێ زمان و نەتەوەدا زەمینەسازی بە شێوەی بەرنامە بۆ دارێژراو بووە وەك تورکی و سویدی ........تاد، هەندێ زمان و نەتەوەی تر بە تێپەڕینی سەردەم و مێژووی دەسەلاتی ئەو میللەتە، بەهۆی پێگەی حوکم و دەسەلات و مێژووی ئەدەبی بەرنامەی ستانداردبوونی بە شێوەیەکی سروشتی بۆ دارێژراوە وەك زمانی ئینگلیزی و فارسی، هەندێ زمانی تر بە هۆی دەقی ئایینی وەك زمانی عەرەبی و عیبری، هەندێ زمانی تر لە ئەنجامی زۆری و دوورکەوتنەوەی شێوەزارەکانیان لەیەکتر هانایان بردۆتە بەر زمانێکی تر وەك هیندی بۆ ئینگلیزی و هەندێ وڵاتی ئەفریقی بۆ فەرەنسی، بەلام لە هەموو حاڵەتەکاندا زەمینەسازی بە پاڵپشتی دەسەلات یەکلاکەرەوەی سەرکەوتن و سەرنەکەوتنی بەرنامەی بە ستانداردکردنی زمانەکانە .

## تەوەری دووەم
## پۆلێنکردنی شێوە گفتوگۆکان و دابەشکردنی شێوە زارەکان

لەپاڵ ئەو ئاریشانەی کە لە ئێستادا بۆتە هۆی ئەوەی کە نەتوانین بە شێوەیەکی رەها رێکبکەوین بۆ دەستنیشانکردنی شێوەزارێك وەك بناغەی ستاندارد بۆ زمانی کوردی بەگشتی، ئەو شێوە دابەشکردنانەیە کە هەموو شێوەزارەکانی بە بێ جیاوازی لەیەك ئاستدا داناوە، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی:

**یەك** / هەموو شێوەزارەکان شێوەی دەربڕینی دەستەواژەکان و بنەما رێزمانییەکانیان بە هاوتا و هاوبڕکێی یەکتر بزانن لە هەڵبژاردنی دەستەواژەکان و هەڵهێنجانی بنەما رێزمانییەکان بۆ دەستوور و بەستانداردکردنی زمانی کوردی .

**دوو** / بیرکردنەوەی زمانەوانانی کورد بەو ئاقارەدا بڕوات کە هەر شێوەزارێك بکەن بە خاوەن بنەمای تایبەت، بە بێ ئەوەی شێوەی گۆڕانی دەستەواژەکان و بنەما رێزمانییەکان لە شێوەزارە نوێیەکان بە شێوەزارێکی کۆنتر ببەستنەوە، بەڵکو راستەوخۆ بەراوردی ئاڤێستای دەکەن، لەم حاڵەتەشدا جیاوازییەکی زۆر دەکەوێتە نێوان لێکدانەوە و شیکردنەوەی بنجی وشەکان، بۆیە ئەگەر دابەشکردنی شێوەزارەکان هەروەکو ئێستا بمێنێتەوە، بێ گومان توێژینەوە و لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکانمان هەر لە چواردەوری ئەو زانیارییانە دەخولێتەوە کە لە کۆنترین سەرچاوەدا ئاماژەی پێکراوە و لێکدانەوەکانی لەسەر بنیاتنراوە، ئەمەش وادەکات کە زۆربەی ئاریشەکانی زمانی کوردی بە ناوازە و تایبەتمەندیی شێوەزارەکان لێك بدەینەوە، نەوەکو گەڕان بەدوای چارەسەرییەکی گونجاو و شیاو بۆ ئاریشەکان.

زمانی کوردی بەچەندین جۆر شێوە گفتوگۆکانی پۆلێنکراوە و شێوەزار و بنەزارەکانی دابەشکراوە، شەرەفخانی بەدلیسی (١٠٠٥ ك) یەکەم مێژوونووسی کوردە کە شێوەزارەکانی زمانی کوردی دابەشکردووە بۆ چوار شێوەی سەرەکی لە روانگەی تیرە و هۆزە کوردییەکان، لە پاشاندا بەهەمان شێوە دابەشکردنەکانی تری بەدوادا هاتووە .

هەروەك دیارە و بەپێی دەرئەنجامەکانیش لە ئێستادا بەدەرکەوتووە، ئەو شێوە دابەشکردنەی کە شەرەفخانی بەدلیسی کردوویەتی و ئەو شێوانەی کە لە

دوای ئـەودا ئەنجامـدراوە زۆر ئاریشـە و گرفتـی بـەدوای خۆیـدا هێنـاوە، چـونکە وایکرد کە زۆربەی شارەزایانی زمـان و مێـژوو جیاکردنـەوە و دابەشـکردنی شـێوە ئاخاوتنەکانی کوردی لە ڕوانگەی بیر و بۆچوونی تایبـەتی خۆیانـدا ئـەنجام بـدەن بەبێ ئەوەی شێوەزارەکان بە ئەرك و بە سەردەمەکانەوە ببەستنەوە، بەڵکو تەنیا جیـاوازیی ئاخـاوتن و شـوێنی نیشـتەجێبوون و سـنووری جـوگرافی (سروشـتی و دەسـتکرد) و کۆمەڵایـەتی ئاخێوەرانیـان ڕەچـاوکردووە، شـێوەزارەکانیان لـە ڕوانگەی تیرە و هۆزە کوردییەکان یا بـە جیـاوازیی ناوچـە و شـار و دەڤـەرەکان لەیەکتر جیاکردۆتەوە، ئەمەش وای لە زمانەوانانی کورد و بیانی کرد، کە هـەردەم وەك چەند شێوەزارێکی پەرتەوازەی بەیەکتر نەبەستراوە لە زمانی کوردی بڕوانن.

لـە ئێسـتادا مێـژوونووس و زمانـەوانان نـاتوانن هـیچ یـەکێك لـە شـێوە دابەشکردنەکانی پـێش خۆیـان یـا دوای خۆیـان بەهەڵـە دابنـێن، چـونکە شـێوەی هەموو دابەشکردنەکان بەپێی چەند پرسیارێك وەڵامـی بـۆ دۆزراوەتـەوە ئـەویش ئایا زمانی کوردی (چەند شێوە گفتوگۆیە؟ چەند شێوەزارە؟ چەند بنەزارە؟)

هەروەك دەزانین هەر پرسیارێك لەم پرسیارانە وەڵامێکی خۆی هەیـە و هـەر وەڵامێکـیش بـۆ پرسـیارێك و بـۆ زمـانی کـوردی بـە گشـتی بـە ڕاسـت دەزانرێـت، دەتـوانین بڵـێین (زمـانی کـوردی لـە چـەند شـێوە گفتوگۆیـەك پێکـدێت/ زمـانی کوردی لە چەندین شێوەزار یا لـە چـەندین بنـەزار پێکـدێت) هـەر وەڵامێکـیش بـۆ پرسیارێك و بۆ زمانی کوردی بەڕاست دەزانرێت، ئەم پرسیارانە لە شـێوەی ئـەو پرسیارانەدایە کە لە پێکهاتەی ساڵیش دەکرێت، کـە دەپرسـین ئایـا سـاڵ (چـەند مانگە؟ چەند ڕۆژە؟ چەند هەفتەیە؟) (ئەگەر بڵـێین سـاڵ دوازدە مانگـە یـا بڵـێین پەنجا و دوو هەفتەیە یا بڵێین سێ سەت و شێست و پێنج ڕۆژە ).

هەر وەڵامێك بۆ ئەم پرسیارانە بەڕاست دەزانرێت ئەگەر لە پێکهاتـەی زمـان یـا سـاڵ بکرێـت، بۆیـە هـەر وەك وەڵامـی پرسـیارەکان هـەموو شـێوە دابەشکردنەکانیش بەڕاست دەزانرێت.

**ئەمانەش هەندێکن لەشێوەی دابەشکردنەکان:**

**یەك/** شەرەفخانی بەدلیسی/// (لوڕ و کەلهوڕ و گۆران و کرمانج)

**دوو/** محەممەد ئەمین زەکی بەگ/// (١-کرمانجی ڕۆژهەلات، ٢- کرمانجی ڕۆژئاوا، ٣- کرمانجی باشووری ڕۆژئاوا)

**سێ/** تۆفیق وەهبی/// (١- کرمانجی شیمالی، بۆتانی و بادینی و هەکاری و بایەزیدی و ئاشتیایی ٢- کرمانجی جنوبی - موکری و سۆرانی و سلێمانی و سنەیی ٣- لوڕی - بەختیاری و فەیلی و کەلهوڕی و مامەسەنی ٤- گۆران - باجەلانی و کاکەیی و زەنگەنە و هەورامی ٥- زازا)

**چوار/** شێخ محەممەدی خاڵ/// (١- زازا ٢- کۆمەڵەی دەستە چەپ - بۆتانی، بادینی، هەکاری، بایەزیدی، شەمدینانی ٣- کۆمەڵەی دەستە ڕاست - سۆرانی، بابانی، موکریانی، ئەردەلانی، کەلهوڕی، گۆران ٤- لوڕی - بەختیاری، لەکی، فەیلی).

**پێنج/** فوئاد حەمە خورشید/// (١- کرمانجی باکوور - بایەزیدی و هەکاری و بۆتانی و شەمدینانی و بادینی و دیالیکتی رۆژئاوا ٢-کرمانجی ناوەڕاست - موکری و سۆرانی و ئەردەلانی و سلێمانی و گەرمیانی ٣-کرمانجی باشوور - لوڕی ڕەسەن و بەختیاری و مامەسەنی و کۆهکۆیی و لەکی و کەلهوڕی ٤-گۆرانی ڕەسەن - هەورەمانی و باجەلانی و زازا)

**شەش/** عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ /// (١- لوڕ ٢- کرمانجی ژووروو - بۆتانی و هەکاری و بادینی و بایەزیدی و ئاشتیایی ٣- گۆران (هەورامی) ٤-کرمانجی خواروو - سۆرانی و سلێمانی و موکری و گەرمیانی ).

**حەفت/** تاهیر سادق/// (١- زازا ٢- لوڕ (بەختیاری و لەکی و فەیلی و رۆژبەیانی ٣- کرمانجی (ژووروو - بۆتانی و بادینی و هەکاری و بایەزیدی و شەمدینانی ) (خواروو - سۆرانی و موکریانی و ئەردەلانی و کەلهوڕی و گۆران).

**هەشت** / محەممەد ئەمین هەورامی/// (١-کرمانجی ژووروو بۆتانی و هەکاری و دیاربەکری و بادینی و ماردینی ٢-کرمانجی ناوەڕاست - سۆرانی و موکریانی و سلێمانی و کەرکووکی ٣- هەورەمانی و لوڕی و باجەلانی و زازایی).

**نۆ** / جەمال نەبەز ///(١- کرمانجی ژووروو - بۆتانی و جەزیری و هەکاری و بادینی و ئاشتەیی و بایەزیدی ٢- کرمانجی ناوەڕاست - سلێمانی و سنەیی و ئەردەلانی و گەرمیانی و هەولێری و کەرکووکی و سۆرانی و موکری و شارباژێڕی و

پشدەری ٣- کرمانجی خواروو - فەیلی و کرمەشانی و لەکی و کەلهوڕی و خانەقینی و لوڕی ٤- گۆران و زازا)........تاد[19].

هەروەك دیارە ئەم دابەشکردنانە هیچ جیاکارییەکیان لە نێوان شێوەگفتوگۆیەکی بنەڕەتی و شێوەزارێکی سەرەکی و بنەزارێکی عەشیرەتی و ناوچەییدا نەکردووە هەروەها هیچ شێوە گفتوگۆیەکیشیان یا شێوە زارێکیشیان بەپێی سەردەمی پەیدابوونیان بە ئەرکێکی زمانەوە نەبەستاوەتەوە، بەڵکو جیاوازی لە نێوان شێوە دابەشکردنەکان تەنیا بەدەرخستنی شێوە ئاخاوتنی زیاتر بووە بەپێی ئاگاداریی مێژوونووس و زمانەوانەکان تا کار گەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی کە بە بەردەوامی شێوەزار و بنەزاری عەشیرەتی و جیاوازی دەربڕینی هەندێ ناوچە و شاری زیاتر خراوەتە لیستی پۆلێن و دابەشکردنەکانەوە .

دەرئەنجامی ئەم شێوە دابەشکردنانە لە ئێستادا زۆر بە ڕوونی کاریگەرییەکانی لەسەر ڕۆشنبیریی زمانەوانی و شێوەی لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکانماندا بەدەرکەوتووە، چونکە وایکردووە کە هەر شێوەزارێك هەڵبژاردنی دەستەواژە و هەڵهێنجانی بنەما ڕێزمانییەکان بە تایبەتمەندیی خۆیەوە گرێبدات، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە توێژینەوە زمانەوانییەکان بەپێی شێوە گفتوگۆکان یا شێوەزارەکان یا بنەزارەکان ئاراستەی سەربەخۆ وەربگرێت و دەستەواژە و بنەما ڕێزمانییەکان لە هەموو شێوەزارەکاندا بکەونە یەك ئاست لە شیاوی و گونجاوی بۆ بە ستانداردکردن، بەڵکو لەوەش زیاتر کاریگەری هەبووە، وایکردووە کە هەندێ بنەزاری ناوچەیی و عەشیرەتیش لەنێو شێوەزارە سەرەکییەکاندا خۆیان بە هاوتای ئەو شێوەزارانە بزانن کە شایستەی بەستانداردبوونن بۆ بەستانداردکردنی زمانی کوردی، بۆیە پێویستە خوێندنەوەیەکی تر بۆ دابەشکردنی شێوەزارەکانی زمانی کوردی بکەین، لە ڕوانگەی کۆن و نوێییدا پۆلێنیان بکەین تا گرفتی خۆ بەهاوتا زانینی شێوەزارەکان نەبێتە بەربەست بۆ بەستانداردکردن .

## کۆن و کۆنتر و نوێیی شێوەزارەکان بە پێی بەڵگە مێژووییەکان

بــە پشتبەســتن بــە بەدەرکــەوتنی بەڵگــە مێــژوویی و دەق و نووســراوە ئەدەبییەکان لە سەردەمە جیاوازەکاندا، بەدەردەکەوێت کە سەردەمی پەیدابوونی هەندێ شێوەگفتوگۆ و شێوەزار و بنەزار کۆنترە یا نوێترە لە هەندێ شێوەی تر .

هەنـدێك لـە شـارەزایانی ئـەدەبی کـوردی لایـان وایـە کـە تێکسـتی شـیعری شـێوەی گـۆران کـۆنترین تێکسـتە لـە ئـەدەبی کـوردی، چـونکە وادادەنـێن کـە سەرەتای مێژووی ئەدەبی کوردی بە شیعری شـێوەی گـۆران دەسـتی پێکـردووە، هەروەها لەبەر ئەوەی شێوەی گۆران لە پێش پەیدابوونی ئیسلامیش زۆر بەڵگـە و ئامۆژگاری ئایینی پێنووسراوەتەوە[٢٠]، (هەندێکی تر لایان وایـە کـە چـوارینەکانی بابـەتاهیری هەمـەدانی (٩٣٥–١٠١٠ز) کـە لـە سـەدەی نۆیـەمی زایینـی نووسـراوە کۆنترین شێوەی کوردییە کە بە شێوەزاری لوڕییـە[٢١]، کۆنترین بەڵگـەی کـوردیی ڕۆژئـاواییش، شـیعرەکانی عــەلی حــەریری و مــەلای جزیــری و فــەقێ تــەیران و ئەحمەدی خانییە کە بۆ سەدەی شازدە و حەڤدەی زایینی دەگەڕێتەوە، کۆنترین بەڵگەی ئەدەبیی کوردی ڕۆژهەڵاتیش شیعرەکانی نـالی و سـالم و کوردییـە کـە بـۆ نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدە دەگەڕێتەوە[٢٢].

لەبــەر ئــەوەی لــە هــیچ سەرچــاوەیەکدا بەڵگــەی هــەبوونی دەق و نووسراوی شێوەزارەکانی ژووروو بەر لە شێوەکانی گۆران و لـوڕ نییـە، سـروودە ئاینییەکانی یارسانەکان تا چوارینەکانی بابەتاهیری هەمەدانی بەو شـێوە زمانەیـە کە لە شێوەزارە کۆنەکانی کوردی دەچن، سەردەمی پەیدابوونیان دەکەوێتە دوای ئاڤێستا و پێش سەدەی نۆیەم ئینجا لـەدوای ئـەم شـێوەزارانە بەڵگـەی نووسـینی شـێوەکانی تـر بەدەرکـەوتوون. زمـانی کـوردیی ڕەسـەنیش ئـەو وشـانەن کـە لـە سەدەی نۆیەمی زایینییـەوە تـا ئـەمڕۆ پەیـدا بووینـە، چـونکە ئـەم جـۆرە وشـانە خاسیەتی وتووێژی کوردییان هەیـە، بـێ گومـان بوونیـان لـە زمـانێکی تـردا ئـەوە نیشان دەدات کە لە زمـانی کـوردی وەرگـیراون[٢٣] ، بۆیـە دەبێـت شـێوەزارەکانی پێش سەدەی نۆیەم هـەروەك کـۆنتر و بناغـە سـەیر بکـرێن لـە دوای سەرچـاوە ئاڤێستاییەکە، کرمانجی ژوورووش وەك کۆنتر لە کرمانجی خوارووی یا ناوەڕاست، چونکە بەهەمان شێوە هیچ بەڵگەیەك نییە کە پێمان بڵێ شێوەی خـواروو بـەر لـە

ژووروو هــەبووبێت، دیــارترین بەڵگــەش لــەپاڵ نــەبوونی دەق و نووســراودا دابەشكردنەكەی شەرەفخانی بەدلیسییە، چونكە ئاماژەی بۆ هیچ شێوەیەكی خواروو نەكردووە .

١- دەستەواژەی **(زار – زاراوە – شێوەگفتوگۆ – شێوە ئاخاوتن – شێوە زمان)** گەورەترە لە شێوەزار و لە بنەزار، چونكە شێوە گفتوگۆ لە چەندین شێوەزار پێكدێت، شێوەزاریش لە چەندین بنەزاری عەشیرەتی و ناوچەیی دروست دەبێت، بۆ نموونە بنەزاری خۆشناوی سەر بە شێوەزاری سۆرانییە، شێوەزاری سۆرانیش سەر بە شێوەگفتوگۆی كرمانجی خوارووە یا ناوەڕاستە، مزووری بنەزارێكە سەر بە شێوەزاری بادینییە، شێوەزاری بادینیش سەر بە شێوە گفتوگۆی كرمانجی ژوورووە.

٢- دەستەواژەی ( **بنچینەی زاراوەیی)** بەواتای ئەوە دێت كە كۆمەڵێك شێوەزار تێكگەیشتنی نێوان ئاخێوەرانی ئاسانترە بە بەراورد لەگەڵ كۆمەڵێك شێوەزاری تر، چونكە هاوگۆیی وشەكان و شێوە و ئاوازی ئاخاوتن و دەربڕینی دەستەواژە و بنەما ڕێزمانییەكانیان لەیەكتر نزیكترە، بۆنموونە: شێوەكانی گۆران (هەورامی و زازاكی ) لوڕ و كەلهوڕ و فەیلی.....تاد لەگەڵ هەموو ئەو شێوەزار و بنەزارانەی كە لەم شێوە گفتۆگۆیانە نزیكن لەگەڵ ئەوەی كە جیاوازیشیان لە نێواندایە، بەڵام نزیكی شێوەی دەربڕینی دەستەواژەكان و بنەما ڕێزمانییەكان و لە یەكترگەیشتنی ئاسانتریان لە نێواندایە بە بەراورد لەگەڵ شێوەكانی ژووروو یا خواروو، بەهەمان شێوە شێوەزار و بنەزارەكانی شێوە گفتوگۆكانی كرمانجی خواروو- ژوورووش هەمان سیفەتیان لە نێواندایە، چونكە ئاخێوەرانی هەر گرووپێك لەگەڵ ئەوەی لە نێوان خۆیاندا هەست بە جیاوازییەكانیان دەكەن، بەڵام ئاخێوەرێكی ئاسایی لە گرووپی بەرامبەردا كەمتر هەست بە جیاوازییەكان دەكات یا لەوانەیە هەر بەیەكیان بزانێت، چونكە تەنیا شێوە گفتوگۆكان لەیەكتر جیادەكاتەوە، بۆ نموونە لەوانەیە گوێگر و ئاخێوەرێكی سۆرانی ئاسایی و نەشارەزا لە جیاوازیی نێوان شێوەزارەكان هەموو شێوەزارەكانی ژووروو بە شێوەیەك بزانێت بە پێچەوانەوەش ئاخێوەرێكی ژوورووش شێوەزارەكانی خواروو

هەر بە شێوەیەك دەزانێت، بەهەمان شێوەش هەردوو شێوەزار، شێوەکانی گۆران و ئەوانی تر بەجیا دەزانن .

کەواتە بە شێوەیەکی گشتی و لە هەموو حاڵەتەکاندا هەر سێ شێوە گفتوگۆ هەمان سیفەتیان هەیە لەگەڵ یەکتر و هەمان هەست و لێکدانەوەیان هەیە بەرانبەر بەشێوە گفتوگۆی جیاواز لە خۆیان .

## کۆن و کۆنتر و نوێیی شێوەزارەکان
## بە پێی دەستووری دروستبوونی چاوگەکان

زمان لە چەند بەشە ئاخاوتنێکی سەرەکی پێکدێت وەك (ناو، ئاوەڵناو، جێناو، ئاوەڵکار و ئامڕازەکان و چاوگ و ئەو پێکهاتانەی کە لە ڕەگی چاوگ دروست دەبن لە کار و بەرکار و بکەری دیار و نادیار و ئەو دەستەواژە فەرهەنگییانەی کە بە لکانی پاشگر و پێشگر و گیرەك بە ڕەگی چاوگەکانەوە پەیدا دەبن)، بەڵام لەبەر ئەوەی چاوگ بابەت و بەشێکی هەرە گرنگە لە زمانەکاندا، بڕبڕەی دروستبوونی زمانی سەربەخۆیە و شادەماری بەیەکتر بەستنەوەی شێوەزارە جوداکانە، بۆیە ئێمە هەموو لێکدانەوەکان بە چاوگەکانەوە دەبەستینەوە بۆ بەدەرخستنی کۆن و کۆنتر و نوێیی شێوەزارەکان، چونکە ئەگەر بەراوردی شێوەی دروستبوونی چاوگەکان بکەین لە زمانی کوردیدا و لە نێوان شێوەزارەکاندا، دەبینین چاوگەکان دەستوور و ڕێڕەوێکی تایبەت وەردەگرن لە شێوەی دروستبوونیان بەپێی پەیدابوونی شێوەزارەکان لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر و لە شێوەزارە کۆنەکانەوە بەرەو شێوەزارە نوێیەکان، شێوە کۆنەکان وەك بناغە چاوگەکان دروست دەکەن، شێوە نوێیەکان کرتان و سوان و گۆڕان لە چاوگەکاندا دەکەن بۆ مەبەستی گونجان بە تایبەتمەندیی شێوەزارە دروستبووەکان لەسەر شێوە کۆنەکان، بەڵام لەبەر ئەوەی تا ئێستا جیاکردنەوەی شێوە گفتوگۆی کۆن و نوێ لە پۆلێنکردن و دابەشکردنی شێوەزارەکاندا نەبۆتە بنەما تا ڕایەڵەی توێژینەوە و لێکدانەوە و بە دواداچوونە زمانەوانییەکانی لەسەر بکرێت، بۆیە هەر شێوە بەکارهێنانێکی چاوگ بە تایبەتمەندی شێوەزارێکەوە لکاوە و پێناسراوە، وەك ئەوەی کە شێوەزارەکان پەیوەندیی دروستبوون و ڕێچکەی گۆڕانەکان تیایاندا

سەربەخۆبێت، بەڵام لە ڕاستیدا دروستبوونی چاوگەکان بە چەند یاسا و ڕێسایەکی بنەڕەتی بەستراوەتەوە کە سەرچاوە و بنەواشەکەی لە شێوە کۆنترەکانەوە هەڵهێنجراوە، شێوە نوێیەکانیش لەم چوارچێوەیە دەرنەچووینە کە زمانی کوردی بەگشتی بنەماکانی لە شێوە کۆنترەکان بۆ دانراوە و بەکارهێنراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی هەر شێوەزارێك بە گوێرەی سەلیقەی ئاخێوەر و ئاوازی شێوەزارەکە ئەم یاسا و ڕێسایەی پەیڕەوکردووە، هەر شێوە گفتوگۆیەك بە شێوەیەك سوودی لەم بنەمایە وەرگرتووە، بۆیە وەك شێوەی جیاواز لەیەکتر بەدەرکەوتوونە.

هەروەك لەپێشتردا گوتمان، دەق و نووسراوە کوردییەکان بەگوێرەی مێژووی بەدەرکەوتنیان، لەدوای سەرچاوە ئاڤێستاییەکەوە، سەردەمی پەیدابوونی شێوەزارەکانمان بۆ بەدەردەخات لە ڕووی کۆن و کۆنتر و نوێیدا، بەهەمان شێوە دەستووری دروستبوونی چاوگەکانیش ئەم ڕاستییە دەسەلمێنن.

بە شێوەیەکی گشتی شێوە کۆنترەکان (گۆران و لوڕ) چاوگەکان بە پاشگری (یان) دروست دەکەن، شێوە کۆنەکان(کرمانجی ژووروو) بەڕێژەیەکی کەمتر، شێوە نوێیەکان (کرمانجی خواروو) بەکارهێنان و بەکارنەهێنانی وەکو یەکی لێ دێت وەك (سووتیان، کوڵیان، فرۆشیان، دڕیان.....تاد [٢٤] ).

بەکارهێنانی پاشگری (یان) لە ئاخاوتندا بەڵگەیەکی تری کۆن و کۆنتر و نوێیی شێوەزارەکانە، بە واتای ئەوەی ئەگەر شێوە گفتوگۆیەك و شێوەزار و بنەزارێك ئەم پاشگرەی بەڕێژەیەکی زۆرتر بەکارهێنا کۆنترە لەو شێوەیەی کە کەمتر بەکاری دەهێنێ، چونکە قۆناغ و مێژووی پەیدابوون و بنەما بنەڕەتییەکانی لە سەرچاوە و بناغەکە نزیکترە، بۆیە کەمتر گۆڕانی بەسەرداهاتووە، بەڵام لەبەر ئەوەی لە سەرچاوە کۆنەکاندا دەورو ڕۆڵی ئەم پاشگرە هەر بە تایبەتمەندیی شێوەزارەکان لێکدراوەتەوە نەوەکو بناغە، بۆیە ئەم پاشگرە بە بێ بایەخی ماوەتەوە و گرنگی پێ نەدراوە، هۆکاریش لەمەدا:

**یەك** / چونکە توێژینەوە لە زمانی کوردیدا لە پلەی یەکەمدا لەلایەن زمانەوانانی شێوەی سۆرانی و بابانی برەوی پێدراوە ئینجا لە شێوەکانی تر، ئەم

پاشگرەش لەم دوو شێوەیەدا بە یەکجاری نەماوە و گەیشتۆتە دوا قۆناغی کرتـان و سوان و گۆڕان .

**دوو**/ ڕێژەی بەکارهێنانی لە نێوان شێوەزار و بنـەزارەکانی نـاو یـەك شـێوە گفتوگۆشدا جیاوازی لێ بەدەر دەکەوێت، بۆنموونە لەشێوە کۆنترەکان، لەشـێوەی لوڕ و کەلهوڕ بە ڕێژەیەکە لە هەورامی و زازاکـی بەڕێژەیـەکی تـرە، لـە شـێوەکانی هەکاری و بادینی بەڕێژەیەکە لە شێوەکانی بایەزیدی و بۆتانی بەڕێژەیـەکی تـرە، لـە شـێوەکانی گـەرمیانی و موکریـانی و ئـەردەڵانی بـە ڕێژەیەکـە لـە شـێوەکانی سۆرانی و بابانی بە یەکجاری نامێنێت .

لەبەر ئەوەی ڕێژەیەکی تەواوی بەکارهێنانی پاشـگری (یـان) لەبـەر دەسـتدا نییە، چونکە لە هیچ سەرچـاوەیەکدا ڕێـژەی بـەکارهێنانی دیـار نـەخراوە و دەورو ڕۆڵـی ئـەم پاشـگرە بەهەنـد وەرنـەگیراوە، هـەروەك تایبەتمەندییـەکی شـێوەزار بەکارهێنانی سەیرکراوە، بۆیە لە ئێستادا نـاتوانین بـە وردی ڕێـژەی بـەکارهێنانی دەستنیشـان بکـەین، بـەڵام دەتـوانین ئەوەنـدە بڵـێین کـە شـێوە کۆنترەکـان بـە ڕێژەیەکی زیاتر ئەم پاشگرە بەکار دەهێنن و دەبنە بناغـە بـۆ هـەڵهێنجانی چـەند بنەمایەکی ڕێزمانی کە لە شێوەکانی ژووروو – خواروو پەیڕەوکراوە.

١– پاشگری (یان) دەبێتە بناغە بۆ نیشانە بنەڕەتییەکانی (ا – ی) چاوگ .

– لە هەندێ چاوگدا (ی) لـە(یان) دەسـوێ بـە نیشـانەی (ا) چـاوگ دروسـت دەبێت وەك (سووتیان، سووتان / گەڕیان، گەڕان....تاد).

– لە هەندێ چاوگی تردا بە پێچەوانەوە (ا) لە یان دەسوێ بە نیشانەی (ی) چاوگ دروست دەبێت وەك (کڕیان، کڕین / دڕیان، دڕین / باریان، بارین ....تاد).

چاوگ لە زمانی کوردیدا بە نیشانەکانی بنەڕەتی (ا–ی) ئینجا بە نیشانەکانی لـەجیاتی ( ت، د ) لەگـەڵ (سـت، شـت) و نیشـانەکانی لاوەکـی (وو، ر) دروسـت دەبێت، بەڵام هەموو چاوگێکی دروستبوو بە نیشانەی لەجیاتی و لاوەکی چـاوگی بەرانبەریان هەیە بە نیشـانە بنەڕەتییـەکانی (ا، ی) لـە یـەکێك لـە شـێوەزارەکانی کوردی و بە تایبەتی لە شێوە کۆنترەکـان بـە مـەرجێك ئەگـەر نـاوازە نـەبێت وەك (پالاوتن، پالوین، پالین، پالزنین/ خوێنـدن، خـوەینین / جـوون، جـووین، جـاین، جاوین / شووشتن، شۆرین / ڕۆیشتن، ڕۆیین / نووستن، نڤین / مرن، مـردن، مـرین

/ هێشتن، هێلان .....تاد) بەڵام مەرج نییە هەموو چاوگێك بەنیشانەی (ا، ی) چاوگی بەرانبەری هەبێت بە نیشانەکانی لەجیاتی و لاوەکی وەك (شێلان، بارین، کڕین، دزین، هێنان، هانین، دان، داین، نان، ناین .... تاد) ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە (ا، ی) نیشانەی بنەڕەتینە بۆ چاوگەکانی زمانی کوردی و بناغەکەی لە پاشگری (یان) دروستبووە[٢٥].

٢– کرتانی (ن) لە( یان) کاری ڕابوردوو دروست دەکات وەك (فرۆشیان – فرۆشیا / سووتیان – سووتیا..... تاد).

٣–گۆڕانی(ن) لە(یان) بۆ (ڕ) لە چاوگە تێپەڕەکان دەبێتە بکەری کۆڵەگەی چاوگ وەك (کڕیان – کڕیار/ ژەنیان– ژەنیار ...... تاد).

٤– گۆڕانی (ن) لە (یان) بۆ ( گ –ی – و) بەپێی بەکارهێنانی لە شێوەزارەکان گۆڕانی بەسەرداهاتووە لە هەمانکاتدا بەپێی واتای چاوگەکە مەبەستی گۆڕان و ئەرکێکی جێبەجێکردووە وەك (سووتیان –سووتیاگ – سووتیای –سووتیاو / فرۆشیان –فرۆشیاگ –فرۆشیای – فرۆشیاو ...... تاد).

٥– بەدانانی (ڕ)ێکی لاواز لە نێوان ڕەگی تێپەڕ و پاشگری (یان) کۆڵەگەی نادیار و بناغەی دۆخی بکەری نادیاری سازدەبێت وەك (فرۆشریان –فرۆشران – فرۆشرا / کوتریان – کوتران – کوترا....... تاد) بەهەمان یاسا چاوگە تێپەڕکراوەکانیش وەك (کولێنران –کولێنرا / شکێنران – شکێنرا......... تاد) بەگۆڕانی (ن) بۆ (و) بەرکار سازدەبێت و دەبێتە (کولێنراو –شکێنراو) .

ئەگەر هەموو شێوەزارەکانی زمانی کوردی بە زادە و هەڵقولاوی سەرچاوەیەك دابنێین، دەبێ درێژکراوەی یەکتریشبن، چونکە شێوە کۆنەکەی بەپێی کاریگەرییەکان گۆڕانی بەسەرداهاتووە ئینجا شێوە نوێیەکانی لێ پەیدابووە، ئەمەش واتای ئەوە دەدات کە شێوە نوێیەکان لەسەر کۆنەکان گۆڕاون، کۆنەکانیش لەسەر کۆنترەکان، کۆنترەکانیش لەسەر ئاڤێستا، ئاڤێستاش بۆ سەرچاوەیەکی لەخۆی کۆنتر کە بە هیندو ئەورووپییەکان ناسراوە.

لە ئەنجامی بەراوردکردنی شێوە گفتوگۆکانی زمانی کوردی بەپێی بەڵگە مێژووییەکان و دەستووری دروستبوونی چاوگەکان بۆمان بەدەردەکەوێت کە زمانی کوردی کۆن و کۆنتر و نوێی هەیە.

ئەگەر شێوەزارەکان لە ڕوانگەی کۆن و نوێییدا یا گۆڕانی دەستەواژەکان بە سەردەمی پەیدابوونی شێوەزارەکان ببەستینەوە، توێژینەوە و بەدواداچوونەکان بۆ زمانی کوردی دەگۆڕێ بۆ پرۆسەیەکی تر، بە لێکدانەوەیەکی جیاواز و پەروەردە بوونێکی گونجاوتر، دەبێتە هۆی خزمەتکردنی زمانەکەمان بە شێوەیەکی ڕاستتر، چونکە ئەم شێوە پۆلێنکردنە دەبێتە بنەما، بە ڕایەڵەیەکی جودا توێژینەوەکانی لەسەر بنیات دەنرێت، زۆربەی ئەو ئاریشە زمانەوانییانەی پێ چارەسەر دەکرێت کە لە ئێستادا بووە بەگرێکوێرە لە زاڵکردنی شێوەزارێکی باڵادەست و هەڵبژاردنی دەستەواژە و هەڵهێنجانی بنەما ڕێزمانییەکان تیایدا بۆ زمانی ستانداردی کوردی، چونکە ئەگەر شێوە گفتوگۆکان و شێوەزارەکانی زمانی کوردی لە ڕوانگەی کۆن و نوێییدا دابەشبکەین، لەم کاتەدا ئەرکی هەر شێوەیەك بە تایبەتمەندییەکەوە دەبەسترێتەوە، ئەمەش وا دەکات کە هەندێ شێوەزار لە هاوبڕکێیەتی ستانداردکردن بچنە دەرەوە، چونکە ئەو مافەیان نامێنێت کە خۆیان بە هاوتا بزانن لە بەرامبەر ئەو شێوەزارەی کە شایانی پشت پێبەستنە لە هەڵبژاردنی دەستەواژەکان و هەڵهێنجانی بنەما ڕێزمانییەکان، چونکە بەگوێرەی بەڵگە مێژووییەکان بەدەردەکەوێت کە شێوە نوێیەکان دوا گەشە و گۆڕانی زمانی کوردییان لێ بەدەردەکەوێت، ئەم تایبەتمەندییەش ئەو شێوەزارە دەکاتە شایستە بۆ پێشەنگی و هەژمارکردن بۆ هەڵبژاردنی وشە و بنەما ڕێزمانییەکان هەروەها ئەم شێوە دابەشکردنە دەبێتە هۆی ئەوەی کە بە گشتی شێوەزارە کۆنترەکان لە هاوکێشەی هاوبڕکێیەتی بچنە دەرەوە بەرانبەر بە شێوەزارە کۆن و نوێیەکان، چونکە گۆڕانی زۆریان بەسەرداهاتووە، ئەم قۆناغەیان بەسەردا تێپەڕیوە تابنە زمانی ستاندارد، بەڵام ئەگەر لە سەدەکانی پێش ئیسلام تا سەدەی نۆیەمی زایینی بیر لە زمانی نەتەوە و دەسەڵاتێکی گشتی بۆ هەموو کورد بکرابایەوە، بێ گومان تاکە شێوە زمانی باڵا و سەرزاری ئەوکات، کە شێوەزارە کۆنترەکان بوون، دەبوونە بناغە بۆ زمانی ستانداردی کوردی، گەشە و گۆڕانی شێوەزارەکانی دواتر ڕوون و ئاشکراتر بەدەردەکەوتن .

## ئاستەکانی دروستبوونی زمانی کوردی

بەپێی سەردەمەکان زمانی کوردی بۆ چوار ئاست دابەش دەبێت هەر ئاستێکیشی بە سەردەمێك و بە ئەرکێکی زمانەوە دەبەسترێتەوە، ئاستی یەکەم ئاڤێستایە کە بە سەرچاوەی زمانی کوردی دەزانرێت، بە تێپەڕینی سەردەم و کاریگەرییەکانی سێ ئاستەکەی تری لەسەر دروستبووە، ئەویش ئەو سێ شێوە گفتوگۆیەیە کە لە ئێستادا نەتەوەی کورد بە هەموو بەشەکانیەوە پێیدەدوێت.

**ئاستی یەکەم** – (ئاڤێستا) وەك سەرچاوەی زمان .

**ئاستی دووەم** – (شێوە گفتوگۆکان) وەك سەرەتای دروستبوونی شێوەی وشە و بنەما ڕێزمانییەکان.

**ئاستی سێیەم** – (شێوەزارەکان) وەك قۆناغی گەشە و گۆڕان .

**ئاستی چوارەم** – (بنەزارەکان) وەك جیابوونەوە لە ئاخاوتندا بە تایبەتمەندیی ناوچە و شار و عەشیرەتەکان .

### دابەشکردنی شێوەزار و بنەزارەکان بەسەر شێوە گفتوگۆکان:

لە ڕاستیدا هەروەك مامۆستا محەممەد عەلی قەرەداغی دەڵێ شێوەزارەکانی زمانی کوردی بۆ سێ شێوە گفتوگۆی سەرەکی دابەش دەبن (گۆران، کرمانجی ژووروو، کرمانجی خواروو)(٢٦).

هەریەکێك لەم سێ شێوە گفتوگۆیە سیفەتی نزیکایەتی و بنچینەی یەك زاراوەییان لەنێواندایە، بۆیە وەك سێ گرووپی جیا بەدەردەکەون، ئەگەر هەر چەند شوێنی جوگرافی و ژینگە و دەسەڵات و سنووری نیشتەجێبوونیشیان لەیەکتر دووربێت .

١– **(شێوە گفتوگۆی کرمانجی ڕەسەن)** نزیکترین شێوە ئاخاوتنە لە سەرچاوە ئاڤێستاییەکە، بۆیە دەبێت بە داڕێژەری بنەما ڕێزمانییەکان و شێوەی بنەڕەتی دەستەواژەکانیان بزانین، ئەم شێوە گفتوگۆیە لە شێوەزارەکانی گۆران بە هەردوو شێوەی (هەورامی و زازاکی)، لوڕی و کەڵهوڕی، لەکی، فەیلی و بەختیاری و مامەسەنی و زەنگەنە و شەبەك و باجەلانی و........ تاد لەگەڵ هەموو ئەو شێوەزار و بنەزارانەی کە لەم شێوە گفتوگۆیە نزیکن، چونکە ئەگەر ئێمە ئاڤێستا بەوردی بخوێنینەوە و بەراورد لەگەڵ هەندێ وشەی ئاڤێستایی و

پارسی کۆن و پارتی و هەورامیدا بکەین، ئـەوەمان بـۆ ڕوون دەبێتـەوە کـە زمانـە کۆنە ئێرانییەکان و لە زاراوەکانی کوردیشدا هەورامی لە هەموویان زیاتر نزیکە لەو زمانەوە کە ئاڤێستای پێ نووسراوەتەوە، ئێستاش زۆرێك لە وشە و دەنگەکانی لە هەورامیدا ماونەتەوە [٢٧]ماموستا هەژاریش دەڵێ زمانی پەهلەوی ماوەی ئەو زمانە کوردییـەی ئێسـتایە کـە بووەتـە زاراوەی کرمـانجی و گـۆرانی و لـوڕی و کـەلوڕی، لـوڕیش لـەوانی تـر لـە پەهلـەوی نـزیکترە، چـونکە لـوڕ کـەمتر تخـوونی کلـدان و ئاشووریان بوون، کەلوڕی و ئەوجار گۆرانی و لە پاشان کرمانجی زۆریان ئاشووری و کلدانی تێکەڵبووە، چونکە هاوسای یەکتر بوون[٢٨] هەروەها فەلەکەددین کاکەیی دەڵـێ بـە بـەراوردێکی تـر دەردەکـەوێ کـە شـێوەزاری گـۆران / هـەورامی درێـژە پێدەری زمانی ئاڤێستایی مادییە، هەروەها زاری زازاکیش هەر وەهایە، هـەر بۆیـە ئـەم دوو زارە لـە زاراوەکـانی دیکـەی کـورد لـە زمـانی ئاڤێسـتا پەهلەوییـەوە نزیکترن[٢٩]هـەروەها مەکـەنزیش لـەو باوەڕەدایـە کـە شـێوەی هـەورامی نـزیکترین زمانە لە ئاڤێستاوە[٣٠].

٢- **(شێوە گفتوگۆی کرمانجی ژووروو)** شێوە ئاخاوتنی کۆنی کوردییـە کـە لەسەر کۆنترین شێوە گۆڕاوە بریتییـە لـە شـێوەزارەکانی (هـەکاری و بایەزیـدی و ئاشتەیی و شەمدینی و بادینی و بۆتانی و........تاد) لەگەڵ ئەو بنەزارە ناوچـەیی و عەشـیرەتیانە وەك (مـزووری و بـەرواری و یەزیـدی و برادۆسـتی و هـەرکی و گەرگەری و کوردەکانی ڕۆژئاوا و لوبنان و ئەرمینیا......... تاد) لەگەڵ هەموو ئەو بنەزارانەی کە لەم شێوەیە نزیکن پێکدێت.

٣- **(شێوە گفتوگۆی کرمانجی خواروو)** نوێترین شێوە ئاخاوتنی کوردییە کە لەسەر کۆنترین شێوە گەشەیکردووە، بریتییە لـە شـێوەزارەکانی (موکریـانی و ئـەردەڵانی و گـەرمیانی و سـۆرانی و بابـانی ) و بنـەزارەکانی وەك (پشـدەری و خۆشناوەتی و شوان و شـارەزووری و شـاربازێڕی و کـۆیی و ...... تـاد) لەگـەڵ هەموو ئەو بنەزارانەی کە لەم شێوەیە نزیکن.

کـە شـێوە گفتوگۆکانمـان لەسـەر ئـەم بناغەیـە پـۆلێنکرد و شـێوەزار و بنەزارەکانمان بەسـەردا دابەشـکردن ئینجـا توێژینـەوە زمانەوانییـەکان دەکەوێتـە

سەر ئەو ڕێڕەوە ڕاستەی کە ئاریشە زمانەوانییەکانی پێ چارەسەر دەکرێت، چونکە دەبێتە هۆی دەرکەوتنی:

**یەك** / ڕێچکەی گۆڕانی دەستەواژە و بنەما ڕێزمانییەکان لە شێوەی کۆنەوە بەرەو نوێ .

**دوو/** ئەرك و دەوری شێوەکان بەپێی سەردەمی پەیدابوونیان، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە بتوانین پێوەر بۆ بەستانداردکردن دابنێین لە هەڵبژاردنی دەستەواژەکان و هەڵهێنجانی بنەما ڕێزمانییەکان، چونکە:

ا- شێوە کۆنەکان دەبنە سەرەتای دروستبوون و جیابوونەوە و بەدەرخەری بناغەی دەستەواژە و بنەما ڕێزمانییەکان .

ب- شێوە نوێیەکان دەبنە دوا قۆناغی گەشە و بەدەرخەری گۆڕانی دەستەواژە و بنەما ڕێزمانییەکان.

## تەوەری سێیەم
## نەخشە ڕێگایەك بۆ بەستانداردکردن

کە شێوەزارەکانمان بەپێی تەوەری دووەم پۆلێن و دابەش کرد، هەر شێوەیەکیشمان بەپێی سەردەمەکان بەئەرکێکی زمانەوە گرێدا بەدەردەکەوێت کە شێوەی (گۆران) کۆنترین شێوەزارە لە نێو کرمانجی ڕەسەندا، بۆیە وەك بناغەی دەستەواژە و بنەما ڕێزمانییەکان و سەرچاوەی گەڕانەوە هەژماری دەکەین، شێوەی (بۆتانی و بابانی)ش هەریەکە لەنێو شێوەی خۆیدا وەك دوا شێوەزاری گۆڕاو و گەشەکردووی دەستەواژە فەرهەنگییەکان و بابەتە ڕێزمانییەکان دادەنێین ئینجا لەم کاتەدا دەتوانین پشت بە پێوەر ببەستین بۆ دەستنیشانکردنی دەستەواژە و بنەماکان لە هەمانکاتدا دەتوانین وەڵامی ئەو پرسیارانەش بدەینەوە کە بە بەردەوامی بیرمەند و زمانەوان و خوێنەر و تاکی کورد لە خۆی دەپرسێت کە ئایا کامە دەستەواژە و یاسای ڕێزمانی شایانی هەڵبژاردنە بۆ بەستانداردکردنی زمانی کوردی، چونکە بەدەردەکەوێت کە کامە وشە و یاسا نزیکترە لە بناغەکە یا کامەی تر گۆڕان و دوورکەوتنەوەی زیاتری بەسەرداهاتووە .

ئەم شێوە پۆلێنکردنە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەگەر توێژەر و زمانەوان لە هەر شێوەزارێکدا بێت، ناچار دەبێت ڕەچاوی شێوەی بنەڕەتی دەستەواژەکان بکات بەپێی دووری و نزیکی لە شێوە کۆنترەکان نەوەکو هەر زمانەوانێك تایبەتمەندی شێوەزارێك یا شێوەزارەکەی خۆی بکاتە بنەما و ڕایەڵەی توێژینەوەکانی لەسەر ئەنجام بدات .

لەم ڕوانگەیەوە هەردوو شێوەی بابانی و بۆتانی دەکەینە پێشەنگی بەراوردی لە هەڵبژاردنی دەستەواژەکان و هەڵهێنجانی بنەما ڕێزمانییەکان، چونکە نوێترین شێوەزارن هەریەکە لەنێو شێوە ئاخاوتنی خۆیدا، بەڵام بۆ چارەسەرکردن و یەکلاییکردنەوەی ئاریشەکان لەکاتی هەڵبژاردنی وشە و هەڵهێنجانی بنەما ڕێزمانییەکاندا دەبێت بگەڕێینەوە بۆ کۆنترین شێوە کە ئەویش شێوەی (گۆران)ە بێجگە لەم تایبەتمەندییە هەردوو شێوەزاری بابانی و بۆتانی چەندین سیفەتی تری هاوبەشیان لە نێواندایە:

**یەك/** هەردوو شێوەزار، شێوەی هاوبەشن بۆ تێگەیشتنی ئاسان، هەریەکە لەنێو شێوە گفتوگۆی خۆیدا .

**دوو/** هەردوو شێوەزار خاوەن مێژوویەکی ئەدەبیی زیندوون، چونکە لە سەردەمی میرنشینەکانیاندا، شێوەزارەکانیان بۆتە شێوەزاری نووسینی ئەدەبی و لە هەمانکاتدا کاریگەرییان لەسەر نووسینی شیعر و شاعیرانی شێوەزارەکانی تریشدا هەبووە، هانی شاعیرو نووسەرانیان داوە تا بە شێوەزارەکانیان بنووسن بە پێچەوانەی میرنشینەکانی تر کە زمان بەلایانەوە ئەو بایەخەی نەبووە .

**سێ/** سەرهەڵدانی بیری نەتەوەیی و خۆ بەکورد زانین لەلایەن میرەکانی بابان و بۆتان .

**چوار/** هەستکردنیان بەگرنگیی زمان و بەکارهێنانی لە دامودەزگای میرنشینەکانیان .

**پێنج/** لە ڕووی دەربڕین و داڕشتنی دەستەواژەکان لەیەکتر نزیکن بە بەراورد لەگەڵ شێوەزارەکانی تر(٣١)

لە ئێستادا ئەو گرفتەی کە ئەم دوو شێوەزارە لەیەکتر جیادەکاتەوە ئەوەیە کە شێوەزارەکانی کرمانجی خواروو تاڕادەیەك شێوەکانی کرمانجی ڕەسەنیش

گرفتی نزیکبوونەوەیان لەگەڵ شێوەی بابانیدا نییە، چونکە نزیکەی سەدەیەك دەبێت شێوەی بابانی لە ڕێگەی خوێندن و نووسین و پێشکەوتنی ئەدەبی و بەکارهێنانی لە دامودەزگای دەسەڵات تا ڕادەیەکی زۆر ئەم بەربەستەی بڕیوە، بەڵام لەبەرئەوەی شێوەکانی ژووروو لە نێویشیاندا شێوەی بۆتانی بە پێچەوانەی شێوەزاری بابانی نزیکەی سەدەیەك دەبێت لەبەر تایبەتمەندیی بارودۆخی کوردستانی باکوور و قەدەغەکردنی زمانی کوردی لەلایەن دەسەڵاتی شۆڤینیزمی تورك ئەم بەربەستەی لەپێشدا ماوە، بۆیە پێویستە لە سەرەتاوە زەمینەسازی بکرێت بۆ ئەوەی شێوەزارەکانی تر لە کرمانجی ژووروودا لە شێوەی بۆتانی نزیك بکرێنەوە، لە خوێندندا بکرێتە زمانی هاوبەش تا ئەویش بکەوێتە ئاستی شێوەی بابانی لە کرمانجی خواروودا.

لەدوای لادان و پاککردنەوەی هەردوو شێوەزار لەو تایبەتمەندییە ناوچەییانەی کە هەیانە ئینجا بکرێن بە پێشەنگی بەراوردی بۆ موتوربەکردن و تێهەڵکێشکردن و هەڵبژاردنی دەستەواژە و هەڵهێنجانی بنەما ڕێزمانییەکان لە هەمانکاتدا بە دەستەواژەی شێوەزارەکانی تر دەوڵەمەند بکرێن بۆ بە ستانداردکردنی زمانی کوردی، ئەم شێوە زمانەش ناو بنرێت شێوەی (**بابۆ**) وەك کورتکراوەی بابانی و بۆتانی .

**یەك – پێوەر بۆ هەڵبژاردنی دەستەواژەکان**

أ– ئەگەر دوو دەستەواژەی سەربەخۆ لە دروستبوون لە نێوان شێوەی بابانی و بۆتانیدا هەبوو، بەڵام هەردووکیان هەمان واتایان هەبوو، دەتوانین بە هاوواتای یەکتر دەستەواژەکە هەژمار بکەین، چونکە لە دەستەواژەیەك زیاتر بۆ زمانی نووسین و ستاندارد نابێتە هۆی لاوازی و جیاوازی هەروەك ئەو جیاوازییانەی کە لە نێوان دوو زمانی سەربەخۆدا هەیە، بەڵکو دەبێتە هۆی دەوڵەمەندبوونی زمانەکەمان .

ب– ئەگەر دوو دەستەواژەی هاوواتا، بەڵام جیاوازی و گۆڕان و ئاڵوگۆڕی پیتیان لەنێواندا بوو، دەبێت شێوەی بابانی بەراوردی شێوەی بۆتانی بکرێت لە پاشاندا بەراوردی کرمانجیی ڕەسەن و شێوەزاری گۆران بکرێت ئینجا ئەو شێوەیە هەڵبژێردرێت کە لە بنەواشەکە نزیکترە یا کەمترین گۆڕانی بەسەرداهاتووە چونکە

لـەم حاڵەتـەدا بەدەردەکـەوێت کـە کامـە شـێوە زیـاتر یـا کـەمتر لـە بناغەکـەی دوورکەوتۆتەوە.

گۆڕان و ئاڵوگۆڕی پیت لە هەموو زمانێکدا بە جیاوازی شێوەزارەکان بەرچاو دەکەوێت، زمانی کوردیش وەك هەر زمانێکی تر لەم دیاردەیە بەدەر نییە، چونکە بە تێپەڕینی کات و کاریگەرییـەکانی ئـاڵوگۆڕی پیتـەکان بۆتـە هـۆی جیـاوازی لـە نێوان شـێوەزارەکاندا، هـەروەك لەئێسـتادا دەبیـنین کـە لـە زۆربـەی حاڵەتەکانـدا گۆڕانی پیتێك لە دەستەواژەیەك، زیاتریش پیتە بزوێنـەکانی (ە، ا، و، ۆ، ی، ێ ) و کەمتر پیتە نەبزوێنەکان شێوەی گۆکردنی دەسـتەواژەکانی بـەگوێرەی ئـاوازی شێوەزارەکە گونجاندووە، بەڵام لەئێستادا هۆکاری ئەم گۆڕانە نە بۆ ئێمە دیـارە و نە بۆ هیچ زمانێکی تـریش، چـونکە ئـەم کـارە کـاری سـەدەیەك و دووان نـەبووە، بەڵکو لە ئەنجامی ئاڵوگۆڕێکی دوورو درێژی زمانەکەماندا بووە، بەڵام لەبەرئـەوەی ئێمەی کورد هەموو شـێوەی دەسـتەواژەکان بـە شـیاو دەزانـین لـە نووسـیندا بـە پێچـەوانەی زمانـە خـاوەن سـتانداردەکان کـە شـێوەیەك بـۆ نووسـین دادەنـێن و شێوەکانی تر بە دەوڵەمەندیی زمان هەژماردەکەن، هۆکاریش لەمـەدا هـەروەك لـە پێشـدا گوتمـان شـێوەی دابەشـکردنی شـێوەزارەکانە کـە دەسـتەواژەی هـەموو شێوەکانی کردووە بە هاوتای یەکتر .

**دوو / پێوەر بۆ هەڵهێنجانی بنەماکان:**

بۆ هەڵهێنجانی بنـەما ڕێزمانییـەکانی ( چـاوگ و کارەکـان و بکـەری دیـار و نادیار و بەرکار و بەکارهێنانی ئەفێکسـەکان لـە نیشـانە و پێشـگر و پاشـگرەکانی گـەردانکردن) و لـە بابەتـە ڕێزمانییـەکانی (ناسـراوی و نەناسـراوی و تـاك و کـۆ و جێناوە لکاو و سەربەخۆیەکان........ تاد) دەبێت تەنیا یـەك بنـەما دەستنیشـان بکرێت، ئەویش بە بەراوردکردنی شێوەی بەکارهێنانی بنەماکە لـە نێـوان شـێوەی بابـانی و بۆتـانی ئینجـا گەڕاندنـەوەی بـۆ نـزیکترین شـێوەی دروسـتبوون و بەکارهێنانی بنەماکە لەشێوە ڕەسەنەکان (گۆران)، چونکە بەکارهێنانی دوو بنەما یا یاسای ڕێزمانی نابێتە هۆی دەوڵەمەنـدبوونی زمـان بـە پێچـەوانەی هەڵبـژاردنی وشـە و دەسـتەواژە فەرهەنگییـەکان، بـەڵکو بـە تێپـەڕینی کـات دەبێتـە هـۆی سەرەتای دابڕان و دوورکەوتنەوەی چەند شێوەزارێك لـەنێو زمـانێکی سـەربەخۆدا بۆ چەند زمانێکی جیاواز .

**سێ / زەمینەسازی و پاڵپشتیی دەسەڵات بۆ بەستانداردکردن**

پاڵپشتیی دەسەڵات بۆ شێوەزارێك و بەکارهێنانی ئەو شێوەیە لە دامودەزگای فەرمانڕەوایەتی و سەپاندنی لە پرۆسەی پەروەردە و خوێندندا وادەکات کە بەرژەوەندیی خۆ نزیککردنەوە و تێکەڵبوونی شێوەزارەکانی تر لە زمانی دەسەڵات ببێتە مەبەستێکی ناچاری بۆ ڕاهیکردنی ژیانی ڕۆژانە، ئەمەش شێوە زمانی دەسەڵات گشتگیر و ئاشنا دەکات بەلای هەموو ئاخێوەرانی ژێر دەسەڵاتەکە ئینجا ئەگەر زمان و شێوەزاری ئەم دەسەڵات و دەسەڵاتدارە شێوەزار و بنەزاری ناوچەیەك و عەشیرەتێکی بالادەستیش بێت.

لەبەر ئەوەی ئێمەی کورد لە کۆندا دەقی ئایینی ئاسانکاری و زەمینەسازی بەستانداردبوونی زمانەکەمانی نەکردووە لە هەمان کاتدا دەسەڵاتێکیش یارمەتیدەرمان نەبووە، بۆیە پێویستە لە ئێستادا لە ڕێگەی پرۆگرامەکانی خوێندنەوە ئەو کەموکوڕیانە پڕبکەینەوە، چونکە ئەگەر پرۆگرامەکانی خوێندن و پەروەردە بەهەست و بەرژەوەندی زمانی نەتەوەیی ڕێکبخرێت، هەنگاوەکانی زەمینەسازی بە بەرنامەی تایبەت و خۆماڵی دابڕێژرێت، بێ گومان لەم حاڵەتەدا پاڵپشتی دەسەڵات دەبێتە مایەی سەرکەوتن و جێبەجێکردنی ئەو پێداویستییانەی کە پێویستە بۆ بە ستانداردکردنی زمانێك بکرێت، چونکە لەم حالەتەدا زەمینەسازی بە پاڵپشتی دەسەڵات هەنگاوە سەرەتاییەکانی بە ستانداردکردنی زمانی لێ بەرهەم دێت، وا دەکات زەمینەسازی بۆ بەستانداردکردن ڕێچکەیەکی ڕاست و ڕەوان وەربگرێت، بەڵام ئەگەر هەنگاوەکانی زەمینەسازی بە پێچەوانە بێت، هەموو بەرنامەکان بە مەبەستی بێ بایەخکردنی زمان و بە نامۆکردن و لێکدابڕینی شێوەزارەکان بێت، توێژینەوەکان بەپێی دەستەواژە و بنەما تایبەتییەکانی شێوەزار و بنەزارەکان ئەنجامبدرێت و هەموو شێوەکان بە هاوتای یەکتر بزانرێت و هەر شێوەیەك ئاراستەی سەربەخۆ وەربگرێت، لەم حاڵەتەدا ئەگەر زەمینەسازی پاڵپشتی دەسەڵاتیشی لەگەڵدابێت ناتوانرێت سوودی لێ وەربگیرێت، چونکە بەستانداردکردن دەبێتە دروشمێك هەروەك قسەی سەرزار هیچ بایەخێکی نامێنێت یا وەك پرۆژەیەکی لێ دێت کە هەرگیز توانای جێبەجێکردنی نابێت، بەڵکو لەم حاڵەتەدا پاڵپشتیی دەسەڵات وا دەکات

کە زمانەکە زیاتر زەرەرمەند بێت، چونکە دەسەڵات دەبێتە پاڵپشتی بەرنامەیەك کە هەرگیز بەستانداردکردنی زمانی لێ بەرهەم ناهێت، بەڵکو هەروەك پیلان و مەبەستی داگیرکەران زیاتر دوورکەوتنەوەی شێوەزار و بنەزارەکانی لێ بەرهەم دێت .

**چوار / هەنگاوەکان :**

**هەنگاوی یەکەم / بایەخدان بە زمانی کوردی و شیرینکردنی بە هەستی نەتەوەیی :**

شیرینکردنی زمان پێویستی بە پاڵپشتیکردنی دەسەڵاتێکی نەتەوەییە کە زمان بەگرنگ بزانێ و بایەخی پێبدات، هەروەها پێویستە ئاخێوەرانی شێوەزارە جوداکان هەست و هۆشیاری نەتەوەییان بە ڕادەیەك بێت کە بەرژەوەندیی بەرز و باڵای نەتەوەکەیان بە تایبەتمەندیی شێوەزارەکانیانەوە نەبەستنەوە .

**هەنگاوی دووەم / دروستکردنی فەرهەنگێکی گشتی** کە وشەی هەموو شێوەزار و بنەزارەکانی تێدابێت، چونکە:

ا- ئەم فەرهەنگە دەبێتە سەرچاوە بۆ بەراوردکردنی چۆنیەتی دروستبوونی وشە و بنەما ڕێزمانییەکان لە شێوە کۆن و ڕەسەنەکان و گۆڕانیان لە شێوە نوێیەکان بەپێی سەردەمەکان.

ب- نەبوونی ئەم فەرهەنگە تا ئێستا بۆ زمانی کوردی بۆتە هۆکارێکی سەرەکی کە لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکانی زیاتر بە تایبەتمەندیی شێوەزار و بەپێی شارەزایی زمانەوانەکان هێشتۆتەوە(٣٢)

**ڕیزبەندی وشەکانیش بەم شێوەیە بێت:**

خشتەی یەکەم دەستەواژەی شێوەزار و بنەزارەکانی شێوە گفتوگۆکانی کرمانجی ڕەسەن ( چاوگ - دەمەکانی کار - بکەری دیار -بکەری نادیار - بەرکار - جێناو - ناسراوی - نەناسراوی - ئاوەڵناو - ئاوەڵکار - بەشەکانی تری ئاخاوتن - وشە فەرهەنگییەکان )ی تێدا بنووسرێ، وشەی هاوواتا لە شێوەزار و بنەزارەکانی تر لە خشتەکانی بەرانبەریدا بنووسرێتەوە بەم شێوەیە:

| وشەکانی (شێوەزارو بنەزار) کرمانجی ڕەسەن | وشەکانی (شێوەزارو بنەزار) کرمانجی ژووروو | وشەکانی (شێوەزارو بنەزار) کرمانجی خواروو | وشەکانی شێوەزاری گۆران | وشەکانی شیوەزاری بۆتان | وشەکانی شێوەزاری بابان |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | |

ئەگەرچی دروستکردنی ئەم فەرهەنگە ئاوات و داواکاری هەموو کوردێکە، بەڵام لە ڕابوردوودا بەهۆی نەبوونی و پاڵپشتی نەکردنی دەسەڵات و نەگونجان و نەڕەخسانی بارودۆخ نەمانەدەتوانی ئەم فەرهەنگە دروستبکەین، بەڵام لە دوای ڕاپەڕینەوە (١٩٩١)، ئەگەر خۆمان خەمسارد نەبوایانیە دەمانتوانی ئەم ئاواتە بهێنینە دی، چونکە هەموو هۆکار و پێداویستییە مادی و مەعنەوییەکانمان لەبەر دەستدا بوو تا بارودۆخ برەخسێنین بۆ کۆکردنەوەی زمانەوانان و فەرهەنگنووسان و شارەزایان لە هەموو شێوەزارەکان بۆ دروستکردنی ئەم فەرهەنگە، بەڵام بە داخەوە لەبەرئەوەی دروستکردنی ئەم فەرهەنگە پاڵپشتیی دەسەڵاتێك و توانادارانی دڵسۆز و بە ئاگای لە گرنگی زمان دەویست، کە ئەوەش نەبوو، بۆیە هەر بە دەستووری ژێر دەستی و ڕابوردوو، بەردەوام بووین لە دروستکردنی ئەو فەرهەنگانەی کە وشەی شێوەزارێك یا دوو شێوەزار و زمانێکی بیانییان دەکردە تەوەر، هەروەك دەریشکەوتووە خزمەتی ئەم فەرهەنگانە لە سنوورێکی دیاریکراودا تێپەڕی نەکردووە، چونکە تەنیا دەبنە ئەرشیفی وشەی شێوەزارێك و دوو شێوەزار و بەراوردی زمانێکی بیانی نەوەکو بۆ زمانی کوردی بەگشتی، ئەمەش هۆکارێکە وایکرد کە لە ڕابووردوو و لە ئێستادا قووڵبوونەوە لە لای توێژیاری کورد و بیانی بۆ زمانی کوردی کەم ببێتەوە، چونکە زەحمەتە بۆ لێکۆڵیارێکی کورد بەر لە بیانی کە شارەزایی تەواوی لە هەموو شێوەزارەکاندا هەبێت، بەبێ ئەوەی سەرچاوەیەکی نووسراوی وەك کەرەستەی خاوی لێکۆڵینەوە و بەراوردکردنی وشەی شێوەزارەکان لە فەرهەنگێکی گشتیدا لەبەردەستدا نەبێت تا بیکا بە سەرچاوە بۆ بە یەکتربەستنەوەی وشەکان لە شێوەی گۆڕان و گەڕاندنەوەی بۆ بنچینەی وشەکان لە کۆنەوە بۆ کۆنتر و لە کۆنترەوە بۆ نوێ. چونکە کە توێژیار و لێکۆڵیاری زمان سەرچاوەیەکی نووسراوی لەبەردەستدا نەبێت لە هەمان کاتدا بێجگە لە شێوەزاری خۆی شارەزایی لە شێوەزارەکانی

تریشـدا نـەبێت، بـێ گومـان توێژینـەوەکانی لەهـەر بابـەتێکی زمانـدابێت هـەردەم بەکرچوکاڵی تەواو دەبێت.

دروسـتکردنی فەرهـەنگی گشـتی بـۆ وشـەی هـەموو شـێوەزارەکانی کـوردی پێداویستییەکە، ئەو کەسەی پاڵپشتی جێبەجێکردنی بکات و هەوڵی دروسـتکردنی بۆ بدات هیچی لەو سەرکردە نەتەوەییانە کـەمتر نابێـت کـە کاریگـەرییان لەسـەر دواڕۆژی نەتەوەکانیاندا هەبووە. چونکە دەبێتە خزمەتێك تا نەتەوەی کورد مابێت قەرزاری ئەو خزمەتە دەبێت .

**هەنگاوی سێیەم** / کتێبەکانی خوێندن تەنیا بـە دوو شـێوەزار بنووسـرێت (بۆتانی – بابانی):

**أ– لە قۆناغەکانی سەرەتاییدا:** هەر شێوە گفتوگۆیەك بە شێوەزاری خـۆی بخوێنێت، شێوەی بۆتانی بـۆ کرمـانجی ژووروو – شـێوەی بابـانی بـۆ کرمـانجی خواروو، شێوە ڕەسەنەکانیش بەپێی ئـارەزووی ئـاخێوەرانی بێـت لـە هەڵبـژاردنی یەکێك لەم دوو شێوەزارە.

مەبەستی سەرەکی لەم قۆناغەدا لە دوای فێربوونی نووسین و خوێندنـەوە و پێدانی زانیاری، گرنگترین بابەت زانینی هاوواتا و دژە واتای دەستەواژەکان بێـت لـە نێـوان شـێوەی بابـانی و بۆتـانی، ئەمـەش بکرێتـە مـەرجێك بـۆ دەرچـوون و دەرنەچوون تاوەکو قوتابیان ئاشنای وشـە و ئاخـاوتنی جیـا لـە شـێوەی خۆیـان بن.

**ب– لـە قۆناغـەکانی دوایيـدا ( ناوەنـدی – ئامـادەیی – زانکـۆ)** لـە پـۆلی حەفتەمەوە باس و بابەتەکان بـەپێی بڕینـی قۆناغـەکان فرەوانبکرێـت، خوێنـدکار ڕابهێنرێـت لەسـەر بـەراوردکردنی وشـە و بنـەما ڕێزمانییـەکان و وەرگێڕانـی بابەتەکان لە نێوان هەردوو شێوەزاردا.

مەبەستی سەرەکی لەم قۆناغەدا زەمینەسازی بێت بۆ تێکگەیشـتنی ئاسـان لە نێوان هەردوو شێوەزاردا، چونکە تێکگەیشتن قۆناغی پێش فێربوونـە و دەبێتـە سـەرەتا بـۆ نزیکبوونـەوە و یـەکتر خوێندنـەوەی هـەردوو شـێوەدا لـەجیاتی دوورکەوتنەوە لەیەکتر و هەستکردن بە نامۆیی لە بەرامبەر یەکتردا .

ج – وەرگێڕانی دەستەواژەکان  لە ڕستەوە دەست پێبکات تا دەگاتە دەق و نووسراو و پەخشان و چیرۆك..... تاد.

ت– بەراوردکردنی بنەما ڕێزمانییەکان بۆ شارەزاکردنی خوێندکاران بێت لە جیاوازییە ڕێزمانییەکان و زانینی ڕێڕەوی گۆڕانەکان لە شێوە کۆنەکانەوە بۆ نوێیەکان لە نوێیەکانیشەوە بۆ کۆنتر و ڕەسەنەکان .

د– لێکدانەوەی دەنگسازی و وشەسازی بۆ پەیوەندی و جیاوازی و گۆڕانی وشەکان لەکۆنەوە بۆ نویێ بەپێی سەردەمەکان بابەتێکی سەرەکی خوێندن بێت.

هـ– قوتابی و خوێندکاران ناچاربکرێن بۆ خۆشارەزاکردن لە شێوەزارەکان بە هاندان و هەوڵدان و خۆماندووکردن و گەڕان بە دوای سەرچاوە زمانەوانییەکان لە فەرهەنگ و تێکەڵبوون و بایەخدان و گوێگرتن لە شێوە جیاوازەکان تا لە دەرئەنجامدا خوێندکارێکی شارەزای لە هەردوو شێوەزاردا لیێ دەربچێت کە تێگەیشتنی ئاسان و ئاخاوتنی  هەردوو شێوەی بەلاوە ئاسایی بێت .

و– مامۆستای زمانی کوردی بە شێوەزارێکی تر شارەزا بکرێت بە هۆی دامەزراندنی لە دەڤەر و ناوچەیەکی جیاواز لە شێوەزاری خۆی .

ر– لەدوای پەروەردەبوونی قوتابی و خوێندکار بەم پرۆگرامە، کۆلیژێکی زمان ئامادە بکرێت (وا باشترە لە جەرگەی هەردوو شێوەزاردا بێت واتە لە سلێمانی و ئامەددا بێت) تا ببێتە هۆی بەرهەمهێنانی مامۆستایەکی شارەزا و ئاشنا  کە بە بەراوردکردنی هەردوو شێوەزار  پەروەردە بووبێت .

لە کۆتاییدا ئەم پەروەردەبوونە  دەبێتە هۆی دروستبوونی ڕۆشنبیرییەکی زمانەوانیی ئاشنا لە نێوان هەردوو شێوەزاردا، کە ڕەنگدانەوەی لەسەر زمانی خێزان و قوتابی و خوێندکار و کاسب و کرێکار و فەرمانبەر و ڕۆشنبیر و نووسەر و هەموو تاکێکی کورددا دەبێت، لە دواتردا ئەم پەروەردەبوونە ئاسانکاری بۆ دروستبوونی زمانی نەتەوەیی و ستاندارد دەکات .

**هەنگاوی چوارەم / سوود لە هۆکارە بینراو و بیستراو و نووسراوەکان وەربگرین .**

زمانی دامودەزگای فەرمانڕەوایەتی و ڕاگەیاندن لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و ڕۆژنامە و گۆڤار و دۆبلاژ و ژێرنووسی ئەڵقە و فیلم و بەرنامەکان بەپێی

نەخشەڕێگایەك لە خزمەتی ئاشنایەتیی نێوان شێوەزارەکان و زەمینەسازی بە ستانداردکردندا بێت.

**هەنگاوی پێنجەم/ وەرگێڕانی سەرچاوە پێویستەکان** بۆ خوێندکارانی زانکۆ لە زمانە بیانییەکانەوە بۆ زمانی کوردی تاوەکو خوێندکاری کورد ناچار نەبێت بە دوای سەرچاوەی بێگانەدا بگەڕێت، چونکە ئەگەر ناچارکرا و دەرچوون و شەهادە و گوزەرانی بە زمانی دووەمەوە بەسترایەوە لەم کاتەدا خوێندکار زمانی دایکی بۆ دەبێتە زمانی دووەم و زمانی بیانی بەلایەوە بایەخدارتر دەبێت.

## ئەنجام

لە کۆتایی ئەم توێژینەوەدا بەم ئەنجامانە گەیشتین:

١– هەبوونی دەسەڵات دەیتوانی هەموو پێناسە نەتەوەییەکانمان یەکگرتوو بکات، بێ گومان یەکێك لە پێناسە هەرە گرنگەکانی هەر میللەتێکیش، زمانەکەیەتی، چونکە پاڵپشتیی دەسەڵات دەبێتە هۆی ڕەخساندنی بارودۆخ و زەمینەسازی بۆ ئاشنایەتی و نزیککردنەوەی شێوەزارەکان لەڕێگەی پڕۆگرامەکانی خوێندندا، ئەمەش گرنگترین خاڵە بۆ سەرکەوتنی ئەو بەرنامەیەی کە بۆ ستانداردکردنی زمانێك دادەڕێژرێت،

٢– ئەگەر ئاڤێستا هەر بە زمانی میدییەکان بمابووایەوە، زمانی کوردی ئێستا پارێزراوتر دەبوو، چونکە گەشە و گۆڕان و بناغەی دەستەواژە و بنەماکانی زمانی کوردی ڕوون و ئاشکراتر بەدەردەکەوت .

٣– وەرگێڕانی ئاڤێستا لە زمانی میدییەکانەوە بۆ پارسەکان، گرنگترین هۆکارە کە ڕێڕەوی مێژوویی بۆ بەرژەوەندیی فارس و زمانی فارسی گۆڕی لە جیاتی کورد و زمانی کوردی.

٤– دەستنیشانکردنی شێوە زمانی کۆن و نوێ خاڵی وەرچەرخانە بۆ توێژینەوە زمانەوانییەکان لە کاتێکدا کە دەیکەن بە سەرچاوەی گەڕانەوە بۆ یەکلاییکردنەوەی گرفتەکان لەکاتی هەڵبژاردنی دەستەواژەکان و هەڵهێنجانی بنەما ڕێزمانییەکان، چونکە هەر شێوەزارێك بەپێی لادان و دوورکەوتنەوە لە شێوە کۆنتر و ڕەسەنەکان دەور و ڕۆڵی دەستنیشان دەبێت .

٥- لە هەر کاتێکدا کە پۆلێنکردنی شێوە گفتوگۆکان و دابەشکردنی شێوەزارەکان بەپێی سەردەمەکان ئەنجامدرا و ڕایەڵەی لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکانی بەدوادا هات و کرا بە بنەواشە بۆ توێژینەوەکان، ئەم هەنگاوە دەبێتە سەرەتایەك، توێژینەوەکان لە تایبەتمەندیی شێوەزارەکان و لەلا ڕێگەیەکی تێکەڵ و نادیار و پەرتەوازەوە دەگوازێتەوە بۆ ڕاستەڕێیەکی ڕوون و فرەوان، چونکە جێگەی جیاوازیی شێوەزارەکانی تێدا دەبێتەوە لە هەمان کاتدا شێوەزارەکانیش بەیەکتر دەبەستێتەوە بەو بەڵگانەی کە سەردەمی پەیدابوونی شێوەزارەکان و دەستووری دروستبوونی چاوگەکان دەکاتە پێوەر بۆ کۆن و کۆنتر و نوێیی دەستەواژەکان تا ببێتە بنەما بۆ لەیەکتر جیابوونەوەی دەور و ڕۆڵی هەر شێوەزارێك بەجیا .

٦- شێوەزاری (گۆران) کۆنترین شێوەزارە لە دوای سەرچاوە ئاڤێستاییەکە، بۆیە بە بناغەی وشە و بنەما ڕێزمانییەکان هەژمار دەکرێت، شێوەزاری (بابانی و بۆتانی) دوا شێوەزاری پەیدابوونە هەریەکە لەنێو شێوە گفتوگۆی خۆیدا، بۆیە دوا گۆڕان و گەشەی زمانی کوردییان لێ بەدەر دەکەوێت.

٧- پەیڕەوکردنی نەخشەڕێگا بۆ بەستانداردکردن لە ڕوانگەی پۆلێنکردنی شێوە گفتوگۆکان و دابەشکردنی شێوەزارەکان و بنەزارەکان بەپێی سەردەمەکان و ڕایەڵەکردنی توێژینەوەکان و جێبەجێکردنی لە پرۆگرامەکانی خوێندندا دەبێتە هۆی نەهێشتنی نامۆیی و یەکتر نەخوێندنەوە و ڕامالینی ئەو گرفتانەی کە لە نێوان شێوەزارەکاندا هەیە، بەڵام بە پێچەوانەوە، مانەوەی ئەم گرفتە دەبێتە ئاڵۆزترین ئاریشە بۆ زمانێك کە هەوڵی ستانداردی بۆ بدرێت، چونکە هەردەم زەمینەسازی بۆ دوورکەوتنەوەی شێوەزارەکان دەڕەخسێنێت لە جیاتی نزیکبوونەوە.

**پەراوێزەکان:**

١- د. رەفیق سابیر ، ناسیونالیزم و کەلتووری کورد، بەشی یەکەم لە کتێبی کولتوور و ناسیونالیزم ، ٢٠٠٥، لا ٥.

٢- د. رەفیق سابیر، بەستانداردکردنی زمان و ئەلفوبێی کوردی، چ٢، چاپخانەی تاران، بڵاوکار، ناوەندی غەزەلنووس،٢٠١٤ ، لا ٣١

٣- نەوشیروان مستەفا ئەمین، بەدەم رێگاوە گوڵ چنین، کتێبی یەکەم، چ٢، دار العربیة للعلوم، بیروت، ٢٠١٢، لا٢٤٣.

٤- جودت هوشیار، ذخائر التراث الکردي في خزائن بطرسبورغ، مطبعة کاروان ، مکتب التفسیر للنشر والاعلان، اربیل،٢٠١١، لا ٨١.

٥- د. رەفیق سابیر، بەستانداردکردنی زمان و ئەلفوبێی کوردی، ٢٠١٤، لا ٢٤.

٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٠ .

٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٠.

٨- د. رەشاد میران، ئیتنۆگرافیا و یەکێتیی ئیتنیکیی کورد، چ١، بڵاوکراوەی ئاراس، ٢٠٠٩، لا ٩٩.

٩- نەوشیروان مستەفا، بەدەم رێگاوە گوڵ چنین، ٢٠١٢، لا ٢٤٣.

١٠- گۆڤاری چریکەی کوردستان، ژمارەکانی (١- ٢- ٣، ٤)، بەرگی ١، ٢٠١١، لا ١٣.

١١- مێژووی میسۆپۆتامیا و زاگرۆس، نووسینی (ماریزان مۆڵە، هێرتز فیلد، گیرشمەن ) وەرگێڕانی بۆ فارسی: زەبیحوڵلا مەنسووری، وەرگێڕانی بۆ کوردی: (ئەردەڵان مام وسوو دزەیی)، چ١، بەرگی٢، چاپخانەی هەولێر، ٢٠١٤، لا ٨.

١٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا٦١.

١٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ٨.

١٤- زەردەشت و ئاڤێستا و فەلسەفەی یەکتاپەرستی، کۆکردنەوە و ئامادەکردنی: فەرهاد عەبدولحەمید پەهلەوان، چ١، ٢٠١٣، چاپخانەی موکریانی، هەولێر، لا ١٧٧.

١٥- نامیق هەورامی، هەورامی و زمانی ئایینی یارسان ، چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، چاپخانەی لەریا، ٢٠١٣، لا ٣٢ .

١٦- زەردەشت و ئاڤێستا و فەلسەفەی یەکتا پەرستی/ کۆکردنەوە و ئامادەکردنی، فەرهاد عەبدولحەمید پەهلەوان ، لا ١٥ .

١٧- نامیق هەورامی، هەورامی و زمانی ئایینی یارسان، لا ٣١.

١٨- مەسعوود محەممەد، زاراوەسازیی پێوانە، چ٢، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١١ ، لا ٢٨٢.

١٩- د. عەبدولواحید دزەیی، زارە کوردییەکان ، چ١، چاپخانەی پاك، هەولێر ،٢٠١١، لا٢١.
٢٠- زمان و ئەدەبی کوردی، لیژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە / پۆلی دەیەم ، چ٣، چاپخانەی ئەکاسیا، هەولێر، ٢٠٠٩، لا ١٢٦.
٢١- د. عیزەدین مستەفا رەسوول ، سەرنجێ لە زمانی ئەدەبی یەکگرتوو، بەغدا، ١٩٧١، لا١٩.
٢٢- بەشێك لە بەرهەمەکانی د. کەمال فوئاد ( زمان و مێژوو) ئامادەکردنی: نەوزاد عەلی ئەحمەد، ٢٠١٣، لا ٤٩.
٢٣- ئەورەحمانی حاجی مارف، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی٣، بەشی٢، ١٩٧٥، لا٢١٧.
٢٤- کازم عەباس عەلی ، گۆڤاری رامان، ژمارە (٢١٠)، شێوەزارەکانی زمانی کوردی لەنێوان کۆن و کۆنتر و نوێدا.
٢٥- کازم عەباس عەلی، چاوگ سەرچاوە و ژێدەرە، چاپخانەی ڕۆژهەلات، چ١، ٢٠١٣، لا٦١.
٢٦- محەممەد عەلی قەرەداغی، کەشکۆڵی کەلەپووری کوردی، چ١، بەرگی١، بەغدا، چاپخانەی الحوادث، ١٩٨٠، لا ١١.
٢٧- نامیق هەورامی، هەورامی زمانی ئایینی یارسان، ٢٠١٣، لا٣١.
٢٨- میر شەرەفخانی بەدلیسی، شەرەفنامە، وەرگێڕانی: مامۆستا هەژار ، چ٦، ناوەندی بڵاوکردنەوە، سنە، کتێبی میدیا، ٢٠١٣، لا ٨٣.
٢٩- نامیق هەورامی، هەورامی و زمانی ئایینی یارسان، ٢٠١٣، لا ٢٥.
٣٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٢.
٣١ -کازم عەباس عەلی، پەیوەندی چاوگەکان لە زاراوە جیاوازەکانی زمانی کوردی، چ١، ٢٠١٤، چاپخانەی ڕۆژهەلات، لا ٥٦.
٣٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ٧٢.

## سەرچاوەکان:

**(بەکوردی):**


١- ئەورەحمانی حاجی مارف، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی٣، بەشی ٢، ١٩٧٥.

٢- بەشێك لە بەرهەمەکانی د، کەمال فوئاد ( زمان و مێژوو) ئامادەکردنی، نەوزاد عەلی ئەحمەد، ٢٠١٣ .

٣- تۆفیق وەهبی، گۆڤاری چریکەی کوردستان، ژمارەکانی (١- ٢-٣ - ٤)، بەرگی ١، ٢٠١١.

٤- د. ڕەفیق سابیر، ناسیونالیزم و کەلتووری کورد، بابەتی ڕووناکبیری، زنجیرەی بڵاوکردنەوە ٣، حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان / لقی هەولێر، بەشی یەکەم لەکتێبی کولتوور و ناسیونالیزم، ٢٠٠٥.

٥- د. ڕەفیق سابیر، بەستانداردکردنی زمان و ئەلفوبێی کوردی، چ٢، چاپخانەی تاران، بڵاوکار، ناوەندی غەزەلنووس، ٢٠١٤ .

٦- د. ڕەشاد میران، ئیتنۆگرافیا و یەکێتی ئیتنیکیی کورد، چ١، بڵاوکراوەی ئاراس، ٢٠٠٩.

٧- د. عەبدولواحید دزەیی، زارە کوردییەکان، چ١، چاپخانەی پاك، هەولێر، ٢٠١١.

٨- د. عیزەدین مستەفا ڕەسوول، سەرنجێ لە زمانی ئەدەبی یەکگرتوو، بەغدا، ١٩٧١.

٩- زمان و ئەدەبی کوردی، لیژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە / پۆلی دەیەم، چ٣، چاپخانەی ئەکاسیا، هەولێر، ٢٠٠٩.

١٠- زەردەشت و ئاڤێستا و فەلسەفەی یەکتاپەرستی/ کۆکردنەوە و ئامادەکردنی، فەرهاد عەبدولحەمید پەهلەوان، چ١، چاپخانەی موکریانی، هەولێر، ٢٠١٣ .

١١- کازم عەباس عەلی ، گۆڤاری رامان، ژمارە (٢١٠)، شێوەزارەکانی زمانی کوردی لە نێوان کۆن و کۆنتر و نوێدا .

١٢- کازم عەباس عەلی، چاوگ سەرچاوە و ژێدەرە، چ١ ، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، ٢٠١٣.

١٣- کازم عەباس عەلی، پەیوەندی چاوگەکان لە زاراوە جیاوازەکانی زمانی کوردی، چ١، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، ٢٠١٤.

١٤- میر شەرەفخانی بەدلیسی، شەرەفنامە / وەرگێڕانی: مامۆستا هەژار ، چ٦، ناوەندی بڵاوکردنەوە، سنە، کتێبی میدیا، ٢٠١٣.

١٥- محەممەد عەلی قەرەداغی، کەشکۆڵی کەلەپووری کوردی، چ١، بەرگی١، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ١٩٨٠.

١٦- مێژووی میسۆپۆتامیا و زاگرۆس، نووسینی: ماریزان مۆڵە، هێرتز فیلد، گیرشمەن، وەرگێڕانی بۆ فارسی، زەبیحوللا مەنسووری، وەرگێڕانی بۆ کوردی: (ئەردەڵان مام وسوو دزەیی)، چ١ ، بەرگی٢، هەولێر، ٢٠١٤.

١٧- مەسعوود محەممەد، زاراوەسازیی پێوانە، هەولێر، چ٢، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، ٢٠١١ .
١٨- نەوشێروان مستەفا، بەدەم ڕێگاوە گوڵ چنین، چ٢، دار العربیة للعلوم، بیروت، کتێبی یەکەم، ٢٠١٢ .
١٩- نامیق هەورامی، هەورامی و زمانی ئایینی یارسان، چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، چاپخانەی لەریا، ٢٠١٣ .

**(بە عارەبی):**

٢٠- جودت هوشیار، ذخائر التراث الكردي في خزائن بطرسبورغ، مطبعة كاروان، مكتب التفسير للنشر والاعلان، اربيل، ٢٠١١.

**ملخص البحث**

هذه الدراسة بعنوان توحد اللغة الكوردية، محاولة او فكرة على شكل خارطة الطريق لمعالجة مشاكل اللغة الكوردية في حالة توحيدها، ويستند هذه الخارطة على ضوء تصنيف وتقسيم اللهجات الكوردية حسب ظهورهما او تكوينهما عبر العصور من القديم الى اقدم ومن اقدم الى جديد، ويتبين مرحلة تكوين اللهجات حسب ظهور الوثائق التاريخية من النصوص والمخطوطات الادبية ودستور تكوين المصادر، لأنه في هذه الحالة نستطيع ان نفرق اللهجات حسب الازمنة ونربط اللهجات بواجبات لغوية، اللهجات القديمة كأساس للكلمات وأسس القواعدية واللهجات الجديدة كآخر مرحلة لتغير الكلمات وأسس القواعدية، وبهذه الطريقة نستطيع ان نستند الى مقاييس لاختيار الكلمات واستنباط أسس القواعدية في حالة التوحيد .

القصد من هذه الدراسة ايجاد طريقة مناسبة لتوحيد اللغة الكوردية حسب خصوصيتها لكي لايطبق عليها خصوصيات اللغات الاخرى، لان اللغة الكوردية كأى لغة اخرى لها خصوصيتها، وهذه الخصوصية مكونة حسب المؤثرات التاريخية عبر العصور على النمو والتغير اللغة الكوردية .

## Abstract

Thisresearch isknown as standardizing the Kurdish language which is an attempt or a concept in a form of a chart to solve the problems of Kurdish language to be standardized.

The plan is shown in classifying idioms and dividing Kurdish dialects according to the age of their existence of idioms according to the historial evidences in literary texts and the constituent of creating bases . Then we connect each idiom with the role of languages.we consider the old forms like the base of grammatical words and the new forms like the last change and development of Kurdish language .

As a result of this plan we indicate several standards for choosing phrases and pulling out the grammatical bases while standardizing them.

The aim of this research is that the Kurdish language with it is speciality such the standardizing languages is going to find the solution so as not to test speciality of other languages Because the Kurdish language has it is own like other languages، this speciality is made according to this historical passage which passed for a long time and had been the effect on the rotation of the development and change of languages

# بەراوردی نێوان زمانی نووسین (کرمانجی ناوەڕاست) و شێوەزاری مزووری باڵا ئاستی (ڕستەسازی) بەنموونە

**پەیمان حەسەن**
بەشی کوردی – کۆلیژی پەروەردەی بنەڕەتی
زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

**پێشەکی**

باسەکە بەراوردی نێوان زمانی نووسین (کرمانجی ناوەڕاست) و شێوەزاری مزووری باڵا ئاستی (ڕستەسازی) بەنموونە، وەرگیراوە.

ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە وەسفی بەراوردکارییە، ئەم لێکۆڵینەوە بەراوردی نێوان زمانی نووسین و شێوەزاری مزووری باڵا دەکات ئاستی ڕستەسازی بەنموونە وەرگیراوە، تاکو هەنگاوێك بێت بۆ ئەوەی ڕێزمانێکی یەکگرتوو بونیات بنرێت بۆ زمانی کوردی، بە چەند تیۆرێکی زمانەوانیی گرنگ کە ئاماژە بە زمانە زیندووەکانی جیهان دەکات وەکو ئینگلیزی و فەرەنسی کە بە هەمان هەنگاوی زمانی ستاندارد بونیات نراون. زمانی نووسین و شێوەزاری مزووری باڵا وەرگیراوە، چونکە زمانی نووسین زیاتر گشتگیرە، زمانی فەرمییە، بەراورد کراوە لەگەڵ شێوەزاری مزووری باڵا چونکە شێوەزاری مزووری باڵا سەر بە کرمانجی سەرووە لە ڕووی زمانەوە، بەلام لە ڕووی جوگرافییەوە لە کرمانجی ناوەڕاست نزیکترینیانە سەبارەت بە کرمانجی سەروو، بۆیە دەکرێت بکرێتە پردێك لە نێوان هەردوو دیالێکتی سەرەکی کرمانجی سەروو و ناوەڕاست تاکو لە بەراوردی لەگەڵ زمانی نووسین زمانێکی یەکگرتوو دروست بکرێت لە ئاستی ڕستەسازی، یەکبخرێت بە جیاوازییەکانی لە ڕووی ڕێزمانەوە دەوڵەمەند بکرێت، هاوبەشییەکان دیاری بکرێت، بۆنموونە ئەگەر دەستەی ڕاناوی سەربەخۆی (ئەن) بۆ زمانی یەکگرتوو زیاد بکرێت، بەم جیاوازییە زمان دەوڵەمەند دەبێت، جیاوازی کەم

دەبێتەوە بەرەو زمانی یەکگرتوو دەڕوات، وەکو زمـانی ئینگلیـزی کـە (will) زیـاد کراوە، لە فەرەنسی (je) زیاد کراوە، تاکو زمانێکی یەکگرتوو بونیات بنێـت، جگـە لەمە زمانەوانەکان جەخت لە بڵاوکردن و گۆڕان و پێشکەوتنی زمان دەکەن، کە لە بەشی یەکەم باسکراوە، لە بەشی دووەم پراکتیککراوە. بەگشتی باسـەکە لـە دوو بەش پێکدێت، هـەر بەشـێك لـە دوو تـەوەر پێکـدێت، لـە بەشـی یەکەمـدا : هـەوڵ دەدرێـت ڕێزمـانی کرمـانجی سـەروو (شـێوەزاری مـزووری بـاڵا) و زمـانی نووسـین لەڕێگەی چەند تیۆرێکی زمانەوانی نزیکیان بکاتەوە، تاکو گونجان لەنێوان هەردوو دیالێکتی سەروو و ناوەڕاست دروست بکات، بۆ ئەوەی زمانێکی پێوانەی ستاندارد دروست بکرێت بۆ بەستانداربوونی ڕێزمانی زمانی کوردی.

لە بەشی دووەمدا: زمـانی نووسـین لەگـەڵ شـێوەزاری مـزووری بـاڵا بـەراورد دەکرێت، لەڕووی ڕێزمانەوە، بەهۆی ئەم بەراوردە نزیکی و هاوبەشی دیار دەبێت، ئینجا لە ڕێگای تیۆر و ئەزموونی زمانە زیندووەکانی جیهان پێشـنیازی یـەکگرتنی هەنـدێ یاسـای ڕێزمـانی دەکرێـت دواتـر لـە نووسـین و میـدیا و بڵاوکراوەکـان و ئاخاوتن بەکاردەهێنرێت، تاکو ئاخێوەری زمانی کوردی بەکاری بهێنێت، بـە یاسـا و ڕێسای نـوێ و یـەکگرتوو بـدوێت، چـونکە زمـانیش وەکـو هـەموو شـتەکانی تـر پێویستی بـە نوێبوونـەوە و گونجانـدن هەیـە، بـەم شـێوەیە زمـان خـۆی لـەڕووی یاسای ڕێزمانی یەکدەگرێت، زمانێکی پێوانەیی و ستانداردی لێ پەیدا دەبێت.

هەروەکو لە زمانی ئینگلیزی هەندێ یاسای ڕێزمانی زمانەکـە زیـاد کـراوە و بەکارهاتووە، بووە بە یاسا و جێگیر بووە، لە زمانی کوردیش بەهـەمان شـێوەیە، ئەوەی زیاتر جیاوازی ڕێزمـانی نێـوان هـەردوو دیـالێکتی دروسـت کـردووە، زیـاتر "کۆمەڵەی ڕاناوی سەربەخۆی دەستەی ئاسایی (ئەزە) "ئەگەر لەهەردوو دیالێکت بەکاربێت وەکو چۆن؟ لە زمانی ئینگلیزی کە (will) دانراوە، ئەو کاتـە جیـاوازی نابێت، دەبێت بە یەك دەستوور و بۆ ڕێزمانی زمانی کوردی پێوانـەیی (سـتاندارد) هەنگاو دەنێت.

# بەشی یەکەم

## تەوەری یەکەم:

## شرۆڤە و پێوانەکردنی ڕێزمانی یەکگرتووی زمانی کوردی:

لەم بەشەدا تیۆر و ئەزموونی زیندووی بەستاندارد بوونی یاسا و ڕێساکانی زمان دیاری دەکەین، تاکو بۆ زمانی کوردی بەکاری بهێنین و ببن بە هەنگاوێکی پراکتیکی و ئەکتیف لە زماندا، بۆ ئەوەی ڕێزمانی زمانی کوردی بەرەو ستانداردبوون بچێت، هەموو ئاخێوەرێکی زمانی کوردی تێیبگات و بەکاریبهێنێت. لە ڕێگەی ئەم ئەزموونانە زمانی پێوانەیی دروست دەکرێت، زمان بەرەو پێشکەوتن و ڕێکخستنی تازە دەچێت، لە هەمان کاتدا زمانێکی ستاندارد و پێوانەیی دروست دەبێت کە هەردوو دیالێکتی سەرەکی "کرمانجی سەروو و ناوەڕاست" بەکاریبهێنێت و کاری پێبکات، کە ئەمانەن:

**یەکەم / کوینتان: (شرۆڤە کردنی زمان):**

لەگەڵ بەسەرچوونی کات زمان دەگۆڕێت، ناکرێت بگوترێت تەنیا دەستەواژە کۆنەکان ڕاستن، چونکە زمانی ڕاست، ئەو زمانەیە کە زۆربەی ئاخێوەرانی لێی تێبگەن، زۆر جەختکردنەوە لە زمانی کۆن شتێکی شیاو و باش نییە بۆ زمان (هاریس، تیلر:٢٠٠٤:١٨٨)

هەر زمانێك توانی خۆی شرۆڤە بکات، ئەوە یەکدەخرێت لەگەڵ هێزی بونیاتنان، خۆی نوێدەکاتەوە، ئامانجەکانی بە دەست دێنێ (چاکوب:٢٠٠٢:٢٥٤) هەروەکو (هیگل) ئاماژەی پێدەکات:" هەموو شتێك لە بازنەی پێشکەوتندایە" هەروەها وەسفکردنی سروشتی زمان پەیوەندی بە زمانەوانییەوە نییە، بەڵکو کۆمەڵێك یاسا و پێوانەیە و پەیوەندی بە کۆمەڵگایەکی دیارکراوەوە هەیە (لیونارد، ٢٠٠٨:١٥٧)، واتە نابێت تەنیا یاسا کۆنەکان ڕاست بن، بەڵکو زمان لەگەڵ هەموو دیالێکتەکان هەیە دەتوانرێت وەسفبکرێت و شرۆڤە بکرێت، خۆی پێشبکەوێت، بەپێی ئەو یاسا و پێوانانەی کە لە هەموو دیالێکتەکاندا هەیە، ئەرکی زمانەوان، یەکخستنی هەموو دیالێکتەکانە، نەك تەنها دیاریکردنی یەك جۆر، چونکە دیالێکتەکان پێوانەی زیاتری تێدا هەیە کە هەموو پێکهاتەکانی کۆمەڵگا دەگرێتەوە.

**دووەم / ئەندریە چاكوب: ( بونیاتنانەوەی زمان):**

پاراوكردنی زمان لە ڕێگای بونیاتنانەوەی نوێوەیە، بەپێی كات، كۆمەڵگا لە پەیوەندیكردنی زمانییەوەیە، ناكرێت بۆ ئەوەی زمانێكی پێوانەیی بەرهەم بهێنین، زمانی لەجیاتی بەكاربهێنین، بەڵكو دەبێت زمان شرۆڤە بكرێت لە سەر ئاستی تیۆری، ئینجا یاسا و بونیاتەكان وەردەگیرێن، لە ئاستی پراكتیك بەكاردێت (چاكوب :٢٥٣:٢٠٠٢) مەبەست پاراوكردنی هەموو دیالێكتەكانە بە یەكەوە نەك تەنها یەك شێوەزار یان یەك دیالێكت بەكاربێت، لە جیاتی هەموو زمانەكە بەڵكو كاری بونیات پێویستە، ئەمەش بە بەراورد و نزیككردنەوە دەبێت.

واتە نابێت ڕستەی چەند شێوەزارێك لەگەڵ یەكتری بەكاربهێنرێت، هەروەكو ئەم ڕێچكەیە لە پرۆسەی فێركردنی زمانی كوردی هەیە، چونكە ئەمە جیاوازی نیشان دەدات لەوەی نزیكی، بەڵكو وەكو (چاكوب) ئاماژەی پێكردووە، دەبێت یاساكانی زمان شرۆڤە بكرێت، بەیاسای نوێ زمان دابڕێژرێت ئینجا بەكاربهێنرێت.

بلووركردن و پاراوكردن پێویستییەكە بۆ زمان، تاكو زمان بونیات بنێت بە شێوەیەكی نوێ، جا ئەگەر گوێزانەوە و گۆڕانەكان هەبێت، زمان خۆی نوێ دەكاتەوە، زمان خۆی بانگێشەی بونیات دەكات، بەهۆی كەسەكان بۆ پێشكەوتنی خودی زمان بەئاراستەی جیاواز، لەو كاتەوە زمانی تاكە كەسی یان چین داخراو دەبێت، زمان بەرەو هەرەمی لووتكەی كۆمەڵگا بەرز دەبێتەوە (كە نزیكە لەزمانی گشتی و زمانی ستاندارد) (چاكوب:٢٠٠٢، ٢٥٤) مەبەست بژاركردن واتە: وەكو چۆن؟ مادەی كیمیایی بلووردەكرێت و ورد و درشت جیادەكرێتەوە، لێرەدا بێ خەوشكردنی زمانە، بۆیە پاراوكردنی زمانی بەدوایدا دێت، واتە زمانی هەموو دیالێكتەكان بەراورد بكرێت (كە ئەمە هەنگاوێكە) و بلووربكرێت و پاراو بكرێت لەگەڵ پرۆسەی گۆڕان، هەروەها زمان خۆی دەگۆڕێت، بۆیە پێویستی بە كاركردن هەیە لەگەڵ گۆڕانەكە.

هەر زمانێك بۆ ئەوەی ببووژێتەوە دەبێت هاوبەش بێت و یەكبخرێت، زوو بەرەو پێشكەوتن دەچێت، ئەمەش لەڕووی زانستییەوە بەزۆری لەڕێگای كاركردنی دەبێت،، ئینجا زمانی سەرەكی دروست دەبێت، هەموو قسەكەرانی بەكاریدەهێنن، چونكە شیاوترینیان دەبێت لەڕووی زمانەوە (نیقولاس:٥٠:٢٠١١)، ئەگەر دەستەی

ڕاناوی (ئەز) زیاد بکەین بۆ هاوبەشی و یەکخستنی زمانی کوردی زمانی نوێ دروست دەبێت. زمان پێویستییەکە بۆ مرۆڤ، دەتوانرێت دروست بکرێت بەو ڕێگایەی کە هەیە و هەڵگری دیموکراتییە، ئەمەش بێگومان بە دەرخستنی هاوبەشی دەبێت لەڕووی زانستی بۆ کۆمەڵگا مرۆڤایەتییەکان، کە سەنتەرێك دەبێت بۆ هەموو جیاوازییەکان بۆ قسەکردن (چاکوب:٢٠٠٢:٢٥٤) چونکە زمان ناسنامەی پێکهاتەکانی کۆمەڵگا و ئاخێوەرەکانی دیاری دەکات، لە تێگەیشتنی یەکتری، زمان دەبێت کاری بۆ بکرێت، تەنیا ئامرازێك نییە بۆ ئاخاوتن، بەڵکو ناسنامەیەکی گرنگ و جیاوازە. (نیقولاس :٢٠١١:٤٦) بۆ نموونە: ئەگەر هەردوو دیالێکت یەکبخەین.

من گوڵێکی زۆر جوان دەچێنم (زمانی نووسین)

ئەز گولەکا زوور جان دێ چینم ( کرمانجی سەروو)

ئەز گوڵێکی زۆر جوان (زوور جان) دەچێنم (دێ چینم) (یەکخستنی هەردووکیان)

دەستەی (ئەز) زیادکراوە بۆ زمانی نووسین بێ ئەوەی واتای ڕستە و پێکهاتەی ڕێزمانی لە زمانی ئاسایی لابدات بۆ دیالێکتی سەروو و زمانی نووسین، بەکارهێنانی وشەکانی بەشی ناو (فرێزی ناوی) دەکرێت بەپێی توانستی ئاخێوەر بێت وەکو زمانی ئینگلیزی بەریتانی و ئینگلیزی ئەمەریکی یەك یاسای زمانی هەیە بە هەڵبژاردنی چۆنیەتی دەربڕینی وشەکان بەپێی ئاخێوەرانی دەگۆڕێت. ئەمەش شتێکی ئاساییە.

**سێیەم/ سۆسێر: ( پێوانە کردنی زمان) :**

هەر ڕێکخستنێك لە یاساکانی زماندا بکرێت دەبێت بەپێی شێوەزار و دیالێکتەکانی زمان ڕێکبخرێتەوە، ئەمە خۆی لەخۆیدا ڕێچکەیەکی دروست وەردەگیرێت بۆ ئەو سەردەمە، ناهێڵێت هەڵەکانی سەدەکانی ڕابردوو دووبارە ببێتەوە (واتە یاسای تازە بەپێی دیالێکتەکانی زمان ڕێکخستنیان بۆ بکرێت) ئەم پێشکەوتنە زمانەوانییە هەر لە سەدەی نۆزدەهەم هەبووە بۆ زانینی بابەتە زمانەوانییەکان و دیاریکردنی پێوانەکانی زمان، لەوکاتەوە بوو کە توێژینەوەیان لەسەر هەموو وردەکاری و گۆڕانکارییەکانی زمانەوانییان دەکرد لە شێوازی

قسەکردنی زار و شێوەزارەکانی پێکهاتەکانی کۆمەڵگا و دیالێکتەکانی زمان، لە دواییدا هەموو ئەو گۆڕانکارییە زمانەوانییانە دیار بوون کە لە دیالێکتەکاندا هەیە، لەهەمان کاتدا هەمان شتە بەجێماوەکان لەگەڵ پێوانەی فەرمیی زمان بە ڕێژەیەکی زۆر بەتایبەتی ئاخاوتنەکانی کۆمەڵگا (شعبی، گەلەری) هەموویان یەك مەیل یەك پێوانەی زمانەوانی هەیە، کە ئەمەش وای لە سۆسێر کرد ڕەخنە لە ئەوانە بگرێت کە جیاوازی دەخەنە پێکهاتەی ئاخێوەرەکانی کۆمەڵگا، هەروەها ئەوانەی کە ناوێزەیی (نامۆ) دەخەنە ناو پێوانەکانی یاسای زمان، کە پێچەوانەیە لەگەڵ (یاسا پێوانەیەکانی زمان) چونکە پێوانە کۆمەڵە سیمایەکە ڕێگا دەدات هەموو پێکهاتەکان دیار بکات، بەیەکەوە بیانبەستێتەوە، هەموو ڕەگەزەکانی بەیەکەوە بناسرێنەوە. (دیکرۆ، سشایفر، ٢٠٠٣: ٢٨٣) (واتە ئەو جیاوازییەی کە هەیە هەموویان یەك سەرچاوەی پێوانەی دەستووری زمانیان هەیە) هەروەکو تروبستکۆی دەڵێت : "زمان ئامرازێکە ڕێکخراوە تاکو گوزارشت لە هزر بکات" (هەمان سەرچاوە :٥٢) هەروەکو زمانی ئینگلیزی زۆر بەباشی ڕێکخراوە بەپێوانەی زۆر ورد، ئەمەش ڕێزمان و وشەکان دەگرێتەوە (جون لوینز، ٢٠٠٩: ٢٥٠) بۆ ڕێکخستنی ڕێزمانی پێوانەیی لە بۆ زمانی ئینگلیزی بۆ کاتی داهاتوو (will) دانراوە تاکو، زمانێکی پێوانەیی ڕێکبخرێت، ئەمەش بەشێوەیەکی زۆر پێوانەیی و ستاندارد ڕێکخراوە (هەمان سەرچاوەی پێشوو: ٢٥١)، هەروەها لە زمانی فەرەنسی (je) بۆ دروستکردنی زمانی فەرەنسی پێوانەیی دانراوە (چاکوب:٢٠٠٢:٢٥٤) کەواتە بۆ زمانی کوردیش دەتوانرێت ڕاناوی سەربەخۆی کۆمەڵەی (ئەن) دابنرێت جیاوازی ڕێزمانی بۆ ڕێزمانێکی هاوبەش ڕێکدەخرێت.

**چوارەم/ لۆسرکل (زمان بەرەو گۆڕان دەچێت):**

ڕێزمان توانای گۆڕانی هەیە، یاساکانی زمان سروشتی گۆڕانی هەیە وەکو یاساکانی سروشت نییە توانای گۆڕانی نەبێت، هەروەها یاسایەك نییە نەگۆڕ بێت، دەتوانرێت ڕێزمانێکی ستاندارد دروست بکرێت (لوسرکل :٢٠٠٦:٦٩) زمان لە حاڵەتێکی یاسایی و دەستووری بۆ حاڵەتێکی تر دەگۆڕێت بە پێکهاتەکانی ئاخێوەرەکانی کۆمەڵگایەکەی، هەروەکو لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم (هیلمیسلف) لەو باوەڕەدابوو (تەنسیق کردنی زمان یان، ڕێکخستنەوە،

نوێکردنــەوە، وێنەکردنــەوەی زمــان ) بــە پەیکــەر (بونیــاد) و لــۆژیکێکی بــاش دادەنرێت، چونکە ئەمە نوێنەرایـەتی هــەموو پێکهاتــەکان دەکـات بـە شـێوەیەکی سەربەخۆ، هەر پێوانەیەك بەپێی ئاخاوتن بەخورتی کرا (اجباری) ئەوە شەرعیەتی لــە بەرهــەمهێنانی ئاخــاوتنی ئاخێوەرەکــانی وەردەگرێــت (دیکــرۆ، سشــایفر: ٢٨٤:٢٠٠٣).

**پێنجەم/ بەرهەمهێنان (چۆمسکی):**

هەر زمانێك دەکرێت بە یاسـای نـوێ بەرهــەم بهێنرێـت، ئەنترۆپۆلۆجییـەکان دەیانگوت: " زمانی ئاخێوەرەکان دەبێـت وەکـو خـۆی بێـت ناکرێـت دەسـتکاری بکرێـت چـونکە گوزارشـت لـە کـردە و بابەتـەکان دەکـات". (لیونـارد جاکسـون، ١٤٣:١٩٩١) بــەلأم زمانەوانــەکانی ڕێزمــانی بەرهــەمهێنان کــارێکی مەیــدانیی فراوانیان کرد، بەگشتی وەسفی هــەموو دیالێکتــەکانیان کـرد. هــەروەها ڕێزمـانی بەرهەمهێنان سەلماندوویان کە توانییـان بـە ئـەژمار وەسـفێکی گشـتی پێشـکەش بکەن کـە ئەگـەری هەڵبـژاردنی تێـدا هەیـە (هــەمان سەرچـاوەی پێشـوو) زانسـتە مەعریفییەکان شــەرعیەتی خۆیـان لــە ڕێگـای داهێنــان دروسـت دەکــەن (لوسـرکل :٢٠٠٦،٦٩)، واتــە زمانەوانــەکانی بەرهــەمهێنان هــەموو شـێوەزارە جیاوازەکــانی کۆمەڵگای وەرگرت بە شێوەیەکی نوێ و گشتی ڕێکخست تـاکو هــەموو بەشــەکانی بەگشــتی بگرێتــە خــۆی، چــونکە ڕێزمــان تــەنیا گەیانــدنی مانــا نییــە، بــەڵکو کەڵەکـەبوونی کۆمەلأیەتییــە، هــەروەها گەنجینەیەکـە لــە یاسـا و نــەریت، تــەنیا بەرنامەیــەك نییــە لای ئــاخێوەر (لوســرکل :٢٠٠٦:٦٩) هــەروەکو زمانەوانــەکانی ڕێزمانی بەرهەمهێنان باس لە زمانی فەرەنسی دەکەن دەڵێن : "دەسـتەواژەکانی ڕێزمانی فەرەنسی لای هەندێ ئـاخێوەر پەسـندە لای هەنـدێکی تـر پەسـند نییـە، ناکرێـت بوترێـت کامیــان ڕاســتە، بــەڵکو دوو فەرەنســی جیــاواز هەیــە، دەبێــت هەردووکیان بە ڕێزمانی بەرهــەمهێنانی وەسـف بکرێـت، یـاخود جـۆرێکی تایبــەتی دابنرێت کە یاسایەکی گشتی زمانەکەیە" (دیکرۆ، سشایفر:٢٨٧:٢٠٠٣) واتە زمانی فەرەنسی بە هۆی ڕێزمانی بەرهەمهێنان یاسـاکان و دەسـتەواژەکانی لـە ژێـر یـەك زمانی ستاندارد پێوانە کراوە کۆکراوەتەوە کە هەموو پێکهاتەکانی زمـانی تێدایـە، دەستەواژەی هەموو ئاخێوەرەکان بـە یاسـای گشـتی بەرهــەم هێنـراوە، پێوانــە و ستاندارد کراوە.

**تەوەری دووەم:**

**هەنگاوەکانی ڕێزمانی گشتی زمانی کوردی:**

١. هـەنگاوی یەکـەم بـەپێی بۆچـوونی (کوینتـان) پێویسـتە ڕێزمـانێکی یـەکگرتوو پێشـکەوتوو کـە هەیـە کۆبکرێتـەوە و دروسـت بکرێـت، تـاکو هـەموو ئاخێوەرەکـان بـەکاریبهێنێت و لێتێبگـات، چـونکە یاسـا و دەسـتووری زمـان لـە پێکهاتەی زمانی کۆمەڵگا وەردەگیرێت.

٢. دووەم هەنگاو بەپێی بۆچوونی (ئەندریـە چـاکوب) دەبێـت زمـانی هـەموو ئاخێوەرەکان بـەکاربێت و شـرۆڤە بکرێـت، بـەپێی یاسـا و دەسـتووری هاوبـەش ڕێکبخرێت، تاکو ڕێزمانی گشتی بەرهەم بهێنرێت.

٣. هەنگاوی سێیەم بەپێی بۆچـوونی (سۆسـێر) زمـانی هـەموو دیالێکتـەکان وەربگیرێت، بەپێی پێوانەی نوێ زمانی دیالێکتەکان ڕێکبخرێت.

٤. هەنگاوی چوارەم بـەپێی بۆچـوونی (لۆسـرکل) یاسـاکانی هـەموو زمانێـك دەتوانێت خۆی نوێبکاتەوە، شەرعیەتی هەموو یاسا زمانییـەکان لـە ئـاخێوەرانی زمان وەردەگیرێت.

٥. هـەنگاوی پێنجـەم بـەپێی (چۆمسـکی ) و ڕێزمـانی بەرهـەمهێنانی زمـان دەتوانرێت خۆی بەرهەم بهێنێتەوە.

کەواتە بەپێی هەموو بۆچـوونەکان بـۆ دروسـتکردنی ڕێزمـانی گشـتی زمـان، زمانی گشتی دیالێکتەکان بەگشتی وەربگیرێت، بەپێی یاسـا و دەسـتووری گشـتی دیالێکتـــەکان ڕێکبخرێتـــەوە، چـــونکە زمـــان بـــەردەوام لـــە بەرهـــەمهێنان و نوێبوونەوەدایە. ئەمەش لە بەشی دووەمی پراکتیکی دەتوانرێت ڕێکبخرێت.

## بەشی دووەم

### تەوەری یەكەم:

### بەراوردی نێوان زمانی نووسین و شێوەزاری مزووری باڵا (ئاستی ڕستەسازی):

لە ئاستی ڕێزمان/ ڕستەسازی لە شێوەزاری مزووری باڵا جیاوازە لە زمانی نووسین وەكو كرمانجی سەروویە، كە بەزۆری لە ڕاناوەكانە كە ئەمەش وای كردووە لە پێكهاتەی شێوەی كارەكە جیاواز بێ، لە شێوەی ڕیزكردنی پێكهاتەكانی ڕستە تاڕادەیەك جیاواز بێت، لە ڕستەسازی جیاوازی كەمترە وەكو لە وشەسازی و دەنگسازی ئەو گۆڕانەی كە تێدا دیارە گۆڕانی دەنگ و وشەیە، وەكو كە زۆربەی زۆری دەنگەكان دەسوێن یان دەگۆڕێن، لە وشەسازی چاوگی دالی كەمترە، چونكە دال دەسوێت و دوو جۆر ڕاناوی سەربەخۆمان هەیە و یەك جۆری ڕاناوی لكاو هەیە، كە ئەمانەش وادەكەن گۆڕانەكە لە ڕستە بەدیار بكەوێت.

**ڕستە**

ڕستە گەورەترین دانەی (ڕێزمانی)ی زمانە، ئامانجی هەرە سەرەكی ڕێزمان پێناسینی ڕستەیە، ڕستەش پێ ناناسرێت بێ پێناسین و دەستنیشانكردنی سروشت و چۆنیەتی هەموو ئەو كەرەسانەی دروستی دەكەن و جۆری پەیوەندیی نێوانیان لەناو چوارچێوەی ڕستەدا، سادەترین ڕستە لە دوو فرێز پێكدێت (وریا عومەر ئەمین،٢٠٠٤: ١٩٨) فرێزی ناوی، فرێزی كاری.

**یەكەم / فرێزی ناوی:**

ئەو بەشە سەرەكییەی ڕستەیە كە لە ناوێك یان ڕاناوێك پێكدێت، سادەترین فرێزی ناوی لە ناوێك یان ڕاناوێك دروست بووە، كۆمەڵە كەرەستەی تریش بەشداری لە فراوانكردنی گرێی ناوی دەكەن لەیەك كەرەستەوە تا چوار و پێنج لەڕووی سادەترین فرێزی ناوی لە ناوێك یان ڕاناوێك پێكدێت (وریا عومەر ئەمین،٢٠٠٤: ١٩٨)

وەكو : ناو + ناو............

هەروەها هەموو بەشەكانی فرێزی ناوی بە ئامرازی بەستنی جیا لەیەك دەدرێن كە ئەمانەن (و، ی، ە) هەموویان بەپێی ڕستەكە بەكاردێن (هەمان

سەرچاوەی پێشوو:١٢٤)، ئەو ناوانەی بە (و) لێك دەدرێن هەموویان دەبن بە فریزی جیا وەکو :

ئێمە درەخت و دار و گوڵ دەچێنین

هەریەك لە (درەخت و دار و گوڵ) بەرکاری جیان

بەڵام ئەو ناوانەی بە (ی) لێك دەدرێن هەموو ناوەکان بە یەکەوە یەك فرێزی ناوی دروست دەکەن دەبن بە دیارخەری یەك دیارخراو (هەمان سەرچاوەی پێشوو).

ئێمە درەختی جوان  دەچێنین.

ئەوەی (فرێزی ناوی) لە شێوەزاری مزووری بالا جیا دەکاتەوە لە زمانی نووسین تەنها ئامرازی خستنە سەرە کە کرمانجی سەروو (نێر و مێ) هەیە، بەڵام لەزمانی نووسیندا نییە، وەك لەم نموونەیەدا دەردەکەوێ، کە ئامرازی خستنەسەر دەگۆڕێت بۆ (ا)یان (ێ) لەزمانی نووسین جیاوازە ، چونکە لەم شێوەزارە نێر و مێ هەیە، وەك:

گولا  جان __________ گوڵی  جوان.

بەگشتی فرێزی ناوی لە زمانی کوردیدا  لە زمانی نووسین بەم شێوەیەیە:

ژمارە + ناو + ڕادە +  ئاوڵناو

دوو گوڵی زۆر جوان

لە کرمانجی سەروو و ناوەڕاست کەرەستەکان بەهەمان شێوە ڕیز دەبن، لە کرمانجی سەروو هەمان ڕیزکردنی بەشەکانی ئاخاوتنە، بەڵام ئامرازی خستنە سەری نێر و مێ هەیە. بۆ نموونە :  دوو گولێد زوور جان

هەمان ڕێکخستن، هەمان پێکهاتەیە ( ێد، ێن، ێت کە بۆ کۆ بەکاردێت) زیاد کراوە.

گوڵێکی سپیی  پەمەییم چاند

من گولەکا سپیا پەمبەیی (پیازی)  چاند.

هەمان پێکهاتەی فرێزی ناوی هەیە لە هەردوو دیالێکت، تەنها (ا) ئامرازی خستنە سەر دەگۆڕێت، ئەمەش بۆ ڕێکخستن و یەکخستنی ڕێزمانی کوردی، دەتوانرێن یاساکانی فرێزی ناوی زمانی نووسین (کرمانجی ناوەڕاست)

بەکاربهێنرێت، چونکە جیاوازییەکان لە فرێزی کاری کرمانجی سەروو زیاتر دەبێت، یاسایەکی گشتی نییە کە ئامرازی خستنەسەری (ا،یٚ) (نێر و مێ) ڕێکبخرێت. بۆیە هەنگاو بۆ زمانی ستاندارد فرێزی ناوی بەپێی یاساکانی زمانی نووسین بێت باشتر ڕێکدەخرێت لەناو یاساکانی زمانی یەکگرتووی کوردی.

**دووەم /فرێزی کاری:**

کار هەروەکو شێوەی نووسین لە شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالاٚ و کرمانجی سەروو لە ڕووی هێزەوە دوو جۆرە:

کاری تێپەڕ و کاری تێنەپەڕ

ئەوەی ئەم دوو جۆرە کارە لەم شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالاٚ لەگەڵ زمانی نووسین جیا دەکاتەوە ئەوەیە کە کاری تێپەڕ هەموو کات لە ڕابردووی تێپەڕ لە زمانی نووسین (دەستەی خاوەنی) ڕاناوی لکاو (م– مان/ ت– تان/ ی–یان) وەردەگریٚ.

بەلاٚم (کرمانجی سەروو/ مزووری بالاٚ ) دەستەی خاوەنی ڕاناوی سەربەخۆ وەردەگرێت

(من –مە
تە – هنگو
وی، ویٚ – وان)

وەکو : من نان خار ____ من نانم خوارد

لە کاری داهاتوو تێپەڕ و تێنەپەڕ و کاری ڕابردووی تێنەپەڕ (دەستەی ئاسایی وەردەگرێت ) لە دەوری بکە، دەستەی ئاسایی ڕاناوی لکاوە بۆ زمانی نووسین:

(م – ین
ی _ ن
٠ ، ات، ێت _ ن)

بۆ کرمانجی سەروو (شێوەزاری مزووری بالاٚ) دەستەی ئاسایی ڕاناوی لکاو و سەربەخۆ وەردەگرێت)

( ئەز /م ________ ئەم/ ین
تو / ی ___________ هنگ/ن
ئەو/ ٠ ____________ ئەوان/ ن)
وەکو:
ئەز هاتم __________ من هاتم
ئەزدێ هێم ________ من دێم

کاری ڕانەبڕدوو لە شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا جیاوازە، کە ئێستا و داهاتووی هەیە، کە ئەمە لە شێوەی نووسیندا نییە تەنها یەك کاتی کاری داهاتوو هەیە.

**کاتەکانی کار:**

**یەکەم/ کاری ڕابردوو :**

ئەم کارەیە دەبێ سەردەمی ڕوودانەکەی پێش دووان کەوتبێ، شێوەزاری مزووری باڵا هەروەکو کرمانجی سەرووییە، لە ڕووی ڕێکخستنی ڕێزمانی، جۆرەکانی کاری ڕابردوو:

یەکەم / ڕابردووی سادە:

ئەم کارەیە لە پێش قسەکردندا ڕووی داوە، پەیوەندی بە ڕوودانی کاری ترەوە نییە، دەبێتە بناغە بۆ سازکردنی جۆرەکانی کاری ڕابردوو.

یەکەمیان/لە کاری سادەی تێپەڕ:

یەکەم/ ( کرمانجی سەروو /شێوەزاری مزووری باڵا):

ڕاناوی سەربەخۆ (خاوەنی) + ڕەگ + م.ك ڕابردوو (ئەورەحمانی حاجی مارف، ٢٠٠١:٢١٤ )

من — مە
تە _ هنگو
وە _ وان

دووەم/ زمانی نووسین :

ڕەگی ڕابردوو + ڕاناوی لکاو (دەستەی خاوەنی) (وریا عومەر ئەمین، ٢٠٠٩:٧١)

| زمانی نووسین | شێوەزاری مزووری بالاّ |
|---|---|
| من خوێندم | من خويند |
| تۆ خوێندت | ته خويند |
| ئەو خوێندی | وه خويند |
| ئێمە خوێندمان | مه خويند |
| ئێوە خوێندتان | هنگو خويند |
| ئەوان خوێندیان | وان خويند |

لە زمانی نووسین و کرمانجی سەروو هەردووکیان ڕەگی کاری ڕابردوو هاوبەشە، بەلاّم جیاوازی تەنیا لە ڕاناوەکانە، لە کرمانجی سەروو ڕاناوی سەربەخۆ دەبێت کار بێت، چونکە ڕاناوی لکاو وەرناگرێت بۆ ئەوەی کەسەکان پۆلێن بکرێن لە یەك جیابکاتەوە، ڕاناوی سەربەخۆ بەکاردێت، بەلاّم لە زمانی نووسین و کرمانجی ناوەڕاست ڕاناوی لکاوی دەستەی خاوەنی بەکاردێت. کە دەکرێت بکرێنە یەك دەستوور، تەنیا یەکێکیان بەکاربێت وەك لە ڕێزمانی بەرهەمهێناندا هەیە.

**دووەم: تێنەپەڕ:**

یەکەم/ (کرمانجی سەروو/ شێوەزاری مزووری بالاّ):

ڕاناوی سەربەخۆ (ئاسایی) + ڕەگ + م.ك ڕابردوو + ڕاناوی لکاو (ئەورەحمانی مارف، ٢٠٠١:٢١٤)

ئەز _ ئەم

تو _ هنگ

ئەو _ ئەوان

دووەم/ زمانی نووسین:

ڕەگی ڕابردوو + ڕاناوی لکاو (دەستەی ڕێکەوتن) (وریا عومەر ئەمین، ٢٠٠٩:٧١)

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالاّ |
|---|---|
| من هاتم | ئەز هاتم |
| تۆ هاتی | تو هاتی |

| | |
|---|---|
| ئەو هات | ئەو هات |
| ئێمە هاتین | ئەم هاتین |
| ئێوە هاتن | هنگ هاتن |
| ئەوان هاتن | ئەوان هاتن |

(لە زمانی نووسین و شێوەزاری مزووری بالا) هەمان ڕاناوی لکاو وەردەگرێت، ڕەگی کاریش بە هەمان شێوەیە

دووەمیان/ کاری ڕابردووی بەردەوامی تێپەڕ:

یەکەم/ (کرمانجی سەروو/ شێوەزاری مزووری بالا):

ڕاناوی سەربەخۆ (خاوەنی) + د (م. ئێستا) + ڕەگ (ئەورەحمانی حاجی مارف، ٢١٤:٢٠٠١)

دووەم / زمانی نووسین:

دە + ڕاناوی لکاو (دەستەی خاوەنی) + ڕەگی ڕابردوو (وریا عومەر ئەمین، ٧١:٢٠٠٩)

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالا |
|---|---|
| من دەمکری | من دکری |
| تۆ دەتکری | تە دکری |
| ئەو دەیکری | وی / وێ دکری |
| ئێمە دەمانکری | مە دکری |
| ئێوە دەتانکری | هنگو دکری |
| ئەوان دەیانکری | وان دکری |

٢. تێنەپەڕ:

١. (کرمانجی سەروو/ شێوەزاری مزووری بالا):

ڕاناوی سەربەخۆ (ئاسایی) + د (م. ک. ئێستا) + ڕەگ + ڕاناوی لکاو (ئەورەحمانی حاجی مارف، ٢١٤:٢٠٠١)

٢. زمانی نووسین:

(دە+ ڕەگی ڕابردوو + ڕاناوی لكاوی دەستەی ڕێكەوتن) (وریا عومەر ئەمین، ٧١:٢٠٠٩)

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالاٚ |
|---|---|
| من دەهاتم | ئەز دهاتم |
| تۆ دەهاتی | تو دهاتی |
| ئەو دەهات | ئەو دهات |
| ئێمە دەهاتین | ئەم دهاتین |
| ئێوە دەهاتن | هنگ دهاتن |
| ئەوان دەهاتن | ئەوان دهاتن |

سێیەمیان/ كاری ڕابردووی دووری تێپەڕ

یەكەم/ كرمانجی سەروو/ شێوەزاری مزووری بالاٚ):

ڕاناوی سەربەخۆ (خاوەنەیەتی)+ ڕەگ + م.ك ڕابردوو + بوو (ئـەورەحمانی حاجی مارف، ٢١٤:٢٠٠١)

دووەم/ زمانی نووسین: ڕەگی ڕابردوو+ بوو + ڕاناوی لكاو (عبدالواحد مشیر، ٨٦:٢٠١٤)

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالاٚ |
|---|---|
| خوێندبووم | من خوند بوو |
| خوێندبووت | تە خوند بوو |
| خوێندبووی | وە خوند بوو |
| خوێندبوومان | مە خوند بوو |
| خوێندبووتان | هنگو خوند بوو |
| خوێندبوویان | وان خوند بوو |

٢. تێنەپەڕ:

١. (كرمانجی سەروو/ شێوەزاری مزووری بالاٚ):

ڕاناوی سەربەخۆ (ئاسایی)+ ڕەگ +م.ك.ڕابردوو+ بوو+ ڕاناو (ئـەورەحمانی حاجی مارف، ٢١٤:٢٠٠١)

٢. زمانی نووسین: ڕەگی ڕابردوو+ بوو + ڕاناوی لکاو (عبدالواحد مشیر، ٨٦:٢٠١٤)

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالاّ |
|---|---|
| چوو بووم | ئەز چوو بووم |
| چوو بووی | تو چوو بووی |
| ئەو چوو | ئەوە چوو بوو |
| چوو بووین | ئەم چوو بووین |
| چوو بوون | هنگ چوو بوون |
| چوو بوون | ئەوان چوو بوون |

چوارەمیان: کاتی ڕابردووی تەواوی تێپەڕ:

یەکەم/ (کرمانجی سەروو– شێوەزاری مزووری بالاّ) :

ڕاناوی سەربەخۆ + (ا) + ڕەگ + م.ک. ئێستا (ە) (ئەورەحمانی حاجی مارف، ٢١٤:٢٠٠١)

دووەم. زمانی نووسین: ڕەگی ڕابردوو+ وو+ ڕاناوی لکاو

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالاّ |
|---|---|
| فرۆشتوومە | منا فرووتە |
| فرۆشتووتە | تەیا فرووتە |
| فرۆشتوویەتی | وەیا فرووتە |
| فرۆشتوومانە | مەیا فرووتە |
| فرۆشتووتانە | هنگویا فرووتە |
| فرۆشتوویانە | وانا فرووتە |

٢. تێنەپەڕ:

شێوەی مزووری بالاّ: ڕاناوی سەربەخۆ + (ا،ێت) + ڕەگ +م.ک.ئێستا + م. ئاوڵناوی کراوە (ی)

مۆرفیمی کاتی ئێستا (ە) دەگۆڕێ بۆ (ی) ئەگەر مۆرفیمی کاتی ڕابردوو یان نیشانەی چاووگ (و،ی،ا) بوو، (واتە یان مۆرفیمی ئاوڵناوی کراوە دەردەکەوێ یان مۆرفیمی کاتی ئێستا)

وەکو:

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالاً |
|---|---|
| من نوستووم | ئەزا نوستی |
| تۆ نوستووی | تویا نوستی |
| ئەو نوستووە | ئەوا نوستی |
| ئێمە نوستووین | ئەمێت نوستی |
| ئێوە نوستوون | هنگێت نوستی |
| ئەوان نوستوون | ئەوانێت نوستی |

پێنجەم: کاری ڕابردووی مەرجی تێپەڕ:

یەکەم: (کرمانجی سەروو/ شێوەزاری مزووری بالاً)

ڕاناو + ڕەگی کار + ڕەگی کاری بوون (ب) + ا

دووەم: زمانی نووسین

ب + ڕەگی ڕابردوو+ ڕاناوی لکاو + ایە (وریا عومەر ئەمین، ٢٠٠٩:٧١)

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالاً |
|---|---|
| بمکریبایە | من کریبا |
| بتکریبایە | تە کریبا |
| بیکریبایە | وێ کریبا |
| بمانکریبایە | مە کریبا |
| بتانکریبایە | هنگو کریبا |
| بیانکریبایە | وان کریبا |

٢. تێنەپەڕ:

یەکەم/ (کرمانجی سەروو/ شێوەزاری مزووری بالاً):

ڕاناو +ڕەگی کار + ڕەگی کاری بوون (ب)+ ا + ڕاناو + ە (ئەورەحمانی حاجی مارف، ٢٠٠١:٢١٤)

دووەم/ زمانی نووسین:

ب + ڕەگی ڕابردوو+ ڕاناوی لکاو + ایە (وریا عومەر ئەمین، ٢٠٠٩:٧١)

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالاّ |
|---|---|
| بهاتمایە | ئەز هاتبامە |
| بهاتیتایە | تو هاتبایە |
| بهاتایە | ئەو هاتبا |
| بهاتینایە | ئەم هاتباینە |
| بهاتنایە | هنگ هاتبانە |
| بهاتنایە | ئەوان هاتبانە |

دووەم: کاری داهاتوو:

ئەو کارەیە سەردەمی ڕووداونەکەی پاش دووان کەوتبێ لە زمانی نووسیندا یەك جۆر کاتی داهاتوو هەیە، بەلاّم لەم شێوەزارەدا دوو جۆر کاری داهاتوومان هەیە، کاتی ئێستا و کاتی داهاتوو:

١. کاتی ئێستای، تێپەڕ:

یەکەم/ (کرمانجی سەروو، شێوە زاری مزووری بالاّ) :

ڕاناوی سەربەخۆ (ئاسایی) + (ات،ێت) +ڕەگ + ڕاناوی لکاو (ئەورەحمانی حاجی مارف، ٢٠٠١:٢١٤)

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالاّ |
|---|---|
| من دەکرم | ئەزات کرم |
| تۆ دەکری | تویات کری |
| ئەو دەکرێت | ئەوات کریت |
| ئێمە دەکرین | ئەمێت کرین |
| ئێوە دەکرن | هنگێت کرن |
| ئەوان دەکرن | ئەوانێت کرن |

٢. کاتی ئێستای تێنەپەڕ:
یەکەم/ (کرمانجی سەروو/ شێوەزاری مزووری باڵا)
ڕاناوی سەربەخۆ (ئاسایی) +(ێت، ات) +ڕەگ + ڕاناوی لکاو
دووەم/ زمانی نووسین:
دە + ڕەگی داهاتوو + ڕاناوی لکاوی دەستەی ڕێکەوتن (وریا عومەر ئـەمین، ٢٠٠٩:٢٠٦)

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
|---|---|
| من دەڕۆم | ئەزات چم |
| تۆ دەڕۆیت | تویات چی |
| ئەو دەڕوات | ئەوات چیت |
| ئێمە دەڕۆین | ئەمێت چین |
| ئێوە دەڕۆن | هنگێت چن |
| ئەوان دەڕۆن | ئەوانێت چن |

٢. کاتی داهاتوو:
١. تێنپەڕ: ڕانـاوی سـەربەخۆ (ئاسـایی) + دێ + ڕەگـی کـار+ ڕانـاوی لکـاو (ئەورەحمانی حاجی مارف، ٢٠٠١:٢١٧)

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
|---|---|
| من دەچم | ئەز دێ چم |
| تۆ دەچیت | تو دێ چی |
| ئەو دەچێت | ئەو دێ چیت |
| ئێمە دەچین | ئەم دێ چین |
| ئێوە دەچن | هنگ دێ چن |
| ئەوان دەچن | ئەوان دێ چن |

٢. کاری داهاتووی تێپەڕ:

| شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا | زمانی نووسین |
|---|---|
| ئەز دێ کرم | من دەکرم |
| تو دێ کری | تۆ دەکریی |
| ئەو دێ کریت | ئەو دەکرێت |
| ئەم دێ کرین | ئێمە دەکرین |
| هنگ دێ کرن | ئێوە دەکرن |
| ئەوان دێ کرن | ئەوان دەکرن |

بەرکار هەموو کات لە هەڵبژاردنی دەستەی خاوەنی بێت یان ئاسایی پێچەوانە دەبێت لەگەڵ بکەردا، واتە ئەگەر بکەر لەدەستەی خاوەنی بێت بەرکار لە دەستەی ئاسایی دەبێت هەروەها پێچەوانەکەشی ڕاستە

وەکو : ئەز هاتمە ماڵا هنگو _ من هاتم بۆ ماڵی ئێوە.

هنگ هاتنە ماڵا مە _ ئێوە هاتن بۆ ماڵی ئێمە.

## تەوەری دووەم

## بەرهەمهێنان و میکانزمی ڕێزمانی یەکگرتووی زمانی کوردی

### میکانزمی یەکەم:

دەکرێت دوو جۆر ڕاناوی سەربەخۆ بەکاربهێنین، وەکو کرمانجی سەروو، واتە دەستەی (ئەز) زیاد دەکرێت، چونکە بۆ ئەوەی ڕێزمانی یەکگرتوو دروست بکەین، دەبێت خاڵی هاوبەش زیاتر بەکاربهێنین، لەبەر ئەوەی پێکهاتەی ڕستەسازی کرمانجی ناوەڕاست و سەروو بەهۆی دوو دەستەی ڕاناوی سەربەخۆیە، کە لێکیان جیاواز دەکات. کەواتە دوو جۆرە ڕاناوی سەربەخۆ بەکاربهێنێت یەک پێکهاتەی ڕستەسازی لە (بکەر، بەکار، کار) دەبێت بەیەک پێکهاتە لە شێوەکەی

وەکو : ئەز گولێت جان دێ کرم ------ گولی جوان دەکرم

تەنها جیاوازی دیار دەستەی (ئەز) دەکرێت بەکاربێت، واتە لە پێکهاتەی ڕێزمانی ڕستەسازی زمانی کوردی دوو دەستە ڕاناوی سەربەخۆ هەبێت.

### میکانزمی دووەم:

تەنیا یەک جۆر ڕاناوی لکاو بەکاربێت واتە ئەگەر دوو دەستەی ڕاناوی سەربەخۆ بەکار هات دەکرێت لەبەر ئەوەی، ئێمە یەک دەستەی ڕاناوی لکاو بەکاربهێنین، پێویست بە ڕاناوی لکاوی دەستەی خاوەنیەتی نابێت، ئەمە لەلایەک، لەلایەکی تر بۆ دروستکردنی زمانی ستاندارد دەبێت شتی هاوبەشی هەبێت.

### میکانزمی سێیەم:

دەکرێت لە فرێزی ناویدا لە کرمانجی سەروودا (نێر و مێ) لابرێت، وەکو کرمانجی ناوەڕاست تەنیا ئامرازەکانی ئیزافە دابنرێت بۆ بەشەکانی فرێزی ناوی، چونکە هاوبەشی زیاتر دەکات و جیاوازی کەم دەکاتەوە. یەک جۆرە لە پێکهاتەی فرێزی ناوی دروست دەبێت، لە کرمانجی سەروو و ناوەڕاست وەکو یەک دەبێت.

من گولەکا جان چاند ----------- من گوڵێکی جوانم چاند

جیاوازی کەم دەکرێتەوە زمان بەرەو زمانی ستاندارد و پێوانەیی هەنگاو دەنێت.

**میکانزمی چوارەم:**

لە ڕاناوی سەربەخۆ دەتوانین دەستەی سەربەخۆ بەکار نەهێنین لە هەندێ حاڵەتدا بۆ ئاسانی یەکخستنی ڕێزمانەکان.

وەکو: ئەز هاتم __________ من هاتم (هەمان حاڵەتی ڕێزمانەیە)

بەڵام ناتوانین لە کاری ڕابردووی تێپەڕ بەهەمان شێوە بێت، وەکو: ( من نان خار ) ناکرێت ڕاناوی سەربەخۆ دانەنرێت چونکە کەسەکان دیار نابن لە زمانی نووسین بەکار دێت، دەستەی سەربەخۆ وەکو :

(من نانم خوارد ) ——————————— (من نان خار)

لێرەدا لە ڕاناوی لکاو لەسەر کار نییە لە زمانی نووسین، بەڵکو لەسەر (بەرکارە)، کەواتە نزیکی هەیە لە پێکهاتەکانیدا.

**میکانزمی پێنجەم:**

لە کاتی داهاتوو لە کرمانجی سەروو دوو کات هەیە :

یەکەم: کاتی ئێستا

١. کاتی ئێستا : ئەزا ——————— زا

٢. داهاتوو : دێ

هەمان شت لە کرمانجی ناوەڕاست بەکاردێت (ناوچەی هەولێر، ناوچەی سلێمانی)

١. هەولێر ———————— ——————وا دەخوێنم

٢. سلێمانی ————————————— ئەوا دەخوێنم

٣. کرمانجی سەروو ————— ئەزا د خوینم

لە هەموویان (ا) هاوبەشە، لە ناوەڕاستدا (هەولێر، سلێمانی).

لە سلێمانی و کرمانجی سەروودا (ئە، ا) هاوبەشە، کەواتە دەتوانین (ئەزا) بەکاربهێنین بۆ داهاتوو لە یاسای زمانی یەکگرتووی کوردیدا وەکو (will ) لە زمانی یەکگرتووی ئینگلیزی زیاد کراوە.

دووەم: کاتی داهاتوو:

١. لە داهاتوودا: لە کرمانجی سەروودا (دێ) هەیە.

٢. لە داهاتوو: لە کرمانجی ناوەڕاست (دە) هەیە

دەکرێت بەپێی ئاخێوەر بگۆڕێت بزوێنی (ە، ێ) بگۆڕینەوە هەردووکیان بەکاردێت لە لای قسەکەر، هەروەها لە کوردی باکوور هەردووکیان بەکارناهێت بەڵکو تەنها (د) بەکاردێت. وەکو:

دە خوێنم ---------- کرمانجی ناوەڕاست

دێ خوینم ---------- کرمانجی سەروو

د خوینم ---------- ناوچەی باکوور

کەواتە ئەمانە هەموویان ئەوە دەسەلمێنن کە زمانێکی هاوبەشە لە یاسا و دەستووری زمانەوانی لە زمانی کوردی، تەنیا هەندێ گۆڕانی فۆنۆلۆجی هەیە کە بەهۆی شێوەزار دروست بووینە ئەمانەش دەکرێت ڕێکبخرێت و پەیڕەو بکرێت.

## ئه نجام

١. دروستکردنی زمانی ستاندارد و گشتی پێویستی بەوە هەیە کە ڕەنگدانەوەی دیالێکتەکانی تێدا هەبێت، بۆیە دەکرێت لە بەشی ناو (فرێزی ناوی) بەپێی دیالێکتی ناوەڕاست بێت، لە بەشی کاری ڕستە بەپێی یاساکانی (فرێزی کاری) بێت لە دیالێکتی سەروو، واتە دەستەی (ئەز) وەربگیرێت، دەستەی خاوەنی لە ڕاناوی لکاو کرمانجی سەروو لابرێت هەموو یاساکانی بەشی کار لە کرمانجی سەروو، هەموو یاساکانی بەشی ناوەڕاست لە بەشی ناو بێت.

٢. یاساکانی بەشی ناو لە کرمانجی زمانی نووسین وەربگیرێت، چونکە (بەشی ناو) لە کرمانجی سەروو ئامرازی خستنە سەری ڕەگەزی هەیە، ئاسان نییە ئاخێوەری کورد بەکاریبهێنێت، زمانی نووسین بەشی ناو گشتیتر و هاوبەشی زیاترە هەرچی کرمانجی سەرووە لە فرێزی ناوی جیاوازی زیاترە.

٣. یاساکانی بەشی کار لە کرمانجی سەروو بۆ ڕێزمانی گشتی بەکاربهێنرێت، چونکە جیاوازی کەمدەکاتەوە لە نێوان کرمانجی سەروو و زمانی نووسین.

٤. دەکرێت بەگشتی یاساکانی ڕێزمانی کوردی ڕێکبخرێت، بە زیادکردنی دەستەی (ئەز)، هەروەها یاساکانی فرێزی ناوی بەپێی زمانی نووسین بێت، چونکە جیاوازی کەمترە، هەروەها کاتەکانی کاری داهاتوو بەپێی کرمانجی سەروو بێت، چونکە وردەتر کاتی ئێستا و داهاتووی تێدایە، جۆرەکانی کار ڕابردوو لە هەردوو یاسای کرمانجی سەروو و زمانی نووسین بەکاربێت وەکو زمانی ئینگلیزی کە بۆ دروستکردنی کاری داهاتوو بۆ چەند شێوەیەك کارەکانیان ڕێکدەخەن واتە چەند یاسایەکیان هەیە، بەهەمان شێوە بۆ زمانی کوردی کاتی ڕابردووی بە هەموو جۆرەکانی (سادە، دوور، تەواو، بەردەوام) دەتوانرێت بە دوو یاسا دابنرێت ئینجا سەلیقەی قسەکەر خوێندنەوەی قسەکەر دەتوانێت یاساکان هەڵبژێرێت و بەکاری بهێنێت.

## سەرچاوەکان:

**یەکەم: کوردی:**

(١) ئەورەحمانی حاجی مارف، (١٩٧٥) وشەی زمانی کوردی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ـ بەغداد.
(٢) ئەورەحمانی حاجی مارف، (١٩٨٧) وشە ڕۆنان لە زمانی کوردیدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد،چاپی دووەم.
(٣) ئەورەحمانی حاجی مارف (٢٠٠٣) مۆرفۆلۆجیا، بەرگی دووەم، چاپخانەی سەردەم، چاپی دووەم.
(٤) وریا عومەر ئەمین (٢٠٠٤) چەند ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، چاپخانەی ئاراس ـ هەولێر.
(٥) عبدالواحید مشیر (٢٠١٤) ڕێزمانی کوردی، چاپخانەی ئاراس – هەولێر.

دووەم : عەرەبی:

(٦) اوزالد ديكرو، جان ماري سشايفر (٢٠٠٧) القاموس الموسوعي الجديد لعلوم اللسان، ترجمة: د. منذر عياش، الطبعة الثانية، الناشر المركز الثقافي العربي، الدار البيضاء ـ المغرب.
(٧) اندرية جاكوب (٢٠٠٢) انتروبولوجيا اللغة بناء و ترميز، ترجمة: ليلي الشربيني، المجلس الاعلى للثقافة للنشر و الترجمة، الطبعة الاولى.
(٨) بريجيتة بارتشت (٢٠٠٤) مناهج علم اللغة (من هرمان باول حتى ناعوم تشومسكي)، ترجمة: سعيد حسن بحيري، الطبعة الاولى، مؤسسة المختار للنشر والتوزيع.
(٩) جون لوينز (٢٠٠٩)، اللغة و اللغويات ترجمة: (محمد العناني) دار جرير للنشر والتوزيع
(١٠) جون اي جوزيف، نايجل لف، تولبت جي تيلر (٢٠٠٤)، اعلام الفكر اللغوي (التقليد الغربي في القرن العشرين)، ترجمة احمد شاكر الكلابي، الجزء الثاني، توزيع دار اويا للطباعة والنشر.
(١١) جان جاك لوسركل (٢٠٠٦) عنف اللغة، ترجمة: محمد بدوي، الطبعة الثانية، توزيع مركز دراسات الوحدة العربية.
(١٢) رومان جاكوبسن، موريس هالة (٢٠٠٨) اساسيات اللغة، ترجمة: سعيد الغانمي، الطبعة الاولى، الناشر كلمة والمركز الثقافي العربي.
(١٣) روي هاريس، تولبت جي تيلر (٢٠٠٤) اعلام الفكر اللغوي (التقليد الغربي من سقراط الى سوسير)، ترجمة: احمد شاكر الكلابي، الجزء الاول، توزيع دار اويا للطباعة والنشر.
(١٤) نيقولاس اوستلر (٢٠١١)، امبراطوريات الكلمة – تاريخ اللغات في العالم، ترجمة: محمد توفيق البجيرمي، دار الكتاب العربي، بيروت – لبنان.

(١٥) فردينان دي سوسور (١٩١٦) علم اللغة العام، ترجمة: يوئيل يوسف، بيت موصل، السنة ١٩٨٨.

(١٦) نعوم تشومسكى (٢٠٠٥) آفاق جديدة في دراسة اللغة والذهن، ترجمة: حمزة بن قبلان المزيني، نشر المجلس الاعلى للثقافة.

(١٧) ن. ي. كولنج (١٩٩٩) الموسوعة اللغوية، جامعة مانشستر، الجلد الاول، ترجمة: محيي الدين حميدي، عبدالله الحميدان، كلية اللغات والترجمة ـ جامعة الملك سعود، المملكة العربية السعودية.

(١٨) ن. ي. كولنج (١٩٩٩) الموسوعة اللغوية، جامعة مانشستر، الجلد الثاني، ترجمة: محيي الدين حميدي، عبدالله الحميدان، كلية اللغات والترجمة ـ جامعة الملك سعود، المملكة العربية السعودية.

(١٩) ن. ي. كولنج (١٩٩٩) الموسوعة اللغوية، جامعة مانشستر، الجلد الثالث، ترجمة: محيي الدين حميدي، عبدالله الحميدان، كلية اللغات والترجمة ـ جامعة الملك سعود، المملكة العربية السعودية.

(٢٠) ليونارد (٢٠٠٨) بؤس البنوية.

(٢١) هدسن (١٩٨٧) علم اللغة الاجتماعي، ترجمة: عبدالامير الأعسم، دار الشؤون الثقافة العامة، بغداد.

## ملخص البحث

يتكون البحث من فصلين، فصلاً عن ثبت بالمصادر، واستنتاجات، ويقوم على مقارنة بين اللغة الرسمية واللهجة الكرمانجية/ مزووری بالا، وعلى تكوين قواعد جديدة للغة، وصولاً إلى تشكيل لغة معيارية، تشمل كل لهجات اللغة الكوردية، بحيث يستطيع المتكلمون استعمالها.

يتناول الفصل الاول: عدداً من التجارب اللغوية، والنظريات النحوية التي تتعلق بالقواعد العامة للهجات، مثل نظرية (جاكوب، سوسير). وبعض التجارب اللغوية والاجتماعية التي اعتدمتها نظريات ( كوينتان، لوسركل، جومسكي ) وذلك بهدف صياغة قواعد عامة لكل لهجات اللغة الكوردية

أما الفصل الثاني/ يقارن بين اللغة المكتوبة و اللهجة الكرمانجية/ (مزووری بالا) على مستوى قواعد الجملة، والسعي إلى تشكيل قواعد للهجات الكوردية وصولاً إلى تأسيس لغة معيارية واحدة.

## Abstract

The research Compares between formal Languages and Mzory dialect _ (Grammar depart) it is divided into two parts with introduction and conclusion.

The first part is taken some fames experience by roles Grammar at Kurdish Languages, like (Jacopo's, Saucer) they said; they take roles Language at society.

(Content , Chomsky, Losearcal) we could found new roles taken all that at the dialects , in this way they near all it, and make standard languages for that.

At the second part there is a comparison between the two dialects and take all the roles in both dialects to step the Universal Grammar.

At the end of the research the two dialects will be perfect to each other and make stander language, which are taken at the different dialects.

# شەبەک- ڕەچەڵەک، زمان و باوەڕی ئایینییان
## ( تۆژینەوەیەکی ئەنترۆپۆلۆگی)

**پ.د. ڕەشاد میران**
زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

**پێشەکی**

شەبەک گرووپەیەکی ئێتنۆگرافیی کوردین شەقڵی کۆمەڵگایەکی ئایینی-مەزهەبییان وەرگرتووە و، بۆیەش، لە سەرەتای سەدەی ڕابردووەوە بووین بە جێگەی بایەخی گەڕیدە و سیاسەتمەدار و تۆژەرانی بیانی و دواتریش عەرەب و ئینجا بەم دواییەش کورد.

گرنگیی ئەم تۆژینەوەیە لەوەدایە کە ئەمە یەکێکە لە یەکەمین تۆژینەوەکان لەسەر شەبەک بەزمانی کوردی، هەروەها بوونی ڕا و بۆچوونی زۆر و جۆراوجۆر و هەندێک جار ناکۆک و دژ بەیەک سەبارەت بە ڕەچەڵەک و زمان و باوەڕی ئایینییان . ئەوەی بایەخی ئەم تۆژینەوەیەش زێتر دەکات، پەیابوونی سەرچاوەی نوێ دەربارەی شەبەک کە هەندێکیان بەرهەمی شەبەکەکان خۆیانن، زیاد لەوەش ئێمە توانیمان هەندێ زانیاری لە ئەندامانی کۆمەڵەی شەبەک بەدەس بێنین، بەڕێگای گفتوگۆ لەگەڵیاندا- هەموو ئەمانە یاریدەدەر بوون بۆ گەیشتنمان بە چەندین دەرئەنجامی گرنگ سەبارەت بە کۆمەڵەی شەبەک، ڕەچەڵەک و باوەڕی ئایینییان .

**نشیمەن:**

گرووپەیەکی 'ئایینی'یە لە کوردستانی باشوور نیشتەجێن لە گوندەکانی نێوان شارەکانی مووسڵ و هەولێر، مووسڵ و کەرکووک، هەروەها لەنێو شاری مووسڵیش- تیایاندا زۆرینە کورد، تورکمان و عەرەبیشیان هەن.

وەکو لە سەرچاوەیەکدا هاتووە ژمارەی گوندەکانی شەبەک (٦٢) گوندن بەڵام، بە قسەی نووسەرەکەی، سەرچاوەکانی تر ئاماژەیان تەنیا بە (٣٤) یان

(٤٧) گوند کردووه / شوکت ،٢٠٠٤، ل٨٦/؛ لەکاتێکدا د. عبدالفتاح بۆتانی خشتەیەکی بە (١٠٩) گوندی شەبەک و گوندی دانیشتوانی تێکەڵاوی داناوە / البوتاني ،٢٠٠٧، ل٤٥٧- ٤٦١/ . نووسەری دوا سەرچاوەش لەسەر شەبەک / عەبدوڵلا، ٢٠١٥، ل١٠- ١١/، (٦٧) گوندی ژماردوون لە پارێزگای مووسڵ- "جگە لەوە گرووپێکی شەبەک لەناو شاری مووسڵ خۆی لە گەڕەکەکانی: ئەلقودس، ئەلکەرامە، ئەلخەزرا، ئەلنعمانیە، ئەلجەزائر، ئەلفەیسەڵییە و ئەلگەزلییە دەژین، هەروەها لە شارەکانی کەرکووک و هەولێر و لە بەغداش گرووپی شەبەک کەم و زۆر دەژین " / هەمان سەرچاوە/ .

وەکو لە سەرچاوەیەکیشدا هاتووە/ الداودی،٢٠١٣، ٢٣٠/ گوندە سەرەکییەکانی شەبەک ئەمانەن :

کوکجلی، باجربوع، عەلی ڕەش، باسەخرا، خرسباد، فازلییە، باشبیتە .

هەروەهاش سەبارەت بە ژمارەیان، ڕای جۆراوجۆر هەن- "ساڵی ١٩٢٥ ژمارەیان دەوروبەری ١٠٠٠٠ کەس بووە؛ لە سەرژمێریی ساڵی ١٩٦٠ ژمارەیان بە ١٥٠٠٠ دانراوە کە لە(٣٥) گونددا دەژین، لە ئێستاشدا (ساڵی ١٩٩٧، ڕ. م.) ژمارەیان بەپێی سەرچاوە ناوچەییەکان ١٠٠٠٠٠ کەس و بەسەر (٦٠) گونددا بڵاوبوونەتەوە " / Bruinessen ، ٢٠١٥ /[1]؛ سەرچاوەیەکی تر " بەگوێرەی ئاماری ساڵی ١٩٧٧ی عیراق ژمارەیان بووەتە ٨٠٠٠٠ کەس... خەمڵاندنی نزیک لە ڕاستی ئەمڕۆ لەنێوان ١٠٠٠٠٠ بۆ ١٥٠٠٠٠ دانیشتوان دەبێ " / عەبدوڵلا، ٢٠١٥، ل١٧/؛ سەرچاوەش هەیە بە ڕەچاوکردنی ڕێژەی زێدەبوونی دانیشتوان لەنێوان ساڵانی ١٩٧٧- ٢٠٠٤ ژمارەی شەبەکانی زێتر لە ١٥٠٠٠٠ کەس خەمڵاندووە / البوتاني ،٢٠٠٧، ل٤٤٨/ . بەهەرحاڵ، وەکو هەموو گرووپە ئێتنۆئایینییەکان، بۆ شەبەکیش ئەستەمە ژمارەیەکی ڕوون و دروست بخەینە بەردەست.

### ناوی شەبەک:

وشەی " شەبەک" وێنای ناوێکی ئایینیی (کۆنفسیۆنیم) وەرگرتووە، ئەگەرچی لە بنەڕەتدا ڕەنگە پەیوەندییەکی بە فیکر و باوەڕی ئایینییەوە نەبێ. نووسەر و تۆژەران لێکدانەوەی جۆراوجۆریان کردووە بۆ مانا و بنەچەی

ئەو ناوە. مەرجیش نییە هەموو ناوێک مانای دیاریکراوی هەبێت، هەرنەبێ لەبەر ئەوەی ئەو ناوە ڕەنگبێ مێژوویەکی دێرینی هەبێت یان هەر لەو زمانەی ئێستاشیەوە نەبێت- بۆیە زۆربەی ناوەکانی "زمانانی جیهان" ماناکانیان نەدۆزراونەتەوە؛ لەم گۆشەنیگایەوە، گەڕان بەدوای مانای ناوێک پێویستییەکی زانستیی ئەوتۆ نییە.

تەنیا لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە ناوی "شەبەک" هاتە نێو کۆڕی زانستییەوە، پێش ئەوە کەس ئاشنای نەبوو . نووسەر و تۆژەرانی ئەم ڕۆژگارە دەستیانکرد بە گەڕاندنەوەی ناوەکە بۆ چەرخە کۆنەکانی مێژووی کورد و بەراوردکردنی بە ناوە هاوشێوەکانی- وەکو: وشەی عەرەبی (شبكة) و تەنانەت (شباک) و (شبابیک)یش/ شوکت،٢٠٠٤،٤٤/، یان میرنشینیی شبانکارە (شوانکارە)/ البوتاني ،٢٠٠٧، ٤٥١؛ الداودی ٢٠١٣، ٢٣٣/ و خێڵی کوردیی (شەنبەک) لە باشووری ئێران/ عەبدوللا،٢٠١٥، ١٦/؛ سەرچاوەش هەیە ناوی شەبەکی گەڕاندۆتەوە بۆ دوو وشەی شاە و بەگ و ناوەکە بووە بە شابەگلەر /٢٠١٥ – Sahbekler; //az.wikipedia.org/ ؛ یاخود بردنەوەی بۆ ناوی میرێکی لوڕی (شا وێردی بەگ)... / خۆشناو، ٢٠١٥، ١٢٧/.

بە ڕای ئێمە، ئەوەی زێتر ڕێی تێدەچێ، "شەبەک" ناوی ناوچەیەکە لە کوردستانی باکوور لە دەوروبەری شاری بەدلیس- مەڵبەندی سەرەکیی عەلەوییەکان. ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنسی "گرینارد" کە لەسەر "قزڵباشانی تورکیا"ی نووسیوە، لە ژماردنی ناوچەکانی نشیمەنی ئەمانەدا، ئاماژە بە ناوچە یان گوندێک دەکات لە نزیک بەدلیس بە ناوی "شۆبەک" / Grenard، ١٩٠٥/؛ نزیکیی ئەم ناوە لە "شەبەک" و هەروەها تۆخمی هاوبەشی نێوان شەبەک و عەلەوییان ئەم بۆچوونە بەهێز دەکەن. کەواتە ئەمانە ڕەنگبێ بە بنەچە خەڵکی ئەو ناوچەیە بووبن و بۆ نشیمەنی ئێستاکەیان کۆچیانکردووە و ناوەکەی خۆیان، بەڕادەیەکیش باوەڕ و تۆخمی کولتووریی خۆیان، پاراستوون .

بۆیە دەتوانین بڵێین شەبەک، لە ڕابردوودا، ڕۆڵی کۆنفدراسیۆنی خێڵەتیی بینیوە و لەژێر ئەو ناوەدا هەموو ئاخێوەرانی زازا و ماچۆ و

تورکمان و عەرەبیش کۆبوونەتەوە، ناوچەکەیان پاراستووە و کاریگەریی کولتووری و سیاسییان نواندووە لەم شوێنەی ئێستاکەیاندا.

### زمان:

هەموو سەرچاوەکان کۆکن لەسەر ئەوەی شەبەک بە دیالێکتی گۆرانی (ماچۆ) دەپەیڤن، سەردانێکی مەیدانیش بۆ ناو شەبەکان ئەوە دەسەلمێنێ.

ئەگەر ئەمانە بە ڕەچەڵەک لە باکوورەوە هاتبن، وەکو لە سەرەوە گریمانی ئەوەمان کردووە، دەبێ زمانیان دیالێکتی زازا بووبێ؛ زازا و گرووپە دیالێکتی هەورامانی (تیایدا گۆرانیش) نزیکایەتی و هاوبەشیی زۆریان هەیە /Yousupova,2000, 122-123/ ... لەم حاڵەتەدا، کۆمەڵە خەڵکێک کە زێدی خۆی دەگۆڕێ (لە ماوەیەکی درێژدا) ڕێی تێدەچێ زمان و کولتووری خەڵکی ژینگە نوێیەکە وەرگرێ- ئەمەش زۆر ڕوویداوە، بەتایبەتیش ئەگەر نزیکییەک لەنێوانیاندا هەبێت... وەکو پێشتریش گوتمان، دیالێکتەکانی گۆران (ماچۆ) و زازا لێکچوون و هاوبەشییان هەیە.

زازاییەکان پێش چەند سەدەیەک (کە نازانرێ کەی بووە) لە ناوچەی "شۆبەک"ی سەربە دەرسیم بۆ دەوروبەری مووسڵ هاتوون و ئەم شوێنەش نشیمەنی خەڵکی سەربە ئاخافتنی ماچۆ- باجەڵان و سارەلوو- بووە و بەپێی هەندێ سەرچاوەش هەر یەک لە " زازایی، باجەلانی، هەورامی، کاکەیی، زەنگەنە، باجەڵانی شێوەزاری گۆرانین کە دیالێکتێکی سەرەکیی زمانی کوردییە " / البوتاني، ٢٠٠٧، ٤٥٤/؛ بۆیە هیچی سەیر لەوەدا نییە کە شەبەکە هاتووەکان لێرەدا بێنە سەر شێوەزاری ماچۆ- ئەوەش پێش هەموو شتێک لەبەر نزیکیی ئاخافتن و هەروەها شیعیزمی خەڵکی ناوچەکە- بە تایبەتیش "شیعیزمی" سارەلوو و بەشێک لە باجەڵان

### باوەڕی ئایینی:

وێنای شیعیبوونی شەبەک بەگشتی زاڵە؛ بەڵام بە نزیکبوونەوە لێیان دەردەکەوێت کە بەشێکیان، هەرچەندە کەمینە، سوننەن؛ ئەمەش گۆڕانێکی سەرنجڕاکێشە لە باوەڕیاندا، ئەگەرچی چاوەڕوانکراویشە- مووسڵ و دەوروبەری هەمیشە مەڵبەندێکی بەهێزی سوننیزم بووە، بۆیەش شەبەک

بەردەوام لەژێر فشاری تەوژمی سوننەدا بووین و ئاساییە بەشێکیان "ناچارکرابن" بە گۆڕینی مەزهەبەکانیان... نە هەر ئەوە، بەڵکو شیعیزمی بەشە زۆرەکەشیان هەر دەرئەنجامی گۆڕانکارییە – ئەمانە کە هاتوون بۆ ئێرە بە باوەڕ عەلەویی بوون، کەچی وردەوردە و لەماوەی چەندین سەدەدا ئەمانە بوون بە شیعەی جەعفەری (١٢ ئیمامی)- ئەمەش، دیارە، بۆ بەدەسهێنانی پاڵپشتیی شیعەکانی عیراق و ئێرانە لە بەرامبەر تەوژمی سوننەدا؛ هەرچەندە هێشتاش هەندێ توخمی عەلەویزمیان لەناودا پارێزراون، وەکو : بە پیرۆزدانانی کتێبە پیرۆزەکانی عەلەوییان گولبەنگ و بویروق و خوێندنەوەیان لە بۆنەکاندا؛ زیارەتکردنی گۆڕی (حاجی بەکداش)ی عەلەوییان (لەهەندێ گوندەکانی شەبەک تا ساڵانی شەستەکانی سەدەی ڕابردووش خۆیان هەر بە بەکتاشی داناوە[٢])؛ نەناشتنی مردووەکانیان لە نەجەف (بەم دواییانە هەندێکیان ئەمەش دەکەن)[٣]؛ داننان بە گوناهباری لای سەید (پیر)[٤].

ئەم پەیوەندییەی نێوان شەبەک و عەلەوی، نووسەر و تۆژەرانی تریش، هەر یەکەو بە شێوەیەک، ئاماژەیان بۆ کردووە. زوهێر کازم عەبوود شەبەکە شیعە کۆنەکان بە بەکتاشی دادەنێ کە ئەوا بەرەو نەمانن، نەوەکانی دواتریشیان بە ١٢ ئیمامی / عبود، ٢٠٠٩، ٣٢/- ئەوە بردنەوەیەکی ناڕاستەوخۆی شەبەکە بۆ سەر عەلەوییەکان، چونکە "ناکرێ قسە لەسەر عەلەوی بکرێ بەبێ ناوهێنانی بەکتاشی " / الداقوقي، ٢٠١٠، ٢٩٥/ .

بە هەمان جۆر، سالم جمعە شەبەک نزیکەی سنوورێک ناهێڵێتەوە لە نێوان عەلەوی و بەکتاشی و، ئەم، دەستەواژەی "بەکتاشییە عەلەوییەکان"ی بەکارهێناوە/ سالم ،٢٠١١،١٢٦/ و عەلەوی، بە قسەی ئەو و سەرچاوەکانی، لە سەدەی چوارەمی کۆچییەوە لە مووسڵدا ژیاون / هەمان سەرچاوە، ١٢١/؛ هەروەهاش د. ڕەمەزان شەریف ئاماژە بە کاریگەریی " تەریقەکانی قزڵباشی و بەکتاشی" دەکات لەسەر شەبەک / الداودی، ٢٤٧،٢٠١٣/؛ کەچی بە ڕای د. نەجاتی عەبدوڵڵا " شەبەک پێوەندییەکی نزیکیان بە تەریقەی سۆفیگەریی سەفەوی (قزڵباش)ەوە هەیە و لەڕووی پراکتیک و باوەڕی ئایینییەوە لە عەلەوییەکانی ئەنادۆڵ نزیکن" / عەبدوڵڵا،١٨،٢٠١٥، ٢٤/ ... هەموو ئەو بۆچوونانە پەیوەندیی نێوان شەبەک و بەکتاشی- عەلەوی دەسەلمێنن و، ڕای

ئێمەش لەم ڕووەوە، بەکتاشی بەشێک یان شێوەیەکی هەندێک تایبەتە لە عەلەویزم .

**باری کۆمەڵایەتی و کولتووری:**

نشیمەنی شەبەک ناوچەیەکی دەشتاییە، بۆیەش چالاکی ئابووریی دانیشتوانەکەی بەجۆری سەرەکی کشتوکاڵی و ئاژەڵدارییە؛ ئەمانە دانەوێڵە و مێوە و سەوزایی دەچێنن و ماڵاتی ورد و درشتیش بەخێو دەکەن/ سالم، ٢٠١٤،٩٩-١٠٢/ . شەبەک بەگشتی خەڵکێکی نیشتەجێن، ئاژەڵدارییەکەیان زێتر بۆ خواردن و بەرهەمی شیر و پێست و بازرگانییە- کوێستان و گەرمێن ناکەن.

سیستەمی کۆمەڵایەتیی شەبەک، وەکو لە سەرلەبەری کۆمەڵگای کوردیدا، باوکسالارییە- واتە پیاو لەناو خێزان و کۆمەڵگادا پلەی یەکەمی هەیە و بڕیارەکان بەدەست ئەون، ئەگەرچی ئافرەت جێگە و ڕێزی خۆی هەیە لای ئەوان.

خواستن و ژنهێنان و زەماوەند بەشێوەی نەریتی ئیسلامی- کوردەواری ئەنجامدەدرێن، هەروەها مردووناشتن و پرسەش؛ هەموو ئەمانەش بە ئامادەبوون و سەرپەرشتیی پیر (سەید، بابە) دەبێ[٥] .

پیر لە بنەماڵەیەکی تایبەت و داخراوە بە بنەچە دەچێتەوە سەر بنەماڵەی پەیامبەر- هەر تاکێکی شەبەک موریدی یەکێکە لەو بنەماڵەیە و لە هەموو مەسەلەیەک پرس و ڕای پێدەکات؛ پیرەکان تەنیا لەنێو بنەماڵەکەی خۆیاندا ژنهێنان دەکەن- ئەوەش هەمان پرەنسیپەکانی ئینستیتووی پیر و موریدە کە لەنێو هەموو کۆمەڵە ئێتنۆ- ئایینییەکاندا باوە: عەلەوی، ئەهلی هەق، ئێزدی...

وەکو لە سەرچاوەیەکدا هاتووە، جگە لە پیر و لە خوار ئەمەوە، هەروەها چەندین پلەبەندیی ئایینی هەیە : ڕەهبەر، چراغ هەڵگر، گەسک هەڵگر، ساقی، قەساب، چوار کارەکەر و دوو دەرگاوان / عەبدوڵلا، ٢٠١٥،٢٠-٢١/- ڕەهبەر زۆربەی کات لەگەڵ پیردا دەبێ، بەڵام ئەوانیتر تەنیا لە هەندێ بۆنەدا دەردەکەون — وەکو شەوی سەری ساڵ .

لێرەدا، دەبێ ئەوەش بگوترێ کە بوون و دەور و کاریگەریی ئینستیتووی سەید(پیر)- مورید، کە ئەوا لە گۆڕاندایە، تایبەتە تەنیا بە

شـەبەکی شـیعەوە، ئـەویش وەکـو پاشـماوەی تـوخمێکی سـەرەکیی دۆگمـای عەلەویزم . هەرچی لـەناو سـوننەی شـەبەکە- لەگـەڵ ئـەوەی ڕێز لـە سـەید و بنەماڵەکـەیان دەگـرن، وەکـو هـەموو موسـڵمانانی سـوننە، لای ئـەمان مـەلا و پیـاوانی ئـایینی ڕۆڵـی سـەرەکی دەبیـنن، بـەلام نـەک بەشـێوەی سـەیدی شیعەکان[٦] .

شیعەکانی شەبەک مەراسیمی عاشـورا جێبـەجێ دەکـەن و بـەڕۆژووش دەبـن، هـەروەها زیـارەتی کەربـەلا و نەجـەف، گـۆڕی ئیمـام و پیاوچاکـانی ناوچەکانیان دەکەن وەکو : ئیمام زین العابدین لە گوندی عـەلی ڕەش، ئیمـام ڕەزا لە گوندی تیسخراب، ئیمام عەباس کوڕی عەلی لـە گونـدی عەباسـییە .../ سالم ٢٠١١، ٩٧/ .

جلوبەرگی نەریتیی شەبەک خەریکە لەنێودەچێ، بەڵام هەندێک لە نەوەی بـە تـەمـەن ئێسـتاش کـەوا و سـەڵتە و جامانـە دەپۆشـن یـان تـەنیا جامانـە و شەرواڵ و کراسێکی بەسەردا شۆڕ دەکەنـەوە - خـەڵکی واش بـەدی دەکرێن کە عەگاڵ بەسەر و دشداشە و عەبایان لەبەرە .

شــەبەک پەیوەنـدییان بـە خــەڵک و گرووپـەکانی تـری ناوچەکـەوە تـا ئەوپـەڕی باشـە، تێکـەڵاوی و هـەرەوەز و بـەهاناوەچوونیان لەنێوانـدا هەیـە؛ بەتایبــەتیش لەگــەڵ مەسـیحی و ئێزدییـان- حاڵــەتی وا زۆرن کــە شــەبەک پەیوەنـدیی "کریفی"یـان لەگـەڵ ئێزدییـان بەسـتووە/ شـوکت،٢٠٠٤، ١٠٣/؛ ئـەو کەسـەی لەکاتی خەتەنەکردندا منداڵەکە لە ئامێزدەگرێ دەبێتە "برای خوێنی"ی ئەندامانی ئەو ماڵە و پێیدەڵێن " کریف ".

پەیوەندیی نێوان شیعە و سوننەکان هەمیشە ئاسـایی بـووە، تێکـەڵاوی و ژنخوازییـان لـە نێوانـدا هـەبووە؛ بـەڵام لـە ئـەنجامی توندبوونی ڕەوتـی تـایفی دوای دەسـەڵات گرتنەدەسـتی شـیعە لـە عیـراق سـاڵی ٢٠٠٣، ئـەو پەیوەندییـە ئـاڵۆزیی تێکـەوت و دوای هـاتنی داعـش بـۆ ناوچەکـە سـاڵی ٢٠١٤ شـەبەکی شـیعە ناوچـەکانی خۆیـان جێهێشـت، کـەچی سـوننەکان مانـەوە- بـەڵام دواتـر ئەمانەی دواییش ناچار تاک تاکە و بە گرووپ هەوڵدەدەن خۆیان ڕزگاربکەن لەژێر دەستی داعش[٧]. لەگەڵ ئەوەشدا، هیچ بـەگژ یەکدا چوونێکی شـیعە و سوننەی شەبەک تاکو ئێستا تۆمار نەکراوە.

## ئەنجام

- شەبەک کۆمەڵەیەکی ئێتنیکیی کوردییە لە گوندەکانی دەشتی مووسڵ نیشتەجێن؛ زۆرینەیان شیعەیە، سوننەشیان بەڕێژەی ٤٠% پێکەوە و بە تێکەڵی لە گوندەکانیان دەژین و بە دیالێکتی گۆرانی (ماچۆ) دەپەیڤن؛

- ئەمانە بە ڕەچەڵەک زازای عەلەویی بوون لە ناوچەی شۆبەکی دەوروبەری دەرسیمەوە هاتوون و لەم شوێنانەدا جێگیر بووینە، لەبەر هاوسێیەتیشیان لەگەڵ باجەڵان و سارەلوو لە ماوەیەکی درێژدا ماچۆ بووە بە زمانی ئاخافتنیان- وەکو پسپۆرانی زمانیش سەلماندوویانە زازا و گۆرانی لە یەکەوە نزیکن .

- مووسڵ هەمیشە مەڵبەندێکی بەهێزی سوننیزم بووە، بەشێک لە شەبەک ناچار بوون بە سوننە، بەشەکەی تریش کە زۆرینەن لەبەر هەژموونی سوننە لە عەلەوییەوە بوون بە شیعەی جەعفەری (١٢ ئیمامی) .

- لای شەبەکی شیعە تا ماوەیەکی کورتیش پێش ئێستا توخمی عەلەویزمیان لەناودا پارێزرابوون، وەکو : بە پیرۆزدانانی کتێبە پیرۆزەکانی عەلەوییان گولبەنگ و بویروق و خوێندنەوەیان لە بۆنەکاندا؛ زیارەتکردنی گۆڕی (حاجی بەکداش)ی عەلەوییان (لەهەندێ گوندەکانی شەبەک تا ساڵانی شەستەکانی سەدەی ڕابردووش خۆیان هەر بە بەکتاشی داناوە)؛ نەناشتنی مردووەکانیان لە نەجەف (بەم دواییانە هەندێکیان ئەمەش دەکەن)؛ داننان بە گوناهباری لای سەید (پیر) ...

- ئینستیتووی پیر- مورید، کە یەکێکە لە گرینگترین ئاسەوارەکانی عەلەویزم، ئێستاش لەناو شەبەک بەڕادەیەک کاریگەری ماوە .

- لەگەڵ ئەوەی توندوتیژیی تایفی (شیعە و سوننە) تادێ زیاد دەبێ لە عیراق، بەڵام پەیوەندییەکانی نێو شەبەک هەر بە ئاسایی ماوەتەوە؛ هاوکات پەیوەندیی شەبەک و تورکمان و عەرەب و مەسیحی و ئێزدی هەمیشە باش بووە .

## پەراوێزەکان:

(١) ئەم کارەی مارتن ڤان بروینسن یەکەم جار لە : Les Annales de l'Autre Islam,5,1998, 185- 196 بڵاوکراوەتەوە.

(٢) چاوپێکەوتن لەگەڵ د. فازیل عەلی غایب / هەولێر ٦/٢٦/ ٢٠١٦

(٣) چاوپێکەوتن لەگەڵ هەواڵدەرانی شەبەک- بەڕێزان د. فازیل عەلی غایب و د. ڕەمەزان شەریف داودی لە هەولێر ٢٠١٦/٨/١١

(٤) د. فازیل عەلی غایب ٦/٢٦/ ٢٠١٦

(٥) د. فازیل غایب، د. ڕەمەزان شەریف

(٦) د. فازیل غایب

(٧) د. فازیل غایب، د. ڕەمەزان شەریف

## سەرچاوە:


1-Martin van Bruinessen ; A Kizilbash Community in Iraqi Kurdistan: The Shabak . http:// Citeseerx.ist.psu. edu/viewdoc / 26. 11. 2015

2- Sahbeklêr . https://az.wikipedia.org/wiki%c5%9Eahbekl%c9%99r
26. 11.2015

3- Paul White ; Ethnic Differentiation among the Kurds: Kurmanci, Kizilbash and Zaza . http:// members.tripod.com/-zaza_kirmanc/research/paul.htm
26.11.2015

4- Grenard M. F.; Religeoznaya sekta Kizilbashey v Maloi Azii", perevod s fran.: P.E. Averyanov, v kn.: Izvestya Shtaba Kavkazskogo voennogo Okruga. Tiflis,1905, No. 7-8

( گرینارد م. ف.؛ "مەزهەبی قزڵباشی لە ئاسیای بچووکدا"- وەرگێڕانی لە فەڕەنسییەوە بۆ زمانی ڕووسی پ. ئی. ئاڤێریانۆڤ. لە کتێبی : هەواڵەکانی بارەگای جەنگیی قەفقاسیا، تفلیس، ١٩٠٥، ژمارە ٧- ٨)

5- Z. A. Yousupova ; Kurdski Dialekt Avramani . Moskva,2000.

( ز. ئا. یوسوپۆڤا؛ دیالێکتی کوردیی هەورامانی . مۆسکۆ ٢٠٠٠)

(٤) احمد شوكت؛ الشبك، الكورد المنسيون . السليمانية ٢٠٠٤ .

(٥) د. عبدالفتاح علي البوتاني؛ دراسات ومباحث في تاريخ الكورد والعراق المعاصر. دار سپيريز للطباعة والنشر، ٢٠٠٧، أربيل .

(٦) زهير كاظم عبود؛ الشبک في العراق . المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت ٢٠٠٩، ط٤ .
(٧) ابراهيم الداقوقي؛ العلويون- أصحاب دين جديد أم طريقة تصوف أو مذهب لعصر العولمة؟ . دار آراس للنشر والطباعة، ط٢، ٢٠١٠ أربيل .
(٨) د. رمضان شريف الداودى؛ الكورد الشبک، دراسة تاريخية- اجتماعية. گۆڤاری زانكۆی سلێمانی ژماره (٤٠) ٢٠١٣
(٩) سالم جمعة خضر محمد شبک؛ تاريخ الشبک فى بلاد الموصل. دهوک، ٢٠١٤
(١٠) د. نەجاتی عەبدوڵڵا؛ شەبەک، مێژوو و زمان و باوەڕیان . گۆڤاری ئەکادیمیای کوردستان، ژماره (٤) ٢٠١٥ .
(١١) پ. ی. د. نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو؛ جوگرافیای شێوەزاری باجەلانی ناسراو به شێوەزاری شەبەک . گۆڤاری (ڕامان) ٢٢٣ – ٢٠١٥/١٢/٥ .

## ملخص البحث

### الشبك — اصلهم ، لغتهم ومعتقداتهم الدينية

### ( بحث انثروبولوجى )

يشكل الشبک مجتمعا ذو اثنية كوردية يغلب عليه الطابع الدينى. فقد اصبح هذا المجتمع محل بحث واهتمام من قبل الرحالة والساسة والمستشرقين الاجانب منذ بدايات القرن الماضي ومن بعدهم الباحثون العرب ومن ثم الكورد مؤخرا .

ان اهمية هذا البحث حول الشبك تكمن في انه من البحوث الاوائل الصادرة باللغة الكوردية وكذلك وجود آراء مختلفة بعضها متشابكة ومتعارضة حول اصلهم ولغتهم ومعتقداتهم الدينية؛ والذي يزيد من قيمة هذا البحث هو ظهور مصادر جديدة حول الشبك والتى بعضها من نتاج الشبك انفسهم . هذا اضافة الى المعلومات التى استطعنا الحصول عليها من خلال المقابلات والنقاشات التى اجريناها مع اعضاء من المجتمع الشبكي، كل هذا ساعدنا في التوصل الى استنتاجات مهمة حول اصل الشبك ولغتهم ومعتقداتهم الدينية.

# Abstract

**The Shabaks - Their Origin. Language and Religious Beliefs**

**(An anthropological research)**

**By: Dr Rashad Miran**

The Shabaks form a community that is ethnically Kurdish with dominant religious characteristic, which since the beginning of the last century has attracted the attention of many foreign explorers, politicians, scholars and then later Arabs and recently Kurds.

The importance of this research is due to its being one of the first researches on Shabaks written in Kurdish Language as well as the existence of many different and contradicting views about their origins, language and religious beliefs. The factor which gives this research even more value is the availability of new sources about the Shabaks which some of them are written by Shabaks themselves. Furthermore, we have managed to gain more information through interviews and conversations conducted with members of this community; all these were helpful for us to reach some important conclusions about shabak community, their origins and religious beliefs.

# ئەدەبی زارەکی وەک سەرچاوەیەک بۆ نووسینی مێژووی کوردستان

**پ. د. سەعدی عوسمان هەروتی**
زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر

کلیلی توێژینەوە: کوردستان، مێژوونووسین، مێژووی زارەکی، ئەدەبی زارەکی، فۆلکلۆر

**پێشەکی:**

پێش سەرهەڵدانی مێژوونووسین، کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی پێشهاتەکانی ڕۆژانەو ڕووداوەکانی ڕابردووی لەڕێگەی ئەدەبی زارەکییەوە دەپاراست. ئەم پێشهات وڕووداوانە دەبوونە چیرۆک وداستان وباوکان بۆ ڕۆڵەکانیان دەگێڕایەوە. یان شاعیرو سترانبێژەکان لەشێوەی بەیتی شیعری وستران دەیانگوتەوە. بەم شێوەیە نەوەکان بۆ یەکتریان دەگواستەوەو لەکۆیادەوەریدا دەمایەوە. دیارترین نمونەش لەسەر ئەمە هەردوو داستانی (ئەلیادەو ئۆدیسە)یە کە شاعیری یۆنانی (هۆمیرۆس) لەسەردەمە کۆنەکانی یۆنان بەزارەکی دەیگوتنەوە.

لەم ساڵانەی دواییدا مێژوونووسان لەو ڕاستییە گەیشتن کە ئەدەبی زارەکی چەندین زانیاری گرنگ لەبارەی ڕەوشی کۆمەڵایەتی وئابووری وڕامیاری و تەنانەت ڕۆشنبیریش، لەخۆدەگرێ. بۆیە ئاراستەیەک پەیدابوو بۆ بەکارهێنانی ئەم جۆرە ئەدەبە وەکو کەرەستەو سەرچاوەی مێژوویی. ئەم توێژینەوەیەی ئێمەش هەوڵێکە بەم ئاراستەیە. ئامانجی توێژینەوەکە ئەوەیە کە سەرنجی مێژوونووسان وتوێژەران بۆ گەنجینەی ئەدەبی زارەکی کوردی ڕابکێشێ. بۆ ئەوەی لەکاتی نووسینەوەی مێژووی کورد وکوردستان

دەقە زارەکییەکان فەرامۆش نەکەن و وەکو سەرچاوە بەکاریان بهێنن. بەڵام بەشێوازو تەکنیکی تایبەت، کە لەمیانەی توێژینەوەکەدا باسیان دەکەین.

توێژینەوەکە دەروازەیەک وسێ باس لەخۆدەگرێ؛ لەدەروازەدا وەکو زەمینەخۆشکردن بۆ بابەتی سەرکی، کورتەیەک لەبارەی مێژووی زارەکی دەنووسین. ئینجا لەباسی یەکەمدا بەدرێژی باسی ئەدەبی زارەکی دەکەین، بۆ ئەوەی پێناسەی بکەین وجۆرەکانی بەدیاربخەین. هەروەها سەرنجی ئەو هەوڵانەش دەدەین کە دراون بۆ کۆکردنەوەو نووسینەوەی ئەم ئەدەبە. لەباسی دووەمیشدا بەگشتی بایەخی ئەدەبی زارەکی بۆ نووسینەوەی مێژوو بەدیاردەخەین. لەباسی سێیەم وکۆتاییدا دێینەسەر مەبەستی سەرەکیمان کە باسی مێژووی کوردە لەسایەی ئەدەبی زارەکیدا. هەر لێرەدا بەنموونەوە لایەنە ئەرێنی ونەرێنییەکانی ئەم جۆرە سەرچاوەیە بۆ مێژووی کورد ڕوون دەکەینەوە. سەبارەت بە سەرچاوەکانی ئەم توێژینەوەیەش، دەبێ بڵێین سەرەتا پشتمان بەو ووتارو توێژینەوانە بەستووە کە لەسایتەکانی ئینتەرنێت بڵاوکراونەتەوە. چونکە ئەم بابەتە کە مەسەلەیەکی تارادەیەک نوێیە، بەزۆری لەئینتەرنێت بابەتی لەسەر بڵاوکراوەتەوە. بەڵام لەکاتی پێویستیشدا سوود لەکتێب وتوێژینەوە ئاساییەکان بینراوە. بەتایبەتی نووسینەکانی ڕۆژهەڵاتناسان و ئەوانەی کە دەقە زارەکییەکانیان بڵاوکردۆتەوە.

**دەروازە:**

**پوختەیەک لەبارەی مێژووی زارەکی (Oral History):**

زارەکی (الشفاهی Oral) ئەو گوتەو زانیارییەیە کە لەڕێگای دەمەوە دەردەچێ، لەوێوە سەرچاوە دەگرێ و هەر لەو ڕێگەیەوەش لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر و لەکۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی تر و لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر بڵاودەبێتەوەو لەنێو خەڵکدا دەگوترێتەوە. ئەم گوتەیە بەشێوەی زارەکی ڕۆڵی خۆی دەبینێ، هەچەندە دواتر بنووسرێتەوەو تۆمار بکرێ وببێتە بینراو وبیستراو.[1] (گێڕانەوەی زارەکی)ش ئەو یادەوەرییانەیە کە پەیوەندییان بەڕابردووی دوورەوە هەیە. ئەوانیش لەکلتورێکی دیاریکراودا ناوبانگیان پەیداکردووەو نەوە دوای نەوە گواستراونەتەوە. بەمەش دەتوانین بڵێین کەلەپوری میللی وفولکلۆریش دەچێتە چوارچێوەی گێڕانەوەی زارەکی. چونکە ئەم کەلەپورە بەرهەمێکی کۆمەڵایەتییەو سیمای ئەو نەتەوەیەی لەقۆناغێکی دیاریکراودا هەڵگرتووە.[2] لەڕاستیدا کەلەپوری میللەتان هێشتا لەژێر باڵی خۆیان کەرەستەیەکی زۆریان حەشارداوە کە دەکرێ ببنە ئامرازێک بۆ ئاشنا بوون بەڕاستییەکان. بەلایەنی کەم، هەندێ زانیاری سایکۆلۆژییان تیدایە کە لەمێژووی نووسراودا نابینرێن. چونکە هەر چیرۆکێکی میللی و هەر نەریتێک لەنەریتەکانی میللەتان لەبنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ ڕاستییەکی دیاریکراو لەمێژووی مرۆڤایەتیدا. بەڵام هەندێ لەمێژوونووسان کە (کۆنترۆڵی دەق Textuality) بەسەریاندا زاڵە، دان بەگێڕانەوەی زارەکی دا نانێن وەکو سەرچاوەیەک بۆ نووسینەوەی مێژوو. بەلای ئەوانە تەنیا دەقی نووسراو بایەخی هەیە لەم بوارەدا.[3] لەوانەیە ئەمە بگەڕێتەوە بۆ (پیرۆزی نووسراو) کە لەلای هەندێ کۆمەڵگەدا باوە، بەتایبەتی کۆمەڵگە ئیسلامییەکان.[4]

ئەمە لەکاتێکدایە کە خودی دەقە نووسراوەکان زۆربەیان لەبنەڕەتدا لەشێوەی زارەکییەوە گواستراونەتەوە بۆ نووسراو. تەنانەت ئەو کەسەی کە (تەورات)یشی کۆکردۆتەوەو نووسیوەتەوە، پشتی

بەگێڕانەوەی زارەکی کەسانێک بەستووە کە هەندێ بەشی تەوراتی بنەڕەتییان لەبیر مابوو.[٥] بێگومان فەرموودەکانی پێغەمبەری ئیسلامیش (د.خ) دوای مردنی لەزاری کەسانی تر کۆکراوەتەوە.[٦] هەروەها (ئەلیادەو ئۆدیسە)ش کە دراونەتە پاڵ شاعیری یۆنانی (هۆمیرۆس)،[٧] سەرەتا زارەکی بوون ودەماودم دەگوترانەوە. بەڵام دواتر نووسرانەوە.[٨] زیاتر لەوەش ئێمەی مێژوونووسان دەزانین کە مێژوونووسین لەبنەڕەتدا پشتی بەگێڕانەوەی زارەکی بەستووە. واتە پشتی بەگوتەی شایتحاڵەکان بەستووە. هەر بەم تەکنیکە (هیرۆدۆتس)[٩] کتێبی (مێژوو)ی نووسی. هەروەها (تۆسیدیس)یش کتێبی (جەنگی بیلۆبۆنیز)ی دانا.[١٠] (هیرۆدۆتس) چەندین گەشتی بۆ ئەنادۆڵ و ڕۆژهەڵاتی نزیک کرد، بەمەبەستی کۆکردنەوەی چیرۆک وگێڕانەوەکان لەبارەی مێژووی ئەو وولاتانەی کە سەردانی دەکردن. لەسەردەمی بەرایی کریستیانیشدا گێڕانەوە زارەکییەکان بایەخی زۆریان هەبوو بەتایبەتی کە زۆرینەی کریستیانەکان نەخوێندەوار بوون. هەر لەم ڕێگەیەوە (ئینجیل) نووسرایەوە. لەسەدەکانی ناوەڕاستیشدا مێژوونووسان پشتیان بەگێڕانەوەی دەماودەم دەبەست لەپاڵ یادەوەری خۆیان و گوتەی شایەتحاڵەکان.[١١] لێرەدا دەکرێ ئاماژە بەکتێبی (Doomsday Book) بکەین، کە یەکەم سەرچاوەیە لەبارەی مێژووی ئابووری وکۆمەڵایەتی ئینگلتەرا لەسەردەمی نۆرماندی. ئەم کتێبە کە لەساڵی ١٨٠٦ز نووسراوەو زانیاری زۆری تێدایە لەبارەی هەڵومەرجی ئابووری وکۆمەڵایەتی و موڵکداریێتی زەوی وداهاتی حکومەت ودانیشتووان، تاڕادەیەکی زۆر پشتی بەزانیاری وگەواهی کەسەکان بەستبوو.[١٢]

کاتێ دێینەسەر باسی جیهانی ئیسلامیش، دەبینین مێژوونووسە عەرەب وموسڵمانەکان کەرەستەی زارەکییان بەشێوەیەکی بەرفراوان بەکارهێناوە. ئەمەش لەزنجیرەی پشتڕاستکردنەوە ( سلسلة إسناد)ی هەواڵەکان بەڕوونی دەردەکەوێ، کە ناوی چەندین گەواهیدەر

وگێـــڕەرەوە ڕیزدەکـــەن ئینجـــا هەواڵەکـــە دەنووســـن. (الـــبلاذري ٢٧٩ک/٨٩٣ز مردووە) و (الطبری ٣١٠ک/ ٩٢٣ز مردووە) و (المسعودی ٣٤٦ک/ ٩٥٨ز مردووە) لەسەرووی مێژوونووسە بەراییە موسڵمانەکانن کە زۆر پشتیان بەگێڕانەوەی زارەکی بەستووە بۆ دانانی کتێبەکانیان.[١٣] بۆیـە هەنـدێ لـەتوێژەران پێـان وایـە کـەمێژووی نووسـراو لەباوەشـی کەلەپووری زارەکی لەدایکبووە.[١٤]

لەســەردەمەکانی دواتــریش گێڕانــەوەی زارەکــی لــەپاڵ زانیــاری نووسراو وەکو سەرچاوە بۆ نووسینی مێژوو بەکاردەهێنرا. بەتایبەتی لای ئەو مێژوونووسـانەی کە ڕووداوەکانی نزیک لەسـەردەمی خۆیـان دەنووسـییەوە. وەکـو شـەرەفخانی بەدلیسـی (١٥٤٣- ١٦٠٣؟) کـە لـەپاڵ کتێب وسـەرچاوە مێژووییـەکان، پشـتی بەگێڕانـەوەی زارەکـی کەسـانی بەتەمــەنی جێگــەی بــاوەڕ وهــەروەها دیـتن ویادەوەرییــەکانی خــۆی بەسـتووە بـۆ نووسـینی کتێبـی (شـەرەفنامە). بۆیـە لەچەنـدین شـوێندا ئاماژە بە زانیاری گێڕانەوەکان دەکات.[١٥] هەندێ لەمێژوونووسانی تری سـەردەمی عوسـمانیش بـۆ نووسـینی کتێبـەکانیان هـەر بـەم شـێوەیە پشــتیان بەگێڕانــەوەکانی ئــەو کەســانە بەســتووە کــە هاوچــەرخی ڕووداوەکان بوون.[١٦]

لەسەدەکانی حەڤدەهەم وهەژدەهەمدا پشت بەستن بە بەڵگەنامەو سەرچاوە نووسراوەکان بووە بناغـەی مێژوونووسـین لـە ئەوروپا. لـەو دەمـەوە دەسـتەواژەی (بەڵگەنامـەکان سـەرچاوەی یەکـەمی پلـە یـەکن) بەدیارکەوت و بەدەگمەن پەنا بۆ گێڕانەوەی زارەکی دەبردرا. سەرەڕای ئەمە هێشتا مێژوونووسان لەنێوان خۆیاندا ناکۆک بوون سـەبارەت بە بایەخی مێژووی زارەکی. بەتایبەتی کە لەسـەرەتاکانی سـەدەی نۆزدەمدا توێژینەوە لەبواری فۆلکلۆر و کەلـەپووری میللـی دەسـتیپێکرد. هەندێک بەلایانەوە وابوو کە ئەم کەلەپوور وزانیارییە زارەکییانە هیچ بایـەخێکی مێژووییان نیەو بەزۆری دەچنە چوارچێوەی ئەفسـانەو ڕووداوی دوور لەڕاسـتی. لەبەرامبەریشـدا بۆچـوونێکی تـر هـەبوو کـە پێـی وابـوو ئـەم

کەلــەپووره میللییانــە هەنــدێ ڕووداویــان تۆمــارکردووە کــە دەکــرێ بەیارمەتی سەرچاوە مێژووییەکان ساغبکرێنەوە. بۆیە دەتوانین وەکو سەرچاوەی یارمەتیدەر و هەندێ جاریش وەکو سەرچاوەی سەرەکی بەکاریان بهێنین، هەر بەو شێوازەی کە کەرەستە مێژووییەکانی تر بەکاردەهێنرێن.(١٧)

سەرەنجام پەرەسەندنی تەکنەلۆژیاو توانای تۆمارکردنی دەنگ و وێنەی کەسەکان، لەماوەی دوای جەنگی دووەمی جیهانیدا ڕێگەی خۆشکرد بۆ بووژانەوەی مێژووی زارەکی. سەرەتای ئەم پرۆسەیە بەپێی وولاتەکان جیاواز بوو؛ لەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەستپێکی ئەم کارە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٤٨، کاتێ (Allan Nevins) لەزانکۆی کۆلۆمبیا پرۆژەیەکی مێژووی زارەکی دەستپێکرد بە مەبەستی کۆکردنەوەی یادگاری وبیرەوەرییەکانی پەیوەندیدار بە کەسایەتییە دیارەکانی ئەمریکا. هەرچی بریتانیا بوو ئەوا پێشەنگانی مێژووی زارەکی تیایدا لە پەنجاکانی سەدەی بیستەم بەدیارکەوتن. سەرنجی ئەمانە، بەپێچەوانەی زانکۆی کۆلۆمبیا، لەسەر چینی ئاسایی خەڵک بوو. چونکە ئەزموونی چینی کرێکارانیان تۆمار دەکرد. مەبەستیان ئەوەبوو بیسەلمێنن کە مێژوو تەنیا کارو کردەوەی چینی بژاردەو دەسەڵاتداران نیە. مێژووی زارەکیش سەرچاوەیەکی بنەڕەتییە بۆ سەرخستنی دروشمی "مێژوو لەقووڵاییدا".(١٨)

دواتر مێژوونووسی تر بایەخیان بەمێژووی زارەکی دا. بەتایبەتی (یان ڤانسینا J. Vansina) کە هەوڵیدا بایەخی مێژوویی کەلەپوری زارەکی بەدیاربخا. بۆیە لەساڵی ١٩٦١ کتێبێکی بەزمانی فەرەنسی بەناونیشانی (سەربردە زارەکییەکان/ توێژینەوە لەڕێبازی مێژوویی) دەرکرد. دواتریش لەساڵی ١٩٦٥ لەشیکاگۆ بەئینگلیزی دەرچوو، ئەم کتێبە بووە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ مێژوونووسان.(١٩) (پاول تۆمسۆن Paul Thompson)یش کە مێژوونووسێکی کۆمەڵایەتی بوو لەزانکۆی ئیسێکس (Essex)، لەبریتانیا پێشەنگ بوو بەوەی کە (کۆمەڵەی مێژووی زارەکی

بریتانی British Oral History Society) لەسەرەتای حەفتاکان دامەزراند، کە لەبزاڤی مێژووی زارەکی جیهانیدا ڕۆڵی هەبوو. هەروەها کتێبەکەشی (The Voice of the Past) کە لەساڵی ١٩٧٨دا دەرچوو، بووە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ ئەوانەی بایەخ بەمێژووی زارەکی دەدەن. (پاول تۆمسۆن) بەرگری لەمێژووی زارەکی کرد لەهەمبەر ڕەخنەگران و ئەوانەی بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە یادەوەری وەکو سەرچاوەی مێژوویی جێگەی متمانە نیە. ئەو مکوڕ بوو لەسەر سەلماندنی بایەخ وگرنگی ڕیبازەکەی.(٢٠)

مێژووی زارەکی ئێستا لەووڵاتانی ڕۆژئاوا چەندین قۆناغی بڕیوەو پەرەسەندنی دیاری بەخۆوە بینیوە.(٢١) تەنانەت سەرچاوە مێژووییە زارەکییەکان بە ئەرشیڤ کراون و لەم بوارەدا سوود لە (وێب)یش بینراوە.(٢٢) دیارە لەم ساڵانەی دواییدا، لەووڵاتە عەرەبییەکانیش خەریکە ئاوڕ لەمێژووی زارەکی دەدرێتەوە. ئەویش لەڕێگای هەندێ دامەزراوەی ئەکادیمی وزانستییەوە. دیارترینیان هەوڵی مێژوونووسانی (تونس)ـە بۆ توێژینەوە لەمێژووی کەمایەتییەکان ومێژووی بزاڤی سەندیکاکان. هەروەها لەووڵاتی میسریش دەستکراوە بەتوێژینەوە لەمێژووی بزاڤە سیاسییەکان بەپشت بەستن بە گەواهی زارەکی. هەروەها ئامادەکاری دەکرێ بۆ دامەزراندنی ناوەندی مێژووی زارەکی لە خانەی بەڵگەنامەی نەتەوەیی لەقاهیرە.(٢٣) لەسعودییەش لە (خانەی شا عەبدولعەزیز) یەکەی مێژووی زارەکی دامەزراوە.(٢٤)

لەکوردستانیش، ساڵانێکە هەندێ کەس هەستیان بەم ڕاستییە کردووە؛ ئەوەتا نووسەرێکی وەک (عەبدولڕەقیب یەسف) هەر لەساڵی (١٩٨٥)ـەوە لەڕێی کتێبێکیەوە بانگەوازی بۆ ڕووناکبیرانی کورد کرد لەپێناو کۆکردنەوەی کەلەپووری کوردی بە هەردوو جۆری ماددی ونامادديیەوە. ئەو داوایکرد بیرەوەری بەساڵداچووان و باس وخواسی سەرزاری خەڵک و ئەفسانەو پەندی کوردی وەک سەرچاوەی مێژوویی سوودیان لێ ببینرێ. هەروەها هانی ئەو کەسانەشی دا کە زانیاری

مێژووییان لایە بۆ ئەوەی یادداشتەکانیان تۆمار بکەن.[٢٥] لەسالانی دواتریش هەندێ هەوڵی بەرایی درا بۆ تۆمارکردنی گێڕانەوە زارەکییەکان و سوودلێبینیان لەبواری مێژوو؛ دیارترینیان کتێبی (شایەتحاڵەکانی ئەنفال)ـە،[٢٦] کە تۆماری لێدوانەکانی هەندێ لە قوربانیانی پرۆسەی ئەنفالە. هەروەها زۆربەی مێژوونووس وتوێژەرانیش لەڕێی دیداری ڕاستەوخۆ سوود لە زانیاری ئەو کەسانە دەبینن کە بەشداری ڕووداوەکان بوون، کاتێ مێژووی هاوچەرخی کوردستان دەنووسن.

دیداری کەسەکان لەپێناو تۆمارکردنی دەقی زارەکی، کە هەندێ کەس بە(مێژووی زیندوو Life History) ناوی دەنێن، هەندێ ڕەهەندی دەروونی ومرۆڤایەتیمان بۆ ڕوون دەکەنەوە کە ناتوانین لەڕێی دەقی نووسراوەوە پێیان بگەین. چونکە لەڕێی ئەم دیدارەوە مێژوونووس دەتوانێ لەگەڵ ئەو ڕووداوانەدا بژی کە لێیان دەکۆڵێتەوە. ئەویش بەهۆی گوێگرتن لەو کەسانەی کە لەم ڕووداوانەدا بەشدار بوون. لەڕێی گفتوگۆ لەگەڵ ئەمانە، توێژەر دەتوانێ زۆر لایەنی ئەم ڕابردووە ڕوون بکاتەوە. هەروەها دەزانێ کە کاریگەری ئەم ڕووداوانە لەسەر ئەو کەسانە چۆن بوو کە بەشداربوون تیایدا یان بینیویانەو گوێبیستی بوون. ئەمەش دەرەنجامە زانستییەکانی توێژەر ووردتر دەکات و ڕاستتر ئامانجەکانی دەپێکێ. هەندێ جاریش ئەم دیارە کەسییانە هەندێ ڕاستی مێژوویی نوێ ئاشکرا دەکەن کە پێشتر نەزانرابوون.[٢٧]

بەگشتی دەتوانین بڵێین مێژووی زارەکی دەرفەت دەداتە مێژوونووس بۆ فراوانکردنی بواری توێژینەوەو ووردبوونەوە لەو مەسەلانەی کە تیایاندا ڕابردوو لەگەڵ هەنوکەدا کارلێکتر دەکەن. هەروەها دەروازەی ئەو بوارانە والا دەکات کە تا دوێنێ کۆمەڵناسان وئینثرۆپۆلۆجییەکان قۆرخیان کردبوو. چونکە بەهۆی ئەو زانیارییە زارەکییانە، تویژەر دەتوانێ بچێتە قوولایی ئەو پێگە وبازنە کۆمەلایەتییانەی کە زانیاری نووسراو پەی پێنەدەبردن. بەمەش

لەیادکراوانی مێژوو قسەیان دەبێ. هەر بۆیە مێژووی زارەکی بایەخێکی تایبەت بە پەراوێزخراوان دەدات؛ وەکو ئافرەتان وزەحمەتکێشان وکەمایەتییەکان، ئەوانەی کە بەدەگمەن لە دەقە نووسراوەکاندا بەدیاردەکەون. ئەویش تەنیا لەتێڕوانینی بەرامبەردا، کە بەزۆری نەرێنییە. دیارە بایەخدان بە پەراوێزخراوان، بایەخدانە بەمێژووی کۆمەڵایەتی وژیانی ڕۆژانەی خەڵک وچۆنییەتی بیرکردنەوەیان.[٢٨]

**باسی یەکەم: ئەدەبی زارەکی وهەوڵەکانی نووسینەوەی:**

بەر لەوەی پێناسەی ئەدەبی زارەکی بکەین، پێویستە پێناسەی کەلەپووری زارەکی بکەین کەچوارچێوە فراوانەکەیە؛ بەپێی فەرهەنگی (لارۆس Larousse) کەلەپووری زارەکی بریتییە لە "کۆمەڵێک ترادیسیۆن لەئەفسانەو داستان و ڕووداو وزانیاری ورێچکەو بیروباوەڕو نەریت وپیادەکاری". هەرچی فەرهەنگی (ڕۆبیر)ـە ئەوا وا دەیناسێنێ کە : "گواستنەوەیەکی نامادديانەی ڕێچکەو سروتی ئایینی وخووڕەوشتی بۆماوەییە لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر لەڕێگەی ووشەی گوتراو".[٢٩] بەگشتی دەتوانین بڵێین کەلەپووری زارەکی کە کەلەپووری ناماددی دەگرێتەوە، بریتییە لە: بیروباوەڕو ئەفسانەو داستان وشێوازەکانی دەربڕینی زارەکی وئەو زانیاری وشارەزاییانەی کە کۆمەڵ وتاکەکان بە بەشێک لەکەلەپووری ڕۆشنبیری خۆیانیان دادەنێن. هەرچی ئەدەبی زارەکییە، ئەوا هەموو شوێنەوارە زمانەوانییەکان دەگرێتەوە کە لەڕێگەی شێوازی داڕشتنیان هەست وسۆزمان دەوروژێنن. هەر بەشێوەی زارەکیش دەگەیەنرێنە ئەوانیتر.[٣٠] بێگومان زۆربەی هەرەزۆری کۆمەڵگەو نەتەوەکان ئەدەبی زارەکییان هەبووەو لەسەردەمانی ڕابردوودا پەنایان بۆ بردووە. دیارە بیروباوەڕە ئایینیە کۆنەکانیش یەکێک بوون لەهۆکارە گرنگەکانی سەرهەڵدانی ئەدەبی زارەکی. چونکە بوونە هۆی دانانی سروودی ئایینی وگۆرانی تایبەت بە ئەنجامدانی پەرستشە ئایینیەکان.[٣١]

ئـەدەبی زارەکـی، کـە بـە ئـەدەبی فۆلکلـۆری وئـەدەبی میللـیش نـاودەبرێ، چەنـدین جـۆر دەگرێتـەوە، وەکـو: چیـرۆک وحیکایـەت وسـەربردەی میللـی وپەنـد وقسـەی نەسـتەق وشـیعرو گـۆرانی.[٣٢] ئـەم جۆرانە لای زۆربەی میللەتان هاوشێوەن. بۆ نمونـە نەتـەوەی کـورد کـە یەکێکـە لـەو نەتەوانـەی سـامانێکی فۆلکلـۆری دەوڵەمەنـدی هەیـە، ئـەم جۆرانـەی ئـەدەبی زارەکـی (یـان میللـی) هەیـە: ئەفسـانە (جیڤـانۆک)، چیرۆک (حیکایەت)، داستانی پاڵەوانی ودڵداری، گۆرانی (ستران)، لاوک وحەیران، پەند ومەتەڵ (مەسەلۆکەو مامک).[٣٣]

بێگومـان ئـەدەبی زارەکی لـەو سـەردەمەدا زیـاتر بـاوبوو کەهێشـتا نووسـین پەیـدا نـەببوو یـان بڵاونـەببۆوە. بـەڵام هەنـدێ نەتـەوە دوای پەیـدابوونی نووسـین ومێژوونووسـینیش هـەر پـەنایان بـۆ شـێوازی ئـەدەبی زارەکـی بـردووە. چونکـە بیسـتن لـەجیاتی بینـین بـاڵی بەسـەر جیهـانی هـزری کۆندا کێشـابوو. ئەمـەش بۆ ماوەیـەکی درێژ بـەردەوام بـوو، تەنانـەت دوای چەسـپاندنی نووسـین. لـەڕۆژئاوادا تـا کۆتاییـەکانی سـەردەمی بووژانـەوە بـەزۆری بـە ووتـار فێـری هونـەرەکانی گـۆتن دەبوون. ماددەی نووسراو بەجۆرێک پاشکۆی بیستن بوو، کە سـەرمان لێی سووڕدەمێنێ. چونکە بیستن بەشێوەیەکی بەرفراوان بۆ هێنانـەوەی مەعریفـە بـەرەو جیهـانی زارەکـی، بـەکاردەهات. وەکـو ئـەو گفتوگـۆو دیبەیتانـەی کـە لـەزانکۆکانی سـەدەکانی ناوەڕاسـت دەکـران، هـەروەها لەکاتی خوێندنەوەی دەقە ئەدەبیەکان بۆ گوێگران. تەنانەت کاتێ مرۆڤ بۆ خۆشی دەیخوێند، بە دەنگی بەرز دەیخوێندەوە.[٣٤]

هەروەها عەرەبەکانیش لـەپێش ئیسـلامدا نووسـینیان دەزانـی بـەڵام بەزۆری بەشێوەی زارەکی شیعرەکانیان دەگوتەوەو بڵاویان دەکردەوە. لەو سەردەمەدا شیعر شێوەی هەرە باوی ڕۆشنبیری بوو لای عـەرەب. بۆیە خەلیفەی دووەمی ئیسلام (عومەری کوڕی خـەتاب) لـەم بارەیـەوە دەڵێ: "شیعر زانستی نەتەوەیەک بوو کە زانستێکی دروستتریان نەبوو". شـیعر دیـوانی عـەرەب بـوو کـە پەنـد وهـەواڵ و ڕووداو وشـەڕەکانیانی

تێدا تۆمارکرابوو. شیعری کۆن کەکێش وسەروای هەبوو، زۆر گونجاوتر بوو بۆ لەبەرکردن وزارگۆتن.[٣٥] بۆیە لەلای عەرەبەکان ئەوەی پێیدەگوترێ (شیعری جاهیلی) بەتایبەتی (المعلقات السبعة) کە بەر لەپەیدابوونی ئیسلام لەنێو هۆزەکانی عەرەبدا بڵاوبوو، بەزۆری بەشێوەی زارەکی دەگوترانەوە، تا دواتر لەسەردەمە بەراییەکانی ئیسلامدا کۆکرانەوەو نووسرانەوە.[٣٦] ئەگەر باسی کوردستانیش بکەین؛ دەبینین داستانە شیعریی (مەم وزین) کە شاکاری (ئەحمەدی خانی ١٦٥٠- ١٧٠٧)یە،[٣٧] لەبنەڕەتدا چیرۆکێک بوو هەر بەشێوەی زارەکی لەنێو خەڵکدا مابۆوە. تەنانەت دوای ئەوەی شاعیری ناوبراو کردییە داستانە شیعریش، هێشتا هەر وەکو چیرۆک دەماودەم دەگێڕدرایەوەو لەزۆربەی ناوچەکانی کوردستان باوبوو.[٣٨]

لەکۆمەڵگە زارەکییەکان (واتە ئەوانەی پشت بەنووسین نابەستن) ڕووداوەکانی مێژوو هەروەها زانستی ڕەچەڵەک وزانیارییەکانی تریش هەر بەزارەکی دەگوازرانەوەو باسیان لێوە دەکرا. لەبەرئەوە زۆر پێویست بوو کە بەزمانێکی ئەدەبی دابڕێژرێن و بەشێوازێکی هونەری جوان بکرێن. بۆ ئەوەی لەبەرکردنیان ئاسان بێت وخەڵک حەز بەگوێگرتنیان بکات وبێزار نەبێ لەدووبارەکردنەوەو گواستنەوەیان. بەمەش لە کۆیادەوەریدا دەمایەوە. ئیتر پێشهاتە مێژووییەکان بەشێوازێکی ئەدەبی سەرنجڕاکێش دەڕازێنرانەوە. سەرەنجام ئەو کەسەی کە ڕووداوەکانی بەزارەکی دەگێڕایەوە (واتە شاعیرە نەخوێندەوارەکە)، لەیەک کاتدا ڕۆڵی ئەدیب ومێژوونووس ومامۆستا وفەیلەسوفی دەبینی. ئەم ئەرک وهونەر ومەعریفانە ئەوەندە تێکەڵ بە یەکتر دەبوون کە جیاکردنەوەیان گران بوو. بێگومان لەکۆمەڵگە زارەکییەکان یادەوەری ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینی لەپاراستن وبڵاوکردنەوەی بەرهەمی ئەدەبی. بۆیە بەهۆی ڕاهاتن ومەشقکردن یادەوەرییان بەهێزتر دەبوو.[٣٩] بە واتایەکی تر شاعیرە زارەکییەکان هەمیشە یادەوەرییەکی خێرا وزیندوویان هەیە. ئەوەتا شاعیرێکی

دەنگبێژی یوگسلاڤی لەخولەکێکدا (١٠-٢٠) بەیتی دەگوتەوە، کە هەر یەکێکیان (١٠) برگە بوون. هەروەها زۆربەشیان (یان هەموویان) نەخوێندەوار بوون، لەبەرئەوەی خوێندن ونووسین شاعیری زارەکی کۆت وبەند دەکات. چونکە خوێندن چەمکی دەق دەخاتە هزری شاعیر. وە ئەوەش کاردەکاتە سەر گێڕانەوەو هەروەها کرداری داڕشتنی زارەکیشەوە.[٤٠]

ئەمە دەنگبێژە کوردەکانیش دەگرێتەوە؛ چونکە (ئۆسکار مان) کاتێ باسی بەیتبێژەکانی ناوچەی موکریان دەکات دەلێ: "زۆر بەدەگمەن هەڵدەکەوێ بەیتبێژێک بتوانێ بخوێنێتەوەو بنووسێ". سەبارەت بەخێرایی وبیرتیژیش باسی بەیتبێژێک دەکات ودەڵێ لە بەندە درێژەکاندا ووشەکان زۆر بەخێرایی لەدوای یەکدا دەڵێتەوەو لە بەندە کورتەکانیشدا لە یەکیان دەکێشێتەوە. "دەڵێی بیری تیژی ئەو پیاوانە بەگوتنی بەیتەکانەوە بەستراوەتەوە". چونکە ئەگەر بە دەنگ بەیتەکان نەڵێ، ناتوانێ بیری خۆی بخاتە سەر دێر بەدێری بەیتەکان.[٤١]

(هۆمیرۆس)ی شاعیری یۆنانی دەڵێ ووشە باڵدارە، هەر لەگەڵ گوتنی لە هەوادا دەفڕێت. بەڵام نووسین باڵی ووشەکان دەکات و لەسەر کاغەز جێگیریان دەکات. لەگەڵ پەیدابوونی نووسین، مرۆڤ زمانی بە هەستی بینین بەستەوە. ئەم گۆڕینە لەهەستنی بیستنەوە بۆ هەستی بینین واتای ئەوەبوو کە ووشەو گفتوگۆ لەڕووداوێکی زەمەنی خێرا لەناوچووەوە بگۆڕێ بۆ شتێکی جێگیر و وەستاو لەشوێنێکدا کە هەر کاتێک بمانەوێ بتوانین بۆی بگەڕێینەوە. دەقی نووسراو شریتێکی بینراوە کە دەتوانرێ بوەستێنرێ بۆ ووردبوونەوە لەووشەیەک یان ڕستەیەک، بێ ئەوەی کار لەشریتەکە بکات. بەڵام لەشریتی بیستراو وەستان واتای بێدەنگی ونەمانی گفتوگۆیە.[٤٢]

لەسۆنگەی ئەم ڕاستییەوە، دەمێکە لە ئەورووپا کەسانێک دەستیانکردووە بەکۆکردنەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری وکەلەپووری زارەکی؛ ئەوەتا لەچوارچێوەی بزاڤی ڕۆمانسیدا بایەخ بەڕابردووی دوور

وکەلـەپوورە میللییەکـەی درا. لـەو کاتـەدا سـەدان کـەس لەکۆکـەرەوەی دەقـــەکان پەیـــدابوون؛ وەکـــو: (جـــیمس ماکڤێرســـۆن ١٧٣٦- ١٧٩٦) لەسکۆتلاند و (تۆماس پێرسی ١٧٢٩- ١٨١١) لەئینگلتەرا وهـەردوو بـرا گـریم[٤٣] (یـەعقوب ١٧٨٥ ١٨٦٣) و (ڤیلهیلم ١٧٨٦- ١٨٥٩) لـە ئـەڵمانیا و (فرانسـیس جـیمس تشـایلد ١٨٢٥- ١٨٩٦) لەویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئـــەمریکا. کـــە بایـــەخی زۆریـــان بەترادیســـیۆنە زارەکـــی ونزیـــک لەزارەکییـــەکان دا. لەســـەرەتای ســـەدەی بیستەمیشـــدا تـــوێژەری ســـکۆتلەندی (ئەنـــدرۆ لانـــک ١٨٤٤- ١٩١٢)[٤٤] و کەســـانی تـــر، ئـــەو بۆچوونەیان ئاوەژووکردەوە کە دەڵـی فۆلکلـۆری زارەکی تـەنیا بریتییـە لەئەفسانەی ئەدەبی.[٤٥]

هەر لەم سەروبەندەدا، چەندین ئەرشـیڤ ومۆزەخانـەی فۆلکلـۆری لەئـەوروپا کرانـەوە، کـە بایـەخیان بەکۆکردنـەوەی کەلـەپووری میللـی و لەنێویشیاندا ئەدەبی زارەکی دا. (ئەرشیڤی زانکۆی ئۆپسالا) لەسوید کـە لەسـاڵی ١٩١٤دا کەوتـە کـار، لـەدیارترین ئـەو ئەرشـیڤانەیە. (پـەیمانگای فۆلکلۆری ئێرلەندا)ش کـە لەسـاڵی ١٩٣٠ دامـەزرا، گـەلێ بابـەتی گرنگـی کـۆکردەوەو کتێبخانەیـەکی دەوڵەمەندیشـی دامەزرانـد.[٤٦] هەوڵـەکانی کۆکردنـەوەی دەقـەکانی ئـەدەبی زارەکـی لەسـاڵەکانی دواتـریش هـەر بـەردەوام بـوون؛ بۆ نمونـە کەسێک بـەناوی (لـۆرد) لـەدەمی شـاعیرانی یوگسـلاڤی چەنـدین دەقـی تۆمـارکردو لـەزانکۆی (هارڤـارد) داینـا.[٤٧] هەنـدێ مێژوونـووس وئـەتنۆلۆجی وزمانـەوانیش لەناوچـەی باشـووری ڕۆژهەڵاتی فەرەنسا لەم بوارەدا کاریان کرد.[٤٨]

لـەم سـاڵانەی دواییدا لـەووڵاتانی عەرەبیشـدا هەسـتیان بـەگرنگی ئەدەبی زارەکی کردووەو پەیتاپەیتا کۆیدەکەنـەوە. وەکو ئـەو هەوڵانـەی کـە دەدرێـن بـۆ کۆکردنـەوەی ئـەدەبی زارەکـی ئـەمازیغی لـەووڵاتانی ڕۆژئـاوای عـــەرەبی.[٤٩] لـــەووڵاتی میســـریش ئەرشـــیڤێکی دەوڵەمەنـــد لەگۆرانی وبـەیتی فۆلکلـۆری وسـەمای میللـی وتەنانـەت نوکتـەو پیشـەی میللـــی وهەنـــدێ چـــالاکی کۆمەڵایـــەتیش کۆکراوەتـــەوە.[٥٠] لـــەووڵاتانی

کەنداوی عـەرەبیش لـەم دواییانـەدا چەند ناوەندێک بۆ بایەخدان بـەم لایەنە دامەزران؛ وەکو (ناوەندی کەلەپووری میللی وولاتانی کەنداوی عـەرەبی) لـە (دۆحـە)، (ناوەندی زاید بـۆ کەلـەپوور ومێژوو) لەشاری (عـەین) لـەئیماراتی عـەرەبی.[٥١] لـەوولاتی سعودیەشـدا (کۆمەڵـەی ڕۆشنبیری وهونـەر لـە باجـە) دەستی بەپرۆژەیـەک کرد بۆ پاراستنی ئـەدەبی زارەکی وپزیشکی میللی. تـا بـەرواری ٢٠١٣/١٠/٢٦ لەڕێگـەی (٧٠) خۆبەخشەوە توانی (١٢٦) کاژێر تۆمار بکات.[٥٢]

ئەگـەر بێینـە سـەر ئـەدەبی زارەکـی کـوردی، دەبینین بڕێکـی باش لـەچیرۆک وهـۆنراوەو بـەیتی فۆلکلـۆری ولاوک ومەتـەڵ و پەنـدی کـوردەواری، کۆکراونەتـەوە. ئەمانـە هەنـدێکیان لـەدوو تـوێی کتێـب و هەندێکیشـیان لەڕووپـەڕی گۆڤـارو ڕۆژنامـەکان بڵاوکراونەتـەوە. بـەم شێوەیەش لە فەوتان ولەناوچوون پارێزراون. بەڵام ئەگـەر هـەمووی نـەبێ ئـەوا زۆربـەی هـەرە زۆری ئـەم کـارە بـە هـەوڵی کەسـەکان ئەنجامـدراوە. لەپێشـینەی ئەمانـەش دەبـێ ئامـاژە بـە هـەوڵی ڕۆژهەڵاتناسـان بکـەین؛ وەکـو: (ئەلیکسـاندەر ژابـا) و (ڕۆجـێ لیسـکۆ ١٩١٤- ١٩٧٥)و (ئۆسـکارمان ١٨٦٧- ١٩١٧) و (مارگرێـت ڕۆدینکـۆ ١٩٢٦- ١٩٧٧)، کـە پێشـەنگن لـە بـواری کۆکردنـەوەی ئـەدەبی زارەکـی کوردیدا.

(ژابا) لەساڵانی (١٨٣٦- ١٨٦٩)دا کۆنسوڵی ڕوسیا بوو لەشاری ئەرزەڕۆمی سەربە دەولەتی عوسمانی. ناوبراو کە دواتر کوردناسێکی گەورەی لێدەرچوو، هەوڵیدەدا زانیاری لـەبارەی کورد کۆبکاتـەوە. لـەم چوارچێوەیـەدا چەنـدین دەسـتنووس ودەقـی فۆلکلـۆری کـوردی کۆکردەوەو لەساڵی ١٨٦٠دا لـەژێر نـاوی (جامعیی رسالیان وحکایتان بزمانی کورمانجی) لە (پترسبۆرگ) بڵاویکردنەوە.[٥٣] هەر لەسـەر داوای ئـەویش، (مـەلا مـەحمودی بایەزیـدی) کتێبـی (عـادات و ڕسـوماتنامەی ئەکرادیـە)ی دانـا، کـە بریتـی بـوو لـەتۆماری داب ونـەریتی کۆمەڵگـەی کـوردی لـەو سـەردەمەدا.[٥٤] ئـەم کتێبـە سـاڵی ١٩٦٣ لـە مۆسـکۆ

بڵاوکرایەوە دوای ئەوەی (مارگرێت ڕۆدینکۆ) لێدوانی لەسەر نووسی وهەروەها وەرگێڕانە ڕوسییەکەشی بۆ کرد.(٥٥) (لیسکۆ)ی فەرەنسیش چەندین دەقی زارەکی کوردی تۆمارکردو بڵاوکردەوە. یەکێک لەکارەکانی لەم بوارەدا (پەندی پێشینان ومەتەڵی کوردی) بوو، کە ساڵی ١٩٣٧ لەگۆڤاری (Revues des Etudes Islsmiques) بڵاویکردەوە. لەساڵانی دواتر هەندێ دەقی کوردی تریشی بڵاوکردەوە. داستانی (مەمی ئالان) یەکێک بوو لەمانە کە لەساڵی ١٩٤٢ بڵاویکردەوە. خۆی ئەم داستانەی لەزاری دەنگبێژانی کورد وەرگرتبوو.(٥٦)

هەرچی (ئۆسکارمان)ی ئەڵمانییە کە لەساڵانی ١٩٠١- ١٩٠٣دا بە فەرمانی ئیمپراتۆری ئەڵمانیا بۆ لێکۆڵینەوە لەزمانە ئێرانییەکان هاتۆتە ئێران، توانیویەتی بڕێکی زۆر لە دەقی ئەدەبی زارەکی کوردی لەزاری کوردانی ڕۆژهەلات وەربگرێ و تۆمار بکا. دواتر لەساڵی ١٩٠٥ لەکتێبێکدا بە ناونیشانی (توحفەی موزەفەرییە) چاپ وبڵاویکردنەوە.(٥٧) (ڕۆدینکۆ)ی ڕوسیش لەساڵی ١٩٤٩ کە هێشتا قوتابی بووە چووەتە ناوچە کوردنشینەکانی ئەرمەنستانی سۆڤێتی ودەستیکردووە بەکۆکردنەوەی دەقی زارەکی کوردی. هەروەها چەندین لێکۆڵینەوەی لەبواری کەلەپووری کوردی کردووەو توانیویەتی (٦) کتێب لەم بوارەدا بێنێتە بەرهەم، یەکێک لەوانە کتێبی (ئەدەبی لاوانەوەی کوردی)یە کە لەساڵی ١٩٨٢ بەزمانی ڕوسی چاپکراوە. ئەو دەقانەی کە لەم کتێبەدا بڵاوکراونەتەوە، نووسەر خۆی لەدەمی کەسانی کوردی وەرگرتووەو تۆماری کردوون.(٥٨) ڕۆژهەلاتناسانی بریتانیش لەم بوارەدا هەندێ هەوڵیان داوەو بڕێک دەقی زارەکی کوردییان کۆکردۆتەوە.(٥٩)

هەندێ لەنووسەران وفۆلکلۆرپەروەرانی کوردیش ڕێچکەی ئەم ڕۆژهەلاتناسانەیان گرت و بەهەوڵی تاکە کەسییان چەندین دەقی زارەکی کوردییان تۆمارکردو بڵاوکردەوە. وەکو: (حەجی جوندی ١٩٠٨- ١٩٨٢) کە بایەخی زۆری بەکۆکردنەوەی دەقەکانی ئەدەبی زارەکی کوردی داوەو چەندین کتێبی لەم بوارەدا بەچاپ گەیاندووە،

لەوانــە: (فۆلکلــۆرا کورمانجــا/ ســاڵی ١٩٣٦)و (مەســـەلەو مەتـــەلۆکێن جماعــەتا کــوردا)و (حکیاتێد جماعــەتا کــوردیێ).[٦٠] هــەروەها عــەرەبی شــەمۆ (١٨٩٧- ١٩٨١)[٦١] کــە کتێبــی (حیکایــەتا جەماعــەتا کــوردا)ی بڵاوکردەوە.[٦٢] (ئۆردیخانی جەلیل)یش بێجگە لەو کتێبەی کە لەبارەی سترانی زارگۆتنی دیرۆکی دایناوە،[٦٣] چەندین خزمەتی تری بە بواری فۆلکلۆری کوردی گەیاندووە؛ یەکێک لەوانە کتێبی (زارگوتنا کوردا)یە کە بەهاوبەشی لەگەڵ (جەلیلی جەلیل)ی برای دایناوە. ئەم کتێبە کە بە گوتەی (کەمال مەزهەر): "گەورەترین بەرهـەمی فۆلکلـۆری کوردییە" بـە دوو بـەرگ لەسـاڵی ١٩٧٨دا لەمۆسـکۆ بڵاوکراوەتـەوە. کتێبەکـە بێجگـە لەپێشەکییەکی کوردی و هەروەها یەکێکی تری ڕوسـی، دەیـان سـترانی دیرۆکی وداستان وشیوەن وپەندی پێشینان ومەتەڵی تێدایە.[٦٤] (جەمیلـە جــەلیل)یش (٧٥) دەقــی زارەکــی کــوردی لەســاڵی ١٩٦٤ لــەژێر نــاوی (کلامێد جماعەتا کوردا) لە یەریڤان بڵاوکردەوە. ئـەم دەقانـە هەندێکیان سترانی دیرۆکی بوون؛ وەکو (خـانی کـورد- دمـدم) و (خـەلیل بـەگ).[٦٥] لێرەدا نـابێ (قـەناتێ کوردۆ)ش لـەبیر بکـەین، کـە ئـەویش یـەکێکی تـرە لەوانـەی خزمـەتی بـواری ئـەدەبی زارەکـی کوردییـان کـردووەو هەنـدێ کتێبی لەم بارەیەوە دەرکردووە.[٦٦] بێگومان ئەمانـە لـەکوردانی یـەکێتی سۆڤێت بوون.

لەکوردســـــتانی باشــــووریش ژمارەیـــــەکی زۆر لەنووســـــەران و توێژەران لـەم بـوارەدا کاریـان کـردووە، بۆیـە تـەنیا وەکو نمونـە باسـی هەندێکیان دەکەین؛ لەوانە (ئیسماعیل حەقی شاوەیس) کە لەسـەردەمێکی زوودا کـاری لەسـەر کۆکردنـەوەو تۆمـارکردنی پەنـدی پێشـینانـدا کـردو لەســـاڵی (١٩٣٣)دا کتێبێکـــی لـــەم بارەیـــەوە دەرکـــرد.[٦٧] لەســـاڵانی دواتریشدا کەسانی تر هـەمان ڕێچکـەیان گـرت؛ وەکو (شـێخ محەمـەدی خـاڵ) کـە لەسـاڵی (١٩٥٧)دا کتێبێکـی (١٩٢) لاپـەڕەیی لەسـەر هـەمان بابــەت دانــا.[٦٨] لــەم ســاڵانەی دواییشــدا(مەلا مــەحمودێ دێرشــەوی) چەنـدین پەنـدی پێشـینانی دەقـەری بادینـانی کۆکردەوەو بەلێکدانـەوەوە

لەکتێبێکدا بڵاویکردەوە.[69] هەندێ نووسەری تریش هۆنراوەو گۆرانییە فۆلکلۆرییەکانیان کۆکردۆتەوە؛ وەکو (هیمدادی حوسێن) کە کتێبی (چەپکێ هۆنراوەی فۆلکلۆری دەشتی هەولێر)ی دەرکرد.[70] هەروەها (جەلال مەلا حەسەن خۆشناو) کە چەندین لاوکی کۆکردەوەو لەکتێبێکدا بەچاپی گەیاندن.[71] لەدەڤەری بادینانیش (حەجی جەعفەر) کتێبێکی تایبەت بە(حەیران) دەرکرد.[72] هەندێکی تریش چیرۆک وداستان وبەیتی فۆلکلۆری کوردییان تۆمارو بڵاوکردۆتەوە؛ وەکو (سەعدوڵلا شێخانی) و (تاریق جامباز) و(مستەفا نوری بامەڕنی).[73] کەسانێکیش مەتەڵ (مامک)یان کۆکردۆتەوە؛ وەکو (ئەحمەد عەبدوڵلا زەڕۆ).[74] بێجگە لەمانە دەیان نووسەر وفۆلکلۆرپەروەری تریش لەبواری کۆکردنەوەو بڵاوکردنەوەی دەقە زارەکییەکان کاریان کردووە.[75]

هەندێ لە نووسەرانی کورد لەپاڵ کۆکردنەوەی دەقی زارەکی بایەخیان بەلێکۆڵینەوەی فۆلکلۆریش داوە، وەکو: (د.عززەدین مستەفا ڕەسول)[76] و(د. شوکریە ڕەسول)[77] و (ئەسعەد عەدۆ)[78] و(عەلی جزیری)و چەندانی تر.[79] ئەمەی دوایی کتێبێکی دوو بەرگی بەزمانی عەرەبی بۆ ئەدەبی زارەکی کوردی تەرخانکرد.[80] بێجگە لەمە لەڕووپەڕی گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا چەندین دەقی فۆلکلۆری دەبینین کە هەندێ لەنووسەران دوای بیستنیان تۆماریان کردووەو بڵاویانکردۆتەوە.[81] بەمەش چەندین دەقی ئەدەبی زارەکی کوردییان لە فەوتان پاراستووە. هەروەها دەیان ستران ولاوک وحەیرانی فۆلکلۆریش لەسەر کاسێتی دەنگی تۆمارکراون ولە ئەرشیڤی ئێزگەو تەلەفزیۆنەکان یان لەتۆمارگەو ماڵەکاندا هەن.

لەکوردستانی ڕۆژهەڵاتیشدا چەندین نووسەر ولێکۆڵەر خۆبەخشانە لەم پێناوەدا خزمەتیان کردووە و ئێستاش بەردەوامن. لەوانە دەتوانین ئاماژە بە (هێمن)ی شاعیر و (عوبەیدوڵڵا ئەیوبیان) بکەین. لەنێو ئەوانەش کە ئێستا لە ژیاندا ماون دەکرێ ناوی (قادر فەتاحی قازی)، (ئەحمەد بەحری)، (ناسر سینا)، (جەعفەر حوسێنپوور /

هێدی)، (محەمەد ساڵح ئیبراهیمی)، (سەید محەمەد سەمەدی)و (محەمەد عەلی سوڵتانی) بێنین.[٨٢] شایانی باسە لەکوردستانی ڕۆژئاواشدا هەندی لەدڵسۆزانی کەلەپوری کوردی هەوڵی خۆیان داوە لەم بوارەدا؛ وەکو شاعیر (جگەر خوێن) کە لەساڵی (١٩٥٧)دا کتیبی (گوتنا پێشییا)ی بەڕێنووسی لاتینی لەشام بڵاوکردەوە.[٨٣]

سەرەڕای هەموو ئەو هەوڵانە، هێشتا پێویستی ئەوە لەئارادایە کە دەزگایەکی فەرمی ئەرکی کۆکردنەوەو تۆمارکردنی ئەم دەقە زارەکییە کوردییانە بخاتە ئەستۆی خۆی. چونکە میللەتی کورد خاوەنی گەنجینەیەکی دەوڵەمەندە لە ئەدەبی زارەکی. دەبێ ئەوەش بزانین کە کەلەپووری میللی وپاراستنی، زۆر گرنگن بۆ بەدیارخستنی تایبەتمەندی کولتوری هەر نەتەوەیەک. بۆیە (یونسکۆ) لەساڵی ١٩٨٤دا لەپلانی ئەو کاتەیدا ڕایگەیاند کە پێویستە پارێزگاری لە کەلەپووری میللی بکرێ، هەر جۆرێک بێ. ئەمەشی بەهاندەری گەشەسەندنی نیشتیمانی دانا.[٨٤]

### باسی دووەم: بایەخی ئەدەبی زارەکی بۆ مێژوونووسین:

دیارە پەیوەندییەکی بەتین لەنێوان ئەدەب ومێژوودا هەیە. تەنانەت ڕێبازێکی مێژووی هەیە بۆ توێژینەوەی ئەدەبی؛ ئەویش ئەو ڕێبازەیە کە دەیەوێ لەکەسایەتی ئەدیب بکۆڵێتەوە بەناسینی ئەو سەردەمەی کەتێیدا ژیاوەو ئەو ڕووداوە گشتی وتایبەتییانەی کەپێیاندا تێپەڕیوە. دەقەکەش لەژێر ڕۆشنایی ژیان وسەربردەی ئەدیبەکەو ئەو هەڵومەرجەی کاری تێکردووە، بخوێنێتەوە. بۆیە ئەو ڕێبازە کاردەکا لەپێناو بەدیارخستنی ئەو هەڵومەرجە مێژوویی وکۆمەڵایەتییەی کە دەقەکەی تێدا بەرهەم هاتووە. بەواتایەکی تر خوێندنەوەیەکی مێژووییە بۆ گوتاری ڕەخنەی ئەدەبی کە هەوڵدەدات سەرهەڵدانی دەقە ئەدەبیەکە بە کات وشوێن وکەسایەتیەکانەوە ببەستێتەوە. لێرەدا مێژوو لەخزمەت لێکۆڵینەوەی دەقی ئەدەبیدا دەبێت. هاوکات، دەقی ئەدەبیش خزمەت بەبواری مێژوو دەکات، چونکە هەمیشە لەگەڵ خۆیدا ئاماژەی جوگرافی

ومێژوویی وکۆمەڵایەتی وژینگەیی وکولتوری هەڵدەگرێ. هەروەها وێنای دەروونی مرۆڤایەتی وتێڕوانین وچەمکە میللییە باوەکان دەکات. ئەمەش دوای ئەوە دێت کە دەقە ئەدەبییەکە لەچوارچێوە زەمەنی وشوێنییەکەی خۆیدا دادەنرێ کە تیایاندا بەرهەم هاتووە. بۆیە زۆرجار جوگرافیناس ومێژوونووسان دەقی ئەدەبی دەکەنە سەرچاوەی زانیارییەکانیان.(٨٥)

ئەگەر ئەم تێڕوانینە بۆ ئەدەب بەگشتی ڕاست بێ، ئەوا بۆ ئەدەبی زارەکیش هەر ڕاستەو بەڵکو ڕاستتریشە. چونکە ئەدەبی زارەکی بە ئەدەبی (میللی)ش دەناسرێ، بەو پێیەی کە لەلایەن جەماوەرێکی فراوان قبوڵکراوەو بنکەی فراوانی کۆمەڵگە بەکاریدەهێنێ وپێیەوە پەیوەستە.(٨٦) ئەدەبی زارەکی یان بەواتایەکی فراوانتر، کەلەپووری زارەکی پەیوەندییەکی بەتینی لەگەڵ مێژوودا هەیە؛ چونکە ئاوێنەی ئەو قۆناغە شارستانییەیە کە خەڵک تێیدا دەژین. دەربڕی بیروبۆچوون وهەست وسۆزیانە. هەروەها وێنای ئەو سیستەمە ئابووری وکۆمەڵایەتی وسیاسی ورۆشنبیرییانە دەکات کە لەسەردەمێکدا باوبوون.(٨٧) دەقە زارەکییەکان ووردەکاری ژیانی ڕۆژانە ئاشکرا دەکەن و ڕەنگدانەوەی کێشەکانی خەڵک وچۆنیەتی چارەسەرکردنیانن. بەواتایەکی تر حوکمدانی کۆمەڵگەیە لەسەر خۆی، لەڕێی دەنگی دانەری دەقە زارەکییەکان و وەڵامدانەوەی گوێگران. بۆیە ئەم دەقانە گەواهیدەری ناوەخۆن، نەک سەرنج وتێبینی دەرەکی.(٨٨)

لەوانە گرنگتر ئەوەیە کە سەربردەو ستران وهۆنراوە میللییەکان سیمای مێژوویی ئەو توێژانەیان پێوەدیارە کە لەدیدی مێژوودا نەبینراون وبەشاردراوەیی ماونەتەوە.(٨٩) ئەم توێژانە کە زۆرجار زۆرینەی کۆمەڵگە پێکدەهێنن، خاوەنی ڕۆشنبیرییەکی میللین کە ناچێتە ژێربارى سانسۆری دامەزراوەیی. بەرهەمەکانی ئەم ڕۆشنبیرییە میللییە، چ چیرۆک بن یان سەربردەو پەند وگۆرانی وتەنانەت قسەی نەستەق ونوکتە، هەڵوێستی ئەم توێژانە لەهەمبەر ژیان وجیهاندا دیاری

دەکـەن. جـا ئـەم هەڵوێسـتە لەتێگەیشـتنەوە بـێ یـان لێکدانـەوەو بیانووهێنانـەوەو گاڵتـەجاڕی، بـەپێی شـێوازو ئـەرکی هەریەکـەیان. بۆیـە ئەم بەرهەمە فۆلکلۆرییانە جۆرێکن لەهەڵوێستی بەرهەڵستکاری لـەدژی واقیعێکی مێژوویی داسەپاودا. ئەگەر کۆمەڵگەی فـەرمی ونیمچـە فـەرمی پشـت بەنووسـراو ببەسـتن، ئـەوا کۆمەڵگـەی فەرامۆشـکراو کـەهیچ بەشـدارییەکیان لەبـەڕێوەبردنی ژیـانی ڕۆژانـەدا نیـەو لەهەڵومـەرجێکی ژیاری ناهەمواردا دەژیـن، پشـت بـەم ڕۆشـنبیرییە میللییـە دەبەسـتن کـە زارەکییـە. ئـەوان لەبەرامبـەر دەسـەڵات وکێشـەکانی ژیـانی ڕۆژانەیانـدا، پـەنا دەبەنـە بـەر سـیمبول ودەربڕینـی ئاماژەدار. زۆرجـاریش بەرهەمـە زارەکییـەکان خۆیـان لەهـەموو سانسـۆرێک ڕزگـار دەکـەن، جـا چ سانسۆری دەسەڵات بێ یـان کۆمەڵگـە و تەنانـەت سانسـۆری منـی بـاڵا. بۆیـە لـەڕێی ئـەم کەلـەپوورە میللییـە زارەکییـە دەتـوانین ڕۆبچینـە نێـو مەسـەلە نێوخۆییـە ووردەکـان ودەرگـا داخراوەکـان بکەینـەوە. چونکـە هـەژاران کەسـانی پسـپۆرن لـەبواری هەژاریـدا و لـەو هەڵومەرجـە کۆمەڵایەتییـەی کەتیایـدا دەژیـن. هـەروەکو جووتیـارانیش پسـپۆرن لـەبواری کشـتوکاڵ وژیـانی لادێ. بێگومـان تاکـەکانی هـەر کۆمەڵگەیـەک خۆیان باشترین سەرچاوەن بۆ ناسینی ئەو کۆمەڵگەیە.[٩٠]

سـەرەڕای ئەمـە دەبـێ بـزانین کـە دەقـەکانی ئـەدەبی زارەکـی بەتێپەڕبوونی کات وسەردەم تووشی گۆڕانکاری ودەستکاری وقرتاندن وزیادەخستنەسـەر بوونـە. بۆیـە نـاکرێ وەکـو ڕاسـتی مێژوویـی ڕەهـا وەربگیـرێن. نووسـەرێک لـەم بارەیـەوە دەڵـێ ئەگـەر گـۆرانی وبەیتـە شـیعرییە زارەکییـەکان دوای تۆمارکردنیـان بـەراوورد بکـەین، دەبینـین هـیچ یـەکێک لەمانـە دووجـار بەهـەمان شـێوە نەگوتراوەتـەوە، ئەگـەرچی لـەڕووی کێشدا هـەمان نـەزمیان هەیـە. ڕاسـتە شـێوازەکەیان هەریەکـە وبابەتەکانیش دووبارە دەبنەوە، بەڵام هـەرجارەی بەشـێوەیەکی جیـاواز ڕێکخـراون، تەنانـەت لەسـەر زاری یـەک شـاعیریش. ئـەم گۆڕانـە وابەستەیە بە کاردانەوەی جەماوەر وسەوداسـەری شـاعیرەکەو جـۆری بۆنەکەو چەندین هۆکاری کۆمەڵایەتی وسایکۆلۆژی تر.[٩١]

ئەم مەسەلەیە لەلایەن (ئۆسکار مان)یش پشتڕاست دەکرێتەوە کاتێ سەبارەت بە بەیتبێژێکی ناوچەی موکریان کە ناوی (ڕەحمان)ە دەڵێ: "تەنانەت ئەو جێیانەی ڕەحمان وەک پەخشان دەریدەبڕین وسوور بوو لەسەر ئەوەی کە ئەوەش بەشێکە لەبەیتەکان، هەروا لەخۆوە دەیخستنەسەر ولەگەڵ سەروا ڕێکیدەخستن. دڵنیام ئەم پەخشانانە ئی خۆی بوون، چونکە هەمووجارێ ئەو بەشانەی بەچەشنێکی دی دەگێڕانەوە". لەشوێنێکی تریش دەڵێ: "زۆر شتیشی لەخۆیەوە لەبەیتەکان داویشتن، بەڵام زۆر کەمتر لەوەی کە ئەمن لەپێشدا بیرم لێدەکردەوە". دیارە ئەو زیادانە کاریگەریان لەکرۆکی سەرەکی بەیتەکان نەکردووە، چونکە دوای ئەوەی چەند دەقێکی زارەکی کە لەبارەی یەک بابەت گوتراون، بەراوورد دەکات دەڵێ سەرت سوڕدەمێنێ کە چۆن "سینگاوسینگ بەشێوەی زارەکی ئاوا بەڕێکوپێکی هاتوون".[٩٢]

هەرچەندە ئەو چیرۆک وستران وبەیتە شیعرییە زارەکییانەی کە باسی ڕووداوەکان دەکەن، بەراوورد بەشیعرو هۆنراوەکانی تر، زیاتر لەیادەوەریدا بەپارێزراوی دەمێننەوە. چونکە پشت بەهێڵی گێڕانەوەی ڕووداوەکان دەبەستن، بەپێی زنجیرەی ڕوودانیان. بەڵام زۆرجار شاعیرە زارەکییەکە بەووردی پابەندی زنجیرەی زەمەنی ڕووداوەکان نابێت و ڕووداوەکان لەبیر دەکات و بۆ نمونە دەچێتە سەر وەسفکردنی زرێی پاڵەوانەکە.[٩٣]

دەقە زارەکییەکان چونکە لەگەڵ دروستبوونیان نانووسرێنەوەو بەتۆمارکردن نابەسترێنەوە، بۆیە شلک ونەرم دەبن وهەمیشە لەدروستبوون دان. بێگومان هیچ ڕێگرییەک نیە کە لەگەڵ دوورکەوتنەوەیان لەڕووی شوێن وکاتەوە، بەرەبەرە لەواقیع دوور بکەونەوەو بچنە جیهانی ئەفسانەوە. بەتایبەتی کە میکانیزمی گێڕانەوەی زارەکی بەسروشتی خۆی، هەمیشە سەردەکێشێ بەرەو گۆڕینی ڕووداوە مێژووییەکان بۆ شێوازی ئەدەبی. ئەمەش وادەکا کە بەبێ

هەستکردن، گێڕانەوە مێژووییەکە ببێتە گێڕانەوەیەکی داستان ئامێز ونزیک لە ئەفسانە. دەبێ ئەوە بزانین کە خودی ئەفسانە لەبنەڕەتدا لەسەر ڕووداوێکی مێژوویی هەڵچنراوە. لەسەرێکی تریشەوە، چونکە لەکۆمەڵگە نەخوێندەوارو زارەکییەکان بێجگە لەیادەوەری هیچ ئامرازێکی تر نیە بۆ پاراستنی زانیاری ودەقەکان. بۆیە یادەوەری میکانیزمەکانی خۆی بەسەر شێوەی دەقەکە دادەسەپێنێ، بۆ ئەوەی نەوە دوای نەوە بمێنێتەوەو لەسەر زاران بێ. ئیتر ئەم میکانیزمە بە بەردەوامی کاردەکات لەپێناو گۆڕینی ڕووداوە مێژووییەکان بۆ چیرۆکی ئەفسانەیی. ئەویش بەداڕشتنی دەقەکە بەشێوازێکی هونەری وا کە لەگەڵ پێداویستییەکانی ئەزبەرکردن وپاراستنی زارەکی بگونجێ. بەڵام ئەمەش لەسەر حیسابی واقیعی مێژوویی و ووردەکاری ڕووداوەکە دەبێت.(٩٤)

لەئەنجامی هەموو ئەمانە، ئەرکی مێژوونووس سەبارەت بەسەرچاوەکانی مێژووی زارەکی لەنێویشیاندا ئەدەبی زارەکی، زۆر ئاڵۆزە. چونکە سێ کێشەی سەرەکی لەبەردەم دایە؛ یەکەمیان: خۆ ڕزگارکردنە لەهەژمونی بەڵگەنامەو دەقی نووسراو، کەخۆیان بەسەر ڕێبازی لێکۆڵینەوەی مێژووییدا سەپاندووە. بۆیە دەبێ گەواهییە زارەکییەکان کۆبکاتەوەو لەگەڵ گەواهییە نووسراوەکان بەراووردیان بکات. بەڵام دەبێ گوێ بۆ ئەوانە ڕادێرێ کە لەمێژوودا نەیانتوانیوە بەشێوازی نووسراو کێشەکانی خۆیان بخەنەڕوو؛ وەکو جووتیاران وئافرەتان وکەمینەکان وپەراوێزخراوەکان. چونکە هەموو ئەمانە گوێیان گرتووەو گێڕانەوە دەماودەمەکانیان گواستۆتەوەو لێدوانیان هەبووەو قسەیان کردووە. بەڵام نەیانخوێندۆتەوەو نەیاننووسیوە. دووەم: لەسەری پێویستە گێڕانەوەی ڕاستی لەگێڕانەوەی ناڕاست (وەکو ئەفسانەو حیکایەت) جیابکاتەوە. لێرەشدا کێشەیەکی قورسی لەبەردەم دایە. چونکە سنووری نێوان ڕاستی و ناڕاستی تۆخ نیەو تەمومژاوییە. سییەمیشیان: کێشەی دیاریکردنی زەمەنە؛ چونکە خاڵی هەرەلاوازی

دەقـــی زارەکـــی ئەوەیـــە کـــە بـــە ســـاڵ وبـــەروارێکی دیـــاریکراو نەبەســـتراوەتەوە. بۆیـــە لەســـەر مێژوونـــوس پێویســـتە کـــەتێڕوانینێکی ڕەخنەگرانـــەی هـــەبێ لەهەمبـــەر ئـــەم گێڕانـــەوە زارەکییانـــە. هـــەنگاوی یەکـەمیش ئەوەیـە کـە بەرامبـەریان بکـات لەگـەڵ ئەرشـیڤی نووسـراو وسەرچاوەکانی تر، بۆ دیاریکردنی کات وسەردەمیان.(٩٥)

**باسی سێیەم: مێژووی کورد لەسایەی ئەدەبی زارەکیدا:**

لەماوەی چوار سـەدەی مێژووی نـوێی کوردسـتان (١٥١٤- ١٩١٤) و بـەڵکو لەسـەدەکانی پێشـتریش، نووسـینەوەی مێژووی ئـەم وڵاتـەو دانیشـتووانەکەی، کێماسـی ئاشـکرای پێـوە دیـارە. ئـەو کتێـب ودانـراوە کەمانـەی کـە کـوردان لـەم ماوەیـەدا لـەبارەی خۆیـان نووسـیویانە، ئـەو کەلێنە گەورانـە پڕناکەنـەوە کـە ئـەم مێژووە بەدەستیانەوە دەناڵێنێ.(٩٦) بۆیە ئەو مێژوونووسانەی کە بایەخ بەمێژووی ئەم ماوەیەی کوردستان دەدەن. ناچـارن پشـت بـەو سـەرچاوانە ببەسـتن کەمێژوونووسـانی نەتـەوەو میللـەتانی دەوروبـەر نووسـیویانە. دیـارە ئـەو سـەرچاوانەش لەبنەڕەتدا بۆ تۆمارکردنی مێژووی کورد تەرخان نەکراون. بـەڵکو تـەنیا لابەلا باس لەڕووداوەکانی کوردستان دەکەن. بۆیـە ناچنـە قووڵایی ئـەو ڕووداوانـەی کـە لـەم وڵاتـەدا ڕوویانداوە. ئەمـە سـەرباری هەڵوێسـتی نەرێنییان لەهەمبەر کوردو دەسەڵاتە خۆماڵییەکانیان.(٩٧) لێرەدا بایـەخی ئەدەبی زارەکی بۆ نووسینەوەی مێژووی کورد وکوردستان بەرجەستە دەبـێ. چونکـە ئـەو ڕووداوگێـڕەوەو گـۆرانیبێژ وشـاعیرە زارەکییانـەی کورد باش ئاگاداری ئەو هەڵومەرجە بوون کە لەووڵاتەکەیان دەگوزەرا. ئەوان وەکو چاوێک وابوون لەسەر ڕووداوە نێوخۆییەکانی کوردسـتان. بەپێچەوانـەی مێژوونووسـانی میللـەتانی دەوروبـەر کـە بایـەخیان بـەو ڕووداوانـەی کوردسـتان نـەدەدا، ئەگـەر پەیوەسـت نـەبان بـەمێژووی دەولەتەکـەی خۆیـان. یـان هـەر لەبنەڕەتـەوە لـەم ڕووداوانـە ئاگـادار نەبوون.

دیاره میللـەتی کـورد لەسـەردەمانی پێشـوو بـە یـەکێک لەمیللەتـە زارەکییەکان ئەژماردەکرا. چونکە بەهۆی بەرزیی ڕێژەی نەخوێندەواری لەنێویانـدا، بـەزۆری پـەنای دەبـردە بـەر شـێوازی زارەکـی وگوتنـەوەی دەماودەم.[٩٨] هەروەها لەبەرئەوەی ژێردەسـتە بـووە و سـتەمی لێکراوە بۆیە ناچار بووە بۆ دەربڕینی خەیاڵ و ئێش و ئازارەکانی ژیان بپرژێتە سـەر ئەدەبـی زارەکـی. ئەمەش خـۆی دەبـڕی ئەوەیە کە کـوردان هـۆگریەکی زۆریـان بە فێربـوونی زمـانی زگمـاکیی خۆیـان هەبـووە.[٩٩] لەسـۆنگەی ئەمـە، دەتـوانین بڵێین کـورد زۆر بەکـەمی دەسـتی داوەتـە نووسینەوەو تۆمارکردنی ڕووداوە مێژووییـەکانی خـۆی. بـەڵام هەسـتی مێژوویـی هـەبووەو زۆرێـک لـەم ڕووداوانـەی لـەیادەوەری خۆیـدا پاراستووە. دوای ئەوەی لەشێوەی چیرۆک وداستان یان بەیت وستران دایڕشـتوون، ئینجـا دەمـاودەم گوتراونەتـەوەو نـەوە لـەدوای نـەوە ماونەتەوە. بەڵام هەندێ جار دوای چەند نەوەیـەک لـەناوچوون؛ ئـەوەتا (شەرەفخانی بەدلیسی) کە باسی یـەکێک لـەمیرانی بابان دەکات، دەڵێ: "ئەدیبانی کورد بایەخیان بەو ڕووداوانە دا کە بەسەری هاتن، هـەروەها بە ئازایەتی وبەخشندەیی ئەویشیاندا هەڵدا. بەچەندین هۆنراوە وەسفیان کـردو چەنـدین چیرۆکیـان لەبارەیـەوە دانـا کـە ئێسـتا قسـەی دانیشـتن وکۆڕەکانـە، لەگـەڵ چەنـدین سـروود کـە دەنگخۆشـان وەکـو سـتران دەیڵێنەوە".[١٠٠] بەڵام ئێستا هیچ یەکێک لەم هۆنراوەو چیرۆک وسترانانە نـەماون. ئاشـکرایە کـە چەنـدین دەقـی زارەکـی تـریش کـە بایـەخی مێژوویيان هـەبوو، لـەناوچوون. دەکرێ هێشـتا دەقی تریش لـەناوبچن. بێگومان ئەمەش زیانێکی گەورەیە بۆ مێژووی کورد.

هەنـدێ مێژوونـووس وتـوێژەری کـورد لـەم سـاڵانەی دواییدا لـەم ڕاسـتییە ئاگـادار بـوون وسـەرنجیان بـۆ بایـەخی دەقـە زارەکییـەکان سەبارەت بەمێژووی کورد، ڕاکێشا. هەندێکیان هەوڵیاندا بـەکردار ئەمـە بسـەلمێنن، ئـەویش لـەڕێی تێهەڵکێشـکردنی ئـەم دەقە زارەکییانـە لەگـەڵ زانیارییـە مێژووییـە نووسـراوەکان. وەکـو نمونەیـەک دەکـرێ ئامـاژە

بەکتێبی (کورد وعەجەم) بکەین، کە لەسەروبەندی باسکردنی ڕووداوی (قەڵای دمدم)[101] هەندێ بەیتی فۆلکلۆریشی لەبارەی ڕووداوەکە هێناوەتەوە.[102] هەروەها دەبێ ئاماژە بەکتێبی (گلێداخ بێخودێ نینە)ی (یەلماز چامليبەل) بکەین کە لەمیانەی باسکردنی ڕووداوەکانی شۆڕشی ئاگری (١٩٢٧- ١٩٣٠) چەندین سترانی دیرۆکی هێناوەتەوەو هەریەکەی لەشوێنی تایبەت بەخۆی داناوە. بۆ نمونە کە باسی شەڕڤانێکی کورد دەکات، سترانێک دێنێتەوە کە لەو سەردەمەدا لەبارەی ئەم شەرڤانە گوتراوە.[103] بێگومان ئەم کارانە سەرەڕای بایەخی خۆیان، ناچنە چوارچێوەی بەکارهێنانی ئەم دەقە زارەکییانە وەکو سەرچاوەی مێژوویی. چونکە زانیاری مێژووییان لێوەرنەگیراوە.

هەندێ مێژوونووسی تر هەستاون بەکۆکردنەوەو تۆمارکردنی ئەو سترانە دیرۆکییانەی کە تایبەتن بەڕووداوێکی مێژووی کوردستان، ئینجا شرۆڤەیان بۆ کردووە. وەکو (عەبدولفەتاح عەلی یەحیا) کە چەند هەوڵێکی گرنگی لەم بارەیەوە داوە. یەکێک لەوانە ووتارێکە بەزمانی عەرەبی لەبارەی سترانێ دیرۆکی تایبەت بە میرنشینی بۆتان وبۆتانییەکان وتیایدا چەند دەقێکی زارەکی خستۆتەڕوو کە باس لەڕووداوەکانی میرنشینی بۆتان دەکەن لەسەردەمی میر بەدرخان پاشا (١٨٢١- ١٨٤٧). هەر لەوێدا و لەچوارچێوەی بەدیارخستنی گرنگی ئەم دەقە زارەکییانە، باسی لەگرنگی ئەم جۆرە سترانانە کردووە بۆ نووسینی مێژووی کوردو گەواهی چەندین نووسەر وتوێژەریشی لەم بارەیەوە هێناوەتەوە.[104] هەوڵێکی تریشی باسێکە بەناونیشانی (دیرۆک وسەرپێهات/ عەلی ئاغایێ ئەرگوشی)، کە ئەم جارەیان بەکوردی بەڵام هەر لەگۆڤاری (کاروان) بڵاویکردۆتەوە. لێرە چیرۆک وبەیتی عەلی ئاغای ئەرگۆشی تۆمارکردووە کە لەساڵی ١٨٣٢دا بەدەستی ئێزیدییەکان کوژراوە. لێرەش بایەخی سترانی دیرۆکی بۆ مێژووی کورد دووپاتکردۆتەوە. هەروەها باسی ئەو هەڵومەرجە مێژووییەشی کردووە کە ئەم ڕووداوەی تێدا قەوماوە. بێگومان هەردوو دەقەکەش

(چیرۆک وبەیتەکە) بۆ ماوەی چەندین ساڵ هەر بەزارەکی گوتراونەتەوە، بەڵام دواتر تۆمارکراون.[١٠٥]

هەرچی (سەلاح هروری)یە، ئەویش هەنگاوێکی لەم جۆرەی هەڵێناوەو لە نامیلکەیەکدا باسی لەگرنگی سترانێ دیرۆکی کوردی کردیە وەک سەرچاوەیەک بۆ نووسینەوەی مێژووی کورد. ئەویش گەواهی چەندین نووسەر وکوردناسی هێناوەتەوە، بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونە. دواتریش هەوڵیداوە زانیاری سەرچاوە مێژووییەکان لەبارەی ڕاپەڕینی ساڵی ١٩١٩ی بادینان، لەڕێی سترانە دیرۆکییەکان پشتڕاست بکاتەوەو بەراووردیان بکات. بێگومان چەند دەقێکی باشی لەو سترانە دیرۆکییانەش تۆمارکردووە کە تا ئەم ساڵانەی دوایی لەبارەی ئەم ڕاپەڕینە لەدەڤەری بادینان دەگوترانەوە.[١٠٦]

ئەم کارانە تەنیا دەکرێ وەکو هەوڵی بەرایی ئەژماربکرێن لەبواری سوودبینین لەئەدەبی زارەکی وەکو سەرچاوەیەک بۆ نووسینەوەی مێژووی کوردستان. چونکە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی گەنجینەیەکی یەکجار دەوڵەمەندە بەجۆرێک (ڤیلجیفسکی) ناوی دەنێ "پەرەسەندنی لەڕادەبەدەری فۆلکلۆر".[١٠٧] دیارە ئەم گەنجینەیە هەزاران دەقی زارەکی تێدایە کە دەشێ زانیاری زۆریان لێهەڵێنجین لەبارەی پێشهاتەکانی ڕابردووی ئەم وولاتە. بێگومان ئەم ڕاستییە شاردراوە نیەو ساڵانێکە دەوڵەمەندیی کورد لەبواری ئەدەبی فۆلکلۆری، سەرنجی ڕۆژهەڵاتناسانی ڕاکێشاوە. بۆیە لەو کتێبانەی کە لەبارەی کورد نووسیویانە، ئاماژەیان بەم مەسەلەیە داوە.[١٠٨] یەکێک لەوانە ڕۆژهەڵاتناسی سۆڤێتی (مینتیشا شڤیلی)یە، کە نووسیویەتی: "لەفۆلکلۆری کورددا مێژووی ئەم نەتەوە کۆنە، خەباتی چەندین سەدەی لەپێناوی ئازادی و بۆ خۆدەستنیشانکردنی نەتەوەیی ڕەنگیداوەتەوە". هەروەها دەڵێ: "لەفۆلکلۆری دەوڵەمەندی کوردیدا، گۆرانی- چیرۆکی بەستراو بە ڕووداوی ڕاستەقینە ئەو شەخسیاتە مێژووییانەی ڕۆڵێکی گەورەیان هەبووە لەمێژووی گەلی کورددا جێگەیەکی تایبەتیی هەیە".[١٠٩]

هەرچی (باسیلی نیکیتین)ـە دەڵێ: "فۆلکلۆری کوردی لەڕووی هەمەجۆری بابەتەکانیەوە، زۆر دەوڵەمەندە. لەپاڵ شیعر وگۆرانی... هۆنراوەی لەخۆڕا وداهێنراوی تێدایە کە لەهزریکی تەواو میللی و دوور لەدروستکردن وهەڵبەستن هەڵقوڵاوە. هەریەکێکیشیان لەکاتی یان کەمێک دوای ئەو ڕووداوە سەرچاوەی گرتووە کە بۆی ڕێکخراوە". کاتێکیش باسی ئەو دەقە زارەکییانە دەکات کە (ئۆسکار مان) کۆیکردوونەتەوە، دەڵێ: "هەموو ئەو شوێنەوارانە گەنجینەیەکی ڕاستەقینەمان لەزانیاری دەدەنێ لەبارەی ژیانی میللەتی کورد، کە تا ئێستا سوودی لێ نەبینراوە بۆ ناسینێکی فراوانتر وگشتگیرتری دەروونی ئەم میللەتەو تایبەتمەندییەکانی، تەنیا بەریژەیەکی کەم نەبێ".(١١٠) یەکێکی تر لەم ڕۆژئاواییانە (دانا شمیدت)ی ئەمریکییە کە لەو بڕوایە دابوو گیانی میللەتی کورد لەسترانەکانی دایە لەگەڵ هۆنراوەو ئەفسانەو چیرۆکەکانی. ئەمەش بە هۆکارێک دادەنێ بۆ شانازیکردنی کورد بە ئەدەبە فۆلکلۆرییەکەی.(١١١)

دیارە ئەدەبی زارەکی کوردی یان بڵێین فۆلکلۆری کوردی، چەندین جۆر دەگرێتەوە، وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا. بێگومان هەموو جۆرەکانیشی بایەخی خۆیان هەیە بۆ توێژینەوە لەبارەی مێژووی سیاسی کوردستان وئاشنا بوون بەڕەوشی ئابووری وکۆمەڵایەتی وئایینی ورۆشنبیریی کۆمەڵگەی کوردی لەسەردەمانی ڕابردوودا. بۆ نمونە ئەو پەندە پێشینانەی کە دەڵی "کەم بژی کەڵ بژی". دەکرێ ببێتە بەڵگەیەک لەسەر بەرزی پێگەی ئازایەتی لەکۆمەڵگەی کوردیدا. هەروەها لەڕێی مەتەڵەکانیش دەتوانین بە هەندێ کەرەستە ئاشنا بین کە لەسەردەمانی پێشوو بەکاردەهاتن وئێستا نەماون، یان زۆر کەم بوون. وەکو " سەر ستویرێ بن زراف" کە دەکاتە (تەشی یان خەڕەک). یان "شەق شەقی شەقاقی، کەتە عەردی عەرد پەقی" کو مەبەست لێی (هەوجاڕ)ـە.(١١٢) بەڵام هەندێک دەقی زارەکی دەبنە سەرچاوەی مێژوویی وڕاستەوخۆ زانیاریمان لەبارەی ڕووداوەکانی کوردستان دەدەنێ. بەتایبەتی گۆرانی فۆلکلۆری کە گرنگترین بواری ئەدەبی فۆلکلۆرییە.(١١٣)

دیارە کوردان زۆر گرنگییان بەگۆرانی وبەیتە فۆلکلۆرییەکان داوە؛ تەنانەت (ئۆسکار مان) دەڵێ: "ئەو لاوانەی دەنگیان خۆشە دەچنە کن (وەستا)یەک... هەتا فێری ئەو بەیتانە بن کە وەستاکە لەبەری کردوون و هەروا سینگاوسینگ هاتوون". هەروەها باسی ئەوەش دەکا کە خەڵکەکە زۆر تامەزرۆی بیستنی ئەم بەیتانە بوون و لەچایخانەکانی سابڵاغ لەدەوری بەیتبێژەکان کۆدەبوونەوە.(١١٤) لەنێو گۆرانی وبەیتە فۆلکلۆرییەکاندا گرنگترینیان بۆ ئێمە ئەو جۆرە گۆرانییەیە کە دەکرێ پیی بڵێین (سترانی دیرۆکی/ یان: گۆرانی مێژوویی). چونکە بەگوتەی نووسەرێکی کورد "مێژوویێکی کۆکەرەوەی زۆر لە ڕووداوە مێژووییەکانە".(١١٥) ئەم جۆرە سترانە لەباکوور وڕۆژئاوای کوردستان پێی دەڵێن (سترانا شەڕا، مێرانی، سوارا) . چونکە باسی ڕووداو وشەڕەکانی کوردستان دەکەن وزانیاری و ووردەکاری گرنگمان لەم بارەیەوە دەدەنێ. بەڵام لەباشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان بە (لاوک) دەناسرێ.(١١٦)

سەبارەت بە بابەتی ئەم جۆرە سترانە، (مینتیشا شڤیلی) دەڵێ: " لەفۆلکلۆری دەوڵەمەندی کوردیدا گۆرانی وحیکایەتی قارەمانانە جێگەیەکی دیاری هەیە".(١١٧) بەڵام ئاشکرایە کە چیرۆک وسەربردەی دڵدارانیش بابەتێکی تری ئەم جۆرە سترانە بووە. بۆیە (نیکیتین) دوای ئەوەی چەندین نمونەی لاوکی کوردیمان بۆ دەهێنێتەوە لەبارەی دڵداری وئەوین. لەگەڵ شەڕ وڕووداوی خوێناوی، دەڵێ: "ئەم نمونانەی لاوک کە پێشکەشمان کردن بەسن بۆ ئەوەی تێڕوانینێکی گشتیمان لەبارەی بابەتەکانی ئەدەبی میللی کوردی بدەنێ ئەوانیش خۆشەویستی وجەنگن".(١١٨) هەر لەسۆنگەی ئەمەوە، زۆربەی ئەو نووسەر وتوێژەرانەی کە سەروکاریان لەگەڵ لاوک وسترانی کوردی کردییە، ئاماژە بەگرنگی ئەم دەقانە دەکەن بۆ مێژووی کوردستان. هەندێکیان بەپێویستی دەزانن کە بکرێنە سەرچاوە بۆ نووسینەوەی ئەم مێژووە.(١١٩) بەڵام دەبێ ئەوە بزانین کە کوردان ڕووداوەکانی مێژووی

خۆیان هەر تەنیا بەشێوەی لاوک وستران نەپاراستووە. بەڵکو هەندێ حیکایەت و چیرۆکیشمان هەن کە باسی ڕووداوی ڕاستەقینە دەکەن. وەک ئەو چیرۆکە پەخشانەی کە باسی داستانی قەلای دمدم دەکات و (ئۆسکار مان) لەکتێبەکەی خۆیدا تۆماری کردووە.[١٢٠]

لەپێناو سەلماندنی ئەم ڕاستیانەی سەرەوە، پێویستە بەگشتی لەدەقەکانی ئەدەبی زارەکی کوردی ڕابمێنین وبزانین تا چ ڕاددەیەک خزمەت بە بواری مێژوونووسی کوردی دەکەن. یان بەواتایەکی تر بڵێین ئایا خاڵە ئەرێنییەکانی ئەم دەقانە وەکو سەرچاوەی مێژوویی چین؟ خۆ دەبێ سەرنجی خاڵە نەرێنییەکانیشیان بدەین. ئەگەر سەرەتا سەیری ئەو سترانە دیرۆکییانە بکەین کە لەبارەی ڕاپەڕینی ساڵی ١٩١٩ی بادینان (دژی دەسەلاتی بریتانیا) گوتراون، دەبینین ئەم سترانانە چەندین ووردەکاری لەخۆ دەگرن کە سەرچاوە ئاساییەکان باسیان نەکردوون، یان بەو شێوەیە نەچوونەتە قولایی ڕووداوەکەوە. هەندێ جاریش زانیارییەکانی نێو سترانەکان، شرۆڤەو لێکدانەوەکانی توێژەر ومێژوونووسان پشتڕاست دەکەنەوە. بۆ نمونە هەندێ مێژوونووس وەکو لێکدانەوەی خۆیان باسیان لە هۆکاری ئایینی کردووە لەبەرپابوونی ئەم ڕاپەڕینە. بەڵام لەسترانەکاندا بەڵگە لەسەر ئەم هۆکارە بەئاشکرا دەبینرێ، کاتێ لەسترانێکدا دەڵێ:

**منێ سوێندەکا خاری ب قەسەمێ ب ئایاتی ب قورئانێ**
**ئەزێ شەرکی کم و ل گەل حوکمەتا ئینگلیزی**
**ئەزێ پێشاهیکا عەسکەرێ گاوری دگرم.**[١٢١]

هاوکات ئەو سترانانە زانیاری و ووردەکاری زۆرمان دەدەنێ لەبارەی هێزەکانی بریتانیا و ئەو گروپانەی تێیدا بەشدار بوون. لەگەڵ جۆری ئەو چەکانەی کە لەشەڕەکاندا بەکارهاتوون. هەروەها ناوی چەندین کەسایەتی کوردیش تۆمار دەکەن کە لەم شەڕانەدا ڕۆڵیان هەبوو؛ وەکو: (حەسۆ دینۆ) کە یەکێک بوو لەئاغاکانی دەڤەری گۆیان،

(حاجی شەعبان) ئاغای ئامێدی، (سادق برۆ) ئاغایێ گولی، (فارس بەگ)ی زێباری و چەندانی تر. ئەمە سەرباری باسکردنی پلانەکانی شەڕ وپێکدادانەکان ودەرەنجامەکانیان.[١٢٢]

بۆ ئەوەی زۆر لەم ماوە مێژووییە دوور نەکەوینەوە، ئاماژە بە بەیتێکی فۆلکلۆری دەکەین کە لەزاری سترانبێژێکی میللی وەرگیراوە. ئەم بەیتە کە بەزۆری لەکاتی دروێنەدا دەگوترایەوە، باسی شالاوی هێزەکانی ڕوسیا دەکات بۆ ڕەواندز لەسالانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا. لەم بەیتەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە خەلکی ناوچەکە چۆن چاوەڕێی کۆمەکی هێزەکانی عوسمانی بوون بۆ ئەوەی لەم کارەساتە ڕزگاریان بکات. بۆیە بەبێ ئارامییەوە هەوالی پێشڕەویکردنی ئەم هێزەیان دەگواستەوە کە بەسەرکردایەتی (خەلیل بەگ) بەرێ کەوتبوو بەرەو ڕەواندز. لەکۆتایی بەیتەکەشدا دەلێ:

| | |
|---|---|
| **هەر لەو شەرێ عروسی** | **کوژرا دۆستێ چل کەزی** |
| **شاریان هەموو کاولکرد** | **هەموو کوژران ڕواندزی** |
| **هەرچی ئاگری تیبەردا** | **هەرچی بردی بەدزی** |
| **خوای کرد دوژمن زوو شکا** | **گەڕاوە بە سەرکزی.**[١٢٣] |

هەروەها (نیکیتین)یش بەشێکی لاوکێکی بۆ نووسیوین کە زانیاری گرنگی تێدایە لەبارەی غافلکوژکردنی (جەعفەر ئاغای شکاک) لەلایەن جێنشینی تەختی قاجاری لەشاری تەورێز.[١٢٤] ئاشکرایە کە (جەعفەر ئاغا) دژایەتی دەسەلاتی قاجاری دەکرد، بۆیە لەسالی ١٩٠٥دا لەپیلانێکدا کوژرا.[١٢٥]

ئەگەر بگەڕێینەوە پێشتر وببینە سەردەمی عوسمانی کە لەکوردستاندا نزیکەی چوار سەدەی خایاند، چەندان دەقی زارەکی تر دەبینین، کە هەریەکەیان باس لەڕووداوێکی مێژوویی دەکەن. ئەم دەقانە بۆ ماوەی زیاتر لە (١٠٠) سال بەشێوەی زارەکی گوتراون و دەماودەم گوازراونەتەوە، تا هەندێکیان دواتر تۆمارکراون. ژمارەیەکی زۆر لەم دەقە زارەکییانە (کە ئەوانیش زۆربەیان لاوک وسترانن) پەیوەندییان

بەشەڕ وجموجوڵی هۆزەكانەوە هەیە. یەكێک لەوانە چیرۆک وبەیتی (عەلی ئاغای ئەرگۆشی) سەرۆک هۆزی مزوورییە، كە لەساڵی ١٨٣٢دا بە پیلانێک لەلایەن (عەلی بەگ)ی میری ئێزیدییان كوژرا. ئەم چیرۆک وبەیتە ووردەكاری زۆرمان لەبارەی ئەم پیلانەو پێشهاتی كوشتنەكە پێدەدەن. گرنگییەكەشیان لەوە دایە كە لەلایەن كەسانی نزیک لەڕووداوەكە لەڕووی شوێن وكات، گوتراونەتەوە. بۆیە دەكرێ زانیارییەكانیان وەكو گوتەی شایەتحاڵ ئەژمار بكرێن.[١٢٦] ئەمە لەكاتێكدایە كە سەرچاوە ئاساییەكان تەنیا بەكورتی باسی ڕووداوەكە دەكەن.[١٢٧]

هەندێ لە لاوكەكان باسی كەسایەتییە مێژووییەكان دەكەن، بەڵام نەک چالاكییە سیاسی وسەربازییەكانیان كە دژی دەولەتانی داگیركەری كوردستان ئەنجامیان دەدا، بەڵكو زانیاریمان پێدەدەن لەبارەی ژیانی خۆیان وبنەماڵەكانیان لەنێو هۆزەكەیاندا. وەكو ئەو لاوكەی كە باسی (تەیمور پاشای مللی)[١٢٨] دەكات، بەتایبەتیش ئەو پەیوەندییە خۆشەویستییەی كە لەنێوان (عەدلە خان)ی خوشكی و گەنجێكی جەربەزەی ئێزیدی بەناوی (دەروێشێ عەڤدی) لە ئارادابوو. بۆیە ئەم دەقە زارەكییە بە (لاوكی دەروێشێ عەڤدی) ناسراوە.[١٢٩]

لەهەموو ئەوانە گرنگتر ئەوەیە كە ئەم دەقە زارەكییانە هەندێ لاپەڕەی شاردراوەی مێژووی كوردیان بەدیارخستووە. وەكو چارەنووسی (سلێمان بەگی كوڕی قولی بەگ)ی[١٣٠] میری سۆران، كە لەهیچ سەرچاوەیەكی مێژووییدا باس نەكراوە. بەڵام بەگوێرەی بەیتێكی فۆلكلۆری بێت ناوبراو بەپیلانێک بانگكراوەتە بەغدا و لەوێ لەلایەن دەسەڵاتدارانی ویلایەتی بەغدا ژەهرخوارد كراوە.[١٣١] ئەمەش دەكرێ بەڕاست وەرگیرێ، چونكە میری ناوبراو هێزو دەسەڵاتی لەناوچەكە زۆر زێدە ببوو، بەجۆرێک هەندێ جار گوێی بەفرمانەكانی سوڵتانی عوسمانیش نەدەدا.[١٣٢] شایانی باسە، دەسەڵاتدارانی بەغدا دواتر بەپیلانی هاوشێوە چەند میرێكی كوردی تریش لەناودەبەن.[١٣٣] كەواتە ئەمە كارێكی ئاسایی بووە بەلای ئەوان.

ئەم بەیتەی پێشوو کە بە (بەیتی لەشکری) دەناسرێ، لەگەڵ هەندێ بەیتی تر کە باسی هەمان بابەت دەکەن،[١٣٤] هۆکارێکن بۆ مانەوەی ناوی (لەشکری) بەو سیفەتەی سوپاسالاری سۆران بووە لەسەردەمی سلێمان بەگی کوڕی قولی بەگدا. هەر لەرێی ئەم بەیتە فۆلکلۆرییانە ناوی (خانزاد)ی شازادەی سۆرانیش بەزیندوویی ماوەتەوە. بەگوێرەی ئەم بەیتانە؛ ئەم شازادەیە خوشکی میر سلێمان بەگ بووە، کە لەکۆتاییەکانی سەدەی شازدەهەمدا کوژراوە. دوای ئەم ڕووداوە، خانزاد خاتوون دەسەڵاتی لەمیرنشینەکەدا پیادەکردووەو زۆر بەلێهاتوویی کاروباری ڕاییکردووە. بۆیە چەندین لاوک وبەیتی فۆلکلۆرییان بەسەردا هەڵداوەو لەیادەوەری خەڵکی ناوچەکەشدا ناو وناوبانگی هەر ماوەتەوە. تا ئێستاش هەندێ قەڵاو شوێنی دەڤەرەکە بەناوی ئەوەوە ناسراون؛ وەکو (قەڵای خانزاد) لەبناری چیای بەنی هەریر.[١٣٥] ئەمە لەکاتێکدایە کە تا ئێستا نەزانراوە ناوی (لەشکری) لەهیچ سەرچاوەیەکی مێژوویی یەکەمیدا هاتبێ. هەروەها ناوی (خانزاد)یش تا ماوەیەکی کەم بەر لەئێستا لەم جۆرە سەرچاوانە نەبینرابوو.[١٣٦] بەڵام لەم دواییانەدا بەدیارکەوت کە هەندێ سەرچاوەی یەکەمی و ڕەسەن باسی (خانزاد)ی سۆرانیان کردووە.[١٣٧] ئەمەش ڕاستی هەبوونی ئەم کەسایەتییە مێژووییە پشتڕاست دەکاتەوەو بایەخی بەیتە فۆلکلۆرییەکانیش زیاتر دەسەلمێنێ.

هەندێ لەدەقە زارەکییەکان باسی ڕووداوێکی مێژوویی دەکەن کە لەسەرچاوە ئاساییەکاندا هاتووە، بەڵام ئەم سەرچاوانە وێنەی تەواوی ڕووداوەکەیان نەداوینەتێ. چونکە لە یەک دیوەوە سەیری ڕووداوەکەیان کردووە، وەکو داستانی (قەڵای دمدم). ئەم قەڵایە مەڵبەندی میرنشینی برادۆست بوو لەباکووری ڕۆژهەڵاتی کوردستان. بەڵام لەلایەن هێزەکانی (شا عەباسی یەکەمی سەفەوی ١٥٨٨– ١٦٢٩) ئابلۆقە دراو دوای بەرگرییەکی دلێرانەی کوردانی برادۆست بەسەرکردایەتی (خانی لەپ زێڕین)، لەساڵی ١٦٠٩ داگیر کرا. بێگومان سەرچاوەی سەرەکیمان بۆ ئەم ڕووداوە تەنیا کتێبی (عالەم ئارای

عەباسی)یە کەمێژوونووسی فەرمی شا عەباس (ئەسکەندەر بێگ تورکمان) دایناوە. بۆیە لەدیوی لای دەولەتی سەفەوییەوە ڕووداوەکەی تۆمارکردووەو ئاگاداری هەڵومەرجی نێوەخۆی ئابلوقەدراوان نەبووە. ئەمە سەرباری ئەوەی کەهەڵوێستێکی دوژمنکارانەی لەهەمبەر کوردان وەرگرتووەو بەچەندین ناو وناتۆرەی خراپ باسیان دەکات. چونکە مێژوونووسی دەربار بووە.[١٣٨] لێرەدا بایەخی ئەو چیرۆک وبەیتە فۆلکلۆرییانەمان بۆ دەردەکەوێ کە لەبارەی ئەم داستانە هۆنراونەتەوەو دەماودەم هاتوون تا هەندێکیان تۆمارکراون وگەیشتوونەتە دەست ئێمە. چونکە ئەم دەقە زارەکییانە دیوەکەی تری ڕووداوەکەمان بۆ باس دەکەن کە دیوی کوردە ئابلوقەدراوەکانە. بێگومان زانیاری و ووردەکاری زۆرتریشمان دەدەنێ لەبارەی قایمکاری قەڵاو ڕەوشی ئابڵوقەدراوان و هەڵوێستیان لەهەمبەر پێشهاتەکانداو چەندین لایەنی تر. بۆ نمونە سەبارەت بەدۆزینەوەی سەرچاوەی ئاوی دانیشتووانی دمدم و ژەهراویکردنی لەلایەن سەفەوییەکانەوە، کۆپلەیەکی بەیتێکی دمدم دەڵێ:

| | |
|---|---|
| **خانێک ڕابوو لەکوردانە** | **کێ بوو؟ لە- حمەد بەگی لێتانە** |
| **ڕووی ڕەش بێ دەگەڵ جووانە** | **لەسەر یەک نیمچوون ئالانە** |
| **زیز بوو، چوو بۆ نێو ئەوانە** | **پێی نیشان دان سوولەخانە** |
| **کێ بوو؟ لەکافری بێ ئیمانە** | **تێیانکرد هەش ودەرمانە** |
| **پێی قڕ دەبوون موسوڵمانە** | **لەوان بوو رۆژی تەنگانە** |

لێرەشدا ناوی ئەو کەسەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە بووە هۆی ئاشکراکردنی سەرچاوەی ئاوەکەو دواتر ژەهراویکردنی. دیارە ئەوەش کاریگەری زۆر خراپی لەسەر دانیشتووانی دمدم هەبووەو دواتر بووەتە هۆکارێکی سەرەکی گیرانی قەڵاکە.[١٣٩]

سەرەڕای هەمووو ئەمانە، نابێ دەقە زارەکییە کوردییەکان بەشێوەیەکی ڕەها وەکو سەرچاوە بۆ نووسینی مێژووی کورد وەربگیرێن. لەبەرئەوەی (وەکو پێشتر باسمانکرد) دەقە زارەکییەکان بەگشتی بەتێپەڕبوونی کات گۆڕانیان بەسەردا هاتووە. تا ئەو ڕاددەیەی

لەهەندێ باردا تێکەڵی ئەفسانە بوون. هەندێکیشیان هەر لەبنەڕەتدا زێدەڕۆییان تێداکراوەو بەتەواوی ڕاستییان نەپێکاوە. سەرەنجام ئەم دەقە زارەکییە کوردییانەش لەپاڵ خاڵە ئەرێنییەکانیان، هەندێ خاڵی نەرێنیشیان هەیە، کە ئێمە لێرەدا تەنیا هەندێکیان باس دەکەین:

یەکێک لەو خاڵە نەرێنییانە زێدەڕۆیی کردن و بەسەرەوەنانە، کە لەهەندێ دەقی زارەکی کوردیدا بەرچاو دەکەوێ. (نیکیتین) نمونەیەکی لەم جۆرەی بۆ تۆمارکردووین؛ کاتێ بەشێکی ئەو لاوکە دەهێنێتەوە کە باسی شەڕیکی کورد وڕوس دەکات لەناوچەی ورمێ. دیارە ئەم شەڕە لەسەروبەندی جەنگی یەکەمی جیهانیدا ڕوویداوە کاتێ هێزەکانی ڕوسیا لەساڵی ١٩١٤ هێرشیان بۆ ناوچەکە هێنا. هەرچەندە ئەم لاوکە تەنیا دوو ساڵ دوای ئەم ڕووداوە بەرگوێی (نیکیتین) کەوتووە، بەلاّم لاوکبێژەکە زێدەڕۆیی زۆری تێداکردووە کاتێ ژمارەی هێزەکانی ڕوسیا بە (١٧٠٠) جەنگاوەرو ژمارەی شەڕڤانانی کوردیش بە (١٩) چەکدار ئەژمار دەکا. چونکە ڕاستی ڕووداوەکە ئەوەیە کە ژمارەیەکی بەرچاو لەکوردان خۆیان لەبۆسە ناوەو توانیویانە زەبر لەمەفرەزەیەکی بچووکی ڕوسەکان بوەشێنن، هەروەکو (نیکیتین) لە ئەفسەرانی ڕوس ئەمەی بیست.[١٤٠]

لەسەرێکی تریشەوە، هەندێ لەدەقە زارەکییەکان کە باسی ڕووداوێک دەکەن کات وسەردەمی ئەو ڕووداوە دیاری ناکەن. بۆ نمونە یەکێک لەو لاوکانەی کە (نیکیتین) تۆماری کردوون، باسی شەڕێکی نێوان کوردو دەسەلاّتدارانی تورک دەکات، بەهۆی نەدانی باج بەحکومەت.[١٤١] بەلاّم تەنانەت ئەوەش نازانرێ کە ئایا ئەمە باسی سەردەمی عوسمانییە یان تورکیای هاوچەرخ، چ جای ئەوەی ساڵی ڕووداوەکە بزانین. بێگومان ئەمەش لەبایەخی زانیارییەکە کەم دەکاتەوە. بەتایبەتی کە توێژەران وا بەئاسانی نەتوانن ڕووداوەکە بگێڕنەوە سەردەمی خۆی. لێرەدا باسکردنی ئەو ڕووداوە تەنیا وەکو چیرۆکی لێدێت و لەڕووی مێژووییەوە بایەخێکی ئەوتۆی نامێنێ.

سەبارەت بەوەش کە هەندێ لەدەقە زارەکییەکان سەردەکێشن بۆ دنیای خەیاڵ وتێکەڵی ئەفسانە دەبن، دەکرێ ئاماژە بە داستانی دمدم

بکەین؛ ئەوەتا لەیەکێک لەبەیتەکاندا سەبارەت بە ئازایەتی (خانی لەپ زێڕین) ولەدەستدانی یەکێک لەقۆڵەکانی، هاتووە:

**شێرەک لە دەحلیێ غەزریە　　بابچین هەم غیرەتەو پیاوەتییە**
**دەورەی دەحلییان گرتییە　　شێر لە دەحلێی نەڕاندییە**
**ڕاستی خانۆی دەرکەتییە　　دەستی مەتاری خواردیە**
**بەدەستی دی گوێی گرتییە　　بەخەنجەرێی سەربڕییە**
**بەسامۆتەی وەکردییە　　بۆ شای برد بەدیارییە**
**شا دەریێ ئەوە چییە　　ئەوە کەروێشکە کێوییە**
**بۆ تۆم هێنا بەدیارییە　　شا دەخورتە کورانە**
**تێکەل بکەن زێڕ وزیوانە　　دەستەک بنێن لەخانانە**
**بەئەمری پاشای ئەکبەری　　دەستی زێڕ ڕوح هاتەبەری**(۱٤۲)

هەروەها (محەمەد مستەفا) ناسراو بە (حەمەبۆر)یش لەباسێکی تێروتەسەلدا کە لەبارەی ئەم داستانەی نووسیوە، تێبینی کردووە کە لەبەیتەکاندا هەندێ ئەفسانە هەن؛ وەک ئەوەی کە (خانی لەپ زیڕین) پیاوچاک بووەو قسەی لەگەڵ پێغەمبەران وپیاوچاکانی پێشوو کردووەو نزاکانیشی گیرابوون. یان لەخەونیدا ڕاسپێردراوە کە شەڕ لەگەڵ گاوران بکات و هەر لەم خەونەدا شوێنی گەنجینەیەکی بۆ ئاشکرا کراوە تا بەکاری بهێنێ بۆ ئەو مەبەستە. تەنانەت باسی ئەوەش دەکەن کە ئەژدیهایەک پاسەوانی ئەم گەنجینەیەی کردووە تا دەیداتە دەست خان.(۱٤۳)

لەکۆتاییدا دەبێ ئەوە بزانین کە تەنانەت سەرچاوە نووسراوەکانیش کەمێژوونووسان پشتیان پێدەبەستن بۆ نووسینەوەی مێژوو، هەموویان ۱۰۰% ڕاست نین و ئەگەری هەڵبەستن و زێدەڕۆیی وتەنانەت ووردنەبوون و ناڕوون بوونیشیان هەیە. کەواتە ئەم خاڵە نەرێنییانەی کە باسمانکردن، لەبایەخی دەقە زارەکییەکان کەم ناکەنەوەو هێشتا دەکرێ سوودمەند بن بۆ نووسینەوەی میژووی کورد. بە مەرجێک وەکو سەرچاوە ئاساییەکان، بەگیانی ڕەخنەو لێ ووردبوونەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ.

**دەرەنجام:**

میللـەتی کـورد خـاوەن گەنجینەیـەکی دەوڵەمەنـدە لەئـەدەبی زارەکـی کـە بـەزۆری چیـرۆک وداسـتان ولاوک وحـەیران وسـتران وپەنـدی پێشـینان ومەتـەڵ، دەگرێتـەوە. سـاڵانێکی زۆر بـوو کـە کـوردان لـەرێی ئـەم ئەدەبـەوە هەست ونەستی خۆیان دەردەبڕی و هەڵوێستی خۆیان لەهەمبەر پێشـهاتەکان دیـاری دەکـرد. هەنـدێ جـار لـەرێی ئـەم ئەدەبـەوە نەخاسـمە (لاوک و بەیتـە فۆلکلۆرییەکان) ووردەی جەنگاوەرانیان بـەرزدەکردەوەو هـانی تـاکی کوردیـان دەدا کـە زیـاتر بـاوەڕی بـەخۆ بێت. هەنـدێ جـاری تـریش دەقـە زارەکییـەکان مـــۆرکێکی تراژیـــدییان پێـــوە دیـــاربوو. چونکـــە باســـیان لـــەو ڕووداوە کارەساتبارانە دەکرد کە بەسەر کورداندا هاتووە. بەشێوەیەکی گشتی ئەدەبی زارەکـی کـوردی وەکـو سـەرچاوەی مێژوویـی، سـوودێکی گرنگـی هەیـە بـۆ نووسینەوەی مێژووی کوردو کوردستان. بەو پێیەی کە هەندێ لەو کەلێنانە پڕدەکاتـەوە کـە ئـەم مێـژووە بەدەسـتییەوە دەنـاڵێنێ، بەتایبـەتی سـەبارەت بەزانینی ووردەکاری هەندێ ڕووداو وهێنانی ناوی ئەوانەی کە بەشداربوون تیایدا. هـەروەها ئـەم دەقـە زارەکییانـە نـاوی هەنـدێ کەسـایەتییان بـە نـەمری هێشـتۆتەوە، کـە لەسـەرچاوە ئاسـاییەکاندا ناویـان نـابینرێ (وەکو: لەشکری)، یـان تـا ئـەم دواییـە نـەبینرابوو ( وەکو: خـانزادی سـۆران). لەوانـەش گرنگتـر ئەوەیـە کـە لـەرێی ئـەم ئەدەبـەوە دەتوانین هەندێ ڕووداو لـەدیوی کـوردەوە ببینـین. چونکـە زۆربـەی سـەرچاوەکانی تـر لـەتێڕوانینی ئـەویترەوە سـەیری پێشـهاتەکانی کوردسـتانیان کـردووە. بۆیـە پێویسـتە تـوێژەر ومێژوونووسـان ئەدەبی زارەکی وەکو سـەرچاوەی مێژوویـی بەهەنـد وەربگـرن وفەرامۆشـی نەکەن. نەخاسـمە کـە هەنـدێ هـەوڵ دراوە بـۆ کۆکردنـەوەو تۆمـارکردنی ئـەم دەقە زارەکییانە. بـەڵام چونکـە هەنـدێ لـەم دەقانـە زێدەڕۆییان تێداکراوە یـان گـۆڕان وزیادکردنیـان بەسـەردا هێنـراوە، بۆیـە دەبـێ بـەگیانی ڕەخنـەو لـێ ووردبوونـــەوە، زانیارییـــەکانی ئـــەم دەقانـــە وەربگیـــرێن. هـــەروەها لەگـــەڵ ســـەرچاوە ئاســـاییەکاندا بـــەراوورد بکـــرێن وســـاغبکرێنەوە. بەتایبـــەتی بـــۆ دیـــاریکردنی کـــات وســـەردەمی ڕووداوەکـــان ودڵنیـــابوون لـــەگونجانی زانیارییـەکان لەگـەڵ هێڵـی گشـتی ڕووداوەکـان، وەک ئـەوەی کـە لەسـەرچاوە ئاساییەکاندا هاتووە.

**پەراوێزەکان:**

[1] سـليمان يحيـى محمـد، الابـداع فـى السـرد الشـعبى الشـفاهى/ القصـص الشـعبى السودانى إنموذجا، باسێکە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاوکراوەتەوە لەسایتی:
Forum. Stop55.com/226881.html- 5/12/2013

[2] د. امنية عامر، التاريخ الشفهي: تاريخ يغفله التاريخ، توێژینەوەیەکە لەسـەر تـۆڕی ئینتەرنێت بڵاوکراوەتەوە لەسایتی:
www.journal.cybrarian.org/index.php?option=com- 5/12/2013

[3] د.عبدالله بـن ابـراهيم العسـكر، أهميـة تـدوين التـراث الشـفاهي كمصـدر تـاريخى، توێژینەوەیەکە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاوکراوەتەوە لەسایتی:
Faculty.ksu.edu.sa/834/pages/topicacd4.aspx- 5/12/2013

[4] محمـد حسـن عبـدالحافظ، حريـه الشـفاهى حريـه المكتـوب، باسـێکە لـەسـەر تـۆڕی ئینتەرنێت بڵاوکراوەتەوە لەسایتی:
www.ahewar.org/debat/show.art.asp?aid=33884- 5/12/2013

[5] والتر ج. اونـج، الشـفاهية والكتابيـة، ت: د. حسـن البنـا عزالـدين، مراجعـة: د. محمـد عصفور، سلسلة عالم المعرفة ١٨٢، الكويت ١٩٩٤، ص٥٥.

[6] بـۆ نمونــە بڕوانــە: البخــاري (٨١٠- ٨٧٠م)، صــحيح البخــاري، تحقيــق: طــه عبـدالرؤوف سـعد، دار الاعتصـام- القـاهرة/ دار الرشـيد-الجزائـر، ٢٠١١، ص٩٦، ١٨٨، ٣١٦.

[7] شـاعیرێکی نابینـاو گـەڕۆک بـوو، لەشـارەکانی یۆنـانی کـۆن دەگـەڕاو داسـتانە شــیعرییەکانی دەگوتــەوە. هــەردوو ســاڵی لــەدایکبوون ومردنــی بەتــەواوی نازانـدرێن، بـەڵام باوەڕوایـە کـە لـەماوەی نێوان ١٠٥٠- ٨٥٠ پێش زایین ژیـاوە. بڕوانـە: أ. بتـرى، مـدخل الـى تـاريخ الاغريـق وأدبهـم واثـارهم، ت: يوئيـل يوسـف عزيز، جامعة الموصل ١٩٧٧، ص١٠٢.

[8] بڕوانــە: هــەمان ســەرچاوە، ص١٠٢-١٠٣؛ هــەروەها: کــەمال مەزهــەر ئەحمــەد، مێژوو/ کورتە باسێکی زانستی مێژوو وکورد ومێژوو، چ٢، هەولێر ٢٠٠٨، ل٤٧.

[9] یەکــەم گــەورە مێژوونووســی یۆنــانی کۆنــەو بــە (بــاوکی مێــژوو) دەناسـرێ. لەدەوروبــەری (ســاڵی ٤٨٤ پ. ز) لــەدایکبووەو لەوانەیــە لەســاڵی (٤٢٦ پ. ز) مردبێ. بڕوانە: أ. بترى، سەرچاوەی پێشوو، ص١١٢- ١١٣.

[10] محمـد حبيـدة، التـأريخ الشـفهى، وتارێکە لەسـەر تـۆڕی ئینتـەرنێت بڵاوکراوەتـەوە لەسایتی: www.Arabvoice.com/39161- 5/12/2013
هەروەها: عبدالله العسكر، سەرچاوەی پێشوو.

[11] عبدالله العسكر، سەرچاوەی پێشوو.

(١٢) امنية عامر، سەرچاوەی پێشوو.

(١٣) بڕوانە: أحمد بن يحيى بن جابر البلاذري، البلدان وفتوحاتها وأحكامها، المكتبة العصرية، ط١، بيروت ٢٠٠٨، ص٦٤، ٧٦، ٢٥٠؛ أبي جعفر محمد بن جرير الطبري، تأريخ الطبري/ تاريخ الامم والملوك، دار صادر، ط٣، بيروت ٢٠٠٨، مج ١، ص٣٦٠، ٣٦٣، ٣٨٣؛ أبي الحسن علي بن الحسين بن علي المسعودي، مروج الذهب ومعادن الجوهر، دار صادر، بيروت بدون تاريخ، ج٢، ص٢٥١، ٢٥٣، ٣٦٣.

(١٤) عبدالله العسكر، سەرچاوەی پێشوو.

(١٥) بڕوانە: شرفخان البدليسي، شرفنامه، ت: محمد جميل الملا احمد الروژبياني، ط٢، مؤسسة موكرياني، اربيل ٢٠٠١، ص٣٦، ٤٥٣، ٥٤١.

(١٦) بۆ نمونە بڕوانە: سليمان فائق بک، تأريخ بغداد، ت: موسى كاظم نورس، مطبعة المعارف، بغداد ١٩٦٢، ص٣-٧؛ محمد أمين بن خيرالله الخطيب العمري، منها الاولياء ومشرب الاصفياء من سادات الموصل الحدباء، ج١، تحقيق: سعيد الديوەچی، الموصل ١٩٦٧، ص٥-٩.

(١٧) امنية عامر، سەرچاوەی پێشوو.

(18) Alistair Thomson, Four Paradigm Transformations in Oral History, The Oral History Review, Vol. 34, Issue 1, 2006, p51.

(١٩) عبدالله العسكر، سەرچاوەی پێشوو.

(20) Alistair Thomson, op.cit, p52.

(٢١) بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل٤٩- ٧٠.

(22) Rob Perks, The Challenges of Web Access to Archival Oral History in Britain, iasa journal no32 - January 2009, p74.

(٢٣) أمنية عامر، سەرچاوەی پێشوو.

(٢٤) عبدالله العسكر، سەرچاوەی پێشوو.

(٢٥) بڕوانە: عبدالرقيب يوسف، بانگەوازێک بۆ ڕووناکبیرانی کورد/ لەپێناوی کۆکردنەوەو زیندووکردنەوەی کەلەپووری کوردیدا، چاپخانەی کامەرانی، سلێمانی ١٩٨٥، لاپەڕەکانی ٢٦، ٤٩، ٥١، ٥٣، ٥٦، ٧٦، ١٣٥.

(٢٦) بڕوانە: عارف قوربانی، شایەتحاڵەکانی ئەنفال، بەرگی ٢، سلێمانی ٢٠٠٢.

(٢٧) عبدالله العسكر، سەرچاوەی پێشوو.

(٢٨) محمد حبيدة، سەرچاوەی پێشوو؛ Alistair Thomson, op.cit, p52-53

(٢٩) عبدالله العسكر، سەرچاوەی پێشوو.

(٣٠) محمد الشحرى، البعد الانسانى فى الادب الشفاهى/ الصداقة فى شعر (الدبرارات) إنموذجا، باسێکە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاوکراوەتەوە لەسایتی:
www.nizwa.com/articles.php?id=3603- 5/12/2013

(٣١) الادب الشفهی فی کوریا، لەسایتی:
www.ar.wikipedia.org/wiki/ الادب-الشفهی-فی-کوریا 5/12/2013
(٣٢) عبدالله العسکر، سەرچاوەی پێشوو.
(٣٣) تحسین ابراهیم الدوسکی، المدخل لدراسة الادب الکردي/ المدون باللهجة الشمالیة، ج١، منشورات جمعیة علماء کردستان، د.م، ١٩٩٣، ص٢٧-٣٥.
(٣٤) والتر اونج، سەرچاوەی پێشوو، ص١٧٧-١٧٨.
(٣٥) امنیة عامر، سەرچاوەی پێشوو.
(٣٦) عبدالرقیب یوسف، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٩؛ هەروەها بڕوانە: د.ابراهیم عبدالرحمن، الشعر الجاهلی/ قضایاه الفنیة والموضوعیة، دار مصر الجدیدة، القاهرة ١٩٨٤ ، ص١٠٢.
(٣٧) بەپێشەنگی شاعیرانی نەتەوەپەروەری کورد دادەنرێ، بێجگە لەشاکاری (مەم وزین) هەندێ بەرهەمی تریشی هەیە. لەبارەی ژیان وبەرهەمەکانی بڕوانە: د. عزالدین مصطفی رسول، أحمدی خانی ١٦٥٠- ١٧٠٧/ شاعرا ومفکرا وفیلسوفا ومتصوفا، بغداد ١٩٧٩، ص٢٧-٣٧.
(٣٨) هەمان سەرچاوە، ص٤٥-٥١.
(٣٩) سعد الصویان، الشفاهي والکتابي فی اللغة والادب، وتارێکە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاوکراوەتەوە لەسایتی:
www.alfusha.net/t16819.html- 5/12/2013
(٤٠) والتر أونج، سەرچاوەی پێشوو، ص١٠٧.
(٤١) ئۆسکارمان، توحفەی موزەفەرییە، ساغکردنەوەو هێنانە سەر ڕێنووسی کوردی: عەلی نانەوازادە، هەولێر ٢٠١٣، ل٣٦.
(٤٢) سعد الصویان، سەرچاوەی پێشوو.
(٤٣) دوو زانای زماننناس وئەفسانەناس بوون. بە دامەزرێنەرانی زانستی فۆلکلۆر دەناسرێن. پێکەوە بۆ ماوەی نزیکەی نیو سەدە لەبواری فۆلکلۆردا کاریان کردووە. خالید جوتیار، بەرەو فۆلکلۆر، چا: الحوادث، بەغدا ١٩٨٤، ل٩٤.
(٤٤) یەکێکە لەدامەزرێنەرانی زانستی ئەفسانە، لەگرنگترین بەرهەمەکانی: (نەریت وئەفسانە) و(حیکایەتەکانی پیرۆ). هەمان سەرچاوە، ل٩٢.
(٤٥) والتر أونج، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٥.
(٤٦) بڕوانە: خالید جوتیار، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٣-٩٢.
(٤٧) والتر أونج، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٧.
(٤٨) محمد حبیدة، سەرچاوەی پێشوو.

(٤٩) محمد أفقير، الادب الامازيغي من الشفاهة الى الكتابة، باسێکه لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاوکراوەتەوە لەسایتی:
www.diwanalarab.com/spip.php?article18313- 5/12/2013

(٥٠) جريدة (الشرق الاوسط)، ع (١١٥٦٩)، الاحد (١) أغسطس ٢٠١٠؛ مركز-توثيق- التراث- الحضاري- والطبيعي (١٦-٧-٢٠١٦)
https://ar.wikipedia.org/wiki/

(٥١) عبدالله العسكر، سەرچاوەی پێشوو.

(52) www.alwatan.com.sa/cultur/news_Detail.aspx?ArticleID =165263&categoryID=7- 5/12/2013

(٥٣) کەمال مەزهەر، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٠.

(٥٤) بڕوانە: مەلا مەحمودی بایەزیدی، داب ونەریتی کوردەکان، و: د. شکریە رسول، بەغدا ١٩٨٢.

(٥٥) عزالدين مصطفى رسول، أحمدى خانى،...، ص٤٩٦؛ کەمال مەزهەر، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٣.

(٥٦) د. نەجاتی عەبدوڵلا، بیبلیۆگرافیای کوردناسی/ کوردو کوردستان لەسەرچاوە فرەنسییەکاندا، هەولێر ٢٠٠٩، ل٣٥٤-٣٥٥، ٣٥٨-٣٥٩.

(٥٧) بڕوانە: ئۆسکارمان، سەرچاوەی پێشوو، ل٩.

(٥٨) جەلال تەقی، لاوانەوەی کوردی ودەوری ڕۆدینکۆ لەتۆمارکردنیدا، گۆڤاری (کاروان)، ژ ٥١، کانونی یەکەم ١٩٨٦، ل١٠٦.

(٥٩) بڕوانە: د. نەجاتی عەبدوڵلا، بیبلیۆگرافیای کوردناسی/ کوردو کوردستان لەسەرچاوە ئینگلیزییەکاندا، هەولێر ٢٠٠٩، ل٢٩٩-٣٠٠.

(٦٠) تیمووریێ خەلیل، گولبژێرەک ژ نڤیسکارێن کوردێن سوڤیەتا بەرێ، چاپخانەی خانی، دهۆک ٢٠٠٧، ل١٣٥. بۆ ناسینی کەسایەتی حەجی جوندی بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل١٣٥- ١٤٢.

(٦١) لەبارەی ژیان وبەرهەمەکانی بڕوانە: أ. شاميلوف، حول مسألة الاقطاع بين الكرد، ت: د. كمال مظهر احمد، ط٢، بغداد ١٩٨٤، ص٢١-٢٧.

(٦٢) تیمووریێ خەلیل، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٩.

(٦٣) بڕوانە: ئوردیخانی جەلیل، سترانێ زارگۆتنا کوردایە تاریقیێ، وەرگێڕانە سەر ڕێنووسی کوردی: شوکر مستەفا وئەنوەر قادر محەمەد، بەغدا ١٩٧٧.

(٦٤) بڕوانە: کەمال مەزهەر، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٨، ٢٧٨.

(٦٥) هەمان سەرچاوە، ل٢٩٧.

(٦٦) لەبارەی نووسین وبەرهەمەکانی ناوبراو، بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل٣٠١-٣٠٢؛ د. عومەر ئیبراهیم عەزیز (پەتی)، بیبلۆگرافیای فۆلکلۆری کوردی (کتێب-ووتار)/ ١٨٦٠- ١٩٩٠، سلێمانی ٢٠٠٥، ل١٩٨- ١٩٩.

(٦٧) بڕوانە: ئیسماعیل حەقی شاوەیس، قسەی پێشینان گۆستاو لۆبۆن، چاپخانەی ئەیتام، بەغدا ١٩٣٣.

(٦٨) بڕوانە: شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ١، بەغدا ١٩٥٧، چ٢، سلێمانی ١٩٧١.

(٦٩) بڕوانە: مەلا مەحمودێ دێرشەوی، مشتاخا چیا ژ گۆتنێت پێشییا، چ٢، چاپخانا زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر ٢٠٠٠.

(٧٠) بڕوانە: هیمدادی حوسێن، چەپکێ هۆنراوەی فۆلکلۆری دەشتی هەولێر، چاپخانەی الحوادث، بەغدا ١٩٨٦.

(٧١) جلال ملا حسن خۆشناو، لاوک، مطبعة اسعد، بغداد ١٩٩٠.

(٧٢) بڕوانە: حجی جعفر، حەیرانۆک ژ کەلەپوورێ کوردی، ب١، هەولێر ١٩٨٩.

(٧٣) بڕوانە: سەعدوللا ئیسماعیل شێخانی، چیرۆک وبەیتی (لاس وخەزاڵ) و زەمبیل فرۆش، بەغدا ١٩٨٦؛ طارق جمباز، محەمەد وسێوێ وسورمێ خان وقورشیدی چاوبەخار، بەغدا ١٩٨٣؛ مستەفا نوری بامەڕنی، لەعلیخانا گوڤەیی، بەغدا ١٩٨٠.

(٧٤) بڕوانە: ئەحمەد عەبدوللا زەڕۆ، مامکێن کوردی، بەغدا ١٩٨٥.

(٧٥) بۆ وەستان لەسەر ناوی ئەم نووسەرانەو بەرهەمەکانیان، بڕوانە: عومەر پەتی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٦- ٢٠٧.

(٧٦) بڕوانە: د.عزالدین مستەفا ڕەسول، ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، چ١، بەغدا ١٩٧٠، چ٢، سلێمانی ١٩٧٩.

(٧٧) بڕوانە: شوکریە ڕەسول، سەرچاوەی پێشوو. ناوبراو تێزی دکتۆراکەشی بەناوی (پەندی پێشینان وقسەی نەستەقی کوردان) بوو، کە لەساڵی ١٩٧٧دا کورتەیەکی لەمۆسکۆ بڵاوکردۆتەوە. بڕوانە: کەمال مەزهەر، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٧٣.

(٧٨) بڕوانە: ئەسعەد عەدۆ، لاوک وحەیران وهۆنراوەی میللی لەفۆلکلۆری کوردیدا، هەولێر ٢٠٠٦.

(٧٩) سەبارەت بە لێکۆڵینەوە فۆلکلۆرییەکان بڕوانە: عومەر پەتی، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٥- ٢٥٠.

(٨٠) بڕوانە: علي جزيري، الادب الشفاهي الكردي، ج١، رابطة كاوه، ٢٠٠٠، ج٢، الاكاديمية الكردية، اربيل ٢٠٠٨.

(٨١) بۆ نمونە بڕوانە: گۆڤاری (کاروان)، ژمارەکانی (٢٥) تشرینی یەکەم ١٩٨٤، ل١٦، (٢٧) کانونی یەکەم ١٩٨٤، ل٩٧، (٣٨) تشرینی دووەم ١٩٨٥، ل١٠٥، (٥٠) تشرینی دووەم ١٩٨٦، ل١٠٦- ١١٩؛ گۆڤاری (بەیان)، ژ(١٠٥) ئاداری ١٩٨٥، ل٩٠، ٩٤.

(٨٢) شەریف فەلاح، ئەدەبی زارەکی وچەند سەرنجێک، باسێکە لە سەر تۆڕی ئینترنێت بڵاوکراوەتە لەسایتی:

www.jwan1387.blogfa.com/posts- 20-6-2016

(٨٣) د.شوکریە ڕەسول ئیبراهیم، ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، ب٢، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر ١٩٨٤، ل٣١.

(٨٤) عبدالله العسکر، سەرچاوەی پێشوو.

(٨٥) خالص مسور، المنهج التأريخي في الادب، باسێکە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاوکراوەتەوە لەسایتی:

www.maaber.org/issue_july06/litrerature2/htm- 5/12/2013

(٨٦) سليمان يحيى محمد، سەرچاوەی پێشوو.

(٨٧) عبدالله العسکر، سەرچاوەی پێشوو؛ شەریف فەلاح، سەرچاوەی پێشوو.

(٨٨) محمد حبيدة، سەرچاوەی پێشوو.

(٨٩) أمنية عامر، سەرچاوەی پێشوو.

(٩٠) محمد حسن عبدالحافظ، سەرچاوەی پێشوو.

(٩١) والتر أونج، سەرچاوەی پێشوو، ص١٠٧.

(٩٢) توحفەی موزەفەرییە، ل٣٦، ٤٠.

(٩٣) والتر أونج، سەرچاوەی پێشوو، ص٢٠٣، ٢١٠.

(٩٤) سعد الصويان، سەرچاوەی پێشوو.

(٩٥) محمد حبيدة، سەرچاوەی پێشوو.

(٩٦) سەبارەت بە مێژوونووسی کوردی لەم ماوەیەدا بڕوانە: د. سەعدی عوسمان هەروتی، کوردو کوردستان لەبەڵگەنامەو سەرچاوە مێژووییەکاندا/ سەردەمی نوێ وهاوچەرخ، هەولێر ٢٠١٤، ل٢٧-٥٣.

(٩٧) لەم بارەیەوە بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل١٤٩-١٩٩.

(٩٨) باسيلي نيكيتين، الكرد/ دراسة سوسيولوجية وتأريخية، ت: نوری طالبانی، ط١، مطبعە خانی، دهوک ٢٠٠٨، ص٣٦٤.

(٩٩) شەریف فەلاح، سەرچاوەی پێشوو.

(١٠٠) شرفنامە، ص٤٧٦.

(١٠١) ئەمە ڕووداوی گرتنی ئەم قەڵایەیە لەلایەن سەفەوییەکان لەساڵی ١٦٠٩دا. لەلاپەڕەکانی داهاتوودا زانیاری زیاتری لەبارەوە دەنووسین.

(١٠٢) بڕوانە: نەوشیروان مستەفا ئەمین، کوردو عەجەم/ مێژووی سیاسی کوردەکانی ئێران، چ٣، سلێمانی ٢٠٠٥، ل٩٨- ١٠٤.

(١٠٣) بڕوانە لاپەڕەکانی ٨٧، ٨٩، ٩١، ٩٣ لەکتێبی:

Yilmaz Camlibel, Gilidax Bexwedi nine/ Serhildana Ciyaye Agiriye, Wesanen Deng, Stenbol, 2005.

(١٠٤) بڕوانە: عبدالفتاح علي يحيى، بوتان والبوتانيون والاغنية الكردية التأريخية، مجلة (كاروان)، ع (٢٨) كانون الثاني ١٩٨٥، ع (٢٩) شباط ١٩٨٥.

(١٠٥) بڕوانە دەقی باسەکە لە: گۆڤاری (کاروان)، ژ (٥٠) تشرینی دووەم ١٩٨٦، ل١٠٦- ١١٩.

(١٠٦) بڕوانە: د. صلاح محەمەد سەلیم هروری، ڕویدانێن سالا ١٩١٩ ل دەڤەرا بادینان دسترانا دیروکی یا کوردی دا، چاپخانا زانکویا دهوک، ٢٠٠٤، ل٥-١٠، ١٩-٢٢، ٢٧ ودواتر.

(١٠٧) باسیلی نیکیتین، سەرچاوەی پێشوو، ص٣٦٤.

(١٠٨) بۆ نمونە بڕوانە: توما بوا، لمحة عن الاكراد، ت: محمد شريف عثمان، النجف ١٩٧٣، ص٥٥؛ ا. م. مینتیشا شڤیلی، کورد/ کورتەی پێوەندی کۆمەڵایەتی ئابووریی ڕۆشنبیری وگوزەران، و: د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، چ٢، چاپخانەی خانی، دهۆک ٢٠٠٨، ل٧١-٧٣.

(١٠٩) مینتیشا شڤیلی، سەرچاوەی پێشوو، ل٧١، ٧٢.

(١١٠) الكرد...، ص٣٦٩، ٣٩٩.

(١١١) د. بدرخان السندي، المجتمع الكردي فى المنظور الاستشراقي، ط١، دار اراس للطباعة والنشر، اربيل ٢٠٠٢، ص٤٣١.

(١١٢) بۆ ئەم مەتەڵانەو چەندین مەتەڵی تر بڕوانە: حجی جعفر، داکو ووندا نەبن، گۆڤاری (کاروان)، ژ (٥١) کانونی یەکەم ١٩٨٦، ل١٠٠- ١٠٥.

(١١٣) عزالدین مستەفا ڕەسول، ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، چ١، ل٩٥؛ شوکریە ڕەسول، سەرچاوەی پێشوو، ب٢، ل١١٦.

(١١٤) توحفەی موزەفەرییە، ل٣٥- ٣٦.

(١١٥) أنور المايي، الاكراد فى بهدينان، ط٢، دهوك ١٩٩٩، ص١٧٤.

(١١٦) عبدالفتاح علي يحيى، بوتان والبوتانيون...، مجلة (كاروان)، ع (٢٨)، ص١٥٤؛ صلاح هروری، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٨.

(١١٧) کورد...، ل٧٢.

(١١٨) الكرد..." ص٣٩٠.

(١١٩) سەبارەت بە بۆچوونی هەندێ لەنووسەر وتوێژەران لەم بارەیەوە، بڕوانە: عبدالفتاح علي يحيى، دیرۆک وسەرپێهات...، (کاروان)، ژ (٥٠)، ل١٠٦- ١٠٧؛ صلاح هروری، سەرچاوەی پێشوو، ل٧- ١٠.

(١٢٠) بڕوانە: توحفەی موزەفەرییە، ل٤٥- ٤٧.

(١٢١) صلاح هروری، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠-٢١.

(١٢٢) بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل٢٧، ٢٩-٣١. ٣٥، ٣٧-٣٩ و لاپەڕەی تر.

(١٢٣) بڕوانە دەقی بەیتە فۆلکلۆرییەکە لە: عبداللە حسین رسول، دوو گۆرانیی فۆلکلۆری، گۆڤاری (کاروان)، ژ (٣٨). تشرینی دووەم ١٩٨٥، ل١٠٥.

(١٢٤) الكرد...، ص٣٨٠-٣٨٢.

(١٢٥) د. سەعدی عوسمان هەروتی، بزاڤی ڕزگاریخوازی نیشتیمانی لەکوردستانی ڕۆژهەڵاتدا (١٨٨٠- ١٩٣٩)، هەولێر ٢٠٠٧، ل٦٣.

(١٢٦) بڕوانە هەردوو دەقی چیرۆک و بەیتەکە لە: عبدالفتاح علي يحيى، دیرۆک وسەرپێهات...، (کاروان)، ژ (٥٠)، ل١٠٩- ١١٩.

(١٢٧) بۆ نمونە بڕوانە: صديق الدملوجي، إمارة بهدينان الكردية/ او امارة العمادية، ط٢، مراجعة وتقديم: عبدالفتاح علي يحيى، اربيل ١٩٩٩، ص٣٨؛ عبدالرزاق الحسني، اليزيديون فى حاضرهم وماضيهم، بغداد ١٩٨٤، ص١٤٠.

(١٢٨) تەیمور پاشای مللی کە لەبەیتە فۆلکلۆرییەکاندا بە (تەمەر پاشای ملان) دەناسرێ، لەچارەگی کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا سەرکردایەتی هۆزی مللی دەکرد کە لەدەوروبەری ماردین بڵاوببوونەوە. لەم ماوەیەدا جموجوڵی لەناوچەکە زیادببوو، بۆیە دەولەتی عوسمانی لەساڵی ١٧٩١دا هێرشێکی فراوانی کردە سەری ولێیخست. بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: د. سعدي عثمان هروتي، كوردستان والامبراطورية العثمانية، مطبعة خانێ، دهوک ٢٠٠٨، ص١٤٦---١٤٨.

(١٢٩) بڕوانە: ئەسعەد عەدۆ، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠-١٥. شایانی باسە من خۆشم گوێبیستی ئەم لاوکە بوومە کە لەسەر کاسێتی دەنگی تۆمارکراوە.

(١٣٠) یەکێک بوو لەمیرە بەتواناکانی سۆران کە لەنیوەی دووەمی سەدەی شازدەهەمدا حوکمڕانی کردووە. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی بڕوانە: شرفخان البدليسي، سەرچاوەی پێشوو، ص٤٦٤-٤٦٦.

(١٣١) بڕوانە بەیتی لەشکری، لە: ئۆسکار مان، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٧٩-٣٨١. شایانی باسە لەژێدەرێکی هاوچەرخیشدا ئاماژە بەڕووداوی ژەهرخواردکردنی سلێمان بەگ کراوە (بڕوانە: عەلی سەیدۆ گەورانی، لە"عەممان"ەوە بۆ "ئامێدی"/ گەشتێک بەکوردستانی باشووردا، و: تالیب بەرزنجی، سلێمانی ٢٠٠٠، ل١٥٢)

بەڵام پێدەچێ ئەویش ئەم زانیارییەی هەر لەبەیتە فۆلکلۆرییەکان وەرگرتبێ لەرێی خەڵکی ناوچەکەوە ، چونکە ئاماژەی بەهیچ سەرچاوەیەک نەداوە بۆ ئەم زانیارییەو وەکو لەسەرەوەش گوتم لەهیچ سەرچاوەیەکدا باسی ئەم رووداوە نەکراوە.

(١٣٢) لەم بارەیەوە بڕوانە: د. عماد عبدالسلام رؤوف، دراسات وثائقية في تأريخ الكرد الحديث وحضارتهم، منشورات وزارة الثقافة، اربيل ٢٠٠٨، ص٢٠٦-٢١٥.

(١٣٣) بڕوانە: سعدي عثمان حسين، إمارة بابان فى النصف الاول من القرن الثامن عشر، اربيل ٢٠٠٠، ص٢٦، ٦٢-٦٣.

(١٣٤) خۆم گوێبیستی هەندێکیان بووم لەرێی کاسێتی دەنگی.

(١٣٥) (موکریانی) دەڵێ :"لەبەیت وهەڵبەستاندا خانزادو لەشکری لەکاردان". هەروەها هەندێ قەڵا دیاری دەکات کە بەناوی (خانزاد)ـەوە ناونراون. بڕوانە: حسین حزنی موکریانی، مێژووی میرانی سۆران، چ٢، چاپخانەی کوردستان، هەولێر ١٩٦٢، ل١٤.

(١٣٦) تەنیا لەهەندێ ژێدەردا کە لەسەدەی بیستەمدا نووسراون، ناویان هێنراوە، وەکو: عەلی سەیدۆ گەورانی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٢-١٥٣؛ حسین حزنی موکریانی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤. دیارە نووسەری ئەم ژێدەرانەش هەر لەرێی بەیتە فۆلکلۆرییەکانەوە ئاشنای ئەم ناوانە بوون، وەکو نووسەری ئەم ژێدەرەی دوایی خۆشی ئاماژەی پێدەدا.

(١٣٧) وەکو (سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی) کە لەناوەراستی سەدەی حەڤدەمدا نووسراوە. لەم سەرچاوەیەدا ناوی "خانزادە سوڵتان" هاتووە. بڕوانە:

Evliyâ Çelebi b. Derviş Mehemmed Zıllî, Evliyâ Çelebi Seyahetnamesi, IV. Kitap, (Topkapı Sarayı Kütüphanesi, Bağdat 305 Numaralı Yazmanın Transkripsiyonu – Dizini), Hazırlayanlar: Yücel dagli - Seyit Ali Kahraman, Yapi Kredi Yayinlari, s.297.

(١٣٨) بڕوانە: اسکندر بیگ ترکمان، تاریخ عالم ارای عباسی، ب ٢، چ٢، انتشارات امیر کبیر، چاپخانە گلشن، تهران ١٣٥٠ هـ ش، ص٧٩١- ٨١٠. بێگومان هەندێ نووسەری هاوچەرخیش باسی ئەم رووداوەیان کردووە، بەڵام ئەوانیش سەرچاوەکەیان هەر ئەم کتێبە بووە. بڕوانە: محەمەد جەمیل رۆژبەیانی، فەرمانرەوایی موکریان، بەغدا ١٩٩٢، ل٧٠-٨٧؛ نەوشیروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٠- ٩٨.

(١٣٩) بڕوانە چیرۆکێک لەسەر رووداوەکە لەگەڵ بەیتی دمدم لە: ئۆسکار مان، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٥-٤٧، ٦٢-٧٨.

(١٤٠) الكرد...، ص٣٨٨.

[١٤١] هەمان سەرچاوە، ص٣٧٧.

[١٤٢] ئەم دەقەم لەدایکم (جەمرە سابیر ئەحمەد) وەرگرت کە بەشێکی بەیتی دمدمی لەبەرەو پێشتر لەبرای خۆی گوێبیستی بووە کە لەکاتی دروێنەکردندا دەیگوتەوە. دایکم ئێستاش لەژیاندا ماوەو دەقەکەم لەبەرواری ٢٠١٦/٧/١١ لەشاری هەولێر لێوەرگرت.

[١٤٣] بڕوانە: محەمەد مستەفا (حەمەبۆر)، خانی لەپ زێرین وقەڵای دمدم، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژ (١٠٥)ساڵی ١٩٨٥، ل٢٠٦-٢٠٧.

**لیستی سەرچاوەکان:**

**یەکەم: کتێب:**

**أ- بەزمانی کوردی:**


- أ. م. مینتیشا شفیلی، کورد/ کورتەی پێوەندی کۆمەڵایەتی ئابووریی ڕۆشنبیری وگوزەران، و: د.عیزەدین مستەفا مستەفا رەسووڵ، چ٢، چاپخانەی خانی، دهۆک ٢٠٠٨.
- ئەحمەد عەبدوڵڵا زەرۆ، مامکێن کوردی، بەغدا ١٩٨٥.
- ئەسعەد عەدۆ، لاوک وحەیران وهۆنراوەی میللی لەفۆلکلۆری کوردیدا، هەولێر ٢٠٠٦.
- ئوردیخانی جەلیل، سترانێ زارگۆتنا کوردایە تاریقیێ، وەرگێڕانە سەر ڕێنووسی کوردی: شوکر مستەفا وئەنوەر قادر محەمەد، بەغدا ١٩٧٧.
- ئۆسکارمان، توحفەی موزەفەرییە، ساغکردنەوەو هێنانە سەر ڕێنووسی کوردی: عەلی نانەوازادە، هەولێر ٢٠١٣.
- ئیسماعیل حەقی شاوەیس، قسەی پێشینان گۆستاو لۆبۆن، چاپخانەی ئەیتام، بەغدا ١٩٣٣.
- تێمووریێ خەلیل، گولبژێرەک ژ نڤیسکارێن کوردێن سۆڤیەتا بەرێ، چاپخانەی خانی، دهۆک ٢٠٠٧.
- جەلال تەقی، لاوانەوەی کوردی ودەوری ڕۆدینکۆ لەتۆمارکردنیدا، گۆڤاری (کاروان)، ژ ٥١، کانونی یەکەم ١٩٨٦.
- جلال ملا حسن خۆشناو، لاوک، مطبعة اسعد، بغداد ١٩٩٠.
- حجی جعفر، حەیرانۆک ژ کەلەپووریێ کوردی، ب١، هەولێر ١٩٨٩.
- حسین حزنی موکریانی، میژووی میرانی سۆران، چ٢، چاپخانەی کوردستان، هەولێر ١٩٦٢.
- خالید جوتیار، بەرەو فۆلکلۆر، چاپخانەی الحوادث، بەغدا ١٩٨٤.

- سەعدوللا ئیسماعیل شێخانی، چیرۆک وبەیتی (لاس وخەزاڵ) و زەمبیل فرۆش، بەغدا ١٩٨٦.
- د. سەعدی عوسمان هەروتی، بزاڤی ڕزگاریخوازی نیشتیمانی لەکوردستانی ڕۆژهەڵاتدا (١٨٨٠- ١٩٣٩)، هەولێر ٢٠٠٧.
- د.شوکریە ڕەسول ئیبراهیم، ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، ب٢، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر ١٩٨٤.
- شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ١، بەغدا ١٩٥٧، چ٢، سلێمانی ١٩٧١.
- طارق جمباز، محەمەد وسێوێ وسورمێ خان وقورشیدی چاوبەخار، بەغدا ١٩٨٣.
- عبدالرقیب یوسف، بانگەوازێک بۆ ڕووناکبیرانی کورد/ لەپێناوی کۆکردنەوەو زیندووکردنەوەی کەلەپووری کوردیدا، چاپخانەی کامەرانی، سلێمانی ١٩٨٥.
- عەلی سەیدۆ گەورانی، لە"عەممان"ـەوە بۆ "ئامێدی"/ گەشتێک بەکوردستانی باشووردا، و: تالیب بەرزنجی، سلێمانی ٢٠٠٠.
- عارف قوربانی، شایەتحاڵەکانی ئەنفال، بەرگی ٢، سلێمانی ٢٠٠٢.
- د.عزالدین مستەفا ڕەسول، ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، چ١، بەغدا ١٩٧٠، چ٢، سلێمانی ١٩٧٩.
- د. عومەر ئیبراهیم عەزیز (پەتی)، بیبلۆگرافیای فۆلکلۆری کوردی (کتێب- ووتار)/ ١٨٦٠- ١٩٩٠، سلێمانی ٢٠٠٥.
- کەمال مەزهەر ئەحمەد، مێژوو/ کورتە باسێکی زانستی میژوو وکورد ومێژوو، چ٢، هەولێر ٢٠٠٨.
- مەلا مەحمودێ دێرشەوی، مشتاخا چیا ژ گۆتنێت پێشییا، چ٢، چاپخانا زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر ٢٠٠٠.
- محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی، فەرمانڕەوایی موکریان، بەغدا ١٩٩٢.
- مستەفا نوری بامەڕنی، لەعلیخانا گوڤەیی، بەغدا ١٩٨٠.
- د. نەجاتی عەبدوڵلا، بیبلیۆگرافیای کوردناسی/ کوردو کوردستان لەسەرچاوە ئینگلیزییەکاندا، هەولێر ٢٠٠٩.
- د. نەجاتی عەبدوڵلا، بیبلیۆگرافیای کوردناسی/ کوردو کوردستان لەسەرچاوە فرەنسییەکاندا، هەولێر ٢٠٠٩.
- نەوشیروان مستەفا ئەمین، کوردو عەجەم/ مێژووی سیاسی کوردەکانی ئێران، چ٣، سلێمانی ٢٠٠٥.
- هیمدادی حوسێن، چەپکێ هۆنراوەی فۆلکلۆری دەشتی هەولێر، چاپخانەی الحوادث، بەغدا ١٩٨٦.

-Yilmaz Camlibel, Gilidax Bexwedi nine/ Serhildana Ciyaye Agiriye, Wesanen Deng, Stenbol, 2005.

**ب- بەزمانی عەرەبی:**

- أ. بترى، مدخل الى تاريخ الاغريق وأدبهم واثارهم، ت: يوئيل يوسف عزيز، جامعة الموصل ١٩٧٧.
- د.ابراهيم عبدالرحمن، الشعر الجاهلى/ قضاياه الفنية والموضوعية، دار مصر الجديدة، القاهرة ١٩٨٤.
- أبي جعفر محمد بن جرير الطبري، تأريخ الطبري/ تاريخ الامم والملوک، دار صادر، ط٣، بيروت ٢٠٠٨، مج١.
- أبي الحسن علي بن الحسين بن علي المسعودي، مروج الذهب ومعادن الجوهر، دار صادر، بيروت بدون تاريخ، ج٢.
- أحمد بن يحيى بن جابر البلاذري، البلدان وفتوحاتها وأحكامها، المكتبة العصرية، ط١، بيروت ٢٠٠٨.
- أنور المايى، الاكراد فى بهدينان، ط٢، دهوک ١٩٩٩.
- باسيلي نيكيتين، الكرد/ دراسة سوسيولوجية وتأريخية، ت: نورى طالبانى، ط١، مطبعه خانى، دهوک ٢٠٠٨.
- البخاري (٨١٠- ٨٧٠م)، صحيح البخاري، تحقيق: طه عبدالرؤوف سعد، دار الاعتصام- القاهرة/ دار الرشيد-الجزائر، ٢٠١١.
- د. بدرخان السندي، المجتمع الكردي فى المنظور الاستشراقي، ط١، دار اراس للطباعة والنشر، اربيل ٢٠٠٢.
- تحسين ابراهيم الدوسكى، المدخل لدراسة الادب الكردي/ المدون باللهجة الشمالية، ج١، منشورات جمعية علماء كردستان، د.م، ١٩٩٣.
- توما بوا، لمحة عن الاكراد، ت: محمد شريف عثمان، النجف ١٩٧٣.
- سعدي عثمان حسين، إمارة بابان فى النصف الاول من القرن الثامن عشر، اربيل ٢٠٠٠.
- د. سعدي عثمان هروتي، كوردستان والامبراطورية العثمانية، مطبعة خانێ، دهوک ٢٠٠٨.
- سليمان فائق بک، تأريخ بغداد، ت: موسى كاظم نورس، مطبعة المعارف، بغداد ١٩٦٢.
- شرفخان البدليسى، شرفنامه، ت: محمد جميل الملا احمد الروژبيانى، ط٢، مؤسسة موكريانى، اربيل ٢٠٠١.

- صديق الدملوجي، إمارة بهدينان الكردية/ او امارة العمادية، ط٢، مراجعة وتقديم: عبدالفتاح على يحيى، اربيل ١٩٩٩
- د. صلاح محەمەد سەليم هرورى، ڕويدانێن سالا ١٩١٩ ل دەڤەرا بادينان دسترانا ديروكى يا كوردى دا، چاپخانا زانكويا دهوک، ٢٠٠٤.
- عبدالرزاق الحسني، اليزيديون فى حاضرهم وماضيهم، بغداد ١٩٨٤.
- د. عزالدين مصطفى رسول، أحمدى خانى ١٦٥٠- ١٧٠٧/ شاعرا ومفكرا وفيلسوفا ومتصوفا، بغداد ١٩٧٩.
- علي جزيري، الادب الشفاهي الكردي، ج١، رابطة كاوه، ٢٠٠٠، ج٢، الاكاديمية الكردية، اربيل ٢٠٠٨.
- د. عماد عبدالسلام رؤوف، دراسات وثائقية في تأريخ الكرد الحديث وحضارتهم، منشورات وزارة الثقافة، اربيل ٢٠٠٨.
- محمد أمين بن خيرالله الخطيب العمري، منها الاولياء ومشرب الاصفياء من سادات الموصل الحدباء، ج١، تحقيق: سعيد الديوەچى، الموصل ١٩٦٧.
- والتر ج. اونج، الشفاهية والكتابية، ت: د. حسن البنا عزالدين، مراجعة: د. محمد عصفور، سلسلة عالم المعرفة ١٨٢، الكويت ١٩٩٤.

ج- بەزمانی فارسی:

- اسكندر بيگ تركمان، تاريخ عالم اراى عباسى، مج ٢، چ٢، انتشارات امير كبير، چاپخانه گلشن، تهران ١٣٥٠ هـ ش.

د- بەزمانی توركی:

Evliyâ Çelebi b. Derviş Mehemmed Zıllî, Evliyâ Çelebi Seyahetnamesi, IV. Kitap, (Topkapı Sarayı Kütüphanesi, Bağdat 305 Numaralı Yazmanın Transkripsiyonu – Dizini), Hazırlayanlar: Yücel dagli - Seyit Ali Kahraman, Yapi Kredi Yayinlari.

دووەم:گۆڤارو ڕۆژنامەکان:

أ- بەزمانی کوردی:

- حجی جعفر، داكوووندا نەبن، گۆڤاری (کاروان)، ژ (٥١) كانونی يەكەم ١٩٨٦.
- عبدالفتاح علی يحيی، ديرۆک وسەرپێهات/ عەلی ئاغایێ ئەرگوشی، گۆڤاری (کاروان)، ژ (٥٠) تشرينی دووەم ١٩٨٦.
- عبداللە حسين رسول، دوو گۆرانيی فۆلكلۆری، گۆڤاری (کاروان)، ژ (٣٨). تشرينی دووەم ١٩٨٥.
محەمەد مستەفا (حەمەبۆر)، خانی لەپ زێرین وقەلای دمدم، گۆڤاری (ڕۆشنبيری نوێ)، ژ (١٠٥) ساڵی ١٩٨٥.

**ب- بەزمانی عەرەبی:**

- جريدة (الشرق الاوسط)، ع (١١٥٦٩)، الاحد (١) أغسطس ٢٠١٠.
- عبدالفتاح علي يحيى، بوتان والبوتانيون والاغنية الكردية التأريخية، مجلة (كاروان)، ع (٢٨) كانون الثاني ١٩٨٥، ع (٢٩) شباط ١٩٨٥.

**ج- بەزمانی ئینگلیزی:**

- Alistair Thomson, Four Paradigm Transformations in Oral History, The Oral History Review, Vol. 34, Issue 1, 2006.
- Rob Perks, The Challenges of Web Access to Archival Oral History in Britain, iasa journal no32 - January 2009.

**سێیەم: پێگەی ئەلیکترۆنی:-**

www.alwatan.com.sa/cultur/news_Detail.aspx?ArticleID=165263&categoryID=7 5/12/2013

- www.ar.wikipedia.org/wiki/ الادب-الشفهى-فى-كوريا -5/12/2013
- د.امنية عامر، التاريخ الشفهي: تاريخ يغفله التاريخ:
www.journal.cybrarian.org/index.php?option=com- 5/12/2013
- خالص مسور، المنهج التأريخي في الادب:
www.maaber.org/issue_july06/litrerature2/htm- 5/12/2013
- سعد الصويان، الشفاهي والكتابي فى اللغة والادب:
www.alfusha.net/t16819.html- 5/12/2013
- سليمان يحيى محمد، الابداع فى السرد الشعبى الشفاهى/ القصص الشعبى السودانى إنموذجا: Forum. Stop55.com/226881.html- 5/12/2013
- شەریف فەلاح، ئەدەبی زارەکی وچەند سەرنجێک:
www.jwan1387.blogfa.com/posts- 20-6-2016
- د.عبدالله بن ابراهيم العسكر، أهمية تدوين التراث الشفاهي كمصدر تاريخي:
Faculty.ksu.edu.sa/834/pages/topicacd4.aspx- 5/12/2013
- محمد أفقير، الادب الامازيغي من الشفاهة الى الكتابة:
www.diwanalarab.com/spip.php?article18313- 5/12/2013
- محمد حبيدة، التأريخ الشفهى www.Arabvoice.com/39161- 5/12/2013
- محمد حسن عبدالحافظ، حريه الشفاهى حريه المكتوب:
www.ahewar.org/debat/show.art.asp?aid=33884- 5/12/2013
- محمد الشحرى، البعد الانسانى فى الادب الشفاهى/ الصداقة فى شعر (الدبرارات) إنموذجا: www.nizwa.com/articles.php?id=3603- 5/12/2013
- مركز-توثيق- التراث- الحضاري- والطبيعي (١٦-٧-٢٠١٦)
https://ar.wikipedia.org/wiki/-

**ملخص البحث**

**( الأدب الشفاهي كمصدر لتدوين تأريخ الكرد )**

لقد مارست معظم المجتمعات اسلوب الأدب الشفاهي الذي أستمر لدى بعض الأمم حتى بعد ظهور الكتابة. ويعد الكرد من بين تلك الأمم التي أولت إهتماماً كبيراً بذلك النوع من الأدب. وتكاد الأدب الشفاهي الكردي تنحصر في الأبيات الشعرية الفولكلورية والملاحم الغنائية وخاصةً ذلك النوع من الغناء المسمى في جنوب كردستان بـ (لاوک) الذي يتناول حدثاً واقعياً وقع في الماضي وترک تأثيراً في الأمة. وتتسم بعض تلك الأحداث بسمات سياسية تأريخية. إذ إن بعض الأبيات الشعبية قد تناولت وقائع بارزة في تأريخ الكرد وسجلت لنا تفاصيل مهمة لاتذكرها المصادر التأريخية. كالأبيات التي تتغنى ببطولة أكراد إمارة برادوست وأميرهم (خاني لەپ زێڕين- الخان ذو الكف الذهبي) في ملحمة قلعة دمدم. والمقصود بهذه الملحمة أحداث محاصرة قوات الشاه عباس الأول الصفوي (١٥٨٨-١٦٢٩م) لمركز إمارة برادوست (قلعة دمدم) وسقوطه في عام ١٦٠٩م.

وكانت بعض الأبيات الفولكلورية الأخرى التي حفظت عن ظهر قلب وتناقلتها الأجيال عبر القرون، سبباً لخلود ذكر بعض الشخصيات التأريخية الكردية. كالأميرة السورانية (خانزاد) التي لم نكن نجد ذكراً لأسمها في أي مصدر تأريخي حتى الاونة الاخيرة. وكنا نعلم بقصتها ودورها البارز في إمارة سوران من خلال الأبيات الشعرية والغنائية. ومن خلال بعض النصوص الشفهية الأخرى نحصل على وجهة النظر الكردية فى خضم بعض الحوادث التأريخية. فى الوقت الذى لاتعبر المصادر التقليدية الا عن وجهة النظر المقابلة، والتى لاتتسم بالحياد في اغلب الاحيان. ولكننا يجب ان نستخدم النصوص الشفاهية بحذر، لان البعض منها قد إختلط بالاساطير و المبالغة. كما العديد منها تفتقر الى السياق الزمنى، مما يؤثر سلبا على أهميتها التأريخية.

# Abstract

## Oral literature as a source for writing the history of Kurdistan

Most communities have practiced the oral literature. And the Kurds are among those nations that given a great interest to this kind of literature. The Kurdish oral literature generally confined in folk poetry and lyrical epics, especially the kind of singing named in southern Kurdistan (Lauk), which deals with a realistic events that occurred in the past and leaves the impact on the general memory of nation. Some popular verses have considered with prominent occurrences in the history of Kurdistan, and memorized an important detail which not mentioned in the historical sources. Like this folk poetry which talk about the bravery of Bradost Kurds and their leader (Khani Iape Zeren- Khan with the Golden hand) in (Castle of Dim Dim) 1609. Some of the other folk verses which memorized through the centuries, was a reason for immortality some Kurdish historical figures. Such as the princess of Soran (Khanzad), that we find her name in some historical source, just before some monthes. But we know her story and prominent role in the Emirate of Soran through some folk poetry. Some of the other verses and lyrical epics provide us the Kurdish view point towards the events. While the normal sources are represent the opposite view point. In spite of these we must be careful with these oral texts, because some of them are mixed with myths and exaggerations.

# ساخكردنەوەی ژمارەكانی گۆڤاری

# (هەتاوی كورد)ی ئەستەنبۆڵ ١٩١٣ - ١٩١٤

**پ. ی. د. ئازاد عوبێد ساڵح**

بەشی مێژوو – كۆلێژی ئەدەبیات –

زانكۆی سەلاحەددین – هەولێر

**پێشەكی:**

مێـژووی ڕۆژنامـەوانی كـوردی ئـاڵۆزی و گـرێ و كـەلێنی زۆری تێدایـە و پێویستییان بـە سـاخكردنەوە و لێتۆژینـەوەی ورد هەیـە، بـۆ ئـەوەی مێژوویـەكی دروست بـۆ ڕۆژنامـەوانیی كـوردی بنووسـینەوە. لـەم ڕوانگەیـەوە ئـەم توێژینـەوە تەرخانـە بـۆ سـاخكردنەوەی ژمارەكـانی گۆڤـاری (هـەتاو ١٩١٣)، كـە تـا ئێسـتا مشتومڕ و گفتوگۆ و بە دواداچوونەكانی بۆی كراوە، پێویستییان بـە ڕوونكردنـەوە و بەدواداچوونی وردتر هەیە.

بایـەخی ئـەم توێژینـەوە بـۆ نووسـینەوەی سـەرەتای مێـژووی ڕۆژنامـەوانی كوردی زۆر پێویستە. گرفتە سەرەكییەكانی ئەم توێژینەوە لەبەردەست نـەبوونی تەواوی ژمارەكانی ئەم گۆڤارەیە، هەرچەند چەند ژمارەیەكی لەم لاو لەو لا هەن و لە هەندێ سەرچاوە و توێژینەوەشدا ئاماژەیـان پێكـراوە، وێـڕای ئـەوە نـەزانینی زمانی توركی عوسمانیش گرفتێكی دیكە بوو، چونكە ژمارەكـانی ئـەم گۆڤـارە بـە هـەردوو زمـانی تـوركی عوسمـانی و كـوردی دەرچـووە. توانیمـان وێـڕای ساخكردنەوەی ژمارەكـانی، پێڕسـتێكیش بـۆ ئـەو ژمارانـەی بەردەسـتی خۆمـانن بكەین – بۆیـە ئێمـە لای خۆمـان هەوڵمانـدا ژمارەكـانی دەسـت بخـەین، ئـەوەبوو سـاڵی ٢٠١٣، ژمارەكـانی (١ و ٢ و ٣ و ٤ و ١٠)مـان دەسـت كـەوت و بەیارمـەتی زانیارییەكانی سەر بەرگی ئەو ژمارانەی تـا ئێسـتا بڵاوكراونەتـەوە، هـەروەها ئـەو زانیارییانەی لە كۆتایی ژمارە (١٠) ئاماژەیان پێكراوە،

ئـەو سەرچـاوانەی لـەم توێژینەوەیـەدا بـەکارهاتوون وێـڕای ئـەو ژمارانـەی بەردەست کە ئاماژەیان پێکرا، سوودی زۆریش لە بابـەتێکی (کـوردێکی یـەکڕەنگ – عەبدوڵڵا زەنگەنە)، دیاری ژمـارە (هتـاو کـرد) لـە ژمـارە (١٣)ی بـەهاری ٢٠٠٨ گۆڤاری (ڕۆژنامەنووس)، بڵاوکراوەتەوە، وەرگیراوە، بەتایبـەتی کـە لـەو بابەتـەدا بەرگی هەموو ژمارەکانی ئەو گۆڤارە زۆر بەجوانی بڵاوکراونەتەوە.

ڕۆژنامــەوانی بــە سەرچــاوەی ســەرەکی و ڕەســەنی نووســینەوەی مێــژووی کــوردی نــوێ و هاوچــەرخ دادەنرێــت، هــیچ مێژوونووســێك ناتوانێــت وێنەیــەکی ڕاستەقینەی دیرۆکی ئەو گەلە بکێشێ بێ تۆژینەوە لـە گۆڤـار و ڕۆژنامـەکانی ئـەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیـەم و سـەرەتای سـەدەی بیسـتەم دەرچــوون، زۆر یارمــەتی مێــژوونووس دەدەن بــۆ شــیکردنەوە و لێکدانــەوەی بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕووناکبیری لەو سەردەمەی مێژووی کورددا [1].

لەو ڕوانگەوە بایەخدان بە ساخکردنەوەی لایەنە شاراوەکانی ڕۆژنامەوانی کوردی، بایــەخی یــەکجار زۆرە، ئــەوەش بــەهۆی بـارودۆخی ناســەقامگیری کوردســتان و نــەبوونی دەســەڵاتی سیاســی کــورد بـۆ خـۆی، ئـەوا بێبەشـیش بـووە لـە دانـان و ڕێکخستنی دامەزراوە پێویست و شایەنەکانی پاراستن و هەڵگرتنی ئـەو بەڵگەنامـە و دەستنووس و گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییانەی کە ڕۆژگارێك لە شـوێنە جیاجیاکـانی کوردستان و دەرەوەی دەرچوونە.

کازیوەی ڕۆژنامەوانی کوردی وەك دەزانین لەسەردەسـتی میقـداد مەدحـەت بەدرخان بە ڕۆژنامەی (کردستان ١٨٩٨/٤/٢٢ – ١٩٠٢/٤/١٤) لە قـاهیرە دەسـتی پێکرد و چەند هەواری جیاجیای گواستەوە و تا ئێسـتا تـەنیا ژمـارە (١٩)ی مـاوە بدۆزرێتەوە [2].

لەگـەڵ بـەرپابوونی شۆڕشـی دەسـتووری لـە دەوڵـەتی عوسمـانی لـە ٢٣ی تەمموزی ١٩٠٨، کەشێکی ئازاد لە سەرزەمینی دەوڵەتی عوسمانی هاتـە ئـاراوە، ئەوە ڕێگەی خۆش کرد بۆ دامەزراندن و پێکهێنانی کۆمەڵە و ڕێکخراوی جیا جیا و دەرکردنی گۆڤار و ڕۆژنامە بە زمانی نەتەوەکانی دیکەش جگە لە زمانی تورکی.

لەو کەشەدا کوردیش وەك نەتەوەیەکی ناو دەوڵەتی عوسمانی دەستی کـرد بـە پێکهێنـانی کۆمەڵـە و دەرکردنـی ڕۆژنامـە و گۆڤـار. ئـەوەبوو (کـورد تـەعاون

تـەرەقی جەمعیـەتی) لـە ٢٥ی ئـەیلوولی ١٩٠٨، لـە شـاری ئەسـتەنبۆڵ دامـەزرا و ڕۆژنامەیەکیشی بەناوی (کورد تـەعاون تـەرەقی غەزەتەسـی- ڕۆژنامـەی تـەعاون تەرەقی کورد) هەر لەو ساڵەدا ١٩٠٨ دەرکرد و (٩) ژمارەی لێ دەرچووە(٣).

دواتر لە ١٩١٢/٧/٢٧، خوێندکارانی کورد کۆمەڵەیەکیان بەناوی (کرد طلبـة هیوی جمعیتی - کۆمەڵەی هێڤی قوتابیانی کورد) هەر لە ئەسـتەنبۆڵ دامەزراند، هەر ئەو کۆمەڵەیەش گۆڤـارێکی بـەناوی (ڕۆژی کـورد) لـە ١٩ی حـوزەیرانی ١٩١٣ دەرکردووە. تا ١٤ی ئەیلوولی ١٩١٣ چوار ژمارەی لێ دەرچووە(٤). خاوەنی ئیمتیاز و بەڕێوەبەر و سەرپەرشتی عەبدولکەریم سلێمانی (١٨٨٠ - ١٩٢٩/٩/١٨)، بـووە کە ناسراوە بە عەبدولکەریمی حاجی عەبدوڵڵا - حەمە کەرکووکی (٥).

## روز کرد - ڕۆژی کورد - هتاو کرد - هەتاوی کورد

بەپێی ئاگاداری و سەرچاوەکانی بەردەست و تا ئێستا زانـراوە، مینورسـکی (١٨٧٧ - ١٩٦٨) زۆر زوو (ساڵی ١٩١٥) ئاماژەی بـە دامـەزرانی کۆمەڵـەی هێڤـی لەلایەن قوتابیانی کـورد و دەرکردنـی گۆڤـارێکی مانگانـە بـەناوی (ڕۆژی کـورد) و گۆڕینی بـۆ (هـەتاوی کـورد) کـردووە و بـەو پێیـەی باسـی بڵاوکردنـەوەی وێنـەی سـەلاحەددینی ئـەیووبی و کـەریم خـانی زەنـد و نـاوەڕۆکی گۆڤارەکـە دەکـات، گۆڤارەکەی بینیوە و بە وردیش ئاماژە بە دەرچوونی ژمارە (١)ی دەکات لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩١٣، هەروەها نووسیویە کە لە ناوچەی دوورە دەستی وەك سلێمانی گوێبیستی هەبوونی ئەو گۆڤارە بووە(٦).

ئەمین زەکی مێژوونووسی دیـاری کـوردیش نووسـیویە: لـەدوای ڕاگەیانـدنی مەشـرووتییەت (کۆمەڵـەی هیـوی کـورد) گۆڤـارێکی بـەناوی (ڕۆژی کـورد) لـە ئەستەنبۆڵ بڵاوکردەوە و لە دوو ژمـارەی یەکـەمی وێنـەی سـەلاحەددین و کـەریم خـانی زەنـدی تێـدابووە، ئەمانـە لـە ٦ی حـوزەیران و تـەممووزی ١٣٢٩/ ١٩ی حـوزەیران و تـەممووزی ١٩١٣ لەلایـەن عەبدولکـەیم ئەفەنـدی خـەڵکی سـلێمانی دەرکراوە و لەدوای ماوەیەك ناوەکەی گۆڕاوە بۆ (هەتاوی کورد)(٧).

یەکێکی دیکە لە سەرچـاوە بایەخـدار و سـەرەتاکان (عەلائـەددین سـەجادی ١٩٠٧ - ١٩٨٤) لە دوای ناوهێنان و باسکردنی گۆڤاری (ڕۆژی کـورد) نووسـیویە، ئەم گۆڤارە پاشان ناونرا (هـەتاوی کـورد) عەبدولعـەزیز بابـان هـەر مـانگێ جـارێ

ژمارەیەکی بە کوردی و تورکی لە ئەستەنبۆڵ لێ دەرکـردووە، یەکـەم ژمـارەی لـە ١١ی تشــرینی یەکــەمی ١٩٢٩ (١٣٢٩) رۆمــی ١٩١٣ی زاینــی بــووە و وێنــەی ئەورەحمان پاشای بابان لەو ژمارەیەدا هەیە[٨].

سەرچـاوەیەکیش نووسـیویەتی گۆڤـاری (ڕۆژی کـورد) ناوەکـەی گـۆڕا بـۆ (هەتاوی کرد) و چەند ساڵێك بـەڕێکوپێکی دەرکـرا[٩]. دیـارە ئـەو زانیارییانـە بـێ ئاماژەکردن بەسەرچاوە نووسراون و بۆیە سادە و هەڵەیان تێدایە، ئەوکاتە هێشتا سەرچاوەی ورد و باوەڕپێکراوی گۆڤارەکان بەردەست نەبوونـە. ئـەو زانیارییانـە، ئێستا بایەخیان نییە.

جەبار جەباریش هەمان زانیارییەکانی سەجادی دووبارە دەکاتەوە و پاشـان نووســیویە، "... بــە زۆری قوتابیــەکانی دانشــگاکانی ئەســتەمۆل بەشــداری لــە نووسینەوەیان ئەکرد وە یارمەتیان ئەدا بە وتاری مێژووی و ویـژەیی و هـونراوەی کوردی، وە ئەم گۆڤارە لەدوای شەری بولقـان لـە سـالی ١٩١٣ لەلایـەن حکومـەتی تورکیاوە داخرا"[١٠].

لەبەرئــەوەی (ڕۆژی کــورد) سیاســەتی ڕەگەزپەرســتانەی تورکــانی لاوی لەقاوداوە، بۆیە هەر تەنیا چوار ژمارەی لێ دەرچووە و دایانخستووە و نووسـەران و بەشدارانی گۆڤارەکەیان راوناوە[١١].

مالمیسانژ ئاماژە بەوە دەکات و نووسیویە: "هـەروەك ئاگـادارین لانـی کـەم دە ژمارەی هەتاوی کورد بڵاوکراوەتەوە کە لە لایەن (هێڤی)یـەوە لـە ئەسـتەنبۆڵ دەرکراوە، سێ ژمارەی یەکەمی هەتاوی کورد مانگی جارێك دەرچون و هەر یەکـە و سـی و دوو لاپــەڕەش بــوون. بــەڵام ژمارەکــانی دواتــر هــەر پــانزە ڕۆژ جارێـك بڵاوکراونەتەوە و ژمارەی لاپەڕەکانیشی بوون بە شانزە لاپەڕە".[١٢]

مالمیسانژ و لەوەندی لە ساڵی (١٩٨٩) تەنیا ئاماژە بە هەر دوو ژمـارە (١)، تشــرینی یەکــەمی ١٣٢٩/ ٢٣ی ذی القعــدەی ١٣٣١/ ١٩١٣ و ژمــارە (٣)، ٢٩ی کـانوونی یەکـەمی ١٣٢٩/ ١٣ی سـەفەری ١٣٣٢ – ١١ی کـانوونی یەکـەمی ١٩١٤ دەکەن[١٣]. وادیارە ئەوکاتە هەر ئەوەندە زانیاری لەبەردەست بووە.

سەرچاوەیەکی بایەخداریش ئامـاژە بـە گۆڤـاری (هـەتاوی کـورد) دەکـات و نووسیویە: بەڕێوەبەری بەرپرسی عەبدولعەزیز بابان بـووە و ژمـارەی (١) لـە ١١ی

تشرینی یەكەمی ١٣٢٩ و ژمارە (١٠)ی لـە ٢٠ی حـوزەیرانی ١٣٣٠ دەرچـووە و لـە چاپخانەی رەسملی كتاب و نەجم ئیستقبال لە ئەستەنبۆڵ بە پێوانەی (١٧ × ٢٣) مانگانە دەرچووە[١٤].

سەرچاوەیەكیش وێڕای ئاماژەكردن بە بەرپرس و ژمارەكانی (١ – ٥ – ١٠) و شوێنی چاپ و قەوارە و شوێنی هەڵگرتنی گۆڤارەكە لە تێبینییێكدا دەنووسێت: بـەپێی كەتـەلۆگی كتێبخانـەی میللـی تـەنیا ژمـارە (٦ – ٧) نییـە[١٥]. ئـەوە لـە كاتێكدا هیچ ئاماژەیەكی بە ژمارەكانی (٨ – ٩) نەكردووە، كە لەو شوێنەدا هەبن یان دەرچووبن!

بەپێی یاسای پەیڕەوكراو حكومەت بۆی هەبوو، هەر شـتێ بـەدژی دەوڵـەت چـاپ كرابێـت، چ سەرنووسـەر و چ خـاوەن وتارەكـە و چـاپخانەكەش بگـرن و بیاندەنە دادگا[١٦].

لە پەراوێزێكدا لە چاپی نوێی بەرهەمەكانی جەباری، زەنگەنـە ئامـاژە بـەوە دەكات كە "دوای تێپەڕبوونی مانگێـك بەسـەر دەرچـوونی گۆڤـاری (ڕۆژی كـورد)، هەروەها دەرچوونی (٣) ژمارە لە بڵاوكراوەیەكی دیكە بەناوی (یـەكبوون)، ژمـارە (١)ی (هەتاوی كورد لە ٢٤ی تشرینی یەكەمی ١٩١٣ بڵاوكرایەوە، ژمـارە (١٠)یـش لـە تـەمموزی ١٩١٤ دەرچـووە، واتـە وەسـتانی هـیچ پەیوەندییـەكی بـە شـەڕی (یەریڤان) [بەلقان]ەوە نییە بەڵكو لە ئەنجامی هەڵگیرسانی شەڕی یەكەمی گێتـی و چوونی ئەندامانی (جڤاتا هێڤی فەقێی كوردان) بووە بۆ بەرەكانی شەڕ"[١٧].

سدیق ساڵحیش سەبارەت بـە (هـەتاوی كـورد) لـە وتـارێكی تێـر و تەسـەلدا ئاماژە بەوە دەكات كە (هەتاوی كورد) گۆڤارێكی كوردی – توركی تـا ژمـارە (٣) مانگانـە و لـەوە بـەدوا تـا دوا ژمـارە نیـو مانگانـە (١٥ ڕۆژ جارێـك) دەرچـووە، كۆمەڵەی هێڤی لە ئەستەنبۆڵ دەریكردووە و لەگەڵ ئاماژەكردن بە ژمـارە و ڕۆژی دەرچوونی بە كۆچی و ڕۆمی دەڵێت ((هەمان تەكنیكی دەرهێنـانی "ڕۆژی كـورد" لەمیشـدا پـەیڕەو كـراوە)) سـێهەم گۆڤـاری كوردییـە كـە وێنـەی بڵاوكردبێتـەوە. "گۆڤارەكە هەمان قەوارەی دوا ژمارەی (٤) (ڕۆژی كورد)ی هەیە، واتە پێوانەكەی بەردەوام (١٥,٥ × ٢١,٥سم)ە هەردوو ژمارەی (٤ – ٥) كە گۆڤارەكەی تێدا بـووە بەنیو مانگانە، پێكەوە بە بەرگێك دەرچوون. نازانرێـت ژمارەكـانی (٦، ٧، ٨، ٩)

كەی بڵاوبوونەتەوە. ئەوەندە هەیە مادام كەوتوونەتە نێوان ١٠/٥/١٩١٤ی ڕۆژی دەرچوونی ژمارە (٤ – ٥) و ٢٠/٦/١٩١٤ی ڕۆژی دەرچوونی ژمارە (١٠)، دەبێت لەو ماوەی ٤٠ ڕۆژەدا بە دوو جار لە دوو بەرگدا، واتە (٦ – ٧) و (٨ – ٩) پێكەوە دەرچووبن. ژمارە (١٠)، حوزەیرانی ١٩١٤ دەرچووە، ئەگەر هەمان هەلومەرجی ئەو چوار ژمارەیەی دوایی گۆڤارەكە فەراهەم بووین، ڕەنگە دەرفەت هەبووبێ لەماوەی مانگێك زیاتری لەوە بەدوادا تا ٢٨/٧/ كە یەكەمیی جەنگی جیهانی تێدا ڕاگەیاندرا، ژمارەیەكی تریش بڵاوبووبێتەوە، ئەمجا وەستابێ! چونكە ئیتر دەوڵەتی عوسمانی هاوپەیمانی ئەلمانیا هەر لەسەرەتاوە بەشداری ئەو جەنگە بوو و كەوتە بەسەربازگرتنی خەڵك، سەرانی هێڤی هەر لەوەی تر كرانە سەرباز و برانە بەرەكانی شەڕ و، دارایی و ئەرشیفی كۆمەڵەكەیش سپێردران بە عەبدولعەزیز بابان تا بیپارێزێ"[١٨].

پاشان وێڕای خستنەڕووی وێنەی بەرگی ژمارەكانی (١ و ٢ و ١٠)، ناوەڕۆكی ژمارەكانی (١ و ٢ و ٤ – ٥ و ١٠)ی بەردەستی لەڕووی قەوارەی لاپەڕەكانی بە كوردی و توركی و پاشان ناوەڕۆكی ژمارەكانی خستۆتە ڕوو[١٩].

وادیارە ئەویش پێی وابووە گۆڤاری (هەتاوی كورد) (١٠) ژمارەی لێ دەرچووە بەو لێكدانەوەی كە خۆی كردوویەتی و ئاماژەی پێكرا.

لەدوای (ڕۆژی كورد)، (هەتاوی كورد)، دەستی بەدەرچوون كردووە، خاوەنی ئیمتیاز و بەڕێوەبەری بەرپرسی عەبدولعەزیز بابان بووە و ژمارە (١) لە (٢٣ی زیلقەعدەی ساڵی ١٣٣١ كۆچی/ ١١ی تشرینی یەكەمی ١٣٢٩ی ڕۆمی (٢٤ی تشرینی یەكەمی ١٩١٣)، دەرچووە و ئەو ژمارەیەی وێنەی ئەورەحمان پاشای بابانی بەسەرەوەیە[٢٠].

هەروەك (زنار سلوپی – قەدری جەمیل پاشا) ئاماژەی پێكردووە تا هەڵگیرسانی شەڕی یەكەمی جیهان و بانگكردنی سەربازانی یەدەگ لەساڵی ١٩١٤ گۆڤارەكە وەستاوە و نووسەرانی بۆ سەربازی داواكراون[٢١].

تەنانەت ڕۆژنامەی (ژاماناك)ی ئەرمەنی ئاماژەی بەوە كردووە كەوا نووسەرێكی دیاری وەك ساڵح بەدرخان (١٨٧٤ – ١٩١٥) وتاری لەدژی دەوڵەت نووسیوە، ئەوا گیراوە[٢٢].

لێرەدا ئەوەی یەکلابووەتەوە سەبارەت بە گۆڤاری (ڕۆژی کورد)، ئەوا هەر چوار ژمارەکەی بەردەستە و بەم شێوەیە بووە:

| ژمارە | مێژووی دەرچوونی بەکۆچی | مێژووی دەرچوونی بە ڕۆمی | مێژووی دەرچوونی بە زایینی |
|---|---|---|---|
| ١ | ١٤ی رەجەبی ١٣٣١ | ٦ی حوزەیرانی ١٣٢٩ | ١٩ی حوزەیرانی ١٩١٣ |
| ٢ | ١٤ی شەعبانی ١٣٣١ | ٦ی تەمموزی ١٣٢٩ | ١٩ی تەمموزی ١٩١٣ |
| ٣ | ١١ی رەمەزانی ١٣٣١ | ١ی ئاغستۆسی ١٣٢٩ | ١٤ی ئابی ١٩١٣ |
| ٤ | ١٠ی شەوالی ١٣٣١ | ٣٠ی ئاغستۆسی ١٣٢٩ | ١٤ی ئەیلوولی ١٩١٣[٢٣] |

**گۆڤاری هەتاو:**

لەبەر ئەوەی هەموو ژمارەکانی گۆڤاری هەتاو بەردەست نەبوون، جۆرێك لە ئالۆزی و ناڕوونی لە راستی و دروستی ژمارەکانی ئەم گۆڤارەدا هەیە، دەبینین لە ژمارە (٤) ەوە دەبێتە (٤ – ٥) دواتریش یەکسەر دەبێتە ژمارە (١٠) بێ ئەوەی ماوەیەکی گونجاو و لەبار هەبێت، بەپێی ئەو زانیارییانەی کە تا ئێستا لەسەر بەرگی ئەم ژمارانەی گۆڤاری (هەتاوی کورد) بەردەستن[٢٤].

بۆیە بۆچوونێك لای ئێمە دروست بووە، کە دەبێت ئەو گۆڤارە (هەتاوی کورد) تەواوکەری گۆڤاری (ڕۆژی کورد) بێت، ئەوەبوو وتارێکی کورتمان لەبارەیەوە نووسی و راکەی خۆمان لەبارەیەوە دەربڕی[٢٥].

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی بابەتەکە ئەوا ژمارە بەردەستەکانی گۆڤاری (هەتاو)یش بە هەرسێ مێژوو دەخەینە بەرچاو، وەك چۆن لەسەر بەرگی گۆڤارەکە نووسراوە، بەڵام بەڕێنووسی ئەمڕۆ:

| ژمارە | مێژووی دەرچوونی بەکۆچی | مێژووی دەرچوونی بەڕۆمی | مێژووی دەرچوونی بەزایینی |
|---|---|---|---|
| ١ | ٢٣ی زیلقەعدەی ١٣٣١ | ١١ی تشرینی یەکەمی ١٣٢٩ | ٢٤ی تشرینی یەکەمی ١٩١٣ |
| ٢ | ٤ی موحەڕەمی حەرام ١٣٣٢ | ٢١ی تشرینی دووەمی ١٣٢٩ | ٤ی کانوونی یەکەمی ١٩١٣ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣ | ١٣ی سەفەری خێر ١٣٣٢ | ٢٩ی کانوونی یەکەمی ١٣٢٩ | ١١ی کانوونی دووەمی ١٩١٤ |
| ٤ | ٥ی جەمادی یەکەمی ١٣٣٢ | ١٩ی مارتی ١٣٣٠ | ١ی نیسانی ١٩١٤ |
| ٥ – ٤ | ٢٧ی جەمادی ئاخر ١٣٣١ | ١٠ی مایسی ١٣٣٠ | ٢٣ی مایسی ١٩١٤ |
| ١٠ | ٩ی شەعبانی ١٣٣٢ | ٢٠ی حوزەیرانی ١٣٣٠ | ٣ی تەممووزی ١٩١٤[٢٦] |

ئەوەی مایەی سەرنجە گۆڤاری (هەتاوی کورد) راستەوخۆ لە مانگی دواتر دەرچووە، واتە ژمارە (٤) و دوا ژمارەی (ڕۆژی کورد) لە ١١ی ئەیلوولی ١٩١٣ بووە، یەکەم ژمارەی گۆڤاری (هەتاوی کورد)یش لە (٢٤ی تشرینی یەکەمی ١٩١٣) دەرچووە، واتە لەسەر هەمان داروپەردووی (ڕۆژی کورد)ەوە، تەنانەت هەموو لایەنەکانی بە نەخشەسازیشەوە کتومت گۆڤاری (ڕۆژی کورد)ە، تەنیا ناوی خودانی ئیمتیاز و بەڕێوەبەری بەرپرسی گۆڕاوە.

لەبەر ئەوەی بۆ ساخکردنەوەی ژمارەکانی لێکدانەوەی ماوەی نێوانی دەرچوونی ژمارەکان گرنگە، وا ماوەی هەردوو ژمارە دەردەخەین بۆ ئەوەی لە مەبەستەکەمان نزیك ببینەوە. کەمترین ماوەی دەرچوونی ژمارەکان لەنێوان ژمارە (١ و ٢) و (٥ – ٤) و (١٠) دایە کە (٤١) ڕۆژە، درێژترین ماوەش (٨٠) ڕۆژە لەنێوان ژمارە (٣ و ٤)، بەڵام لەوەش گرنگتر و جێی سەرنجە، ژمارە (٥ – ٤) کە لە ٢٣ی مایسی ١٩١٤ دەرچووە، ئەوا یەکسەر بە دوایدا ژمارە (١٠) دێت کە لە ٣ی تەممووزی ١٩١٤ دەرچووە، واتە ماوەیەکی وای بەبەرەوە نییە تێری دەرچوونی (پێنج) ژمارەی دیکە بکات! ![٢٧]. تەنانەت زەنگەنەش ئاماژە بەوە دەکات کە: "با خوێنەر و توێژەران سەرنج بدەنە مێژووی هەردوو ژمارە (٤) و (٥ – ٤)ی "هەتاوی کورد" – ەکە "[٢٨].

وێڕای ئەوە مێژووی دەرچوونی هیچ دوو ژمارەیەك لەیەك کاتی دیاریکراودا دەرنەچوونە، نە لە سەرەتای مانگ و نە لە کۆتایی مانگ، وا پێدەچێت هەر کە ژمارەکە ئامادەبووە نێردراوە بۆ چاپ بێ ئەوەی بۆیان بکرێ ڕەچاوی ئەو ماوەیە بکەن کە لەسەر بەرگی گۆڤارەکە ئاماژەیان پێکردووە.

لەو سۆنگەیەوە، بە هەموو لێکدانەوە و پێودانێك ئێمە وای بۆ چووین کە هەر دوو گۆڤاری (ڕۆژی کورد) و (هەتاوی کورد)، تەواوکەری یەکدین و سەرەنجامی بە یەك ژمارە (١٠) هەموو چۆتەوە سەر یەکدی. ئیدی ئەوا ژمارەکانی هەردوو گۆڤارەکە بەمێژووی زایینی، بۆ ئەوەی تەواو لەبیری خوێنەردا چەسپ بێت:

وێڕای ئەمانەش، لەدوای دەرخستنی ژمارەکانی (١ و ٢ و ٣ و ٥ – ٤ و ١٠)، هەندێ زانیاریی دیکەمان کەوتە بەردەست بەم جۆرە: ئەوا لە (ل ١٧)ی ژمارە (١٠)دا بەم سەردێرە نووسراوە: "روژناوەء **(ڕۆژنامە، توێژەر) مە سال خولی یکی دقە دینە** = ڕۆژنامەی ئێمە ساڵ خولی یەکەم تەواو دەکات"، پاشان دەنووسێت: " رند درکتنی سال تی لسر همت و غیرتە کردا مایە. ژی وی پاشوندا ڕۆژناوە ژی پانزدە روژاندە جارك وی درکەوە، قیمتی آبونە سی تریو (غروش) بویە. لی رویی دنیی تنی روژناوەکی کردا هایە لی رغبت کرن، آبونە بویین لی سر حمو کردارا فرضە. ابونەمان سالی چونی حوجی یە کویونا سال تە ژی روکی بری قیمتی وی بشیتن، لهف آنین ژی خدی، رغبت ژی حمیت کردا، خبات ژی مە جان کردا"[29]

بە گشتی واتە (دەرچوونی بەرێکوپێکی ساڵانە لەسەر هیمەت و جوامێری کوردان وەستاوە، لەمەودوا ڕۆژنامە پازدە ڕۆژان جارێك دەردەچێت، نرخی بەشداری ئابوونە (قوروشە)، لە رووی دنیادا تەنیا ڕۆژنامەیەکی کوردان هەیە، بۆیە ئارەزووی ئابوونەدان لەسەر هەموو کوردان ئەرکە).

هەروەها بەناوی (پۆزش – اعتذار)یش نووسیویە:

"ژی هنك سببی روژناوەء مە درنك ما، ام عفو خوانندەء خوناهی وی دیکن و ژی **سال دو دویا بیوە** رند درخستنا خو راپرس دیدین"، واتە (لەبەر هەندێك هۆ ڕۆژنامەی ئێمە درەنگ دەرچوو، ئێمە داوای لێبووردن لە خوێنەرانی دەکەین و بەهیواین و بەڵێن دەدەین لە ساڵی دووەم را بەرێکی دەربچێ).

هەمان ئەو وتانە بەتورکیش لە (ل١)دا نووسراوە، تێیدا هیواخوازە کە لە ساڵی دووەمیدا، گۆڤارەکە بەرێکوپێکی دەربچێت[30].

ئەمەش بەڵگەیەکی بێ چەند و چوون و زۆر بە ئاشکرا و روونی یەك ساڵ و یەك خولی گۆڤارەکە دەردەخات واتە لە حوزەیرانی ١٩١٣ یەکەم ژمارەی (ڕۆژی کورد)ەوە تا تەمموزی ١٩١٤ دوا ژمارەی (هەتاوی کورد).

لەلایەکی دیکەوە لەبابەتێکی دیکەدا بەناوی (بۆ ڕای گشتی کورد)دا (هەتاوی کورد) نووسیویە: "ریسالەکەمان دوای دەرچوونی سێ ژمارەی دیکە ساڵی یەکەمی پەخش و دەرچوونی خۆی تەواو دەکات. لە ساڵی دووەمی دەرچوونیدا گۆڤارەکە لەباتی مانگێك جارێك هەموو پانزە ڕۆژ یەك جار بەشێوەیەکی ڕێکوپێك دەردەچێ..."[31].

لە بڕگەی دواییشدا دەنووسێت: "لە کۆتاییدا داوا لە زانا و شێخ و خوێنەوار و ڕۆشنبیرانی کورد دەکەین کە بەر لەوەی بکەوینە ساڵی دووەمی پەخشی گۆڤارەکەوە پارەی بەشداربوونی ساڵانەمان بۆ بنێرن" هەمان سەرچاوە مالمیسانژ، ل ٣٦٧.

لێرە بە ڕوونی باس لە ساڵی دووەمی گۆڤارەکە دەکات واتە بە (ڕۆژی کورد)یشەوە کە ژمارەی (١)ی لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩١٣ دەرچووە و ئەو ژمارەیەش کە ئەوەی تێدا بڵاوکراوەتەوە (٤ – ٥) لە ٢٣ مایسی ١٩١٤ لەگەڵ ئەوەی بەڵێنیان داوە کە لە مەودوا پازدە ڕۆژ جارێك دەردەچێ، بەڵام ئەمەشیان بۆ نەچووەتە سەر، بەڵکو ژمارەی داهاتوو (١٠) لە ٣ی تەمموزی ١٩١٤ دەرچووە، تەنانەت ئەم جارە (٤٠) ڕۆژی پێچووە تا دەرچووە.

د. جەلیلی جەلیل پێی وایە (هەتاوی کورد) بەردەوامی (ڕۆژی کورد)ە. بە وەرگرتن لە جەلیلی جەلیل، ڕاپەڕینەکانی کورد لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، ل ٧٥.

ئەو ئاگادارییەی کە لە ژمارە (٤ – ٥)ی (١٠ی مایسی ١٣٣٠) (هەتاوی کورد)دا بڵاوکراوەتەوە، جارێکی دیکەش بەهەمان سەردێر (بۆ ڕای گشتی کورد) لە ژمارە (١٠)ی ٢٠ی حوزەیرانی ١٣٣٠دا ئاماژەی پێکراوە، دەڵێت: "لە ژمارەی پێشووشدا باسی ئەوەمان کردبوو کە لە ساڵی دووەمی چاپ و بڵاوکردنەوەی گۆڤارەکەماندا، هەر پانزە ڕۆژ جارێك گۆڤارەکە دەردەکەین"[32].

ئەمە بە ڕوونی دەریدەخات کە لە نێوان ژمارە (٤ – ٥) و ژمارە (١٠)دا هیچ ژمارەیەکی دیکە دەرنەچووە.

توێژەرێك نووسیویە دوو ژمارە بەناوی (هەتاوی کورد) دەرچووە[33].

تـا ئـەو دەمـەی کۆمەڵـەی ((هێڤـی)) بـەردەوام بـوو، گۆڤـاری (هـەتاوی کورد)یش دەردەچـوو، بـەڵام لەگـەڵ سـەرەتای بـانگکردنی یـەدەگ بـۆ سـەربازی لەساڵی ١٩١٤، لە سوپا، زۆربەی نووسەرانی گۆڤارەکەش راپێچ کران، بۆیـە ئیـدی نەتوانرا گۆڤارەکە دەربکرێ[٣٤].

ئیدی لەگـەڵ هەڵگیرسـانی جـەنگی یەکـەمی جیهـانی و راپێچـانی خـەڵك بـۆ بەرەکانی شەڕ، دەستەی نووسینی (هـەتاوی کـورد)یش کەوتـە بـەر ئـەو شـاڵاوە، هەروەك سەرچاوەکان ئاماژەی پێدەکەن بۆ ئەوەی خوێنەران و توێژەران کەڵك لە بابەتەکانی گۆڤاری (هەتاوی کورد) وەربگـرن، دیـارە (ڕۆژی کـورد) ئـەوەی نـاوێ چونکە هەموو ژمارەکانی لەبەردەستن[٣٥].

لـــە دوای بەدەســـت خســـتنی ژمارەکـــانی (١ و ٢ و ٣ و ٥ – ٤ و ١٠) بیبلۆگرافیایەك بۆ ئەو ژمارانەی بەردەستمان دەکەین[٣٦].

| ڕۆژی کورد | مێژووی دەرچوونی بەزایینی |
|---|---|
| ١ | ١٩ی حوزەیرانی ١٩١٣ |
| ٢ | ١٩ی تەمموزی ١٩١٣ |
| ٣ | ١٤ی ئابی ١٩١٣ |
| ٤ | ١٤ی ئەیلوولی ١٩١٣ |
| هەتاوی کورد | |
| ١ | ٢٤ی تشرینی یەکەمی ١٩١٣ |
| ٢ | ٤ی کانوونی یەکەمی ١٩١٤ |
| ٣ | ١١ی کانوونی دووەمی ١٩١٤ |
| ٤ | ١ی نیسانی ١٩١٤ |
| ٥ – ٤ | ٢٣ی مایسی ١٩١٤ |
| ١٠ | ٣ی تەمموزی ١٩١٤ |

## ئەنجام

لە ڕێڕەوی ئەم توێژینەوەدا گەیشتینە ئەو ئەنجامەی كەوا دەركردنی هەردوو گوڤاری (ڕۆژی كورد) و (هەتاوی كورد) لەلایەن كۆمەڵەی هێڤی خوێندكارانی كوردەوە، كە یەكەمیان چوار ژمارە و دووەمیان (٦) ژمارە، لە حوزەیرانی ١٩١٣ تا حوزەیرانی ١٩١٤ ێ دەرچووە، بەڵام ئەوەی دووەمیان تەواوكەری یەكەمە، هەر بۆیە لە دوا ژمارەدا (١٠)، كە لە حوزەیرانی ١٩١٤ دەرچووە، بە نووسینی ڕوونكردنەوە و بەڵێندان بەڕێكوپێكی دەركردن و پۆزش هێنانەوە، باس لە تەواوبوونی ساڵێكی تەمەنی دەكات، دیارە ساڵەكەش لە حوزەیرانی ١٩١٣ كە یەكەم ژمارەی (ڕۆژی كورد) دەرچووە و تا تەمووزی ١٩١٤. تەنانەت ئەو ساڵەی دامەزراندنی (هەتاوی كورد) كە لەسەر ژمارە (١) تا (٥ – ٤)یدا نووسراوە (تأریخ تأسیسی غرەء ذی القعدة ١٣٣١ = تشرینی اول ١٣٢٩ = تشرینی یەكەمی ١٩١٣)، لابراوە و هەروەها لەجیاتی ژمارە (٥) بە تەنیا لەسەر بەرگی نووسراوە (٥ – ٤) كە لە مایسی ١٩١٤ دەرچووە.

سەربارى ئەوەش ئەو ماوەیەی ئەو ژمارانەی (هەتاوی كورد)ی تێدا دەرچووە، بەشی ئەوە ناكات ئەوەندە ژمارەیە دەربچێت، تەنانەت لە ڕووی نەخشەسازی و دەرهێنانی گۆڤارەكەشەوە هەمان شێوازی (ڕۆژی كورد)ە، بۆیە بەدڵنیاییەوە، (هەتاوی كورد) تەواوكەری (ڕۆژی كورد)ە.

## پاشکۆ

پێڕستی ناوەڕۆکی ژمارەکانی

(١، ٢، ٣، ٥ – ٤، ١٠) گۆڤاری هەتاو

**ژمارە (١)**

سەر بەرگ: وێنەی ئەوڕەحمان پاشا لە میرەکانی بابان.

بەرگی ناوەوە: عثمانلی تسهیل مصالح اداره خانەسی – اعلان.



**ژمارە ٢**

سەر بەرگ ، وێنەی خێزانێکی کورد لە شام، ئەستەنبۆڵ، چاپخانەی رەسملی کتاب ١٣٢٩

بەرگی ناوەوە: عثمانلی تسهیل مصالح اداره خانەسی

اعلان

بەرگی ناوەوە: هەمانە وێنەی خێزانە کوردەکە و زانیارییەکان دووبارەن

**اجتماعي:**



**تاريخي:**



**ادبی:**



**ژمارە ٣**

سەر بەرگ: وێنەی خوالێخۆشبوو ئیسماعیل حەقی بابان

**ژماره ۱۰**

## پاشکۆی وێنەی بەرگی گۆڤاری هەتاو

**کوردێکی یەك ڕەنگ، دیاری ژمارە هەتاوی کورد، ڕۆژنامەنووس، ژمارە (١٣) بەهاری ٢٠٠٨، ل (١٥ – ٢٢).**


هتاوكرد



# هتاوكرد

صاحب امتياز
ومدير مسئول :
بابانه عبدالعزيز

عدد : ۳

تاريخ تأسيسى :
غرهٔ ذى القعده
۱۳۳۱

درج اولنميان آثار اعاده اولنماز
ژماره : ۳

۱۳ صفر الخير سنه ۱۳۳۲ شيمديلك آيده بر نشر اولونور ۲۹ كانون اول سنه ۱۳۲۹

مرحوم بابان زاده اسماعيل حقى بك

**پەراوێز و سەرچاوەکان:**

(1) د. عبدالفتاح علي البوتاني، دراسات في تاريخ الكورد والعراق المعاصر، دار سپیرێز للطباعة والنشر، مطبعة حاجی هاشم – اربيل، ٢٠٠٧، ص ١٣٥.

(2) (بۆ زانیاری پتر بڕوانە: کوردستان یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی ١٨٩٨ – ١٩٠٢، کۆکردنەوە و پێشەکی: د. کەمال فوئاد، چاپی سێیەم، دەزگای چاپ و پەخشی بەدرخان، تاران، ٢٠٠٦.

(3) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: مالمیسانژ، جەمعییەتی تەعاون و تەرەقی کورد و ڕۆژنامەکەی، لە تورکییەوە وەرگێڕانی: زریان ڕۆژهەلاتی، پێداچوونەوەی: سدیق سالح، بنکەی ژین بۆ بووژانەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی، چاپخانەی دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل١٥.

(4) بۆ زانیاری پتر لە بارەیانەوە بڕوانە: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا، چ. کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨، ل٢٣١" ڕۆژی کورد گۆڤاری جڤاتی "هێڤی قوتابیانی کورد ١٩١٣ ئەستەموڵ، ئامادەکردن و لێکۆڵینەوەی: عەبدوڵلا زەنگەنە، پێشەکی: د. ئیسماعیل شوکر. بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٥. جەمال خەزنەدار، ڕۆژی کورد ١٩١٣، بلاوکردنەوە و پێشەکی و لەسەر نووسین، زنجیرە (٣) ژیانەوەی گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردی، چاپخانەی (المؤسسة العراقية، بەغدا، ١٩٨١).

(5) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: عەبدوڵلا زەنگەنە، هەمان سەرچاوە ل ٨٤ – ٨٦" ساخکردنەوەی ناسنامەی خاوەنی (ڕۆژی کورد – ١٩١٣)، ڕامان (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (٥٦)، ٥ی شوباتی ٢٠٠١، ل ١٩٨ – ٢٠٧.

(6) ڤ.ف. مینورسکی، الاکراد ملاحظات وانطباعات، ترجمه وعلق عليه وقدم له الدكتور معروف خزندار، مطبعة النجوم، بغداد، ١٩٦٨، ص ٤٤. چاپی ڕووسی ئەو کتێبە لەساڵی ١٩١٥ دەرچووە، ناوەڕۆکەکەشی لەمایسی ١٩١٥ وەك موحازەرە پێشکەش کراوە. بڕوانە: نفس المصدر، بەرگی ناوەوە، ص١٢.

(7) سەرجەمی بەرهەمی محەمەد ئەمین زەکی بەگ، خولاصەیەکی تأریخی کورد و کوردستان لە زۆر قەدیمەوە تا دەوری ئەمڕۆ، ئامادەکردنی: ڕەفیق سالح، بنکەی ژین، چ. وەزارەتی پەروەردە، سلێمانی ٢٠٠٦، ل ٢٣٦.

(8) عەلائەدین سجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، چ١، بەغدا، ١٩٥٢، ل ٥٥٢.

(9) بڕوانە محەمەد تۆفیق وردی، ڕۆژنامەگەری لە کوردستانا، "ڕووناکی" (گۆڤار)، بەغدا، ژمارە (٢٩)، ٣ی تەشرینی یەکەم ١٩٦٩، ل٤١.

(10) عبدالجبار محمد جەباری، مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی، چ. ژین، سلێمانی، ١٩٧٠، ل١٤٨.

(١١) جەلیلی جەلیل، هەندێ سیمای ژیانی كۆمەڵایەتی...... ل ٨٧.

(١٢) مالمیسانژ، جڤاتا هێڤی تەلەبەیێ كوردان (١٩١٢ – ١٩٢٢)، لە توركییەوە وەرگێڕانی: زریان ڕۆژهەڵاتی، پێشەكی و پێداچوونەوە: عەبدوڵڵا زەنگەنە، بنكەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل ٢٢٠.

(١٣) Malmîsanij & Mahmüd Lewendî, Li Kurdistana Bakur û li Tirkyiyê RojnaMegeriya KURDI (1908 - 1981) JN weşanên jînaNû uppsala, 1989, r. 60-64.

(١٤) .. بڕوانە:

Hasan Duman, Osmanl - Türk Süreli YayInlar Ve Gazeteleri (1828 - 1928), Cilt -2, Ankara, 2000, 1. 375 - 376.

(١٥)MEHMET BAYRAK, KüRt SORUNU VE DEMOKRATiK ÇÖZÜM, 416.

(١٦) كیسوت چاپەمەنی ئەندۆل، تیفلیس ١٩٢٢، ل١٤ (ب ڕووسی)، بە وەرگرتن لە: جەلیلی جەلیل، هەندێ سیمای ژیانی كۆمەڵایەتی..... ل٨٧.

(١٧) هەمان سەرچاوە ل ١٣٥ – ١٣٦ پەراوێز.

(١٨) بڕوانە: سدیق ساڵح، (ڕۆژی كورد) و (هەتاوی كورد) زانیاریی نوێ بۆ یەكەم جار، "كوردستانی نوێ"، ژمارە ٢٤٨٨، ٢٠٠١/٦/٢٥، ل٨. ئەو وتارەی سدیق ساڵح بە دوو بەش لە هەردوو ژمارەی (٢٤٨٧، ٢٠٠١/٦/٢٤، ٢٤٨٨، ٢٠٠١/٦/٢٥)، لە ڕۆژنامەی كوردستانی نوێ بڵاوكراوەتەوە.

(١٩) بڕوانە: هەمان سەرچاوە.

(٢٠) هتاو كرد، عدد (١)، (٢٣ ذی العقدة سنة ١٣٣١/ ١١ی تشرین اول ١٣٢٩).

(٢١) قەدری جەمیل پاشا (زنار سلوپی)، دۆزی كوردستان، وەرگێڕانی فەیزوڵڵا برایم خان – بارزان وەهاب، وەزارەتی ڕۆشنبیری هەرێمی كوردستان – دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی بیر، چ٣، دیار بەكر، ٢٠٠٧، ل ٤٦.

(٢٢) بە وەرگرتن لە جەلیلی جەلیل، هەندێ سیمای ژیانی كۆمەڵایەتی... ل٨٧.

(٢٣) بڕوانە: ڕۆژی كورد گۆڤاری جڤاتی هێڤی قوتابیانی كورد ١٩١٣ – ئەستەموول، ئامادەكردن و لێكۆڵینەوەی: عەبدوڵڵا زەنگەنە، بنكەی ژین، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٨٠، جێی ئاماژەیە ژمارە (٣) مێژووی ڕۆمییەكەی هەڵەیە دەبێ (١)ی ئاغستۆس بێت. وەك پێشتریش ئاماژەی پێكرا، بەهۆی هەندێ وتارەوە، (ڕۆژی كورد) داخراوە و خاوەنەكەی گیراوە. لە دوای (ڕۆژی كورد)، گۆڤارێكی دیكە هەر لە لایەن ئەو كۆمەڵەیەوە دەردەچێت، بەڵام بە خاوەنییەتی ئیمتیاز و بەرپرسی (عەبدولعەزیز بابان)، ژمارە (١) ئەم

گۆڤارە (لە ٢٣ی ذیلقەعدەی ١٣٣١/ ١١ی تشرینی یەکەمی ١٣٢٩/ ٢٤ی تشرینی یەکەمی ١٩١٣) دەرچووە. بڕوانە: "هتاو کرد" (گۆڤار)، ئەستەنبوڵ، ژمارە (١)، ٢٣ ذی القعدة سنة ١٣٣١/ ١١ تشرین اول ١٣٢٩ (بەرگ).

(٢٤) بڕوانە: کوردێکی یەکڕەنگ، دیاری ژمارە: هتاو کرد، "ڕۆژنامەنووس" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (١٣)، بەهاری ٢٠٠٨، ل ١٥–٢١.

(٢٥) بڕوانە: د. ئازاد عوبێد سالّح، ئەوەش دەستەچیلەی من بۆ ساخکردنەوەی ژمارەکانی گۆڤاری هتاو کرد، "ڕۆژنامەنووس"، ژمارە (٢٣ و ٢٤) زستانی ٢٠١١، ل ١٥٣ – ١٥٥. بەڵام هەر ئەوکات عەبدوڵڵا زەنگەنە، لوت و بزوت کورتە وەڵامێکی بەناوی "لە پەراوێزی دەستەچیلەکەی د. ئازاد عوبێد سالّح دا"، بە دەمارگرژییەکی زۆرەوە نووسی و بەدوای وتارەکەی مندا بڵاوی کردبووەوە. بۆ زانیاری پتر بڕوانە: عەبدوڵڵا زەنگەنە، لە پەراوێزی دەستەچیلەکەی (د. ئازاد عوبێد سالّح)دا، "ڕۆژنامەنووس" ژمارە (٢٣ و ٢٤)، زستانی ٢٠١١، ل ١٥٦. وێڕای هەندێ پەلاماری ناڕەوا، بە هەندێ پاساو سەرلەبەری بۆچوونەکانی ئێمەی ڕەت کردووەتەوە و نووسیویە: ( ............ بەڵێ ئێوە لەم لێکدانەوەتان سەرچیغ چوونە و ژمارەکانی ئەو (هەتاوی کورد)ە، لەلایەنی ژمارەوە. درێژە پێدەری (ڕۆژی کورد) نییە، بەڵکو گۆڤارێکە بە هەموو لێکدانەوەیەك دەبێ بەلای کەمییەوە هەر (١٠) ژمارەکەی لێ دەرچووبێ، ........). عەبدوڵڵا زەنگەنە، لە پەراوێزی دەستەچیلەکەی ....... ل١٥٦.

(٢٦) بڕوانە: کوردێکی یەکڕەنگ، دیاری ژمارە: هتاو کرد، ل ١٧ –٢٢.

(٢٧) بڕوانە: د. ئازاد عوبێد سالّح، ئەوەش دەستەچیلەی من........ ل ١٥٤.

(٢٨) بڕوانە: عەبدوڵڵا زەنگەنە، "مژدە"یەکی خۆشی دیکەی ڕۆژنامەنووسی کوردی، "بەدرخان" (ڕۆژنامە)، هەولێر، ژمارە (٨٨)، ٢٢ی کانوونی یەکەم ٢٠٠٨، ل٢١. [ئەو ژمارە (٤)ە لە کتێبخانەی (ڕەشید باجەلان) لەلایەن بەهارخانی کچی ڕەشید باجەلان دۆزراوەتەوە].

(٢٩) بڕوانە: "هتاو کرد"، ژمارە (١٠)، ٩ شعبان ١٣٣٢/ ٢٠ حزیران ١٣٣٠ (٣ی تەممووزی ١٩١٤) دیوی ناوەوەی بەرگی دوایی.

(٣٠) بڕوانە: هتاوی کرد، ژمارە (١٠)، ٩ی شعبان ١٣٣٢/ ٢٠ حوزەیران ١٣٣٠ (٣ی تەممووزی ١٩١٤). ل. دیوی ناوەوەی بەرگی کۆتایی.

(٣١) هتاو کرد، (٥ – ٤)، ١٠ مایس ١٣٣٠ [ ٢٣ مایس ١٩١٤ ]" مالمیسانژ، ل ٣٦٦.

(٣٢) مالمیسانژ ل ٣٨٧ بە وەرگرتن لە ژمارە (١٠)ی هەتاو لاپەڕەی دیوی ناوەوەی بەرگی یەکەمی گۆڤارەکە.

(٣٣) (فـاروق عـەلی عومـەر)، ڕۆژنامەگـەریی كـوردی عێـراق بەراییـەكان ١٩١٤ – ١٩٣٩، تـاریق كـارێزی كردوویـە بـە كـوردی، عەبـدوڵڵا زەنگەنـە دەقـە ڕۆژنامەوانییـە كوردییـەكانی سـاغ كردووەتـەوە، دەزگـای چـاپ و بڵاوكردنـەوەی موكریـانی، چ ١، چ. وەزارەتـی پـەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١، ل ١٨٢.

(٣٤) قەدری جەمیل پاشا (زنار سلوپی)، دۆزی كوردستان، ل٤٦.

(٣٥) بڕوانە: عەبدوڵڵا زەنگەنە، ڕۆژی كورد، سەرچاوەی پێشوو.

(٣٦) بێگومان عەبدوڵڵا زەنگەنە زۆر لەمێژە خـەریكی ئامـادەكردن و لێكۆڵینەوەیـە لەسـەر ئـەم گۆڤارە، بەڵام دیارە هێشـتا تـەواو نـەبووە، ئـەو كـارەی ئێمـە لەگـەڵ هـی ئـەو جیـاوازە و ئەوەی ئەو تێر و تەسەلتر دەبێت. هەر لێرەش ئامـاژە بـەوەش دەكـەین كـە ئێمـە خۆمـان هەوڵمان دا بۆ دەستخستنی ژمارەكانی گۆڤاری (هەتاوی كورد) ئـەوە بـوو لەسـاڵی (٢٠١٣) گەیشـتنیە ئامـانج و ژمارەكانیمـان دەسـت خسـت، جگـە لـە ژمـارە (٤). كـە زەنگەنـە بەیارمەتی بەهارخانی ڕەشید باجەلان لە كتێبخانـەی ڕەشـید باجـەلان بـە دەسـتی هێنـا و یەكەم جار وەك ئاماژەی پێكرا لە ڕۆژنامەی بەدرخان بڵاوی كردەوە.

## ملخص البحث

يتناول هذا البحث تحقيق اعداد مجلة (هتاوى كورد – شمس الكرد) التي صدرت في استنبول عام ١٩١٣ – ١٩١٤ من قبل (جمعية هيوى طلبة الكرد)، وكانت هذه الجمعية قد أصدرت (٤) اعداد من مجلة اخرى قبلها باسم (روژى كورد) في حزيران ١٩١٣، وقد تم اغلاقها بعد زج صاحب الأمتياز في السجن، فقامت الجمعية بأبدال اسم المجلة الى (هتاوى كورد)، حيث صدر العدد الاول في تشرين اول ١٩١٣، الا انه في العدد (الخامس) بدل وضع العدد الخامس فقط كتب عليه العدد (٥ – ٤) في مايس ١٩١٤ ومن ثم جاء صدور عدد حزيران ١٩١٤ تحت رقم (١٠) مباشرة، ولكون الفترة من (مايس الى حزيران) غير كافية (لأصدار مجموعة اعداد من (٥ – ١٠)، هذا الى جانب مسح تأريخ تأسيس المجلة (تشرين اول ١٩١٣) على غلاف العدد العاشر، فضلاً عن ذلك فقد نشرت المجلة ( اعتذاراً وتوضيحاً يؤكدان على اكمال المجلة سنة من عمرها (من حزيران ١٩١٣ الى حزيران ١٩١٤) عليه فان مجلة (هتاوى كورد) تعتبر تكملة واستمرار لمجلة (روژى كورد) وقد صدر (١٠) اعداد منها خلال السنة.

## Abstract

The history of the Kurdish press is showing the political situation in Kurdistan because Kurdistan was always invaded and divided to different parts by enemies. They were never in possession of their own sovereignty. All kinds of reference to the Kurdish issue were prohibited and anyone who got any document or archive of any Kurdish release was arrested and killed by the respective authorities of the state in which they were living.

Therefore, the history of the Kurdish press is filled with examples of many problems and complexities. That is why there is a duty researchers have to heed and work on Kurdish press' history to figure out solutions for those problems. Hence, This research is dedicated for ensuring that the Kurdish magazine entitled by Hatawi Kurd which was being released by a group of Kurdish students named Hevi group, هێڤی (کۆمەڵەی) after the constitutional movement. At that time, this group has previously published another magazine named the Kurdish day (Roji Kurd, ڕۆژیکورد). In fact, four issues of that magazine were released in the end of the same year. However, they issued Hatawi Kurd on after the authorities prohibited any other issue of Roji Kurd from being published and shut it down.

There is disagreement and debate between researchers regarding the history of Kurdish press; Hatawi Kurd was published with issues numbers 1 through 4, the next issue's number was 4-5 and then immediately issue number 10 was published.

Finally, with sufficient documents and archives, I believe I can prove that Hatawi kurd was followed by Roji Kurd as its heir, rather than being two independent magazines; moreover, both of then published (10) numbers during (June 1913 – June 1914).

## بزاڤی

# خوێندن و زانستی ناوچەی قەرەداغ و خوێندنگە ئاینییەکانی

**پ.ی.د.ئاراس محەممەد ساڵح**
کۆلێجی زانستە ئیسلامییەکان
زانکۆی سلێمانی

## پێشەکی

لەگەڵ بڵاوبوونەوەی پەیامی ئیسلام لە کوردستاندا، وەك پێویستییەکی ئاینی لە زۆربەی ناوچە و گوند و شارەکانیدا، مزگەوت و حوجرە کراونەتەوە و، ئەمەیش هۆیەکی باش بووە بۆ گەشەکردنی خوێندن و خوێندەواری، بەهۆی ئەو هەستە پاك و پاڵنەرە ئاینییەی لە دڵ و دەروونی کوردا ڕەگی داکوتاوە ڕۆژ بەڕۆژ خەڵکەکەی زیاتر باوەشیان بۆ ئاینەکەیان کردووەتەوە و منداڵی خۆیان خستووەتە بەر خوێندن و لەسەر ئەرك و گیرفانی خۆیان ئەرکی پرۆسەی خوێندنیان بەڕێوەبردووە، هەرئەمەیش وایکردووە لە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا دەیان زانای گەورە و خوێندنگەی مێژوویی دەربکەون و، مێژووی ئەو زانایانە و خوێندنگە و دەستخەتەکانیان ئەمڕۆ لە کتێبخانەکانی جیهاندا شایەتی گەورە و ئاشکرای توانا و لێهاتوویی ئەو زانا گەورە و ئەو خوێندنگە زانستییانەن.

خوێندنگەی (دینەوەر) و زانا هەڵکەوتووەکانی و حەیدەرییەکان و ئەربیلییەکان و شارەزوورییەکان و ئامەدییەکان و بەرزنجی و مەردۆخی و جەلیزادە و قزڵجەیی و زەهاوی و دەیان و سەدان بنەماڵەی زانستیی تری کوردستان بەڵگەی ئاشکرای ئەو قسەیەن. هەموو کەسێکی بە ویژدان ئەمڕۆ داندەنێت بە گەورەیی و لێهاتوویی ئەو زانایانەدا کە لەڕۆژگاری خۆیاندا لەگەڵ هەموو نەبوونی هەژاری و دوورە دەستییەکدا توانیویانە لە ئاستە زانستییەکاندا سەربکەون، هەروەها لە وڵاتی خۆیاندا برەویان بە خوێندن و خوێندەواری داوە و

بیری میللەتیان ڕووناك کردووەتەوە و، توانیویانە لەگەڵ بەرەوپێشچوونی گەلانی تردا ئەمانیش هەنگاوی گەورە بنێن و لەو کاروانە دوانەکەون.

لەم نووسینەدا توێژەر هەوڵدەدات ئاماژەیەك بە پرۆسەی خوێندن و ڕۆشنبیری و خوێندنگە زانستییەکانی ناوچەی قەرەداغ بکات، ئەم ناوچەیە بە بەراورد بە ناوچەکانی تری کوردستان پرۆسەی زانستی تێدا لەئاستێکی لەپێشتردا بووە و زانای گەورەی تێدا هەڵکەوتووە و خزمەتیان بە خوێندن و ڕۆشنبیری کردووە لە ناوچەکەدا.

**گرنگیی توێژینەوە:** لێکۆڵینەوە لە مێژووی بزاڤی زانستی و مەعریفی لە کوردستاندا وەك پێویست لێکۆڵینەوەی لەبارەوە نەکراوە و، هەتا ئێستا کتێب و نووسین لەو بوارەدا لە ئاستی پێویستدا نییە، بۆیە ئەم جۆرە توێژینەوە و نووسینانە گرنگی و بایەخی تایبەتیی خۆیان هەیە. ناوچەیەکی گرنگی وەك قەرەداغ، کە هەر لە سەرەتای موسڵمانبوونی کوردەوە خوێندنگە و پرۆسەی خوێندنی تێدا بووە و، دەیان زانا و شاعیر و بەهرەمەندی تێدا هەڵکەوتووە، توێژینەوە لەسەر مێژووی پرۆسەی خوێندنی ئەو ناوچە گرنگە بایەخی تایبەتی خۆی هەیە.

**ڕێبازی توێژینەوە:** توێژەر هەردوو ڕێبازی مێژوویی بەڵگەنامەیی و سەرچاوەی مەیدانی پەیرەو دەکات لە نووسینی توێژینەوەکەیدا، لەبەر ئەوەی بەشی زۆری ئەو مێژووە گرنگە تۆمار نەکراوە، ناچار دەبێت پەنا بۆ ڕێبازی مەیدانی و چاوپێکەوتن لەگەڵ کەسانی شارەزای خەڵکی ناوچەکە بەرێت.

## سەرەتایەك دەربارەی ناوچەی قەرەداغ

ناوچەی قەرەداغ یەکێکە لە قەزا کۆنەکانی سەر بە شاری سلێمانی و بە نزیکەی ٢٠کم دەکەوێتە باکوری ڕۆژئاوای شاری سلێمانییەوە، ناوچەیەکی شاخاوی و دارستاناوی و ئاوی زۆرە، وەك سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژەی پێدەکەن هەر لە کۆنەوە شوێنێکی ئاوەدان بووە، ئەم ناوچە لە کۆندا کەوتووەتە سەر ڕێگای هاتوچۆ و بازرگانی بەغدا کفری کەلی سەگرمە و سلێمانی و ناوچەی شارەزوور، لەبەر ئەوەی ناوچەیەکی سەخت و شاخاوی و ئاوەدان بووە لەگەڵ هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بۆ کوردستان لە ناوچەی قەرەداغدا مزگەوت و حوجرە و خوێندن کراونەتەوە.

لەکاتی پەلاماردانی بنەماڵەکانی سەر بە نەوەی خەلیفە (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) لەلایەن دەسەڵاتدارانی عەباسییەکانەوە (کە لەناو کوردا بە سەید قڕان ناسراوە)، نەوەی ئەو بنەماڵە کە بە سادات ناسراون، ناچار دەبن و کۆچ دەکەن بۆ خۆدەربازکردن لە پەلاماری دەسەڵاتی سیاسی ئەوکات. ئیمام حەمزەی کوڕی ئیمام موسای کازم ڕوو دەکاتە کوردستان و پەنا بۆ ناوچە سەخت و شاخاوییەکان دەبات و لە ناوچەی قەرەداغدا و دێی تەکێدا نیشتەجێ دەبێت، لە دوای مانەوەی ئەو بنەماڵە زانستییە لەو دێیەدا گەشانەوەی زانستی زیاتر ڕووی لەو ناوچەیە کردووە. بەدرێژایی ئەو مێژووە خوێندنگە و شێخانی تەکێی قەرەداغ ڕۆڵی گەورە و بەرچاویان هەبووە لە خزمەتکردن بە خوێندن و خوێندەواری لە قەرەداغ و هەموو کوردستاندا[1].

یەکێك لەو ناوچانەی پشکی ئەو کۆچە زانستییەی بەرکەوتووە ناوچەی قەرەداغ و گوندی تەکێی قەرەداغ بووە، لەدوای کۆچی ئیمام حەمزە و نەوەکانی بۆ ناوچەی قەرەداغ و بەدرێژایی ئەو مێژووە ئەو دێیە شوێنی خوێندن و عیرفان بووە، زۆر کەس لەو گوندەدا هەڵکەوتوون و خزمەتیان بە پرۆسەی خوێندن و خوێندەواری کردووە لە کوردستاندا.

(ئەولیا چەلەبی) لە گەشتەکەیدا لە نێوان ساڵانی ١٠٥٨کۆچی ١٦٤٨زاینی هەتا ١٠٦٩ کۆچی بەرامبەر ١٦٤٨ زاینی، کە لەو گەشتەیدا حەوت ساڵ لە کوردستاندا گەڕاوە، باس لە گرنگی و ئاوەدانی کوردستان دەکات و دەڵێ: ئەگەر باسی هەموو شار و شارۆچکە و گوند و لیواکان (سنجاق) تۆمار بکەین پێویستی بە یەك بەرگ کتێبی گەورە دەبێت، هەر لەو مێژووەدا (قەرەداغ) بە سنجاقی قەرەداغ ناودەبات و، باس لەوە دەکات باج و خەراجی سنجاقی قەرەداغ (٨٠٤٣٧٨) قرۆش بووە، بڕی ئەو باجەی ناوچەی قەرەداغ بەبەراورد بە ناوچەکانی تر ڕێژەیەکی زۆرە و بەڵگەی ئاوەدانی و پێشکەوتنی ناوچەی قەرەداغە لەو کاتەدا[2].

مامۆستا (محەمەد قزڵجەیی) دەڵێ: (لە سەردەمی لەدایك بوونی مەولانا خالیدا (١٧٧٦ز) لەو سەردەمەدا قەرەداغ خوێندنگەی زۆر و باخاتی جوانی تێدا بووە)[3]. ئەم بۆچوونەی قزڵجەیی ئاماژەیەکی بەهێزە کە لەو سەردەمەدا ناوچەی قەرەداغ زۆر ئاوەدان بووە و لەڕووی بزاڤی زانستی و ڕۆشنبیرییەوە پێشکەوتوو بووە و، لەهەمان کاتدا لەڕووی کشتوکاڵ و ئابوورییەوە لە ئاستێکی باشدا بووە.

گەڕیدە (المنشي البغدادي) کە لەساڵی ١٨٢٠ زاینی گەشتێکی بۆ سلێمانی و دەوروبەری کردووە دەڵێ: (یەکێك لە ناحیەکانی سلێمانی قەرەداغە و نزیکەی چوارسەد دێ دەبێت لەناوچەیەکی شاخاویدا)[٤]. هەرچەندە ڕەنگە چوارسەد دێ دوور بێت لە ڕاستییەوە و ئەم گەڕیدەیش هەر بە خەمڵاندن داینـاوە، بەڵام ئاماژەیەکی بەهێزە کە لەو ڕۆژگارەدا قەرەداغ زۆر ئاوەدان بووە.

## بەشی یەکەم:
## هۆیەکانی گەشەکردنی خوێندن لە ناوچەی قەرەداغدا

لەگەڵ هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بۆ کوردستان و کرانەوەی سەدان مزگەوت و حوجرە و خوێندنگەی زانستی لە زۆربەی گوند و شارۆچکە و شارێکی کوردستاندا، بۆ فێربوونی بنەماکانی ئاینی ئیسلام و بەجێهێنانی ئەرکە ئاینییەکان، پاڵنەری ئاینی و خۆشەویستی کورد بۆ زانست و مەعریفە و بیر ڕووناکی و، سینە پاکی و، مێشك ڕوونی و، دڵکراوەیی ئەم میللەتە وای کردووە سەدان زانای گەورە لەهەموو بوارە جیاجیاکانی زانستە عەقڵی و نەقڵییەکان دەربکەون و، نووسین و دانراوی بەنرخ پێشکەش بە مرۆڤایەتی بکەن و، هەتا ئێستایش نووسین و دەستخەتەکانیان جێگەی لێکۆڵینەوەی زانکۆ و ناوەندە زانستییەکانن[٥].

لەگەڵ بوونی هەموو ئەو هۆیانەی کە وای کردووە میللەتی کورد لە ڕووی خوێندن و زانست و مەعریفییەوە پێشبکەوێت، بەڵام دەکرێت چەند هۆیەکی تر ئاماژە پێبکەین کە لە قەزای قەرەداغدا ڕۆڵی گەورەیان بینیوە لە بەرەو پێشبردنی خوێندن لەو ناوچەیەدا ئەوانیش:

**باسی یەکەم:**

**کۆچی ئیمام حەمزەی باپیری شێخانی تەکیە بۆ قەرەداغ**

زۆرێك لەوانەی باسی مێژووی ساداتی کوردستانیان کردووە ئاماژە بەوە دەکەن کە شێخانی تەکیەی قەرەداغ نەوەی ئیمام حەمزەی کوڕی ئیمام موسای کازمن، ئیمام موسای کازم لە ساڵی ١٨٣ کۆچی شەهید کراوە، لەدوای ئەوە نەوەکانی پەرتەوازە بوون هەر یەکەو ڕوویان لە ناوچەیەك کردووە، بەپێی بۆچوونی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس شێخانی تەکێیەی قەرەداغ

نەوەی ئیمام حەمزەن، هەروەها باس لەوە دەکات کە ئیمام حەمزە هاتووەتە تەکێیە و لەوێدا نیشتەجێ بووە و ئیرشاد و دینداری کردووە و تەکێیە و مزگەوتی کردووەتەوە، یەکێك لەو بەڵگەنامانەی پشتی پێبەستووە شەجەرەی مەلا عەبدولاّی خەرپانییە، کە ئەو شەجەرە مۆری زۆرێك لە زانایانی کوردستانی پێوەیە، وەك مۆری شێخ مارفی نۆدێ و کاك ئەحمەدی کوڕی و سەید عەبدولرەحیمی بەرزنجی و سەید عەبدولکەریمی بەرزنجی سەید عەبدولاّی خەتیبی سلێمانی و زانایانی قەزای هەڵەبجە و خەڵکانی تر[٦].

بەپێی بۆچوونی مامۆستا شێخ نوری شێخ بابە عەلی ئیمام حەمزە لە ساڵی (١٦١کۆچی) لەدایك بووە، لەساڵی (١٨٢کۆچی) هاتووەتە کوردستان لەناوچەی دەڵۆ بیست ساڵێك ماوەتەوە، لە ساڵی (٢٠٣کۆچی) هاتووەتە قەرەداغ و گوندی تەکێیە[٧]. کەواتە هەر لە ساڵی ٢٠٣ کۆچییەوە دێی تەکێیە و ناوچەی قەرەداغ خوێندنگە و خوێندەواری تێدا بووە، ئەم مێژووە زۆر گرنگە بۆ دیاریکردنی پرۆسەی خوێندن و مێژووی خوێندنگە لە هەموو کوردستاندا.

بنەماڵەی شێخانی تەکێیەی قەرەداغ بەدرێژایی ئەو مێژووە درێژەی لە ناوچەی قەرەداغدا بوون بەردەوام زانای گەورە و حوجرە و تەکیە و مزگەوتیان هەبووە، بەدەیان فەقێ و مەلای گەورە لە خوێندنگاکانیان دەرچووە و لە هەموو کوردستاندا خزمەتی گەورەیان بەخوێندن و ئاین کردووە، مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس زیاتر لە پازدە زانای گەورەی ئەو بنەماڵەی لە کتێبی (بنەماڵەی زانیاران)دا هێناوە و ئاماژەی بە ژیانی زانستی و تەدریس و دەستنووسەکانیان کردووە[٨].

**باسی دووەم:**

**نیشتەجێبوونی هەندێك لە شێخانی بەرزنجە لە ناوچەی قەرەداغدا**

شێخانی بەرزنجە لە ناوچەی سلێمانیدا ڕۆڵی باشیان بینیوە لە بەرەوپێشبردنی خوێندن و خوێندەواریدا، بە تایبەتی لە دوای دەرکەوتنی شێخ مارفی نۆدێی ڕۆڵی بەرزنجییەکان زیاتر دەردەکەوێت، بەرزنجییەکان بە پاڵنەری ئاینی و سۆفیگەری کە نوێنەرایەتی تەریقەتی قادرییان کردووە بەناوچە جیاوازەکانی کوردستاندا بلاّو دەبنەوە و لە زۆر ناوچەی کوردستاندا تەکێیە و خوێندنگەی ئاینییان هەبووە و ئیرشادی خەڵکییان کردووە.

یەکێك لەو ناوچانەی ئەو بنەماڵەی بەرزنجییەکان تێدا نیشتەجێ بوون و کاریگەرییان لەسەری هەبووە ناوچەی قەرەداغە، هەر لەدوای کۆچی شێخ ئیسماعیلی ولیانی (١٠٨١کۆچی ١١٥٨کۆچی)یەوەو برا و نەوەکانیەوە ناوچەی قەرەداغ دەبێتە سەنتەرێکی بەرچاوی شێخانی بەرزنجەیی و تەریقەتی سۆفیگەریی قادری، هەر یەك لە دێهاتەکانی قازانقایە و خاوێ و دێلێژە و گڵەزەردە کە هەریەکیان ناوەندی زانستی و سۆفیگەریی قادری بوون بەهۆی کۆچی شێخانی بەرزنجەوە ئەو گرنگیەیان هەبووە، جگە لە دێی دێلێژە کە پێش کۆچی شێخ ڕەزای دێلێژەیش هەر ئاوەدان بووە و خوێندن و خوێندەواری و مزگەوت و حوجرەی تێدا بووە[٩].

**باسی سێیەم:**

**هاتنی بەشێك لە مەردۆخییەکان بۆ ناوچەی قەرەداغ**

مەردۆخییەکان بنەماڵەیەکی دێرین و ناسراون بە زانست و قووڵبوونەوە و خزمەتکاری زانست و حیکمەت، زۆر زانای گەورەیان تێدا هەڵکەوتووە نیشتەجێی سنە و دەوروبەرین، یەکێك لە زاناکانی ئەو بنەماڵەیە زانای گەورە شێخ محەمەد قەسیمە مامۆستای مەولانا خالیدە لە ساڵی ١٢٣٦کۆچیدا وەفاتی کردووە، هەروەها برازاکانی شێخ عەبدولقادری موهاجیرە خاوەنی (**شرح تهذیب الكلام**)، هەروەها براکانی زانای گەورە محەمەد وەسیم و شێخ محەمەد جەسیمە، دانراوی زۆریان هەیە لە (**الحكمة والكلام**) خزمەتیان بەرچاوە، هەروەها برازاکەی شێخ تەها نەوەی شێخ محەمەد قەسیم ئەم شێخ تەهایە کۆچی کردووە بۆ بەغداد و باپیری خێزانی سنەییە لەو شارەدا، هەروەها هەندێك لە بنەماڵەی مەردۆخی لە سەرەتای سەدەی یازدەی کۆچی چوونەتە قەرەداغ لە لیوای سلێمانی لەوانە شێخ عەبدوللەتیفی گەورە خاوەنی دانراوی بەناوبانگ و هۆنراوی پاراو، زۆر زانای تر لەو بنەماڵەدا هەڵکەوتوون[١٠].

بەپێی بۆچوونی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس مەردۆخییەکان لە بنەڕەتدا خەڵکی وڵاتی شامن، خەڵکی دێیەك بوون ناوی مەردۆخ بووە سەر بەپارێزگای (سوەیدا) لە وڵاتی سوریای ئەمڕۆدا، باپیرەی ئەم بنەماڵە کاتی خۆی لەبەر ستەمی ستەمکار یان هەر هۆیەکی تر لە شامەوە هاتوون بۆ کوردستانی ئێران، شێخ محەمەدی مەردۆخی ناوچەی هەورامانی پەسند کردووە و تیا

نیشتەجێ بووە، بەگوێرەی رشتەی بنەماڵەی مەردۆخی دەوروبەری ساڵی ٨٠٠ کۆچی هاتوونەتە ئەو ناوچەیە[١١].

یەکێك لە زانا گەورەکانی مەردۆخی کە چووەتە ناوچەی قەرەداغ شێخ عەبدوللەتیفی شێخ مەعروف بووە، ئەم زانایە لە ساڵی ١١٣٨کۆچیدا لە دایك بووە، خوێندنی لای باوکی و هەندێ لە زاناکانی ناو قەڵەمڕەوی بابانـدا بووە، لە شاری قەلاچوالان ئیجازەی عیلمی وەرگرتووە، لەبەر ناوبانگی و توانای زانیاری و پلەبەرزی لە زانستەکاندا، میری بابان فەرمانی بۆ دەردەکا بۆ ئەوەی ببێ بە مامۆستای خوێندنگای (زەردیاوا) کە مەرکەزی ناحیەی قەرەداغ بووە و جێگەی (وەلی عەهدی میری بابان) بووە و نزیکەی (٦٠٠٠) شەش هەزار خانووی تێدا بووە.

لەو مێژووەدا کە ساڵی ١١٦٣کۆچی بووە، شێخ عەبدوللەتیف بەماڵەوە چووە بۆ زەردیاوا و بووە بە مامۆستای خوێندنگەکەی، جێگیربوونی ئەو زانایە لەو خوێندنگەدا بووەتە هۆی بووژانەوەی زانیارییە ئیسلامییەکان لە قەرەداغدا و ڕۆژ بە ڕۆژ لەسەر بناغەی زانیاری و ڕەوشتی بەرز و شەخسیەتی هەڵکەوتووی خزمەتی زۆرتر ئەبوو زیاتر پایەی بەرز ئەبووەوە و بووبووە یەکە زانای قەرەداغ و سەنگاو و مەرجەعی فەتوا و ڕێکخەری نێوانی خەڵك لە ناوچەکەدا.

لەگەڵ ئەمانەیشدا دیوەخانێکی پیاوانەی بۆ ناندان بە موسڵمانان لە میوان و قوتابی و ئامشۆکەری ئەو ڕۆژگارە هەبووە، کە ئەم خووە بەرزانە لای میری بابان دەرکەوت، ئەویش مەردانە چوو دەرامەتی شەرعی دێهاتی ئەو ناحیەیە– کام دێی باش بوو– بەرەو ڕووی شێخ عەبدوللەتیفی کردەوە بۆ ئەوەی بتوانێ خزمەتی زانیاری و دین و موسڵمانان بکا.

شێخ عەبدوللەتیفی گەورە لە ساڵی ١٢١٢ کۆچیدا وەفات دەکات و چوار کوڕی لەدوا بەجێ ماوە، شێخ عومەر کە شێخ هۆمەر بەناوبانگ بووە، شێخ عوسمان و شێخ ئەحمەد شێخ محەمەد، ئەمانیش لەسەر ڕێگەی باوکیان دەڕۆن لەدوای خۆشیان نەوەکانیان ڕۆڵی گەورە و کاریگەریان بووە و لە بلاوکردنەوەی زانست و زانیاری خزمەتی دیندا لە ناوچەی قەرەداغ و شاری سلێمانیدا[١٢].

مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس دەڵێ: مەردۆخییەکان زانای گەورە و پایە بەرزیان تێدا هەڵکەوتووە و، بە بلاوکردنەوەی ئاین و زانست سەرزەویی کوردستانیان ئاوەدان کردووەتەوە[١٣].

**باسی چوارەم:**

**نیشتەجێبوونی بنەماڵەی ئیبنوخەیاتی قەرەداغی(ابن الخیاط) لە قەرەداغدا**

ئەم خێزانە یەکێکە لەو خێزانە زانستییانەی لە ناوچەی قەرەداغدا دەرکەوتوون و ڕۆڵی بەرچاویان هەبووە لە گەشەپێدانی زانست و ڕۆشنبیریدا لەو ناوچەدا، ئەم بنەماڵە لە بنەڕەتدا لە عەشیرەتی شکاکی ناوچەی تەورێزن لە کوردستانی ڕۆژهەلأت، بەهۆی ستەمی حکومەتی شاهنشاهی ئێرانەوە ئاوارە بوون.

سەرەتای هاتنیان بۆ ناوچەی قەرەداغ لە دێی (سەرکۆ) نیشتەجێبوون، لە سەردەمی شێخ محەمەدی ئیبنوخەیاتدا دەچنە شارۆچکەی قەرەداغ و خوێندنگەکەی زانستی لەو شارۆچکەدا دروست دەکات هەتا کۆچی دوایی دەکات لەو خوێندنگەدا خزمەتی زانست و فەقێیان دەکات، لە دوای خۆی دوو کوڕی هەبووە شێخ عەبدولڕەحمان و شێخ مەحمود، لە دوای باوکیان درێژە بە بلأوکردنەوەی خوێندن و زانست دەدەن لە خوێندنگەکەی باوکیاندا، لە سەردەمی شێخ عەبدولڕەحماندا ژمارەیەکی زۆر قوتابی لە خوێندنگەکەدا کۆدەبنەوە و لە زانستی مامۆستاکەی بەهرەمەند دەبن، شێخ عەبدولڕەحمان زەوییەکی زۆر لەسەر ئەو خوێندنگە وەقف دەکات بۆ خەرجی خوێندن و قوتابیان و بە زەوییەکانی شێخ عەبدولرەحمان ناسراون(١٤).

**باسی پێنجەم:**

**بایەخدانی بابانەکان بە خوێندن و خوێندەواری لە ناوچەی قەرەداغدا**

یەکێك لە لاپەڕە پرشنگدارەکانی مێژووی بابانەکان لەناو قەڵەمڕەوەکەیاندا بایەخدانیان بووە بە زانست و خوێندن، وەك کۆکردنەوەی زانا گەورەکان لە سنووری میرایەتیەکەیاندا و، دابینکردنی پێویستی خوێندن و کردنەوەی خوێندنگە و، گرنگیدان بە کڕینی کتێب و پەیداکردن و کۆکردنەوەی دەستنووس، یەکێك لەو ناوچانەی پریشکی ئەو بایەخەی پێگەیشتووە و گەشانەوەی بەرچاوی بەخۆیەوە بینیوە لە سەردەمی دەسەلأتی بابانەکاندا ناوچەی قەرەداغ بووە(١٥).

لە سەردەمی بابانەکاندا و لە دوای کوژرانی سلێمان پاشای بابان (١٧٦٤ز)و تێکچوونی بارودۆخی قەڵەمڕەوەکەیان لە قەلأچوالاندا و لەدوای بڕیاری گواستنەوەی پایتەختی میرایەتییەکە بۆ ناوچەیەکی تر، قەرەداغ بژاردەی یەکەم بووە لەلایەن بابانەکانەوە کە بیکەنە پایتەختی خۆیان، وەك هەندێ سەرچاوە

ئاماژەی پێدەکات لەو کاتەدا شارۆچکەی قەرەداغ شەش هەزار ماڵی تێدا بووە، کە ئەوەیش بۆ ئەو سەردەمە بەڵگەی ئاوەدانی و پێشکەوتنی ئەو شارۆچکە بووە[١٦].

یەکێك لە هەنگاوەکانی بابانەکان کە کاریگەری زۆری هەبووە لەسەر ناوچەی قەرەداغ ناردنی شێخ عەبدوللەتیفی مەردۆخی بووە بۆ ناوچەکە کە یەکێك بووە لە زانا گەورەکانی سەردەمی خۆی، کەواتە مەردۆخییەکانی قەرەداغ لەسەر داوا و ڕاسپاردنی بابانەکان چوونەتە قەرەداغ و ئەم خێزانە زانستییە ڕۆڵی بەرچاویان بووە لە بەرەو پێشبردنی زانست و ڕۆشنبیری لە ناوچەکەدا[١٧].

یەکێك لە هەوڵەکانی میرانی بابان بۆ بەرەوپێشبردنی خوێندن و ڕۆشنبیری وەقفکردنی دێهات بووە لەسەر مزگەوت و خوێندنگەکان، هەتا بتوانرێت لە داهاتی ئەو دێهاتانە پێویستی خوێندن و مامۆستایان و قوتابیان دابین بکرێت و بەهۆی نەبوونی و هەژارییەوە ئەو پرۆسە گرنگە تووشی وەستان و پاشەکشە نەبێت.

یەکێك لەو ناوچانەی بابانەکان چەند دێیەك وەقف دەکەن بۆ خوێندنگەکەی شارۆچکەی قەرەداغ و دێی تەکیێ بووە، وەقفکردنی ئەو دێهاتانە بۆ پێویستی خوێندن و مامۆستاکانی بووە، لەدوا ئەو هەنگاوەی بابانەکان شێخ عەلی مەلا دەگەڕێتەوە بۆ بەڕێوەبردنی ئەو خوێندنگە گەورەی لە تەکێدا بووە، هەروەها لە ڕێگەی دابینکردنی کتێبەوە بۆ کتێبخانەی شارۆچکەی قەرەداغ و دێی تەکیێ، بابانەکان هەوڵی بەرەوپێشبردنی خوێندن و ڕۆشنبیرییان داوە لەو ناوچەدا[١٨].

سەردەمی بابانەکان لە هەردوو سەردەمی قەڵاچوالان و سلێمانیدا بە پرشنگدارترین مێژووی خوێندن و ڕۆشنبیری ناوچەکە دادەنرێت، زۆرێك لە زانا گەورەکان لەو سەردەمەدا پێگەیشتوون و دەرکەوتوون، هەتا هەندێ بەسەردەمی زانا گەورەکان ناویان بردووە[١٩].

جگە لەم هۆیانە لەبەر ئەوەی ناوچەی قەرەداغ ناوچەیەکی نیشتەجێبوونی هەمیشەیی بووە، واتە لە کاتی کۆچی خێڵە کۆچەرە کوردەکان بۆ گەرمیان و کوێستان ناوچەی قەرەداغ لە هیچ کاتێکدا چۆڵ نەبووە و ژیانی کشتوکاڵکردن و ئاژەڵداری تێدا بووە، ئەو نیشتەجێبوونە یارمەتی دروستبوونی مزگەوت و حوجرە و مانەوەی مەلای چاکی داوە و بەدرێژایی وەرزەکانی ساڵ سەرقاڵی دەرس و خوێندن بوون و کۆچ و ڕەو و گەرمیان و کوێستان تووشی دابڕانی نەکردوون لە خوێندن.

## بەشی دووەم

## خوێندنگەکانی ناوچەی قەرەداغ و هەندێ لە مامۆستاکانی

**خوێندنگەی شارۆچکەی قەرەداغ:** لە پێشدا بە زەردیاوا ناوبراوە بووەتە سەنتەری قەزای قەرەداغ، ئەم شارۆچکەی خوێندنگەی تێدا بووە و زانای گەورە مەلاعەبدوللەتیفی گەورە کوڕی شێخ مەعروفی مەردۆخی (١٢١٢هـ-١٧٩٧ زاینی وەفاتی کردووە) مامۆستای بووە، لە زۆربەی ناوچەکانەوە فەقێ ڕوویان تێکردووە، هەتا لە زانستی ئەو زانا گەورە بەهرەمەند بن، لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا شێخ نەجیبی قەرەداغی کە نەوەی شێخ عەبدوللەتیفی گەورەیە مامۆستای ئەو خوێندنگە بووە و لە سالّی ١٩٣٢ زاینیدا کۆچی دوایی کردووە، نووسەری دەستنووسی (الأسطرلاب) ئاماژە بەوە دەکات کە لەو خوێندنگەدا ئەو دەستنووسەی نووسیوەتەوە لە سالّی ١٧٨٣ زاینی، هەروەها دەستنووسی (شرح المغني) لە سالّی ١٨٥٥ زاینی.

هەروەها بابانەکان گرنگییان بە خوێندنگەکانی ئەو ناوچەیە داوە و سلێمان پاشای بابانی لە سالّی ١٨٤٩ی زاینی خوێندنگەیەکی نوێی لەو شارۆچکەدا دەکاتەوە و مەلا محەمەدی قەرەداغی دەکاتە مامۆستای و هەتا کۆچی دوایی دەکات لەو خوێندنگەدا ماوەتەوە، مەلا محەمەدی قەرەداغی لە سالّی ١٢١٣کۆچی لە قەرەداغ لەدایك بووە، سەرەتای خوێندنی لە ناوچەکەی خۆیدا بووە، پاشان دەچێتە دێی مۆرتکە و لای مەلا عەبدولغەفوری مۆرتکەیی زانستەکانی (الآداب والمنطق والنحو) دەخوێنێ، لای شێخ عەبدوللەتیفی بەرزنجەیی (الفقه وأصول الفقه والتفسير) دەخوێنێ، لەدوای ئەو قۆناغە ڕوو دەکاتە ناوچەی هەڵەبجە و لای زانای گەورە مەلا عەبدوڵای خەرپانی زانستەکانی ( البلاغة وعلم الكلام والحكمة) دەخوێنێ و ئیجازەی عیلمی لای ئەم زانا گەورە وەردەگرێت، لەدوای وەرگرتنی ئیجازەی عیلمی دەچێتە لای مەولانا خالید لە سلێمانی و تەریقەتی نەقشبەندی لێ وەردەگرێت، لە دوای هەموو ئەمانە دەگەڕێتەوە قەرەداغ و سلێمان پاشای بابان خوێندنگەیەك و مزگەوتێکی لە قەرەداغدا بۆ دروست دەکات.

ئەم زانا بەهرەمەندە کۆمەڵێك دانراوی هەیە لەوانە: (شرح الاعراب في النحو)و (شرح رسالة الآداب في الآداب) و (تعليقات على حاشية عبدالحكيم والخيالي في علم

البلاغة) و (تعليقات على شرح الشمسية في المنطق) و (تعليقات على عصام الدين في علم الوضع) و (تعليقات على تفسير البيضاوي) و (تعليقات على تحفة ابن حجر الهيتمي في الفقه الشافعي) و (تعليقات على رسالة بهاءالدين العاملي في علم الحساب). لە ساڵی ١٢٨١ی كۆچی وەفاتی كردووە و لە قەرەداغ بە خاك سپێرراوە[٢٠].

یەكێكی تر لە مامۆستاكانی لە سەدەی ١٣ ی كۆچی ١٩ زاینی شێخ عەبدوللەتیف عەبدولاّ ناسراو بە (قوتب) بووە، هەروەها مەلا ئەحمەدی دێڵێژەیی ١٣١٨ كۆچی ١٩٠٠ زاینی وەفاتی كردووە، زانایەكی گەورە بووە و دانراوی هەیە لە بواری زانستی كەلام و فیقهدا. هەروەها شێخ جەلالی كوڕی شێخ عەبدوللەتیف ١٣٥٠كۆچی ١٩٣٥ زاینی وەفاتی كردووە، مامۆستای ئەو خوێندنگە بووە. چەند مامۆستایەكی تریش لە هەمان خوێندنگەدا دەرسیان وتووەتەوە.

بەپێی ئەو دەستنووسانەی لەو شارۆچكەدا نووسراونەتەوە ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن كە لە سەدەی یازدەی كۆچی و حەڤدەی زاینیدا بووژانەوەیەكی زانستی تێدا بووە، دەستنووسێك كە بەدەستخەتی عوسمانی كوڕی ئیبراهیمی كوڕی محێددینی مورادی لە ساڵی ١٠٨٨كۆچی بەرامبەر١٦٧٧ نووسراوەتەوە، هەروەها دەستنووسی (حاشية حسن الزيباري) بە دەستخەتی محەمەدی كوڕی مەحمودی تاریوێردی لەساڵی ١٢٣٥كۆچی ١٨١٧زاینی لە هەمان شارۆچكەدا نووسراوەتەوە، هەروەها (الفوائد الضيائية) بەدەستخەتی محەمەدی كوڕی مەحمود ناسراو بە (ابن الخياط القرداغي) لە ساڵی ١٢٣٥كۆچی ١٨١٩زاینی نووسراوەتەوە، هەروەها دەستخەتێكی (كلنبوی بورهان) لە زانستی لۆژیكدا بە دەستخەتی عەبدولاّ بن خدر لە ساڵی ١٢٩٥كۆچی ١٨٧٨زاینی نووسراوە، هەروەها (شرح رسالة الباني المير روستمي)ی ئیبنوقەرەداغی، بەدەستخەتی عارف كوڕی شێخ ئەحمەدی دەلوجەیی قەرەداغی نووسراوەتەوە لە ساڵی ١٣١١كۆچی ١٨٩٣زاینی، هەروەها (حاشية محی الدينی التالشي على حسام الدين كاتي) بە دەستخەتی محەمەدی كوڕی شێخ مەحمود كوڕی شێخ محەمەد كوڕی شێخ مەحمود كوڕی شێخ ئەحمەد كوڕی شێخ عەبدوللەتیف لە شاری قەرەداغ لە ساڵی ١٣٣٢ كۆچی ١٩١٣زاینی نووسراوەتەوە[٢١].

هەموو ئەم دەستنووسانەی ئەو زانایانەی لەو ناوچەدا تەدریسیان کردووە و ئەوانەی لە هەمان ناوچە خوێندنیان تەواو کردووە بەڵگەی ئاشکران لەسەر خوێندنگەکانی ناوچەی قەرەداغ و زانایانی ئەو ناوچەیە.

**خوێندنگەی تەکیێی قەرەداغ**: ئەم گوندە لە دوای نیشتەجێبوونی شێخانی نەوەی ئیمام حەمزەوە ناوبانگیی زانستی بڵاوبووەتەوە، کۆمەڵێك زانا و ئەدیب و شاعیر و خۆشنووس لەم گوندەدا دەرچوون، وەك شاعیر (جامی) و (السید عوض) و یوسفی ئەصەم و مەلا عەبدوڵای خەرپانی و چەندانی تر، کۆمەڵێك کتێبی گرنگ لەو گوندەدا نووسراونەتەوە لەوانە: (الوضوح في شرح المحرر) ی زانای گەورەی کورد مەلا ئەبوبەکری موصەنیف (١٠١٤هـ ١٦٠٥ز) شێخ مستەفای کوڕی شێخ عوض کوڕی شێخ ئەوەیس کوڕی شێخ عیوضي (١١٠٦کۆچی-١٦٩٤زاینی)، هەروەها کتێبی (الفناري) لە نووسینەوەی محەمەدی کوڕی مەحمودی ئیبنو خەیاتی قەرەداغی لە ساڵی ١٢٣٥کۆچی ١٨٠٩زاینی، هەروەها کتێبی (موصل الطلاب) لە نەحودا، لە نووسینەوەی ئەبوبەکری کوڕی مەحمودی تەکیێی، لە خوێندنگەی تەکیێدا لە ساڵی ١٢٣٨کۆچی ١٨١٣زاینی نووسراوەتەوە، هەروەها کتێبی (قصیدة البردة) هەر لە هەمان خوێندنگە نووسراوەتەوە لە ساڵی ١٣٤٣کۆچی ١٩٢٥زاینی، بەهەمان شێوە کتێبی (کلنبوي البرهان) لە لۆژیکدا لە نووسینەوەی مەلا عەبدولقادری رەباتی لە ساڵی ١٣٤٥کۆچی ١٩٢٧زاینی نووسراوەتەوە(٢٢).

مامۆستا (محەمەد عەلی قەرەداغی) لە کتێبی (کنوز الکرد)دا ژمارەیەکی بەرچاو دەستنووسی ئاماژە پێداوە کە لە دێی تەکیەی قەرەداغدا نووسراونەتەوە، یان نووسەرەکەیان پەیوەندی بە خوێندنگە و زانایانی تەکیەوە هەبووە، کە نزیکەی پازدە دەستنووس دەبن، ئەمەیش ئاماژەیەکی ئاشکرایە کە لەو دێیەدا بزاڤێکی زانستی باش هەبووە(٢٣).

**خوێندنی کچان و ژنان لە تەکیەدا**: خوێندنی حوجرە و دێ بەدێ کردنی فەقێ بەدوای مامۆستا و خوێندنگەدا، زیاتر بۆ پیاو گونجاو بووە و کەمتر ژن ئەو دەرفەتەی بۆ هەڵکەوتووە بتوانێت بخوێنێ و خۆی بۆ ئەو مەبەستە یەکلایی بکاتەوە، بەڵام لە دێی تەکیێی قەرەداغدا بەهەوڵی خۆیان بەهۆی ئەوەی گەورە دێ بووە و زانای گەورە و خوێندەواری باشی تێدا بووە، ئەو دەرفەتە بۆ ژنیش

ڕەخساوە بخوێنێ و تەدریسیش بکات، لە تەکێیەدا حاجی خەجێ قورئان خوێن بووە و دەرسی بە فەقێ وتووە، مامۆستای نووسەر (محەمەد عەلی قەرەداغی) و چەندانی تر بووە لە تەکێیەدا[٢٤].

یەکێکی تر لەو ژنانەی دەرسی وتووەتەوە لە دێی تەکێیەدا (دایە عیصمەت ١٩٢٧ لەدایك بووە لە ساڵی ١٩٩٧ وەفاتی کردووە) ئەم ژنە بەهرەمەندە قورئان خوێن بووە و تەدریسی کردووە و، هاوینان کە ماڵیان گەڕاوەتەوە تەکێیە دەرسی بە کچان و ژنان وتووە، ژمارەیەك لە ژنانی فێری خوێندنی قورئان و خوێندەواری کردووە، لەهەمان کاتدا دەرسی پەروەردە و زانستە ئیسلامییەکانی پێ وتوون، ئەم خانمە شاعیریش بووە کۆمەڵێك شیعری زۆر جوانی هەیە[٢٥].

**کتێبخانەی دێی تەکێی قەرەداغ:** لەگەڵ هاتنی ئیمام حەمزە و نیشتەجێبوونی لە تەکێی قەرەداغ و بنیاتنانی خوێندنگە و مزگەوتدا، ئەو بنەماڵە خاوەنی کتێبخانە بوون و دەست بەدەست ئەو کتێبخانە پارێزراوە و دەوڵەمەند کراوە هەتا ناوەڕاستی سەدەی بیستەمی زاینی، بە وتەی مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی کە خۆی یەکێکە لە نەوەی ئەو خێزانە بەهرەمەندە باسی ئەوە دەکات لە ماڵی مامۆستا شێخ محەمەدی شێخ حەمە ئەمین کتێبە دەستخەتی بینیوە دەستی داونەتێ و مامۆستای ناوبراو پێی فەرمووە ئەو کتێبانە ئەمانەتن و لە شوێنی خۆی دایناوەتەوە.

هەروەها مامۆستای ناوبراو دەڵێ: ئەوەی تا ئێستا بە بەڵگەوە بۆم دەرکەوتووە ئەوەیە ئەم کتێبخانە لە دوای شێخ جامی[٢٦] و شێخ یوسفەوە بێناز کەوتووە و، لە دەست مەلایانی بنەماڵەکەی خۆیان دەرچووە، وەك کتێبخانەی وەقفکراو چاودێری کراوە و، دەستاو دەستی کردووە، لە سەرەتاوە لای زانایەکی گەورەی شێخ مستەفا ناو و شێخەلی مەلا و کەسانی تر بووە، تا دوایی گەیشتووەتە دەستی مامۆستا شێخ بابا عەلی و مامۆستا شێخ نوری کوڕی، بەلام دوای مامۆستا شێخ نوری ئەو کتێبخانە شێوا و کتێبەکان بێناز کەوتن و پەرتەوازە بوون، هەرکەس بۆخۆی بێ گوێدانە وەقف و میرات و وەرەسە، کەوتنە فرۆشتنی ئەو کتێبانە و ئەوەی ئێستا زانرابێت بەشێکی لە کتێبخانەی ئەوقافی

سلێمانیدایە و، بەشێکی لە کتێبخانەی (دار المخطوطات العراقیة)دایە و، خوا دەیزانێ ئەوانی دیکەیشی چییان بەسەرهاتووە[٢٧].

هەر لە دێی تەکیەدا مامۆستا مەلا عەبدوڵای تەکێ کتێبخانەیەکی دەوڵەمەندی هەبووە، سەدان دەستنووس و کتێبی ناوازەی تێدا بووە، لە ساڵی ١٩٨٨ لەکاتی هێرشی بەعسدا بۆسەر ناوچەی قەرەداغ هەمووی سووتاوە، لەو کتێبخانەدا دەستنووسێکی (کلنبوی برهان) لە زانستی لۆژیکدا تێدا بووە، مامۆستا عەبدوڵا خۆی حاشیەکی زۆر عیلمی لەسەر نووسیوە و، ئەو حاشیە ئەوەندە بەرز بووە لەڕێگەی ئەو حاشیەوە توانای زانستی مامۆستا عەبدوڵا و مەلای کورد دەردەکەوت، مامۆستا عومەر نیزامیش کە خەڵکی ئەو گوندەیە کتێبخانەیەکی باشی هەبووە، جگە لە دەیان کتێب دوو دەستنووسی تێدا بووە، بە خەتی مەلا مەحمودی بەڵخە، یەکێك لەو دەستنووسانە (جامع المسائل) زیاتر لە ٢٠٠ مەسەلەی تێدا بووە، مامۆستای ناوبراو دەڵێ: ئەویتریان نازانم چی بووە، هەروەها دەڵێ: یەکێکی تر لەو دەستنووسانەی ماڵی باپیرم (شێخ نوری شێخ بابا عەلی تەکێیی) لای من سووتا کتێبی (تهذیب) لە فەلسەفە و مەنتیقدا بوو[٢٨].

مەخابن هەرچەندە بەهۆی نالەباریی بارودۆخی سیاسی و ئەو نائارامییەی لە کوردستاندا بووە و، هەزاران کۆچ و ڕەو و ماڵویران بوون و سووتانی لادێ و شار و شارۆچکەی کوردستان، لەهەمان کاتدا تالانکردنی هەزاران شوێنەوار و کتێب و دەستنووسی بەنرخ و، لەناوچوونی هەزاران لاپەڕەی مێژووی میللەتەکەمان، لە هەمان کاتدا بەهۆی لاوازیی ئاستی هۆشیاری و نرخ نەزانینی بەهای کتێب و کتێبخانە و دەستنووسەکانەوە، زۆرجار لەلایەن نەوە و خێزانی زانایانەوە چەندین کتێب و کتێبخانەی گەورە و گرنگ لەناوچوون، بەڵام بوونی کتێبخانە لە ناوچەیەکی وەك قەرەداغ و دێی تەکێیدا، بەڵگەی بوونی زانستی و زانیاری و خوێندەواری و زانای گەورەیە لەو ناوچەیەدا هەر لە مێژوویەکی کۆنەوە.

**خوێندنگەی گڵەزەردە:** هەرچەندە دێی گڵەزەردە لە ڕووی کارگێڕییەوە سەر بەقەزای قەرەداغ نییە، بەڵام لە ڕووی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و ئەو مێژووە زانستییەی تێدا بووە بەشێکە لەو جموجوڵە زانستییەی ناوچەی قەرەداغ، لە ڕووی شوێنی جوگرافیشەوە دەکەوێتە سەر زنجیرە شاخەکانی ئەو ناوچەیە، دێی

گڵەزەردە لەڕووی پێکهاتەی دانیشتوانەوە بەشێك لە ساداتی بەرزنجە و نەوەی شێخ حەسەنی گڵەزەردە هەر ئەمەیش وای کردووە هەرکاتێك باسی قەرەداغ و بزاڤی زانستی و عیرفانی ئەم ناوچەیە بکرێت دێی گڵەزەردەیش لەو باسانە بەدەرنابێت.

لە سەدەی دوازدەی کۆچی و هەژدەی زاینی بزاڤی زانستی لە دێی گڵەزەردەدا لە برەودا بووە، ئەویش بەهۆی بنەماڵەی زانستی شێخانی گڵەزەردەوە، لە ناسراوترین زانایانی ئەو خێزانە شێخ حەسەنی کوڕی شێخ محەمەد کوڕی شێخ عەلی کوڕی شێخ بابا ڕەسوڵی گڵەزەردەیی لە ساڵی ١١٧٥کۆچی شەست و یەکی١٧زاینی وەفاتی کردووە، ئەم زانا گەورەیە لەگەڵ زانستی شەرعیدا دەستێکی باڵای هەبووە لە فەلەکناسیدا، لە مزگەوتی گڵەزەردەدا سەعاتێکی هەتاوی دروستکردووە زۆر بە وردی کاتەکانی دیاری کردووە و، لە زانستی فەلەکناسی و زانستەکانی تردا دانراوی بە نرخی هەیە، هەروەها شێخ عەبدولجەباری کوڕی شێخ حەسەنی گڵەزەردە لە دوای باوکی زانایەکی بەهرەمەند بووە و دانراوی هەیە.

لە دوای ئەوان شێخ مەحمودی نەقیب ئەشراف کوڕی شێخ محەمەد لە ساڵی ١٢٧٥ کۆچی دوایی کردووە، هەروەها شێخ ئەحمەد میرەسوور کوڕی شێخ مەحمودی نەقیب، لە ساڵی ١٨٧٨زاینی کۆچی دوایی کردووە، لە دوای ئەوان شێخ حەسەنی کوڕی شێخ مارفی کوڕی شێخ حەسەنی گڵەزەردە کە لە ساڵی ١٨٢٧زاینیدا لە ژیاندا بووە، زانایەکی بەهرەمەند و شارەزا بووە لە بنەچە و بنەماڵە ناسیدا (الانساب)، هەروەها شێخ حسێنی قازی کوڕی شێخ مەحمودی نەقیب لە ساڵی ١٨٧٨زاینیدا وەفاتی کردووە، لە فیقهدا زانا بووە و لە شاری سلێمانیدا بووەتە قازی و دانراوی هەیە و شاعیر بووە، هەروەها شێخ عەبدولسەمەد کوڕی شێخ حەسەنی گڵەزەردە و شێخ ئەحمەد کوڕی شێخ عەبدولکەریم کوڕی شێخ حەسەنی گڵەزەردە.

لەو دەستنووس و بەرهەمانەی دێی گڵەزەردە کتێبی (رسالة اثبات الواجب) بە دەستخەتی عیسای کوڕی یەعقوبی ئەفغانی بۆ شێخ حەسەنی گڵەزەردەی نووسیوە لە مزگەوتی (سعدان) لە ساڵی هەزار و سەد و سی و چواری کۆچی

١٧٢١زاینی، هەروەها کتێبی (الناسخ والمنسوخ)ی ئەبو قاسم بەدەستخەتی عەبدولسەلام کوڕی حسێن، لە مزگەوتی (سعدان) لە ساڵی ١٧٢١زاینیدا[٢٩].

هەروەها قورئانە بەناوبانگەکەی گڵەزەردە کە لە ناوچەکەدا بە (قورئانە گەورەکەی گڵەزەردە) ناسراوە، قورئانێکی دەستنووسی زۆر ناوازەیە و زۆر چیرۆك دەربارەی نووسینەوەی ئەو قورئانە باس دەکرێت، بەڵام بەبۆچوونی نووسەری ئەم باسە ئەگەری زۆرە ئەو قورئانە لەلایەن کەسێکی زۆر خەتخۆشەوە لە سەردەمی شێخ حەسەنی گڵەزەردەدا بۆ شێخ حەسەنی گڵەزەردە نووسرابێتەوە و پێشکەش بەو زانا گەورەیە کرابێت، بەندە بە خزمەتی ئەو قورئانە گەیشتووە و زۆر پێی سەرسام بووە، لەکاتی ئێستادا ئەو قورئانە پیرۆزە لە مزگەوتی دێی گڵەزەردەدایە و لەلایەن شێخانی گڵەزەردەوە پارێزراوە.

**خوێندنگەی دێلێژە**: دێلێژە دێیەکی کۆنی ناوچەی قەرەداغە، شوێنەواری کۆن لە دەوروبەری دێلێژە هەیە و (مامۆستا عەبدولڕەقیب یوسف) هەندێ شوێنەواری لە دەوروبەری دێلێژەدا دۆزیوەتەوە، هەروەها بوونی گۆڕستانێکی گەورە لە دێلێژەدا کە هەموو گۆڕەکان ڕوو بە قیبلەن و گۆڕستانی موسڵمانانە بەڵگەیە کە ئەو دێیە لەکۆنەوە ئاوەدان بووە، لە پێش هاتنی شێخانی دێلێژە کە لە شێخانی بەرزنجەن دێلێژە هەر ئاوەدان بووە، شێخ ڕەزای دێلێژە کە بە شێخ ڕەزا سوورە ناسراو بووە، بۆ ئیرشاد و بڵاوکردنەوەی تەریقەتی قادری چووەتە دێلێژە، بەڵام شێخ عەبدولسەلامی برای مەلا بووە و تەدریسی کردووە لە مزگەوتی دێلێژەدا.

یەکێك لەو مامۆستایانەی لە دێلێژەدا دەرسی وتووەتەوە مەلا محەمەدی دێلێژەیی کە ناسراو بووە بەمەلا محەمەدی گەورە، ئەم زاتە خوێندنگایەکی گەورەی هەبووە و لە دێلێژەدا لە ساڵی ١١٧٣کۆچی لە دێلێژە کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێش بەخاك سپێرراوە.

لەدوای ئەو مەلا مەحمودی کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا محەمەدی گەورە، مامۆستایەکی زانا بووە و لای (مەلا محەمەدی ئیبنوحاجی هەزارمێردی) ئیجازەی وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە دێلێژە و خوێندنگەیەکی گەورەی کردووەتەوە لە دێلێژەدا و بەڕێوەی بردووە، ئەم زانایە لەگەڵ دروستکردنی سلێمانیدا چووەتە

ئـەو شـارە و لەگـەڵ شـێخ مـارف نۆدێـدا لـە خوێندنگـەی مزگـەوتی دەرسـی وتووەتەوە، لەپاش مردنی سێ کوڕی لێ بەجێماوە، مەلا حوسەین و مەلا ئەحمەد و مەلا حەسەن، مەلا حەسەن لە دوای مردنی باوکی لە دێلێژەدا ماوەتەوە(٣٠)، ئەم زاتە شاعیر بووە و شیعری چاکیشی هەبووە، ئەم بەیتە شیعری ئەوە:

یاقووتـە لـەبی لـەعلت؟ یـاقووتی ڕەوانـی دڵ.......ڕەشمـاری سـەری زوڵفـە یاخود ڕەشمارێکە؟(٣١).

شێخ ڕەزای دێلێژە (شێخ عەبدولڕەزاق شـێخ ئیسـماعیل ولیـانی) لـە سـاڵی ١١٨٤کۆچی بەرامبـەر ١٧٧٠ زاینیـدا وەفـاتی کـردووە و گۆڕەکـەی لـە دێلێژەیـە، ئەگەر چڵ ساڵێك پێش ئەو مێژووە چووبێتە دێلێژە دەکرێت بڵێین لـە دەوروبـەری ساڵی ١٧٣٠ چووەتە دێلێژە و پێش ئەو مێژووە دێلێژە ئاوەدان بووە.

کاتێـك شـێخ ڕەزای دێلێـژە و شـێخ عەبدولسـەلامی بـرای دەچـنە دێلێـژە مزگەوتێکی گەورە دەکەنەوە و پێشتر مزگەوتێکی تری تێدا بووە، ئەو مزگەوتـەی شێخ ڕەزا هـەتا سـاڵی ١٩٧٢زاینـی مـاوە و لـەو سـاڵەدا لەلایـەن خـەڵکی دێکـەوە تێکدرا و مزگەوتێکی کۆنکرێت لە شوێنەکەیدا دەکەنەوە، هـەتا ئـەو سـاڵە دێلێـژە ڕێگای ئۆتۆمبێلی نەبووە و هەموو چیمەنتۆ و پێویستییەکانی تری مزگەوتەکـە لـە چەمی تلێەوە بە هێستر و گوێدرێژ دەگوازنەوە بۆ ناو دێلێژە.

لە مزگەوتی دێلێژەدا مەلا شێخ مەحمود کوڕی شێخ محەمەد باڵدرێژی کوڕی شێخ ڕەزای دێلێژە مەلا بووە و فەقێی هەبووە و ئیجازەی عیلمی داوە.

مەلا محەمەد ئەمین ناسراو بە عاصی شاعیری دێلێژەیی، ئەم مامۆسـتا مـەلا چـاك بـووە و لـە دێلێـژەدا حـوجرە و فـەقێی هـەبووە و ئیجـازەی عیلمـی داوە، هاوسەردەمی مەلا ئەحمەدی فورقانی بـاوکی مـەلا جـەمیل ڕۆژبـەیانی بـووە، لـەو سەردەمەدا جیـاوازی دەکەوێتـە نێـوان مـەلا ئەحمـەدی فورقـان و شـێخ عومـەری قەرەداغی لەسەر ئەوەی ئایا (قەوان) حەڵاڵە یان حەرام، چەند نامە گۆڕینەوەیـەك دەکەوێتە نێوانیان لەسەر ئەو بابەتە هەتا دەگاتە ئاسـتی تونـد و تەشـهیر کـردن، نامەکان لە ڕێگەی کاروانەوە نێردراوە لە گەرمیانەوە بۆ دێلێژە و لە دێلێـژەوە بـۆ لای شێخ عومەر لە قەرەداغ، نامەکانی هەردوولا دەچێتە دێلێژە لای مەلا محەمـەد ئەمین و ئەو بەکارواندا دەیاننێرێ، کاتێك دەبینێ نامەکان توندن و تەشهیری تێـدا

لای خۆی دەیانپارێزێ و نایبنێرێ بۆ هەر یەك لە مەلا ئەحمەد و شێخ عومەر، نامەکان بە فارسی بووە و پارێزراون لای مامۆستا بابا رەسولْ مەلا شێخ ئیسماعیل دێلێژەیی ئەویش ڕادەستی مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی کردووە.

مامۆستا حاجی مەلا رەسوڵی سەفوەت لە بنەڕەتدا مکایەڵین، لە ساڵی ١٢٨٠کۆچی لە دێلێژە لەدایك بووە و خوێندنی لە ناوچەی قەرەداغ و سلێمانی تەواو کردووە، بنەماڵەی سەفوەت هەر لە کۆنەوە لە دێلێژەدا بوون خەڵکی ئەو دێیەن، چوار کوڕی بووە مەلا مستەفای سەفوەت، مەلا ئەحمەدی فائیز، مەلا مەحمود، مەلا نەجمەدینی ناری شاعیر، حاجی مەلا رەسولْ لە دێلێژەدا حوجرە و فەقێی هەبووە و خەلیفەی کاك ئەحمەدی شێخ بووە و هەر بەو هۆیەوە دێتە سلێمانی و لە خوێندنگەی شێخ مارفی نۆدێیی لە مزگەوتی گەورەدا تەدریس و مەلایەتی کردووە، ناسراو بووە بە مەلا (قال رسول الله) چووەتە هەر کۆڕ و کۆبوونەوەیەك دەستی کردووە بە وتاردان و وتوویەتی (قال رسول الله) لەوەوە ئەو نازناوەی وەرگرتووە، لە ساڵی ١٣٣٨کۆچی وەفاتی کردووە و لە گردی سەیوان بەخاك سپێرراوە.

مامۆستا شێخ ئیسماعیل دێلێژەیی لە ساڵی ١٩١٩زاینی لە دایك بووە و، مەلای دوانزە عیلم بووە و لە مزگەوتی دێلێژەدا دەرسی وتووەتەوە، زۆر کەسی ئەو دێیەی فێری خوێندن و خوێندەواری کردووە، لە ساڵی ١٩٩٦وەفاتی کردووە.

لە دێلێژەدا کتێب و دەستنووسی بەنرخ هەبووە، شێخ ڕەزای دێلێژە قورئانێکی دەستنووسی زۆر ناوازە و جوانی هەبووە، بە قورئانەکەی شێخ ڕەزای دێلێژە بەناوبانگ بووە، هەتا ساڵی ١٩٨٨ لای شێخانی دێلێژە پارێزراوە، بەڵام مەخابن لەکاتی هێرشەکانی بەناو ئەنفالی ساڵی ١٩٨٨ ئەو قورئانە لای مامۆستا بابا رەسولْ بووە و دەیشارێتەوە، لە دوای هێرشەکانی سوپای عێراق مامۆستا بابا رەسولْ سەردانی دێلێژە دەکات بەمەبەستی دەربازکردنی قورئانەکە و چەند دەستنووووسێکی تری بەنرخ، بەڵام ئەو دەستنووسە بەنرخانە دەست سوپا کەوتووە و مامۆستا بە دڵشکاوی دەگەڕێتەوە، بەو هیوایەی ڕۆژێك بێت ئەو قورئانە بدۆزرێتەوە و وەك دەستنووسێکی ناوازە بگەڕێتەوە بۆ دێلێژەی ڕەنگین[٣٢].

**خوێندنگەی صـۆڵە:** دوو دێ لە ناوچەی قەرەداغدا هەیـە بـەناوی صـۆڵەوە، صۆڵەی لای دەربەند باسەڕە و صـۆڵەی چرچـەقلاّ، کـە لێـرەدا مەبەسـت صـۆڵەی چرچەقلاّیە کە خوێندنگەی تێدا بووە، لە ڕۆژگارێکدا چـرای زانسـت لـەم گونـدەدا گەشاوەتەوە بە تایبەت لە سـەدەی سـیازدەی کۆچـیدا، خوێندنگـەی تێـدا بـووە، یەکێك لەو مامۆستایانەی لـەم دوایانـەدا دەرسـی تێـدا وتووەتـەوە شـێخ حسـێنی صۆڵەیی بووە، لەدوای ئەویش کوڕەکەی مەلا عەبدولقادر، مەلا و زانای گەورە بابا ڕەسوڵ کوڕی سەید ئەحمەد کـوڕی سـەید عەبدولسـەمەد بیـدەنی تەدریسـی تێـدا کردووە.

لەو کتێب و دەستنووسانەی لـەو خوێندنگـەدا نووسـراوەتەوە (سـعد الله) لـە ساڵی ١٣٨، هەروەها (حاشـیة عصـام الـدین علـی العقائـد العضـدیة) لـە زانسـتی کەلامدا، بە دەستخەتی عەبدوڵا کوری عەبدولقادر لە ساڵی ١٣٥٢کۆچـی، هـەروەها (سولیاباد) بەدەستخەتی عەبدولکەریم کوڕی عەلی کوڕی یوسف لە فیقهدا[٣٣].

**خوێندنگەی قازانقایە:** یەکێکە لە دێهاتـەکانی قـەزای قـەرەداغ و دەکەوێتـە ڕۆژئاوای قەزاکەوە، لە سەدەی دوازدەی کۆچیدا چالاکیی خوێندن و زانستی تێـدا بووە، هەندێك لە بەرهەم و دەستنووسی ئـەو بزاڤـە زانسـتییە (الفوائـد الضـیائیة) بەدەستخەتی عەبدوڵا سلێمان کوڕی مستەفا لـە سـاڵی ١٢٣٩کۆچـی ١٨٢٣زاینـی، هـەروەها (حاشـیة اسماعیـل الحیـدري علـی شـرح القربـاغي لرسـالة آداب المنـاظرة لعضـدالدین الإیجـي) بـە دەسـتخەتی (محمـد ابـن الخیـاط) قـەرەداغی لـە سـاڵی ١٢٤٠کۆچی ١٨٢٤زاینی.

یەکەم نیشتەجێبوونی شـێخانی بەرزنجـەیی لـە ناوچـەی قەرەداغـدا لـە دێـی قازانقایەدا شێخ ئیسـماعیلی ولیـانی کـوڕی شـێخ محەمـەدی نـۆدێیی بـووە، دوای چوونی شێخ ئیسماعیل و شێخ حەسەنی گڵـەزەردەی بـرای بـۆ ناوچـەی قـەرەداغ ئەمیر ئەحمەد بەگی زەنگەنەیی کە سوڵتانی عوسمانی کردبـووی بـە ئـەمیری ئـەو ناوچـە سـەردانیان دەکـات و دێـی قازانقایـە دەدات بـە شـێخ ئیسـماعیل و دێـی گڵەزەردەیش دەدات بە شێخ حەسەن و مزگەوت و تەکێیان بـۆ دەکاتـەوە و هـەتا وەفات دەکەن لە خزمەتی ئاین و موسڵماناندا بەردەوام بوون[٣٤].

مامۆستا محەمەد ئەمین زەکی دەڵێ: شێخ ئیسماعیلی ولیانی کە باپیری شێخانی قازانقایە و دێلێژە و کەسنەزان و خاوێ و گۆپتەپە و قەرەچێوار و کانی خاکی و هەشەزینی و کانی کەوەیە، یەکەم بەرزنجییە کە چووەتە ناوچەی قەرەداغ لەگەڵ شێخ حەسەنی گڵەزەردەی برایدا، ئەم دوو زانا گەورە دەچنە لای ئەحمەد بەگی ئەمیری زەنگەنە کە ئەو سەردەمە قەرەداغ لە ژێر دەسەڵاتیدا بووە، ئەویش شێخ ئیسماعیل لە قازانقایە دادەنێت و شێخ حەسەن لە گڵەزەردە، مزگەوتیان بۆ دەکاتەوە و بە تەدریس و ئیرشادەوە خەریك بوون[٣٥].

لە ناسراوترین زاناکانی گوندی قازانقایە لە نەوەی شێخ ئیسماعیلی ولیانی، شێخ عەبدولکەریم کوڕی شێخ قادری قازانقایەی کوڕی شێخ حسێن ولیانی لە ساڵی ١٢٨٠کۆچی ١٨٢٣زاینی کۆچی دوایی کردووە، زانایەکی گەورە و خواناس و دنیانەویست بووە[٣٦].

**خوێندنگەی شیوی قازی**: دێی شیوی قازی گۆڕ و زیارەتگای زانا و پیاوچاك قازی بەنێی تێدایە، قازی بەنێ قازی و مەلاچاك بووە، ئەدیب و شاعیریش بووە، شیعر و شوێنەواری ئەدەبی لێ بەجێ ماوە، ناوی ئەم دێیە ڕەنگە هەر لە ناوی ئەو زانایەوە هاتبێ، ئەم گوندە ماوەیەکی زۆر بنکەیەکی گەورەی ڕۆشنبیری بووە، چەند زانا و پیاوی گەورەی تێدا هەڵکەوتووە، دەگێڕنەوە لە یەك کاتدا دوانزە مەلای چاکی گوندەکەی تێدا بووە، ئەم مەلایانە بەکاری کشتوکاڵییەوە سەرقاڵ بوون، لەکاتی جووتکردندا پرسیاری فیقهیان لەیەك کردووە و وەڵامی یەکتریان داوەتەوە[٣٧].

ئەگەر ئەم مێژووە ڕاست بێت ئەم گوندە لەیەك کاتدا دوانزە مەلای تێدا بووبێت شتێکی ناوازەیە لەسەر ئاستی کوردستان زۆر کەم ڕوویداوە لە یەك کاتدا و لە یەك گوندا زیاتر لە یەك مەلا هەبووبێ، ئەوەیش بەڵگەی پێشکەوتنی خوێندەواری و ڕۆشنبیرییە کە لە تاقە گوندێکدا دوانزە مەلا هەبووە.

**خوێندنگەی خاوێ**: گوندی خاوێ دەکەوێتە ڕۆژئاوای مەڵبەندی قەزای قەرەداغ، خوێندنگە و حوجرەی تێدا بووە، قوتابیان ڕوویان تێکردووە بۆ خوێندن و سوود وەرگرتن لە زاناکانی، لەم دوایانەدا مەلا عەبدولحەکیم هەویەیی مامۆستا

بووە لەو گوندەدا، ئەم زانا بەهرەمەندە دانراوی هەیە لە لۆژیك و (آداب البحث والمناظرة) و میراتدا[٣٨].

مەلا عەبدولحەکیم هەویەیی هاوسەردەمی خوێندنی مەلا عەبدولکەریمی مودەریس بووە، لە مزگەوتی خانەقای مەولانا خالیدا لە سلێمانی پێکەوە خوێندوویانە، هەر لای ئەو زاتە ئاستەکانی خوێندن تەواو دەکات، دوای تەواوکردنی خوێندن لە سلێمانی لە مزگەوتی (شێخعەبدولرەحمان) لەگەڕەکی سەرشەقام دەبێتە ئیمام، دوای ئەوە دەچێتە دێی خاوێ لە ناوچەی قەرەداغ، چەند جێگایەکی تریش بە مەلایەتی گەڕاوە هەتا کۆچی دوایی کردووە لە ساڵی ١٩٥٩زاینیدا لە خانەقین[٣٩].

یەکێك لە مەلاکانی خاوێ شێخ عەبدولکەریمی کوڕی شێخ ئیسماعیل بووە کە ناسراو بووە بە شێخ عەبدولکەریمی خاوێ، لە دێی خاوێدا تەکێی هەبووە و ئیرشادی خەڵکی کردووە، لە دوای مردنی شێخ عەبدولقادری کوڕی لە شوێنی بەردەوام بووە، لەدوای مردنی ئەمیش شێخ عەبدولکەریمی کوڕی کە زانایەکی گەورە و خوێندەوار بووە بەردەوام دەبێت لە خزمەتی زانست و ئایندا[٤٠]، هەتا لە ساڵی ١٢٨٠ کۆچیدا وەفاتی کردووە، واتە چەند پشتێکی لە دێی خاوێدا مەلایەتییان کردووە و ساڵانێکی باش خوێندن و حوجرەی تێدا بووە.

**خوێندنگەی دوکان:** یەکێکە لە گوندەکانی قەرەداغ کە لە سەدەی دەیەمی کۆچیدا ژیانی زانستی تێدا بووە، یەکێك لەو دەستنووسانەی لەو گوندەدا تۆمار کراوە (حاشیة عصام الدین علی العقائد) بە قەڵەمی حاجی وەلی کوڕی عەبدولرەحیم لەساڵی ٩٨١ کۆچی بەرامبەر ١٥٧٣ زاینی نووسراوەتەوە[٤١].

جگە لەم خوێندنگانەی ئاماژەمان پێکردن لە چەند دێیەکی تری قەرەداغدا خوێندنگە و حوجرە و مەلاچاك هەبووە و دەرسیان بە فەقێیان وتووە و ڕاڤە و شەرحی کتێبیان کردووە و ئیرشادی خەڵکیان کردووە، بەڵام مەخابن لەبەر ئەوەی مێژووی ئەو خوێندنگانە تۆمار نەکراون و ناوی مامۆستاکانیان چانسی ڕووناکیان نەبووە و دەستنووسەکانیان بەرچاو نەکەوتوون نەمانتوانی شتێکیان لەسەر بنووسین، وەك خوێندنگەکانی گەڕەزیل و برایماوا و نەوتی و جافەران و چەند شوێنێکی تر کە خوێندنگەی ئاینی تێدابووە.

## کۆتایی توێژینەوە:

دوای ئەم لێکۆڵینەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە لە کوردستاندا هەر لەدوای هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە میللەتی کورد سەدان مزگەوت و خوێندنگەی ئاینی کردووەتەوە و، میللەتی کورد و زانا و خوێندنگەکانی کوردستان خزمەتی بەرچاوی بزاڤی زانستی و شارستانیی ئیسلامی کردووە، هەر بۆ ئەو مەبەستەیش لە زۆربەی لادێ و شارۆچکە و شارێکی کوردستاندا مزگەوت و خوێندنگەی زانستی کراوەتەوە و هەزاران زانای گەورە و خوێندنگەی بەناوبانگ دەرکەوتوون و زانایانی کورد و خەڵکی کوردستان لەو بوارەدا خزمەتی بەرچاویان کردووە.

یەکێك لەو ناوچانەی لە کوردستاندا پێگەی گەورەو ڕۆڵی بەرچاوی بینیوە لە مێژووی زانست و خوێندەواریدا ناوچەی قەرەداغ بووە، چەند هۆیەکی سەرەکی یارمەتیدەری بەرەوپێشچوونی زانست و خوێندەواری بوون لەو ناوچەدا، هەر ئەوەیش وای کردووە خوێندنگە و زانای گەورە لەو ناوچەیەدا دەربکەون وەك:

کۆچی ئیمام حەمزەی کوڕی ئیمام موسای کازم: دێی تەکێی قەرەداغ ناوەندێکی گرنگی خوێندن و خوێندەواری بووە لە ناوچەی قەرەداغدا، وەك هەندێ سەرچاوە ئاماژەی پێدەکەن ئەو گوندە بەهۆی نیشتەجێبوونی ئیمام حەمزەی کوڕی ئیمام موسای کازم بووەتە ناوەندێکی گرنگی ئاینداری و خوێندن هەر لە سەدە سەرەتاییەکانی موسڵمانبوونی کوردەوە، بەدرێژایی چەندین سەدە لەو دێیەدا چەندین زانا و فەقێ و شاعیر و خوێندەوار هەڵکەوتوون و خزمەتی بە پرۆسەی خوێندن و ڕۆشنبیری کردووە لە هەموو کوردستاندا.

کۆچی بەشێك لە شێخانی بەرزنجە لە سەردەمی شێخ ئیسماعیلی ولیانییەوە بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی تەریقەتی قادری و ئاینداری ڕوویان لە ناوچەی قەرەداغ کردووە و، لە شارۆچکەی قەرەداغ و دێیەکانی قازانقایە و گڵەزەردە و خاوێ و دێلێژە و، چەند دێیەکی تردا تەکیە و مزگەوت و خوێندنگەیان هەبووە و کاریگەری بەرچاویان هەبووە لەسەر ناوچەکە، لە ڕووی ئاینداری و بیری تەسەوفی و عیرفانی و خوێندەواری و ئاوەدانی ناوچەی قەرەداغدا.

هەروەها شێخانی مەردۆخی مێژوویەکی پرشنگداریان هەبووە لە گەشەپێدانی خوێندن و خوێندەواریدا لە ناوچەی قەرەداغ و زۆر ناوچەی تری

کوردستاندا، یەکێك لەو ناوچانەی کە شێخانی مەردۆخی پرۆسەی خوێندن و خوێندەوارییان تێدا بەرەوپێش بردووە ناوچەی قەرەداغ بووە، هەر لە سەردەمی شێخ عەبدوللەتیفەوە کە بەفەرمانی میری بابان چووەتە ناوچەکە، ئەو بنەماڵە زانستییە ڕۆڵی بەرچاویان بووە لە بەرەوپێشبردنی خوێندن و زانیاریدا لە ناوچەی قەرەداغدا.

بنەماڵەی ئیبنوخەیاتی قەرەداغی کە یەکێکن لە بنەماڵە زانستییەکانی قەرەداغ و لەدوای نیشتەجێبوونیان لە ناوچەی قەرەداغ و پاشان لە شارۆچکەی قەرەداغدا خزمەتێکی زۆری زانست و ڕۆشنبیرییان لەو ناوچەیەدا کردووە.

یەکێکی تر لەو هۆیانەی بووەتە هۆی گەشانەوەی زانست و ڕۆشنبیری لەو ناوچەیەدا، بایەخدانی میرەکانی بابان بووە بە خوێندن و ڕۆشنبیری لەو ناوچەی قەرەداغدا، چوونی مەردۆخییەکان لەسەر داوای میرانی بابان بووە بۆ ناوچەی قەرەداغ ، نیشتەجێبوونیان لەو شارۆچکەیەدا و دروستکردنی مزگەوت و خوێندنگە و وەقفکردنی چەند دێیەك لەسەر خوێندنگەکانیان و دابینکردنی پێویستییەکانی خوێندن، هەموو ئەم هەولانەی میرانی بابان ڕۆڵی گەورەیان بووە لە پێشخستنی خوێندن و ڕۆشنبیری لە ناوچەی قەرەداغدا.

### سەرچاوە و پەراوێزەکان:

(١) بڕوانە: محمد علي القرداغي، الشيخ عبدالله الخرپاني من خلال مخطوطات مكتبته، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی دووەم، بەشی دووهەم، ١٩٧٤، ص٢٣٩بەدواوە.

(٢) الدكتور عماد عبدالسلام رؤوف، دراسات وثائقية في تاريخ الكرد الحديث وحضارتهم، الطبعة الأولى ٢٠١٢م، دار الزمان– دمشق، ص ٣١–٣٢.

(٣) محەمەد قزڵجەیی، ناساندنێکی مزگەوتەکانی سلێمانی و خوێندنگە ئاینییەکانی، وەرگێڕانی د. ئاراس محمد صالح، چاپی یەکەم ٢٠١٣ز، چاپخانەی شڤان– سلێمانی، ل٦١.

(٤) المنشي البغدادي، رحلة المنشي البغدادي الى العراق، ترجمة عباس العزاوي، الطبعة الأولى ٢٠٠٨م، دار الوراق، بيروت– لبنان، ص ٨٦.

(٥) بۆ نموونە بڕوانە: دوکتۆر مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپی دووەم ٢٠١٠ز، دەزگای ئاراس– هەولێر، بەرگی یەکەم، ل ٧٥ بەدواوە.

(٦) شێخ نوری شێخ بابا عەلی، ساداتی تەکیەی قەرەداغ باوباپیری خۆتان بناسن، ئامادەکردنی عەلاء نوری، چاپی یەکەم ١٩٩٩ز، کوردستان، ص٣ بەدواوە. هەروەها: مەلا عبدالکریمی مدرس، بنەماڵەی زانیاران، چاپی یەکەم، بغداد، ل ١٤٠–١٤١.

(٧) حاجی شێخ نوری بابا عەلی، سەرچاوەی بێگەرد بۆ ناسینی مەرد، پێداچوونەوەی مامۆستا شێخ کەمال، چاپی یەکەم ٢٠٠١ز، چاپخانەی بینایی– سلێمانی، ل٥٢–٥٣.

(٨) مەلا عبدالکریمی مدرس، بنەماڵەی زانیاران، ل ١٤٢ بەدواوە.

(٩) دیمانەی توێژەر لەگەڵ مامۆستا بابا رەسول مەلا شێخ ئیسماعیل دێلێژەیی لە رۆژی سێشەمە ٢٠١٤/٢/١٦ لە سلێمانی.

(١٠) محەمەد قزڵجەیی، ناساندنێکی مزگەوتەکانی سلێمانی و خوێندنگە ئاینییەکانی، وەرگێڕانی د. ئاراس محمد صالح، چاپی یەکەم ٢٠١٣زاینی، چاپخانەی شڤان–سلێمانی، ل٣٤. هەروەها: عدنان عبدالقادر السيواني، العلامة ابن القرداغي حياته وآثاره، رسالة مقدمة الى مجلس كلية العلوم الاسلامية/جامعة بغداد، لنيل درجة الماجستير، غير مطبوع/٢٠٠٦م، ص٦.

(١١) مەلا عبدالکریمی مدرس، بنەماڵەی زانیاران، ل ٨٦.

(١٢) مەلا عبدالکریمی مدرس، بنەماڵەی زانیاران، ل ٨٦ بەدواوە.

(١٣) مەلا عبدالکریمی مدرس، یادی مەردان، چاپی یەکەم ١٩٨٣ز، بەغدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی دووەم، ل ٥٠٠.

(١٤) أميد نجم الدين جميل المفتي، التبيان في بيان الناسخ والمنسوخ في القرآن، الطبعة الأولى٢٠٠٥م، مطبعة روون– السليمانية، ص١٣–١٥.

(١٥) محەمـــەد عـــەلی قـــەرەداغی، بووژانـــەوەی مێـــژووی زانایـــانی کـــورد لـــە ڕێگـــەی دەسـتخەتەکانیانەوە، چـاپی یەکـەم ١٤٢٢ك ٢٠٠٢ز، چـاپخانەی الخنسـاء، بەغـدا، بـەرگی چوارەم، ل٤٨–٤٩. هەروەها بڕوانە: مەحمود ئەحمەد محەمەد، بایەخ پێدانی بابانەکان بـە ئاستی زانسـت و ڕۆشـنبیری لـە قەڵەمڕەوەکەیانـدا، گۆڤـاری ڕۆشـنبیری نـوێ، ژمـارە ١٠٢ تەموزی ١٩٨٤. هەروەها بڕوانە: د. ئاراس محەمـەد صـالح، هۆیـەکانی گەشـەکردنی بزاڤـی ڕۆشنبیری لە شاری سلێمانیدا، چاپی یەکەم ٢٠١٥ز، چاپخانەی سەردەم– سـلێمانی، ل ٢٤ بەدواوە.

(١٦) الشـيخ محمـد الخـال، الشـيخ معـروف النـودهي البرزنجـي، الطبعـة الأولى ١٩٦١م، مطبعـة التمدن– بغداد، ص ٦١. هەروەها محەمەد قزڵجەیی، ناساندنێکی مزگەوتـەکانی سـلێمانی و خوێندنگـە ئاینییـەکانی، چـاپی یەکـەم ١٤٣٤ك – ٢٠١٣ز، چـاپخانەی شـڤان– سـلێمانی، وەرگێڕانی د. ئاراس محمد صالح، ل٤٧.

(١٧) عەتا قەرەداغی، چۆن لە مێژووی قەرەداخ دەدوێـین، ڕۆژنامـەی کوردسـتانی نـوێ، سـاڵی نۆیەم، ژمارە ٢٢٠٩ ڕۆژی پێنج شەممە ٢٧/٧/٢٠٠٠.

(١٨) عەلاء نوری بابا عەلی، ڕاستکردنەوەی چەند هەڵەیەك، ڕۆژنامەی کوردستانی نـوێ، سـاڵی نۆیەم، ژمارە (٢٢٥٦) ڕۆژی چوارشەممە ٢٠/٩/٢٠٠٠.

(١٩) ينظر: الشيخ محمد الخال، الشيخ معروف النودهي البرزنجي، ص ٦٤–٦٥.

(٢٠) محمد امين زكي، مشاهير الكرد وكردسـتان في العهـد الاسـلامي، الطبعـة الثالثـة ٢٠١١م، دار الكتب والوثائق– بغداد، ص٣٤٩.

(٢١) د. عمـاد عبدالسـلام رؤوف، مراكـز ثقافيـة مغمـورة في كوردسـتان، الطبعـة الأولى ٢٠٠٨م، مؤسسة موكرياني– أربيل، ص٨٧–٨٨.

(٢٢ ) د. عماد عبدالسلام رؤوف، مراكز ثقافية مغمورة في كوردستان، ص٥٧–٥٨.

(٢٣) محمد علي القرداغي، كنوز الكرد في خزائن دار المخطوطات العراقية، الطبعـة الأولى ١٤٣٤هـ ٢٠١٣م، ص٢٥٤–٢٥٦.

(٢٤) محەمەد عەلی قەرەداغی، دیفاعێك لەخوێنـدن لـە حوجرەکـانی کوردسـتان، چـاپی یەکـەم ٢٠٠٩ز، سلێمانی – پرۆژەی تیشك، ل١٧.

(٢٥) عمر احمد نظامي، دایە عیصـمەت، چـاپی سـێیەم ١٤٣٠کۆچـی ٢٠٠٩ زاینـی، چـاپخانەی شڤان – سلێمانی، ل١–١٥.

(٢٦) الملا عبدالكريم المدرس، علماؤنا في خدمة العلـم والـدين، الطبعـة الأولى ١٠٣هـ١٩٨٣م، دار الحرية للطباعة– بغداد، ص ١٣١–١٣٢.

(٢٧ ) محەمـــەد عـــەلی قـــەرەداغی، بووژاندنـــەوەی مێـــژووی زانایـــانی کـــورد لـــە ڕێگـــەی دەسـتخەتەکانیانەوە، چـاپی یەکـەم ١٢٢کۆچـی ٢٠٠٢ز، چـاپخانەی الخنسـاء، بەغـداد، ل ٢٨-٢٨٧.

(٢٨) دیمانەی توێژەر لەگەڵ مامۆستا مەلا عومەر ئەحمەد نیزامی لە ڕۆژی ٢٠١٤/٣/٣ لە ماڵی خۆیان گەڕەکی خەبات لە سلێمانی.

(٢٩) د.عماد عبدالسلام رؤوف، مراكز ثقافية مغمورة في كردستان، ص ١٣٨-١٣٩.

(٣٠) بێخـود، دیـوانی بێخـود، کۆکردنـەوەی محەمـەدی مـەلا کـەریم، چـاپی دووەم ٢٠١١ز، چاپخانەی شڤان- سلێمانی، ل ٩.

(٣١) بابا شێخ مەردۆخ ڕۆحانی شێوا، مێژووی ناودارانی کورد، چاپی یەکـەم ٢٠١١ز- هـەولێر، بەرگی یەکەم، ل ٢٩٨-٢٩٩.

(٣٢) دیمانەی توێژەر لەگەڵ مامۆستا بابـا ڕەسـول مـەلا شـێخ ئیسـماعیل دێلێـژەیی لـە ڕۆژی سێشەمە ٢٠١٤/٢/١٦ لە سلێمانی.

(٣٣) د. عماد عبدالسلام رؤوف، مراكز ثقافية مغمورة في كوردستان، ص١٠٩.

(٣٤) الملا عبدالكريم محمد المدرس، علماؤنا في خدمة العلم والدين، ص٩٥-٩٦.

(٣٥) محەمەد ئـەمین زەکـی بـەگ، تـاریخی سـلێمانی و وڵاتـی، چـاپی دووەم ٢٠٠٨ سـلێمانی، چاپخانەی شڤان، ل ١٧٧.

(٣٦) د. عماد عبدالسلام رؤوف، مراكز ثقافية مغمورة في كوردستان، ص ١٢٣.

(٣٧) محەمەد عەلی قەرەداغی، با نەخشەی جوگرافیای ڕۆشنبیری قەرەداغ تەسـك نەکەینـەوە، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ساڵی نۆیەم ژمارە (٢٢٢٤) دووشەممە ٢٠٠٠/٨/١٤.

(٣٨) د. عماد عبدالسلام رؤوف، مراكز ثقافية مغمورة في كوردستان، ص٦٤.

(٣٩) الملا عبدالكريم محمد المدرس، علماؤنا في خدمة العلم والدين، ص ٢٦٣-٢٦٤.

(٤٠) الملا عبدالكريم محمد المدرس، علماؤنا في خدمة العلم والدين، ص٣٢٠-٣٢١.

(٤١) د. عماد عبدالسلام رؤوف، مراكز ثقافية مغمورة في كوردستان، ص ٧٧.

## ملخص البحث:
## الدراسة والحركة العلمية في منطقة قرداغ ومدارسها

تشتهر منطقة قرداغ بمدارسها وعلمائها في انحاء كوردستان وخارجها، هذه المنطقة من أوائل المناطق التي انشئت فيها المدارس على مستوى كوردستان بعد الفتح الإسلامي، كما هو معلوم أن الامام حمزة ابن الامام موسى الكاظم بعد فراره من بغداد توجه الى كوردستان وسكن في قرية (تكية القرداغ) وبنى فيها مدرسة وقام بالتدريس ونشر العلم، رحل في (عام ١٨٣هـ) رحمه الله، وإنتهج أبنائه نهجه واستمروا على التدريس ونشر العلم لعدة قرون حتى أيامنا هذا، وكان لهم دور رائد في خدمة العلم والدين في منطقة قرداغ ومدينة السليمانية خاصة وجميع انحاء كوردستان بشكل عام، إشتهرت هذه الأسرة الكريمة بـ (سادات تكية القرداغ) وقدمت خدمات جليلة عبر تاريخهم الحافل لخدمة الدين والعلم.

وكان لكل من الأسرة المردوخية والبرزنجية وابن الخياط القرداغي دور كبير في نشر العلم وبناء المدارس والمساجد وخدمة طلبة العلم والمسلمين، وبالأخص الأسرة المردوخية حيث كان لها دور كبير في خدمة العلم والدين في مركز قضاء القرداغ، وظهر فيهم علماء كبار مثل الشيخ عبداللطيف الكبير وابنائه والشيخ عمر القرداغي (ابن القرداغي) وغيرهم من علماء كبار رحمهم الله.

كان للأمراء البابانيين دور رائد في نشر العلم ودعم العلماء وخدمة الطلاب، ودعوة العلماء وتعينهم في مدارس القرداغ مثل المردوخيين وغيرهم وكان لتخصيص الوقف المالي لمدارس القرداغ دور كبير في تطوير العلم والثقافة في هذه المنطقة وغيرها من المناطق الخاضعة لسلطة الأمارة البابانية.

توجد في قضاء القرداغ وأريافه مدارس علمية مشهورة مثل مدرسة القرداغ في مركز القضاء، ومدرسة تكية القرداغ وقازانقاية وديليزة وگڵەزەردە وغيرها من القرى في هذا القضاء، والكثير من العلماء المشهورين خدموا العلم والدين والثقافة في قرداغ.

## Abstract

### Scientific roles and schools in Qarada region and Schools

Qaradag region was known from their schools and scientists in/out all Kurdistan regions, considered as the first area where the schools were established in Kurdistan after Islamic conquest. As is well known that that Imam Hamza Ibn Imam Mousa Elkazem After fleeing from Baghdad to Kurdistan was settle in ( Qarada takya) and built a school there, And he has taught and Dissemination of science. And after his died in 183 H. his sons followed his approach; they kept on teaching and dissemination of science foe centuries up to dates, they are a leading role in science and Religion service in Qarada, Sulaimani and in all Kurdistan. In addition, Mardukh, Barzenja and Ibn Elkhayat Alqaragi families have a great role in dissemination of science, building of schools and mosques and serving Muslims and science students especially Mardukh family in Qarada center and a lot of senior scientists appeared like Sheikh Abdul Latif and sons, Sheikh Omar Qaradagi and others. The Babane ameers have the same role. There were a lot of famous scientific schools like Qaradag school in the city center, Qarada takya school, Qazanqaya, Delezha, Glazarda and others, with a lot of scientists that serves religion, science and culture in Qaradag.

# خزمەتگوزارییە گشتییەکانی شاری ڕەواندز لەنێوان ساڵانی (١٩٢٣- ١٩٥٨)

**د. ئامانج ئەحمەد مستەفا**
کۆلیژی ئاداب — زانکۆی سۆران

شاری ڕەواندز یەکێکە لە شارە دێرینەکانی هەرێمی کوردستان و بەهۆی هەڵکەوتە جوگرافیاکەیەوە هەر لە کۆنی کۆنەوە ، دواتریش لە سەردەمی ئیمارەتە کوردییەکانەوە، قەڵایەکی بەرز بووە کە ڕووبەڕووی دوژمنانی داگیرکەر بۆتەوە و مێژوویەکی پڕشنگداری تۆمار کردووە .

هەرچەندە بوونی دامودەزگا خزمەتگوزارییەکان لەم شارە مێژوویەکی کۆنی نییە لەبەر شوێن و سەختی ڕێگاوبان و گرینگی نەدان بە خەڵکی ناوچەکە، تاکو هاتنی ئینگلیزەکان و دەرکردنی دەسەڵاتدارانی عوسمانی لە شارەکە و هەوڵدان بۆ پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری، کە کەمترین ڕێژەی بەرکەوتووە بە بەراورد لەگەڵ شارەکانی تردا.

ئەم توێژینەوەیە هەوڵدانە بۆخستنەڕووی ڕەوشی تەندروستی و خزمەتگوزارییە گشتییەکان کە پێشکەشی شارەکە کراوە لە سەردەمی پادشایەتیدا لە نێوان ساڵانی (١٩٢٣-١٩٥٨)، کە لە دوو تەوەر پێکهاتووە و هەر تەوەرێکیش چەند بابەتێک لە خۆدەگرێت ..تەوەری یەکەم: باس لە بابەتەکانی باری تەندروستی و بنکە تەندرووستییەکان دەکات و تەوەرەی دووەمیش: باس لە خزمەتگوزارییە گشتییەکان دەکات وەک شارەوانی و پۆست و تیلیفون و بەڕێوەبەرایەتییەکان.

**تەوەری یەکەم : ڕەوشی تەندروستی**

**بابەتی یەکەم . تەندروستی:** ڕەواندز وەک زۆربەی شارەکانی تری هەرێمی کوردستان، لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا دانیشتوانەکەی بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان هانایان بردۆتە لای شێخ و سەید و مەلاکان، باوەڕیان بە نوشتە و دوعاکانیان هەبووە. پێیان وابووە کە تووشبوون بە نەخۆشی، شتێکی سروشتیە و دەردێکی خوداییە و خودا خۆی شیفای چاکبوونەوە بۆ نەخۆشەکان دەنێرێت .

لەگەڵ ئەو دیاردە کۆمەڵایەتییەدا کەسانێک هەبووینە دەستێکی باشیان هەبووە لە چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان لە ڕێگای بەکارهێنانی گژوگیای سروشتییەوە، کە شارەزایی باشیان هەبووە لەدروستکردنی داوودەرمان.[1] بە ( داو و دەرمانی میللی) ناسراوە تا ئەو کاتەی نەخۆشخانەی میری لە شارەکان دامەزراوە، بەو کەسانەش وتراوە ( حەکیمە میللییەکان ).[2]

ئەو حەکیمانە لە ئەنجامی کارکردنی زۆرو تاقیکردنەوە و ئەزموونی زۆرەوە شارەزاییان پەیداکردووە و چارەی زۆر لە نەخۆشییەکانیان کردووە، ئەمەشیان لە باوو باپیرانەوە بۆ بەجێماوە و ناوبانگیان پێ پەیداکردووە و لە دوورو لە نزیک خەڵکی پەنای بۆ هێناون بۆ وەرگرتنی چارەسەر لە سووتان و شکان و سەرئێشە و گەرووکەوتن و لەرزوتا. ئەو چارەسەرە میللییانە بەدرێژایی دەسەڵاتی عوسمانی و پادشایەتی ئینگلیزەکان بەردەوامی هەبوو، چونکە بنکە تەندروستییەکان هەمیشەیی نەبووینە و بە شێوەی گەڕۆک ناوە ناوە سەردانی شارەکانیان کردووە.[3]

زۆر لە گۆڤارو ڕۆژنامەکانی ئەو کاتە خەڵکیان ئاگادارکردۆتەوە و هۆشیارییان داوەتە خەڵک دەربارەی ئەو حەکیمە میللییانە، کەبەبێ مۆڵەتی فەرمی کەس نابێت چارەسەری نەخۆشییەکان بکات و داوودەرمان بدات بە نەخۆشەکان، دەنا دووچاری سزای یاسایی دەبێتەوە[4] بەڵام لەبەرنەبوونی بنکە تەندروستی و تیمارگەکان وایکرد

کە خەڵکی باوەڕ بە نوشتە و دوعا و حەکیمە میللییەکان بکەن. لە سەردەمی عوسمانیدا کاتێک کە ڕەوشی خزمەتگوزاری تەندروستی زۆر خراپ بووە بە ناچاری هەر گەڕیدەیەکی ئەوروپاییان ببینابایە ئەگەر نۆژداریش نەبوایە لێی کۆدەبوونەوە و داوای چارەسەری و دەرمانیان لێدەکرد.[٥]

ئەو حەکیمە میللییانەی ڕەواندز لە چەند کووچە و گەڕەکێکدا بوونیان هەبووە و هەیانبووە پیاو، نموونە (عەباس دبۆ و مام عالی و مستۆ و زۆری تریش) هەشیانبووە ژن بووە وەک (ئاغەژنە شەریف، ئامینەی یحیا بەگ و حەبیبە عارف وحەبیبە عەلۆ وپلکە فاتم و دایکی قادر بەگی سەعید بگ)،[٦] کە لەماڵەکانی خۆیاندا نەخۆشیان چارەسەرکردووە پاش ئەوەی کە دەرمانیان لە گژوگیا دروستکردووە و بەکاریان هێناوە و هەندێکیان بەرامبەر بە پارە وهەشیانبووە بەخۆبەخشی بووە، ئەو گژوگیایانەش کە بەکارهاتوون: (پورنگ، جاترە، هەنار، گروان، دڕی، گوڵە حاجیلە، گوڵە زەرد، گوڵە روون، نەعنگەرجەک ومێخەک، کووزەڵە، پەڵپێنە، ڕەشکە، شملّی، شبیت، شاتووی وشککراو، تووتن، پەڵپێنە و مێخەک و گەڵای هەنجیر و ڕەشکە و ڕەزیانە و ئاوی کەرەوز و نەعنا و گوڵە هێرۆ و بەهێ و هەرمێ و سێو و مازو و گوڵ هەنار).

بەڵام هەر لەگەڵ زیادبوونی ژمارەی دانیشتوانی شارەکان، پێداویستییەکانی تەندروستی وەک دەرمان و پزیشک ڕووی لە زیادبوون کردووە و داوودەرمان و حەکیمە میللییەکان بەرەو لەناوچوون چوون.[٧]

ئەو دەرمانانەی کە لە گژوگیا دروستکراون هەروا بە سادەیی و بێباکانە بەکارنەهاتوون، بەڵکو لەلایەن کەسانی شارەزاو زیرەکەوە دروستکراون و بەکارهاتوون و بە گوێرەی نەخۆشییەکە ناوی تایبەتییان لێندراوە و نموونەی ئەو کەرەستانەی کە دەرمانەکانیان لێ دروستکراوە ئەمانەن (بنێشت، هەنگوین، پەلکی هەنار، قەزوان و مازو

و پوونگ و نەعنا .....هتد[٨]. جگە لەو دەرمانانە کەسانێک هەبووینە کە خزمەتی زۆریان بە خەڵکی کردووە بە تایبەتی لە حاڵەتی شکاندا کە پێیانوتوون (بەیتار)[٩] و هەر ئەو نازناوەشیان پێوە لکاوە و پێوەی ناسراون. ئەو بەیتارانە شوێنە شکاوەکەیان گەرم کردووە و دواتر بە هێواشی هێناویانەتەوە شوێنی خۆی و چەوریان کردووە و هەویر یان پیازی پیشاویان لەسەر داناوەو بە دوو پارچە داری ڕێک بەستۆتەوەو هەڵیان بەستووە و تاماوەیەک ماوەتەوە تاکو چاک بۆتەوە. لە کاتی هەڵبەستنی شوێنە شکاوەکە بە خراپی ئەوا ماسی کوتاویان لە شوێنی شکاوەکە داناوە بۆ ماوەیەک بەستراوەتەوە دواتر بەیتارەکە بە هێواشی هەڵیوەشاندۆتەوە بۆ ئەوەی دیسان بە ڕێکی شوێنی شکاوەکە بهێنێتەوە شوێنی خۆی.[١٠] هەروەها کەسانێک هەبوونە کە چارەسەری نەخۆشییەکانی کەچەڵی و خوران و ڕشانەوە و سکچوون و باداری و شەکرە و سەرێشە و ئازاری گورچیلەیان کردووەو دەرمانیان بۆ دروستکردوون[١١]، (حەبیبەی عەلۆیی) وە یان (پلکە حەبیب) لە ساڵانی پەنجاکان چارەسەری زۆربەی نەخۆشەکانی منداڵانی کردووە و خەڵکی سەردانی کردووە، وەک نەخۆشییەکانی (بەبۆن کەوتن) بۆن و مانگرتن و ترسان و گەرووهێنانەوە و لەرز و فەرج کەوتن (ناوک هێنانەوە)...هتد.[١٢] کەچی بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشە دەروونی و عەقڵییەکان خەڵکی بە گشتی پشتیان بە دوعا کردن و نوشتەکردن بەستووە.[١٣] وەیان سەردانی پیاو چاک و مەزارگە و شێخ و مەشایخ.

زۆرجار بەشێک لەو دەرمانە میللییانە ناتەندروست و خراپ بووینە و کاردانەوەی خراپی هەبووە و بەتایبەتی ئازاری ددان و شێوازی چارەسەرکردنی، کە کەرەستە و ئامرازی پیسیان بەکارهێناوە، کە ئەم حاڵەتە مامانەکانیشی دەگرتەوە کە زۆر جار چەقۆی پیسیان بەکارهیناوە بۆ بڕینی ناوکی مناڵی تازە لەدایکبوو کە بۆتە هۆی هەوکردنی شوینەکە و هۆکاری مردنی مناڵەکە.[١٤] زۆر لەو حەکیم و مامانانە ناوبانگیان هەبووە لە ڕەواندز و دەوروپشتی وەک (مام عالی و

مستۆ بۆ ناوک هێنانەوە، پلکە خەجیج بۆ برین و کەچەڵی و وەستا حاجی رەشید بۆ شکان و پلکە زولێخا بۆ چاوکولی)، ئەمە جگە لە مامانەکان  کە ناوبانگیان هەبووە وەک (دایکا حەسەنی و دایکا فەقێ و ئامینا حەکیمی و پلکە خەجیج و حاجی حەبیب). [١٥]

زۆرێک لەو نەخۆشییانەی کە بڵاوبوونەتەوە و بوونەتە هۆی مردنی خەڵکانێکی زۆر لە رەواندزو دەوروپشتی نەخۆشی (سووریژە، تاعوون، مەلاریا، ڕشانەوە، سیل و ئاوبەندی)، کەلەبەر نەبوونی دەرمان و بنکەی تەندروستی پەنایان بردووە بۆ شیخ و مەلا و نوشتە و مەزاری پیاوچاکان وەک مەزاری (مەلا وسوو، مەلای خەتی[١٦] و شێخ قەرە حەسەن و مەلا شیخ تاهیر سەرانەیی) و...هتد.[١٧] هەربۆیە چاپەمەنییەکانی ئەوکاتەی ناوەوە و دەرەوەی ڕەواندز جورێک لە هۆشدارییان بە خەڵکی داوە کە ئاگاداری بڵاوبوونەوەو تووشبوون بە نەخۆشییەکان بن و ڕێگای تەندروست بەکاربێنن بۆ چارەسەرکردنیان، وەک ڕۆژنامەی زاری کرمانجی و ڕۆناکی کە لە ڕەواندز و لە هەولێر دەردەچوون. ئەمانە گشتیان دەمانگەیەنن بەو دەرەنجامەی کە خەڵکی هۆشیاریی تەندروستییان کەم بووە هەروا ماوەتەوە تاکو کۆتایی ساڵانی جەنگی دووەمی جیهانی و خەڵکی لە ڕێگای کۆمەڵەو ڕێکخراوەکان و بڵاوکراوەکاندا ئاگادارو هۆشیار کراونەتەوە.

لەو ماوەیەدا دەسەڵاتدارانی ئینگلیز زۆر بە تەنگ نەخۆشی و خەمی خەڵکییەوە نەبووینە و نەیانویستووە بنکە تەندروستییەکان لە شارو شارۆچکەکان زۆر بڵاو بکەنەوە و خزمەتی خەڵکی سفیل بکەن، بۆیە نەخۆشییە کوشندەکان زۆر بە زوویی تەشەنەی کردووە و خەڵکی زۆری کوشتووە، هەرچەندە هەندێک جار چارەی هەندێک نەخۆشییان کردووە وەک (مەلاریا و تاعوون و ڕشانەوە ) بۆ هێور کردنەوەی بارودۆخ و چەسپاندنی دەسەلاتیان.[١٨] نەخۆشی مەلاریا یەکێک بووە لەو نەخۆشییانەی کە زۆر بڵاوبۆتەوە لە لیوای هەولێر، خەڵکانێکی زۆری کوشتووە، لە بەر کەمیی دەرمان و خزمەتگوزارییە

تەندروستییەکان و گرنگی نەدان بەم لایەنە لە کۆتاییەکانی سالانی ٢٠ی سەدەی ڕابردوو. کە بێگومان ڕەواندزیش سەر بە لیوای هەولێر بووە، بۆیە بە گشتی ئاماژەی پێکراوە.

**خشتەی ژمارەی نەخۆشەکانی پەتای مەلاریا لیوای هەولێر**
**لە ساڵی ١٩٢٨ـ١٩٢٩[١٩]**

(١)

| ساڵ | ژمارەی تووشبووان بە مەلاریا | ژمارەی هەموو نەخۆشەکان | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|---|
| ١٩٢٨ | ٢٧١٨ | ١٥٦١٨ | ٪١٧.٤ |
| ١٩٢٩ | ٣٥٤٥ | ٢٤٥٥٦ | ٪١٤.٤ |

لەبەر نەبوونی خزمەتگوزاری و پشتگوێخستنی لایەنی تەندروستی لەلایەن حکومەتی پادشایەتییەوە، لیوای هەولێر تەنها ڕێژەی لە ٦٪ی لە بودجەی وەزارەتی تەندروستی بۆ تەرخان کرا بوو، بۆیە بڵاوبوونەوەی نەخۆشی مەلاریا بە پیسبوونی ئاو و زۆری گۆم و زەلکاو و زیادبوونی مێشوولە وای کردبوو ڕێژەی تووشبووان بە نەخۆشی مەلاریا ڕووی لە زیادبوون بێت. بە تایبەتی لە سالانی پەنجاکان تا ئەو کاتەی ڕژێمی کۆماری دادەمەزرێت و چارەسەری گونجاو بۆ نەخۆشییەکە دەدۆزرێتەوە.
ئەم خشتەیەی خوارەوە ئاماری تووشبووانمان بۆ ڕووندەکاتەوە بە مەلاریا لە نێوان سالانی ١٩٥٢ـ١٩٥٧[٢٠]

(٢)

| ساڵ | ژمارەی تووشبووان | جیاوازی |
|---|---|---|
| ١٩٥٢ | ٣٧,٣٠٥ | زۆر بووە |
| ١٩٥٧ | ٢,٧٤٦ | کەمی کردووە زیاتر لە١٣ جار |

بوونی ئەو نەخۆشییانە بەو ژمارە زۆرەی تووشبووان ئەوەمان بۆ دەردەخات  کە لایەنی پەیوەندیدار زۆر بایەخی بەلایەنی تەندروستی نەداوە لە شارەکە و دەوروپشتی، لەبەر زۆر هۆکار کە گرینگترینیان سەختی ڕێگاوبان و کەمتەرخەمی دەسەڵاتداران و هۆشیاری تەندروستی کاریگەری زۆری هەبووە لەسەر زیادبوونی ڕێژەی تووشبووان بە نەخۆشییەکان، بەتایبەتی دایکان و باوکان زۆر جار ئاگادارکراونەتەوە لەڕێگای ڕۆژنامەکانەوە کە چۆن بتوانن بەرگری لە نەخۆشییەکان بکەن. ڕۆژنامەی زاری کرمانجی ڕۆڵێکی باشی هەبووە لە هۆشیارکردنەوەی دایکان و باوکان لە نەخۆشییەکانی منداڵان، وەک (ڕشانەوە و سکچوون و سوورێژە)،[21] هەروەها خەتەنەکردنی منداڵ بەباش دەزانێت و هانی خەڵکی داوە کە ئەم کارە ئەنجام بدەن.[22]

**بابەتی دووەم: نەخۆشخانە و شوێنە خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان.**

هەروەک زۆربەی شارەکانی تری کوردستان شاری ڕەواندز لایەن و خزمەتگوزارییە گشتییەکانی تیادا پشتگوێ خرابوو بە بەراورد لەگەڵ شارەکانی تری عێراق کە ژمارەی پزیشک و برینپێچەکانی زۆرکەم بووینە. هەموو عێراق بە بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکان و کەمی نەخۆشخانە و دەرمان دەیانناڵاند کە لە ساڵی ١٩٣٦ لە شاری هەولێر تەنها شەش پزیشک و دوو دەرمانخانە هەبووە[23] لە ڕەواندزیش تەنها یەک خەستەخانە هەبووە لە چلەکان، کە پێکهاتبوو لە دوو هۆبە، یەکێکیان بۆ ژنان و ئەویتریان بۆ پیاوان و یەک دکتۆر و پەرستارێک و دوو برینپێچی هەبووە، زۆر جار ئەو دکتۆرانەی کە هاتوون بۆ خەستەخانەی ڕەواندز کورد نەبووینە و بە زمانی تر ئاخاوتنیان کردووە و لە ڕێگای وەرگێڕەوە کارەکانیان ئەنجام داوە، نموونەی ئەو دکتۆرانەش: هورمزی فەلە و نەدیمە خان و نورل هوداش سستەر بوون زۆر بەباشی کارەکانیان ڕادەپەڕاند.[24] بۆ ددان هێشانیش خەڵکی پەنایان دەبرد بۆ داوودەرمانی میللی تاڕادەیەک ئێش و ئازاری کەم دەکردەوە، بەڵام تاسەر نەبووە چونکە ئێشی ددان زۆر ناخۆش بوو کە بە ناچاری ڕێگای جۆراوجۆرو ناتەندروستیان بە کاردەهێنا بۆ ددان

هەڵکێشـان وەک بە داو ڕاکێشـان و درێشـە و گـازی بزمـار دەرهێنـان وەیـان زەردکردنی پیاز لە سـەر ددانیـان دائەنا تـاکوو ئـازارەکەی کەم بیـتەوە، بەڵام دواتـر (عەبـدوڵلا ئەفەنـدی) و (عەلـی بەگـی) بـرای بە شـێوەیەکی بـاش و ڕێگـا پێدراو ئەو کارەیـان ئەنجـام داوە و خەڵکـی حەسـاونەتەوە. بـۆ گـوێ هێشـان دووکەڵـی جگەرە، وە پەڕۆی گەرم و ئاوی کوڵا و بەیبوون و پوونگ بـۆ سـک هێشـە بەکار دەهـات، تـا ئەو کـاتەی کە دکتـۆر و دەرمـان پەیـدابوون و شـوێنی ئەو چارەسـەرە کاتییانەیان گرتەوە.[٢٥]

خـۆ ئەگەر باسـی ڕەوشـی تەندروسـتی و خزمەتگوزارییەکـانی دەوروپشتی شارەکان بکەین ئەوا لە بارێکی زۆر خراپدابووە لە ماوەی سـاڵانی سـییەکان و چلەکـانی سـەدەی بیسـتەم، دکتـۆر و بـرینپێچ لە لادێکان هەرنەبووە، وەیـان ژمارەیـان زۆر کەم بـووە، ئەگەر خەڵکانێک بە کـاری دەرزی لێـدان وەیـان برینپێچـی هەڵسـابان بە دکتـۆر بانـگ دەکـران و نازنـاوی دکتۆریشـی بـۆ ئەبـڕایەوە کە نموونەیـان زۆرە لە هەموو شار و شارۆچکەکانی کوردستان.[٢٦] نموونەی ئەو دکتۆرانەش ئەمـانە بـوون: (د.کەمیـل، کە لوبنـانی بـوو لەگەڵ هـورمزی فەلە )، لە ڕەوانـدز خەسـتەخانە زۆر درەنـگ دروسـتکراوە، بە گـوێرەی زۆربەی سەرچاوەکان دوای کۆتایی شەڕی دووەمی جیهانی بووە لە ١٩٤٤، کە پێکهاتبوو لە دکتۆرێک و سستەرێک و سێ موزەمید و سەیدەلی[٢٧].

ئەو کەسانە کە بەو کارانە هەڵدەستان، لەبەرامبەردا پارەکی کەمیـان وەردەگرت و دەبوو بەسەرچاوەیەک بۆ بژێوی ژیانیان، بەڵام دواتر کە نۆڕینگەکـان کـرانەوە و ئەوانـیش کەم بـوونەوە. خەڵکـی گونـدەکانی دەوروپشتی ڕەواندز زۆرجار بۆ یارمەتی تەندروستی هانایان بردۆتە لای تـیم و گەڕیـدە و کرێکـارانی ڕێگاوبـان، (هـامیلتۆن[٢٨] کاتێـک کە خەریکـی دروسـتکردنی ڕێگـای هەولێر و ڕەوانـدز بـووە، کە بە ڕێگـای (هـاملتۆن) ناسـراوە باسـی ئەوە دەکـات کە زۆرجـار دەسـتی یـارمەتی تەندروستی بۆ خەڵکانی دەوروبەر درێژکردووە، هەروەک دەگێڕێتەوە (جارجـارەش خێڵەکییەکـان لە شـاخەکانەوە لە شـەڕەوە بـۆ تیمـارکردنی

زامەکانیان دەهاتن و زۆر باوەڕیان بەچارەسەرە ئاساییەکەی من هەبوو و جێگای دڵنیاییان بوو ).[٢٩]

هەروەها لەدرێژەی گێڕانەوەی باسەکەیدا (هامیلتۆن) ئاماژە بەو نەخۆشانە دەکات کە زۆر باری تەندروستیان خراپ بووە و توانیویەتی ڕەوانەی هەولێریان بکات.[٣٠] ئەمە دەمانگەیەنێت بەو دەرەنجامەی کە بۆ چارەسەری نەخۆشییەکان لە ساڵانی بیستەکان خەڵکی چوونەتە هەولێرو هیچ دکتۆری نیشتەجێ لە دەرەوەی هەولێر نەبووە، ئی. ئار. لیچ لە کتێبەکەیدا **(ڕەوشی ئابووری و کۆمەڵایەتی کوردی ڕەواندز)** ئاماژە بە نەبوونی پزیشک لە دەڤەرەکە دەکات و دەڵێت "لێکۆڵینەوەی خزمەتگوزاری گشتی ماندوومان ناکات، چونکە ناوچەی لێکۆڵینەوەکەمان هیچ دکتۆری نیشتەجێی لە دەرەوەی شاری هەولێر نەبووە"[٣١] ئەمە جگە لەوەی لە لیوای هەولێر ژمارەی پزیشکەکانی مۆڵەت پێدراو زۆر کەم بووە لە ساڵانی چلەکان تا کۆتایی پەنجاکان، کە لەم خشتەی خوارەوە بە ڕوونی بە دیار دەکەوێت کە جگە لە پزیشک بە ڕێژەیەکی کەم هیچ لایەنێکی تری خزمەتگوزاری تەندروستی بوونی نەبووە و هەتاکو کۆتایی دەستەڵاتی پاشایەتی لە عێراق.

**خشتەی ژمارەی پزیشکەکانی لیوای هەولێر لە نێوان ساڵانی ١٩٣٦ـ١٩٥٨**[٣٢]. (٣)

| ساڵ | پزیشک |
|---|---|
| ١٩٣٦ | ٦ |
| ١٩٤٨ | ١٠ |
| ١٩٤٩ | ١٧ |
| ١٩٥٠ | ١٥ |
| ١٩٥١ | ١١ |
| ١٩٥٢ | ١٥ |
| ١٩٥٨ | ٢١ |

لەبەر نەبوونی نەخۆشخانە و پزیشک و دەرمانی باش، ساڵانە نەخۆشی جۆراوجۆر بڵاوبۆتەوە و خەڵکانێکی زۆری کوشتووە و وەک نەخۆشییەکانی سیل و تاعوون و ڕشانەوە و تراخۆما (چاوکولی). و هەروەک لە سەرەتاوە ئاماژەم پێی کرد خەڵکی پەنایان بردۆتە بەر حەکیمە میللییەکان و سەر مەزاری پیاو چاکان لە ڕەواندز و دەورو پشتی بۆ دوعا و وەرگرتنی چارەسەر. بە گوێرەی ڕاپۆرتی (فیتس پاتریک Fits Patric) ڕەوشی تەندروستی خزمەتگوزاری لە لیوای هەولێر بە گشتی زۆر خراپ بووە، بەڵام وردە وردە لە نێوان ساڵانی ١٩٣٨ تاکو ١٩٥٨ بەرەو باشی چووە.(٣٣)

ئەم ڕەوشە خزمەتگوزارییە خراپە تەندروستییە، لە ڕەواندزیش بەردەوامی هەبوو تا ناوەڕاستی ساڵانی چلەکان تا ئەوکاتەی نەخۆشخانەی حکوومی لە ڕەواندز کرایەوە لە ساڵی ١٩٤٦(٣٤) ، کەچی هەندێک لە سەرچاوەکان ساڵی ١٩٤٧ بە ساڵی کردنەوەی نەخۆشخانەی ڕەواندز دادەنێن. هەروەکو پێشتر ئاماژەم پێکرد، لە بەر نەبوونی خزمەتگوزاری تەندروستی و هۆشیاری تەندروستییەوە، خەڵکی ڕەواندز دووچاری جۆرەها نەخۆشی خراپ و کوشندە بوونەتەوە وەک نەخۆشی مەلاریا، کە بەهۆی پیسی و پاشماوە و زۆری مێشوولەوە بڵاوبۆتەوە خەڵکی ئاگادار کراونەتەوە کە ئاگاداری پاک و خاوێنی بن و دکتۆر و فەرمانبەرانی تەندروستی سەردانی شوێنە گشتییەکانیان کردووە بۆنموونە لە ساڵی ١٩٤٦ تاکو ساڵی ١٩٥٦ پزیشکێکی لوبنانی کە ناوی "کامیل" بووە بۆ بەرگریکردن لە بڵاوبوونەوەی نەخۆشی مەلاریا سەردانی شوێنە گشتییەکانی کردووە، تا ئاگاداری پاکوخاوێنی شاربێت کاتێک کە چۆتە مزگەوتی تەکیەی ڕواندوز سەیر دەکات ئاوی حەوزەکە پیس بووە، جگە لە بۆنێکی ناخۆشیشی هەبووە لە ئاوی حەوزەکە، بۆیە بڕیاردەدات کە دابخرێت، هەرچەندە ناڕازی بوونی خەڵکی لێدەکەوێتەوە و پاش ماوەیەک دیسان دەکرێتەوە.(٣٥) ئەمە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە خەڵکی سوودیان لە

حەوزی مزگەوتەکان وەرگرتووە بۆ خۆشوشتن کە شار گەرماوی لێ نەبووە، بەڵام دواتر دوو گەرماو ناوبانگی لە ڕەواندزدا هەبووە وەک گەرماوی ڕەواندز لە گەڕەکی (ژێری) و گەرماوی سەعید بەگ لە (قەراتێ). ئەو گەرماوانە خزمەتی باشیان بە خەڵکی شارەکە کردووە و تاڕادەیەک پەیوەندی هەبووە بە کەمبوونەوەی نەخۆشییەکان. بەڵام کە ڕووسەکان هاتن زۆر شوێنیان لە شارەکە خاپوور و وێران کرد، ئەو حەمامانەشی بەرکەوت و ڕووخان، دواتر (فەتحوڵا ئەمین) گەرماوێکی تری بنیات ناوە. لەساڵانی چلەکانیش بنەماڵەی ئیسماعیل بەگی سەعید بەگ توانییان گەرماوێک دروست بکەن و دوابەدوای ئەوانیشەوە شارەوانی ڕەواندز گەرماوێکی دروست کرد بۆ خزمەتی هاووڵاتیان کە شوێنەوارەکەی تاکو ئەمڕۆش هەر ماوە.[٣٦] ئیتر رەوشی تەندروستی قەزای ڕەواندز بەم شێوەیە مایەوە تاکو ڕووخانی ڕژێمی پاشایەتی، دواتر نەخۆشخانە و بنکە تەندروستییەکان لە قەزاکە و ناحیەکانی ڕووی لە زیادبوون بوو.

**تەوەری دووەم: خزمەتگوزاری گشتی**
**بابەتی یەکەم : شارەوانی و پاک و خاوێنی**

دوای هاتنی ئینگلیزەکان لە سەرەتای سالانی بیست بۆ ڕەواندز و دامەزراندنی دامودەزگا میرییەکان بەتایبەتی لەسەردەمی بوونی (سەید تەها) بە قائمقامی ڕەواندز، گرینگی زۆردرا بە پاکوخاوێنی شوێنە گشتییەکان بەتایبەتی بازاڕو گەرماوەکان و گۆشت فرۆشان و چێشتخانەکان و ئاو و ئاوەڕۆ.

دەربارەی خزمەتگوزاری ئاو، لەسالانی بیستەکاندا ئاو وەک ئێستا بەبۆڕی دابەشی سەر ماڵەکان نەکرابوو خەڵکی ڕەواندز ئاویان لە جۆگە و کانی و سارداو و کارێزەکان، بەتایبەتی ئاوی سارداوەکانیان بۆ خواردنەوە دەبردەوە بۆ ماڵەکانیان وەک (سارداوی[٣٧] گەردەگەرد، سارداوی ڕەشاغە، سارداوی سپی، سارداوی وەستا ئەلیاس لە گەڕەکی ژێری، سارداوی ماڵی باویل ئاغا، سارداوی ماڵی حاجی عەبدولرەزاق و سارداوی ماڵی مستەفا ئەفەندی). چەند ماڵێک لە گەڕەکەکان حەوز و "قولەتین"[٣٨]یان هەبووە کە لەوێوە خەڵکی ئاویان بە گۆزە و مەرکانە گواستۆتەوە ماڵەکانیان. ئاو هەر لەکۆنەوە گرفتی گەورەی دانیشتوانی ڕەواندز بووە، بۆیە هەر لە زەمانی دەسەلاتی پاشای گەورەوە تا ڕۆژگاری کەریم بەگی ئەحمەد ئەفەندی کە قائمقام بووە، بیر لە چەندین پرۆژە و ڕێگاچارە کرایەوە بۆ کێشەی ئاو کە شوێنەواریان تاکو ئێستا هەر ماوە کە نەتواندرا جێبەجێ بکرێت بۆیە بە ناچاری پەنایان بردە بەر سەرچاوەی ئاوی مێگری بناری کێوی کۆرەک، کە بە جۆگەیەکی دوورو درێژ بە ڕەواندزیان گەیاندووە[٣٩]. کەریم بەگی ئەحمەد بەگ جۆگەلەی نوێی کردەوە لە (بیان) وە بەرەو بانەنۆک و پشتی گوندیکانی قۆری بەلای ژێر (خوار) گردی (ماران)دا، دەڕوانێتە سەر ئاشی (باویل ئاغا) لە وێشەوە بە گوری (داتیلاندا) بەرەو ئاشی (شێخ عوسمان) دەکردەوە و چەند ئاشێکی دیکەشی لە

سەر بوو، بە شـەویش بە نۆبەت باغچەکانی ناوشـاریان پێ ئـاو ئەداو سارداوەکانیان پێ پڕدەکردەوە.[٤٠]

ئاوی بناری چیای کۆڕەک سەرەتا زۆر پاک و خـاوێن بـووە، بەڵام دواتر تا گەیشتۆتە ناو ئاوایی و بازاڕ پاکییەکەی بەتەواوی لەدەسـتداوە و بە کەڵکی خواردنەوە و بەکارهێنان نەماوە و بۆتە هـۆی تووشـبوونی دانیشتوان بەنەخۆشی جۆراوجۆر. ئەوەتا ئەندازیاری ڕێگای هاملتۆن لە کـاتی سـەردانیکردنی ئـاوی مێگـر هۆشـداری دەداتە خەڵکـی ڕەوانـدز لەسەر پیسبوونی ئاوەکە: هەرچەندە ئاوی ڕەواندز لە شاخی کۆڕەکەوە هەڵـدەقوڵێت و زۆر پـاکە و ڕوونە وەک چـاوی قـرژاڵ، بەڵام کاتێک کە بەنـاو ماڵەکانـدا تێـدەپەڕێت و دەگـاتە بـازاڕەکە، پـاکییەکەی بەتەواوی نامێنێـت و دەبێـتە هـۆی بڵاوبـوونەوەی ڕشـانەوە و زەحیـری، کاتێـک هەسـتم بە پێویسـتی ئـاوی پـاک کـرد، خـۆم تووشـی نەخۆشـی بـووم، لەوانەشـــە بەهـــۆی خـــواردنەوەی ئەو ئـــاوە پیســـانەوە بووبێـت. دوای ساڵێک زۆر هەستم بە خۆشی کرد، کە توانیمـان بـۆری ئـاو دابنێین بـۆ ئاوی شارۆچکەکە.[٤١]

دوای زۆربـــوونی ڕێـــژەی دانیشـــتوانی ڕەوانـــدز و دەوروپشـــتی بەتایبەتی لە ساڵانی چلەکانی سـەدەی ڕابـوردوو، پێویسـتیی ئـاو ڕووی لە زیادبووندا بوو، بۆیە میری بیری لە پڕۆژەی ڕاکێشانی ئاو کردەوە، سەرەتا ئاویان بەبۆڕی ڕاکێشا بۆ چەند گەڕەکەکی شـاری ڕەواندز، کە هەر گەڕەکەو حەوز و بەلۆعەی هەبـووە و لەوێـوە خەڵکی بە تەنەکە و گـۆزە ئاویـان پڕکـردووە و بردوویـان بـۆ ماڵەکانیـان "لێـرە چـوار جـێ هەبوون لە کن ماڵی باویل ئاغای، ئەویش لەکن مزگەوتـا گەورە بـوو و، ئێکیش لە گەڕەکا خوارێ بوو وە ئـاوی چـارەمیش لەکن مـاری ئیمـامی کاکیلی بوو"[٤٢] دواتر وردە وردە تۆڕی ئـاو گەیشـتە زۆربەی ماڵەکـانی ڕەواندز و تـانکی و حەوزی ئـاو لەشـوێنە بەرزەکـان دامەزران و میـری کارمەنـدی ئـاوی لەســەردانان کە کاریـان چـاکردنی تـۆڕی ئـاو و بەردانەوەی ئـاو بـوو کە ڕۆژانە دوو جـار ئەم کارەیـان ئەنجـام دەدا و

پێیان دەگوترا "ئاوبەردەرەوە (میراو)" کە وەستا وهاب و کەمال و مام سەید و مەدی و خەلیل لەو کارمەندانانە بوون .[٤٣] لە ساڵی ١٩٥٣ میری پرۆژەی نوێی ئاوی خواردنەوە بە هەرەوەزی خەڵکی لە مێگرەوە بە بۆری چوار ئینجی هێناوەتە ڕەواندز کە هەموو خەڵکی تێدا سوودمەند بوون. کەچی "ئومێد شێرکۆ" لە کتێبەکەیدا ساڵی ١٩٥١ دادەنێت بە هاتنی تۆڕی ئاو بۆماڵەکان[٤٤]. هەروەک لە سەرەتاوە ئاماژەم بە پاکوخاوێنی خەڵکی کرد، زۆربەی خەڵکی ڕەواندز لە ساڵانی بیست وسییەکان هەتا نیوەی یەکەمی ساڵانی چلەکان پیاوان لە ڕووبار و حەوزی مزگەوتەکان و ژنانیش لە کانی و سەرشۆرک و قولەتێنی ماڵەکان کە شوێنی هەڵگرتنی دەستنوێژو ئاوهێنان و جل شووشتن و خۆشوشتنیش بوو خۆیان پاک دەکردەوە و کە دەبووە هۆی پیسبوونی ئاوەکە و بڵاو بوونەوەی زۆر نەخۆشی. بەڵام دواتر لەگەڵ گرینگیدانی میری بە ئاو و ئاوەڕۆی ڕەواندز و دەوروپشتی ئەو شوێنانە روویان لە کەمبوونەوە کرد و لە پەنجاکان بەتەواوی لەناو چوون و چونکە هەندێک لە خەڵکی دەوڵەمەندی شارەکە گەرماویان دروستکرد، کە بەرامبەر خۆشووشتن بۆ گەوران بە درهەمێک و مناڵیش بە خۆڕایی بوو وە یان دە فلس بوو،[٤٥] بەڵام دواتر شارەوانی حەمامی باشتری دروستکرد کە بەیانیان بۆ ژنان و ئێوارانیش بۆ پیاوان بوو. میری جگە لە شارۆچکەی ڕەواندز گرینگیشی داوە بە ناحیەکان و گوندەکان هەوڵیداوە کە خزمەتگوزاری شارەوانییان پێ بگات لە ئاو و کارەبا و بنکە تەندروستییەکان .

خزمەتگوزاریی کارەبا وەک زۆربەی شارەکانی تری هەرێمی کوردستان زۆر درەنگ گەیشتە قەزای ڕەواندز، خەڵکی بۆ رووناککردنەوەی ماڵەکانیان لەمپە و فانۆس و لۆکسیان بەکاردەهێنا، لە کۆلان و جادە و ڕێگاکاندا بە شەو، شەوچراغ هەڵدەکران، سەر لە ئێوارێ هەتا بەرە بەیانیان ئەیان کوژاندەوە، کە نوری دەلال و مام حاجیلە کاریان بوو[٤٦] بەڵام دوای هاتنی ئینگلیزەکان بۆ هەرێمی

کوردستان بۆماوەیەکی تارادەیەکي زۆر خزمەتگوزاری کارەبا گەیشتە شار و شارۆچکەکان و خەڵکی چرای نەوتیان داگیرساندووە.[٤٧] بەڵام لە نیوەی دووەمی ساڵانی بیستدا موەلیدەی کارەبا لە ڕەواندز داندراوە و بەسەرماڵەکان دابەشکراوە کە دووانیان سەید تەهای قائمقام هێنابووی[٤٨]، کە هەموو ماڵێک بۆی نەچووە وەیان بەری نەکەوتووە، کە دواتر لەگەڵ زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان خواستی ڕاکیشانی کارەباش زیادی کردووە، "کارەبای چەند سەرف کردبا مانگی ناگەیشتە پێنج درهەم.[٤٩] بەگوێرەی زۆربەی سەرچاوەکان تەزووی کارەبا لە ساڵی ١٩٥٤ هاتۆتە ڕەواندز و ناحیەکانی سەر بە قەزاکە، بەڵام (ئومێد شێرکۆ) دەنووسێت "لەساڵی١٩٥٣ پرۆژەی کارەبای ڕەواندز دەستی پێکرد، لە پایزی ١٩٥٤ تەزووی کارەبا دراوەتە ڕەواندز و ڕۆشنی کردۆتەوە"[٥٠] هێنانی کارەبا سەرەتا لەسەر ئەرکی شارەوانی بووە بەڵام دواتر سەر بە بەڕێوەبەرایەتی بووە و حەسەن مەکتەبە بووە بە لێپرسراوی کارەبای ڕەواندز و دوای ئەویش محەمەد عەبدولا سەلمان، وەستا کەمال ساڵح و وەستا تەلعەت ڕەواندزی بوون کە کارەبایان بۆ ماڵان بەستووە [٥١].

خزمەتگوزاری شارەوانی لەماوەی حوکمی پاشایەتی نەگەیشتۆتە دەوروپشتی لەبەر سەختی و نەبوونی ڕێگاوبان و نەبوونی هۆشیاریی کۆمەڵایەتی لای زۆربەی خەڵکی دەڤەرەکە وای کردووە کە ڕۆژنامەکانی ئەوکاتە داکۆکی لەسەر پێداویستییەکانی تری ڕۆژانەی خەڵک بکەن، وەک کوشتارخانە و بەیتەریە و بنکەی قەلاچۆی مێرووە زیان بەخشەکان وەک (کلۆ) بە کشتوکاڵ[٥٢] ئەوەی کە پەیوەندی بە هاتوچۆ و ڕێگاوبانەوە هەیە، خزمەتگوزاری ڕێگاوبان تاکو هاتنی ئینگلیزەکان و ئەندازیار (هاملتۆن) زۆر خراپ و لە ڕەوشێکی نالەباردا بوون و ڕێگا بۆ گوندەکان زۆر بە زەحمەت بوو .[٥٣] میری هەولێی زۆری دەدا کە هەولێر بە سنووری حاجی ئۆمەران ببەستێتەوە، بۆیە بەفەرمان و کۆششی (میجەر.و.ا.پوڤر) معاونی ئەندازیار (ا.م.هاملتۆن)ەوە، ڕێگای ئۆتۆمبێل لە هەولێرەوە هەتا نیوەی زێتری

گەلی عەلی بەگ کاردەکات" ئەمە لەو کاتەیە کە نیوەی ڕێگاکە تاکو گەلی تەواو بووە و هەواڵەکە بۆ خەڵکی لە ژمارە ٢٠-ی زاری کرمانجی ساڵی ١٩٢٦ دا بڵاوکراوەتەوە. سەید تەهای نەهری قائمقام ڕۆڵێی گرنگی بینیوە لە هاوکاری و پارێزگاری وجێبەجێکردنی پرۆژەکە[٥٤] کە تا ڕۆژگاری ئیمڕۆ سوودی لێ وەردەگیرێ و بە ڕێگایەکی گرینک و ستراتیجی دادەنردرێت و ڕۆل و ماندووبوونی (هاملتۆن) هەرگیز لە یاد ناکریت.

**بابەتی دووەم: خزمەتگوزارییە کارگێڕییەکان**

خزمەتگوزارییە کارگێڕییەکان لە قەزای ڕەواندز زۆر کۆنە و هەر لە سەردەمی داگیرکەرە عوسمانییەکانەوە بوونیان هەبووە، وەک فەرمانگەکانی پۆلیس و دادگا و باج و بەڕێوەبەرایەتییەکانی پۆست و تیلیگراف و نفوس. دوای دەرکردنی تورکە عوسمانییەکان لە لایەن ئینگلیزەکانەوە گرتنەوەی ڕەواندز لە ٢٢/نیسانی/١٩٢٣ [٥٥]، لە ٢٩ نیسانی ١٩٢٣، نوێنەری کۆمیساری باڵا و ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی عێراق سەردانی ڕەواندزیان کردووە و بڕیاریان داوە کە ڕەواندز بخرێتە سەر هەولێر و قائمقامی بۆ دابندرێت، ئەویش سەید تەهای نەهری بووە و کە لە چواری مایسی ١٩٢٣ لەلایەن ئینگلیزەکانەوە کراوەتە قائمقامی ڕەواندز[٥٦]. سەید تەها جگە لەوەی کە مرۆڤێکی باش و ئازا و نیشتمانپەروەر بووە، لە هەمان کاتدا مرۆڤێکی دادپەروەر و خزمەتگوزار بووە، ڕۆڵی ئەو لە ئاوەدانکردنەوە و پەرەپێدانی ڕەواندز لە ڕووی سیاسی و کارگێری و ڕۆشنبیرییەوە کە خەڵکی ڕەواندز سەردەمی ئەو بە قۆناغێکی پڕشنگدار لە مێژووی ڕەواندز لە قەڵەم دەدەن و بە قۆناغی پێشکەوتن و پەیڕەوکردنی دادپەروەری باسی لێوە دەکەن.[٥٧] لە ساڵانی پەنجاکاندا ڕەواندز پێشکەوتنی زۆری بە خۆیەوە بینیوە لە بواری جێبەجێکردنی پرۆژە جۆراوجۆرەکان بۆ خزمەتی خەڵکی ڕەواندزو دەوروبەری، بەتایبەتی لە سەردەمی قائمقام (فەوزی بەگ )دا کە توانی زۆر پرۆژە بە ئەنجام بگەیەنێت .[٥٨]

دوای تەواوبوونی جەنگی یەکەمی جیهانی لە ١٩١٨/١٠/٣١ و دۆڕانی عوسمانییەکان و هاتنی ئینگلیزەکان بۆ عێراق و ڕەواندز، ئینگلیزەکان بیریان لەوە دەکردەوە کە چۆن بتوانن کۆنترۆڵی ناوچەکە بکەن، لە کردنە قەزا و بەستنەوەی بە لیوای هەولێر دەستی پێکرد و لە مایسی ١٩٢٣ سەید تەهای کوڕی شێخ محەمەد صدیق، لەلایەن دەوڵەتی ئینگلیز و عێراق کرا بە قائمقامی قەزای ڕەواندز و (ئیسماعیل بەگ کوری سەعید بەگ)یش کرا بە حاکم و لە ڕووی ئیدارییەوە ئەم شوێنانە کەوتنە ژێر دەسەڵاتی قائمقامی ڕەواندز (شەقڵاوە، هەریر، هیران، نازەنین، بلە، بارزان، مێرگەسۆر، شێروان مەزن، سیدەکان، کانییە ڕەش و هەموو ناوچەی باڵەک)[٥٩] لە سەرەتای دەستبەکاربوونی سەید تەها، هەوڵی ئەوەی دەدا کە خزمەت بە ڕەواندزو دەڤەرەکە بکات، کە هاوکات خەڵکی ڕەواندز و بەشێک لە سەرۆک خێڵی ناوچەکە پشتگیرییان لە پۆستەکەیی و کارەکانی دەکرد.[٦٠]

سەید تەها کاتێک کە لە ساڵی ١٩٢٣ وەک قائمقام دەستبەکاربوو، دەستی کرد بە ڕێکخستنی شارەکە لە ڕووی ئیدارییەوە و بۆ ئەوەی فەرمانگەکان بتوانن خزمەت بە خەڵکی بکەن، بۆ ئەو مەبەستە لە ساڵی ١٩٢٤ چەند یەکەیەکی کارگێڕی لە ڕەواندز دامەزراند، وەک دائیرەکان و سەرای حکوومی و گومرگ و دەرسخانە[٦١] هەر لە سەردەمی ئەودا لە بەڕێوەبەری ناحیە و ڕێگاوبان و چەند پۆستێکی دیکەی شارەکە دامەزراون کە بۆیەکەم جار لە ساڵی ١٩٢٨ یەکەی ئیداری شارەوانی لە ڕەواندز کرایەوە، یەکەم سەرۆک شارەوانی محەمەد عەلی ئاغا بووە[٦٢] دوای ئەوەش سەید تەها خەڵکی زۆری دامەزراندووە لە یەکە کارگێڕییەکان و خزمەتگوزارییەکان لە ڕەواندز و دەوروپشتی، چەندین فەرمانگەی پێویستی بۆ خزمەتی خەڵک کردەوە بەم هەنگاوانەی هێمنی و ئاسایش بە جارێ بۆ خەڵکی ڕەواندز گەڕایەوە [٦٣] بۆیە سەید تەها لە بواری ئیداریدا مەرکەزییەتی خۆی بە تەواوی سەپاندبوو و ئارامی بەرقەرار بوو بەتایبەتی شەوانە تاکو بەیانی پاسەوانی ناو شار لە

گەڕان و جوولەدا بوون بۆ پاراستنی سەرو ماڵی هاووڵاتیان.[٦٤] لەو بارەیەوە غەفور عەلی  کە دانیشتووی دیانەیە دەگێڕێتەوە "من بۆ خۆم پۆلیس و پیاوەکانی ئەوم بینیون، ئەو کاتەی لە ڕەواندز بوو خاوەنی نزیکەی حەفتا پۆلیس بوو، هەمووشیان یەک جۆرە جلوبەرگیان دەپۆشی و ئەستێرەکانی سەر شانیان بە کراو و گۆرەوی بەسترابوونەوە".[٦٥]

کاتێک کە سەید تەها پۆلیسی دامەزراند، هێزێکی تایبەتیشی بۆخۆی دروستکرد کە پێیاندەگوتن "شەبانە"،[٦٦] کە ڕۆڵێکی زۆر گرینگیان لە پارێزگاری سەید تەها و ئارامی شارەکەدا دەبینی. هاملتۆن لە سەر هێزی شەبانەی تایبەت بە سەید تەها دەگێڕێتەوەو دەڵێت "هەڵوێستی سەید تەها زۆر گران دەکەوتە سەر ئینگلیز، چونکە ئەو هێزی پۆلیسی تایبەتی خۆی هەبوو، کە پێیاندەگوت "شەبانە" بە پارەی دەوڵەتی عێراق چەک و مووچەیان وەردەگرت، هیچ کونترۆڵێک لەسەر کۆکردنەوەی باج لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی نەبووە، ئەم "شەبانانە لە باشکردنی عەمبارەکانماندا یارمەتییان دەداین و کارەکانیان بە باشی دەبردە سەرو هیچ هۆکارێک نەبوو بۆ دەربڕینی ناڕەزایی لە بەرامبەریاندا"[٦٧] بەڵام لە دوای دەست لە کارکێشانەوەی سەید تەها بە فەرمی وەک قائمقامی ڕەواندز لە ٢٩ کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٩ و پێشکەشکردنی بە حکومەتی عێراق و ئینگلیز[٦٨]، ئەفسەرانی ئینگلیز هەوڵیان دا کە "شەبانە" بخرێتە سەر سوپای حکومەت، سەرەتا بەشێکی زۆریان بەو بڕیارە رازی نەبوون، بەڵام دواتر لە ئەنجامی فشارێکی زۆر ئەمانە خرانە سەر حکومەت ، هاوکات بەشێکی تریان بەمەبەستی پاراستنی بنەماڵەی سەید تەها وەک پاسەوانی تایبەتی لە شوێنی خۆیان مانەوە.[٦٩]، لە مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٩ موفەتشی پۆلیسی ئینگلیز لە هەولێرەوە گەیشتە ڕەواندز و بە فەرمی هەموو شەبانەکانی لابرد و پۆلیسی فەرمی لە شوێنیان دامەزراند و سەرەتا نزیکەی حەفت کەس بوون و بەرەبەرە ژمارەیان ڕووی لە زیادبووندا بوو وە چەند

بنکەیەکی پۆلیسیشی لە ناحیەکاندا دامەزراندووە چەند بنکەی تریش لە دامەزراندندایە.[٧٠]

هەرچی پەیوەندی بە پۆستە و ناردنەوە هەیە پێشان، نە پۆستە هەبووە نە تەلەفۆنیش، بە ولاغ و ئێستر پۆستە دەبردرا دەگەیەنرایە هەولێر و دەوروپشتی شاری ڕەواندز لە ناحیەکانی برادۆست و شێروان و دێرک و بالەک، لە سالانی چل و پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو، ئەو کەسانەی کە بەم کارانە هەلدەستان ئەمانە بوون ( ئاغای دەروێش ڕەشید پۆستی لە ڕواندزەوە دەبردە برادۆست بە پیادە، سابر خدر ئەحمەد لە ڕەواندزەوە بۆ ناوچەی شێروان، وە حاجی حسێن هەفتەی دوو جار دەچووە سیدەکان بە دوو سەعات ڕێگای دەبڕی)[٧١]

لێرەدا دەگەینە ئەو دەرئەنجامانەی کە خزمەتگوزارییە گشتییەکان کە پێشکەش بە شاری ڕەواندز کراوە لە سەردەمی دەستەلاتی پاشایەتیدا بە گوێرەی پێویست نەبووە، کەمتەرخەمی زۆری بەرامبەر کراوە، بە بەراورد بە شارەکانی تری کوردستان، ئەویش لەبەر دووری و سەختیی ڕێگاوبان و شوێنی جوگرافی ناوچەکە، تا ئەو کاتەی کە شۆڕشی تەمووزی سالی ١٩٥٨ سەری هەلدا وردە وردە نەخۆشخانە و بنکە تەندروستییەکان کرانەوە.

**دەرئەنجام**

- حکــومەتی پاشــایەتی لە ڕووی خزمەتگــوزاری تەندروســتییەوە کەمتەرخەمــی زۆری کــردووە بەرامــبەر بە دانیشــتوانی ڕەوانــدز بەراورد بە شارەکانی تری کوردستان.
- لەبەر نەبــوونی خزمەتگــوزاری تەندروســتی، خەڵکــی ڕەوانــدز لە ساڵانی سی و چلەکان بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشــەکانیان هانایــان بردۆتە بەر حەکیمە میللییەکان و داو و دەرمانە سروشتییەکان.
- هەڵــکەوتەی جــوگرافی و ســەختیی ڕێگاوبــانی شــاری ڕەوانــدز لە ســەنتەری لیــوای هەولێــر هۆکــار بــووینە بــۆ درەنــگ گەیشــتنی خزمەتگوزارییەکان بۆ شارەکە.
- حەکیمە میللییەکــان ڕۆڵێکــی گرنگیــان بینیــووە لە چارەســەرکردنی نەخۆشــــییەکان لە ئەنجــــامی نەبــــوونی پزیشــــک و بــــنکە تەندروستییەکان.
- لە بەر نەبــوونی هۆشــیاری تەندروســتی نەخۆشــی جۆراوجــۆر لە شــاری ڕەوانــدز و دەوروپشــتی بلاوبــووەتەوە وەکــو ( مەلاریــا و ڕشانەوە و کۆلێرا و تاعوون)، کە خەڵکانێکی زۆری کوشتووە.
- دوای هــــاتنی ئینگلیزەکــــان بــــۆ ڕەوانــــدز هەولّیــــان داوە خزمەتگوزارییەکی ســەرەتایی پێشکەش بکەن کە لەبەرژەوەندیی خۆیاندا بووە.
- بە دامەزرانــدنی ســەید تەهــای نەهــری وەک قائمقــامی ڕەوانــدز خزمەتگوزارییە گشتییەکان ڕووی لە بووژانەوە کردووە و گرنگی بە پڕۆژەکان دراوە.

## پەراوێزەکان:

(١) د. مەهدی محمد قادر، هەولێر لە ساڵانی ١٩٢٦ـ ١٩٣٨، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٣، ل ٣٨٦.

(٢) بەوکەسانە دەوترا کە چارەسەری نەخۆشی و شکستی خەڵکانی شار و لادێکانیان دەکرد،

(٣) حسێن ئیسماعیل عەزیز، ڕەوشی تەندروستی و خزمەتگوزاری گشتی لە لیوای سلێمانی لە نێوان ساڵانی (١٩٢١ـ ١٩٥٨)، گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، ژمارە (٣٠) هەولێر، ٢٠١٤، ل ٣٠٥.

(٤) هەمان سەرچاوە.

(٥) پ.د. سەعدی عوسمان هەروتی، چەند لایەنێکی مێژوویی و ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ئابووریی کوردستان لە سەردەمی عوسمانیدا، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٣، ل ٢٤٣.

(٦) مەولود بێخاڵی و تاریق جامباز، ڕەواندز شارەکەی پاشای گەورە، چاپی یەکەم، چاپخانەی بینایی، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل ١٠٤.

(٧) حسێن ئیسماعیل، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٠٦.

(٨) چاوپێکەوتن لەگەڵ مامان (بەستی ئەحمەد رسول، لەدایکبووی ١٩٣٧، دانیشتووی گەڕەکی زێری لە ڕەواندز وەماوەیەکی زۆر کاری مامانی کردووە)، ڕێکەوتی ٢٠١٦/١/٣٠.

(٩) بەیتار ئەو وەستایەی کە دەست و قاچی شکاوی دەهێنایەوە شوێنی خۆی و شارەزایی تەواوی لە شکستی دەست وقاچدا هەبووە.

(١٠) زرار سلێمان بەگ دەرگەڵەیی، لە بیرەوەرییەکانیدا ئاماژەی بە چۆنیەتی دەستەشکاوەکەی داوە لە کاتی خۆی کە مێردمنداڵ بووە، چۆن (کوێخا ئەحمەدی کۆیلەیی) کە پسپۆری میللیی شکست بووە، وتوویەتی ماسییەکم بۆ پەیدا بکەن، دواتر ماسییەکەی کوتاوە و گۆشتە کوتراوەکەی لە شوێنی شکاوەکە بەستووە و شەو پێوە نوستووە و تا بەیانی دواتر هێناویەتیەوە شوێنی خۆی و داری لێ بەستووە تا ماوەیەک چاک بۆتەوە، زرار سلێمان دەرگەڵەیی، بیرەوەرییەکانم، چاپخانەی ڕەهەند، سلێمانی،٢٠٠٢،ل ٥٩.

(١١) عەقیلە ڕەواندزی، وەبیرم دێتۆ. چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٣، ل ٧٣.

(١٢) شوکریە حەمەدەمین ڕەواندزی، چیرۆکەکانی ژنێک، چاپخانەی بینایی، هەولێر، ٢٠١٤، ل ٤٨.

(١٣) مەهدی قادر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٨٦.

(١٤) حسێن ئیسماعیل، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٠٧.

[١٥] مەولوود بێخاڵی و تاریق جامباز، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٤ ؛ چاوپێکەوتن لەگەڵ فەوزییەی مامان، ڕێکەوتی ٢٠١٦/١/٣٠.
[١٦] "خەڵکی گوندی (خەتێ) بووە، زانا و موفتی کۆرپاشای ڕەواندزی بووە، کەلەپوورێکی زانستی لە پاش بەجێماوە، زۆر کتێبی لە هەموو عیلمێک دانابوو، یەک لەوان ئەم کتێبە بوو ( مسئلة العلم) لە عیلمی کەلام" بڕوانە: مەمدوح مزووری، بنەماڵەکانی ڕەواندز، چاپخانەی جندیان، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٩، ل٢٢.
[١٧] عەقیلە ڕەواندزی، سەرچاوەی پێشوو. ل ٨١.
[١٨] مەمدوح مزوری، مێژووی ڕەواندز، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٦، ل٢٨٩ـ٢٩٠.
[١٩] مەهدی قادر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٩٠.
[٢٠] د. إسماعيل شكر رسول، أربيل دراسة تأريخية في دورها الفكري والسياسي ١٩٣٩ـ ١٩٥٨، مطبعة بينايي، أربيل، ٢٠٠٥، ص ١٢٢.
[٢١] زاری کرمانجی (ڕۆژنامە)، ژمارە (١٦)، ساڵی دووەم، ڕواندز.
[٢٢] هەمان سەرچاوە.
[٢٣] د. إسماعيل شكر رسول، المصدر سابق، ص١١٥.
[٢٤] عەقیلە ڕواندزی، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٤.
[٢٥] هەمان سەرچاوە.
[٢٦] هەمان سەرچاوە، ل ٧٣ـ٧٤.
[٢٧] ئیسماعیل حسێن، سەرچاوەی پێشوو، ل٣١٠.
[٢٨] ا.م. هاملتون: ئەندازیارێکی نیوزلەندی کە لەنێوان ساڵانی (١٩٢٧- ١٩٣٢) لە عێراق کاری ئەندازیاری کردووە، ڕێگا بەناوبانگەکەی هاملتونی ئەنجامداوە کە هەولێرو حاجی ئۆمەرانی بەیەکتری دەبەستێتەوە. ا. م. هاملتن، ڕێگایەک بەکوردستان، و:د. علی عبدولڕەحمان عەسکەری، چ١، هەولێر، ٢٠١٣، ل٩.
[٢٩] عەقیلە ڕواندزی، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٤.
[٣٠] أ.م. هاملتون، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٤.
[٣١] هەمان سەرچاوە.
[٣٢] ئی. ئار. لیچ، ڕەوشی ئابووری و کۆمەڵایەتی کوردی ڕواندز، و. عەزیز گەردی، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل ٣٠.
[٣٣] د. إيسماعيل شكر رسول، المصدر سابق، ص١١٥ـ١١٦.
[٣٤] المصدر نفسه، ص١١٧.
[٣٥] ئومێد شاکر مەجروم، ڕواندز لە لاپەڕەکانی مێژوودا، چاپی یەکەم، هەولێر،٢٠١١،ل ٣٢.
[٣٦] مەولود بێخاڵی و تاریق جامباز، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٤.

(٣٧) سارداو: بریتی بووە لە چاڵێک بە قووڵایی دوو مەتر، بەردڕێژ کراوە دواتر ئاوی بە جۆگەلە لە مێرگەوە بۆ هاتووە و ژوورێکی بە قوڕی لەسەر دروستکراوە و کەمێک نەوی بووە و خەڵکی بە تەنەکە و سەتڵ ئاوی پاکیان هەڵێنجاوە بۆ ماڵەکانیان. بڕوانە: مەولوود بێخاڵی و تاریق جامباز، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٠.

(٣٨) قوڵەتێن: لە ساڵانی سی و چلەکانی سەدەی ڕابردوو لە ڕەواندز هەروەک زۆربەی شارەکانی تری کوردستان ئاودەست لە مالەکان نەبوو، بۆیە لە هەر گەڕەکێک کانیاوێک بۆ ژنان دروست کراوە تاوەکو پێویستییەکانیان لەچوونە سەر ئاو و جل شوشتن و خۆشوشتن وقاپوقاچاغ شوشتن و نوێژکردن بەکاردەهات ئاوی خواردنەوەیان بۆماڵەکانیان دەبردەوە پێیاندەگوت قوڵەتێن کە لەچەند ماڵێکدا هەبوو. مەولوود بێخالی و تاریق جامباز، ڕەواندز شارەکەی پاشای گەورە، چ١، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل١١٣.

(٣٩) هەمان سەرچاوە.

(٤٠) هەمان سەرچاوە.

(٤١) هاملتۆن، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٤.

(٤٢) عەقیلە ڕەواندزی، سەرچاوەی پێشوو.ل٦٢.

(٤٣) هەمان سەرچاوە.

(٤٤) ڕواندوز لە لاپەڕەکانی مێژوودا...، ل ٣٢.

(٤٥) عەقیلە ڕەواندزی، سەرچاوەی پێشوو.ل٦١.

(٤٦) هەمان سەرچاوە.

(٤٧) نەوشیروان مستەفا ئەمین، ژیان بە تەمەنترین ڕۆژنامەی کوردی (١٩٢٨ـ١٩٣٨)، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل ٣٥٣.

(٤٨) عەقیلە ڕەواندزی، سەرچاوەی پێشوو.ل٦١.

(٤٩) هەمان سەرچاوە.

(٥٠) ئومێد شاکر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٢.

(٥١) هەمان سەرچاوە.

(٥٢) ئومێد شاکر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٢.

(٥٣) مەمدوح مزووری، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٩.

(٥٤) فەتحوڵڵا ئەحمەد گەروەیی، شاری ڕواندز و دۆڵی ئاکۆیان و گەرەوان، چاپخانەی شەهاب، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ٤٥.

(٥٥) د. حەسەن جاف، سەید تەهای شەمزینان، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٣٥)، ئابی ١٩٩٥، ل ٣٤.

(٥٦) حسێن مستەفا، ڕواندز لە ئێستا و ڕابردوودا، چاپی یەکەم، ٢٠١٣، هەولێر، ل ٢١.

[٥٧] ئەحمەد حەمەدەمین ئۆمەر، ڕەواندز لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی و سیاسی، چاپی یەکەم، چاپخانەی سەنتەری ستراتیژی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل ١٠٥.
[٥٨] هەمان سەرچاوە.
[٥٩] مەلا ئەحمەدی حەداد دەرگەڵەیی، ڕەواندز.. باڵەک.. برادۆست..، چاپی یەکەم، چاپخانەی هێڤی، ڕەواندز، ٢٠١٥، ل ٢٦.
[٦٠] وەلید حەمدی، کوردستان لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیادا، و. محمد نوری، چاپی یەکەم، چاپخانەی تیشک، سلێمانی، ل ١١٩ـ١٢٠.
[٦١] ڕێبین مەلا سەعید، سەید تەهای نەهری ڕۆڵی سیاسی و کارگێڕی، ماستەر نامە، زانکۆی سۆران، فاکەڵتی ئاداب، ساڵی ٢٠١٦، ل ١٣٧.
[٦٢] هەمان سەرچاوە.
[٦٣] هەمان سەرچاوە، ل١١٤-١١٧.
[٦٤] هەمان سەرچاوە.
[٦٥] هەمان سەرچاوە.
[٦٦] ئەو هێزە بوو کە بەریتانییەکان دروستیان کرد دوای ئەوەی کە عێراقیان داگیرکرد. سەرەتا بەجلوبەرگی خۆیان بوون، بەڵام دواتر جلی سەربازی بەریتانیایان لەبەرکرد وبە(میلیشیا) ناودەبران، دواتر ناویان نان (شەبانە) و (خیاله) و لەساڵانی چلەکان ناویان نرا (لیفی). عمید. جی . کیلبرت براون، قوات الليفي العراقية، ت: د. مؤيد إبراهيم، ط١، سليمانية، ٢٠٠٦، ص١٦-١٧.
[٦٧] چاوپێکەوتن لەگەڵ مامۆستا (زرار محمد رواندزی) لەدایکبووی ساڵی ١٩٣٧، مامۆستای ناسراوی شاری ڕواندزە زیاتر لە ٥٠ ساڵە خزمەت دەکات لە هەردوو بواری هونەری و ڕۆشنبیری، لە ئەرشیفی ڕێبین مەلا سەعید.
[٦٨] سەید کەمال ئیبراهیمی، سمکۆ، چاپخانەی لەریا، سلێمانی، ٢٠١٢، ل ١١٤.
[٦٩] ڕێبین مەلا سەعید، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٨.
[٧٠] زاری کرمانجی ژمارە (١٦)، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢.
[٧١] مەولود بێخاڵی و تاریق جامباز، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٣.

## الخلاصة

**الخدمات الصحية في قضاء رواندوز**
**خلال الفترة الملكية بين عام ( ١٩٢٣- ١٩٥٨)**

يتكون البحث من مبحثين :

المبحث الأول: يتناول الحالة الصحية في قضاء رواندوز خلال مدة الحكم.

اما المبحث الثاني فأنة يتناول الخدمات العامة الادارية والخدمية في المدينة، فقد كانت الحكومة الملكية مقصرة الى حد ما. من الناحية الخدمية والصحية تجاه اهالي مدينة رواندوز مقارنة بالمدن الأخرى في كوردستان.

وكان للموقع الجغرافي لمدينة رواندوز ووعورة طرقها وبعدها عن مركز محافظة اربيل سببا اخر في عدم وصول المستلزمات الخدمية والطبية وعدم وجود اطباء اخصائيين وانعدام الثقافة الصحية عند اغلب سكان المدينة لذلک اضطر اهل المدينة الى الاعتماد على الأعشاب الطبية الشعبية في معالجة مختلف الامراض في المنطقة.

وكان للأطباء الشعبيين دور كبير في معالجة كثير من الأمراض السائدة حينذاک وبالرغم من ذلک ادى تدهور الاحوال الصحية في المدينة الى عدم السيطرة على الامراض وانتشار الاوبئة في المدينة مثل (الملاريا والطاعون) وغير ذلک من الامراض الفتاكة وأدى ذلک الى موت الكثيرين.

وبعد مجيء الانكليز الى رواندوز حاولوا تقديم بعض الخدمات الصحية البدائية للمواطنين خدمة لمصالحهم في المدينة وبتعيين (سيد طه النهري) قائمقاما في قضاء رواندوز فانتعشت الخدمات العامة حيث انصبت اهتماماته بالمشاريع الخدمية الضرورية في المدينة.

## Abstract:

The city of rawanduz is one of the ancient cities in the Kurdistan region of Iraq. because of its geographical location, since the very old times and then during the time of the Kurdish emirates, the city was a high castle to face the invaders and has recorded a shiny history. Until now, the academic work on the history and culture of this city wasn't on the desired level, and lots of the hidden aspects haven't been worked on and need the effort of historians and specialist people. fortunately, this year, there's a chance to convene a conference on the history and culture of this city which gives opportunity for the university professors and academic people to make it to be in a desired way. in this conference, I want to present a study on the public services of rawanduz district between (1923-1958) which indicates on the services in the study area during the of royal regime in Iraq. This study is consisted of two parts; the medical services and the municipal services. this study aims to show the services that were given to people in the study area during the royal time

# زەرادەشت، وار و سەردەمێ وی

د. عەبدولڕەحمان مزووری
ئەندامێ کارایێ ئەکادیمیا کوردی

زەرادەشت ناڤێ وی ب گەلەک تەخلیتان هاتیە: زەردەشت، زەرتوشت، زارائوس، زوروئاستەر Zoroaster، زەرتوشترا، زەرائوسترا، زاراهوشت، زەردوهەشت ... هتد[1]. د ئاڤێستا Avesta پشکا گاتا Gatha دا، ناڤێ وی زەراتوشترا Zarathushtra هاتیە. ئاشکارە ناڤێن بووری هەموو دراستن، رامانا وان زەرادەشتە، ئێکانە پێغەمبەرێ ئاریان. شەرەزایێن زمانێ ئاڤێستا ناڤێ زەراتوشترا دکەنە (دوو) پرت. پرتا زەرەت/ زەرەڤ zarat/zarath ب ئانکوییێن: زەر، زۆر، زەرەنت (پیر). پرتا هوشترا/ئوشترا hushtra/ushtra کو حێشترە. وێگاڤێ ناڤێ زەرادەشتی (سێ) ئانکویا ددە: (خودانێ) حێشترێن زۆر/ خودانێ حێشترا[2]، (خ) حێشترا پیر[3]، (خ) حێشترا زەر. گەلەک خەلکی حێشترێن هەین و حێشترێن جوان و پیر ژی یێن هەین، حێشترێن زەر بەلکو دکێم بن، لەوان ئەز ئانکویا داویێ، بو ناڤێ زەرادەشتی دچێترینم. ئەز نزانم بوچی (خودان) ل سەر پەیڤێ هاتیە زێدەکرن؟ زەراتوشترا ئانکو حێشترا زەر. ئەڤروژی ناڤێن جانەوەران ل سەر کوردان هەنە وەک: شەمو، گورگین، شێرو، شەپال (شێرا مێ یا جوان) پلنگ، بلبل، خەزال، ئاسیک (ئاسک)، کەوێ، پورێ ... هتد. هنەکان ئانکویا زەراتوشترا کریە: ستێرا زێڕی یان ستێرا گەش[4]. بەرئەقل ئەڤە ئانکویەکا شاشە، دجڤاکەکێ کارێ وی شڤانی، گاڤانی و جانەوەر خودانکرن بیت، دێ خودانێ حێشترێ نێزیکترین ئانکوبیت بو راستیێ.

زەرادەشت ژبنەمالا سپیتاما Spitama یە، بنەمالا سپیا. باڤێ وی پوروشئەسپە Pourushaspa خودانێ هەسپێ بوزە (هەسپێ بورە)، دیا

وی دوغدوڤا Dughdova یە شیردوشە یان بێریڤان، کابانیا وی هەڤویە Havo (هەوێ)یە خودانا کەوالێن جوانە[٥].

ل گووڕ ناڤونیشانا ڤەکولینێ، ڤەکولین دێ بیتە (دوو) پشک:

ئێک. وار و ژینگەها زەرادەشت.

دوو. سەردەمێ ژیانا زەرادەشت.

**ئێک. وار و ژینگەها زەرادەشت:**

حەتا ئەم بگەهینە ژینگەها راستا زەرادەشت، باشترە ئەم پشتا خو ب پەرتووکا ئاڤێستا (پشکا گاتا) قاهیمکەین. چمکی ب هزرا گش ڤەکولەرێن ئاڤێستا، پشکا (گاتا) گوتنێن زەرادەشتی بخونە. ب کورتی ئاڤێستا Avesta پەرتووکا زەرادەشتی یە. دپەرتووکا دینکەرد Dinkard دا، کو ب زمانێ پەهلەوییە، ناڤێ وێ ئاپستاک Apistak هاتیە، ب ئانکویا: ئەساس و بونیان، ئاڤاهیێ (ب ئەساس و بنیان و) چاک راوەستای[٦]. ڤەکولەرێ ئەلمان کارل گێلدنەرK. Geldner دپەرتووکا خودا: - Avesta die Heiligen Bücher der Parsen ئانکویا بووری هەلبژارتیە[٧].

ل گووڕ ژێدەرێن فارسی، ئیسکەندەرێ مەقدونی (٣٥٦ ـ ٣٢٣ ب.ز) پشتی شەڕێ گەوگامێلا Gaugamela (گرگوملی) وکەفتنا داریوشێ سێ Darius III سالا ٣٣١ ب.ز، پەرتووکا ئاڤێستا کو ژ ٢١ نەسکا naska / پەرتووکا پێکهاتبوو، سوٚت. بلاشێ ئێکێ Blash I یێ ئەشکانی ٧٨ ــ ٥١ ب. ز (ڤەلاخشێ ئێکێ Valaxshl ب پەهلەوی)، تشتێ مای کوومکرەڤە. دسەردەمێ ساسانیاندا، ب فەرمانا ئەردەشیرێ بابکان (٢٢٦ ــ ٢٤١ ز) موبەدانێ موبەد تەنسەر Tansar ب کوومکرنا وێ رابوو. دغەزەواتێن عەرەبێن موسلماندا جارەکا دن هاتە سوٚتن و ژناڤبرن[٨].

نهو تنێ (پێنج) نەسک/ پەرتووک ژ کووما بیست و ئێک نەسکان ماینە، ئەڤن: یەسنا ٧٢ هاتن (فەسلن) ١٧ ژێ گاتانە، ڤیسپەرد، ڤاندیداد، یەشت، خوردە ئاڤێستا.

د ژێدەرادا ئاڤێستا ل سەر ١٢٠٠٠ چەرمێن گا، ب ئاڤا زێڕی هاتبوو نڤێسین[٩]. دوازدە هزار چەرمێن گا، رێ دچیتێ. ب ئاڤا زێڕێ جهێ خش و گومانێیە! د ئاڤێستادا پشکا ڤاندیداد، مالا پوروشئەسپە Pourushaspa باڤێ زەرادەشت ل سەر کنارێ رووبارێ دارێجا/داراجا dareja/daraja ل دەڤەرا ئاریاناڤیج aryanavaej بوو[١٠]. ئانکو زەرادەشت ل دەڤەرا ئاریاناڤیج ل سەرکنارێ رووبارێ داراجا پەیدابوویە. د یەشتاندا کەڤنترین پشکا ئاڤێستا درەنگتر (متاخر)[١١]، هاتیە: زەرادشت قوربانیێن خو ل دەڤەرا ئاریاناڤیجە aryanavaejah ل سەرکنارێ رووبارێ دائیتیا daitya پێشکێشی خودێ خو دکرن، هەر ل ڤێدێ ژی ناڤدێر بوو. دیسان تێدا هاتیە: زەرادەشت ل سەرکنارێ رووبارێ دروجا/ داراجا droja/daraja خودێ خو دپەرست[١٢]. دەڤەرا ئاریاناڤیج دڤیدا Veda دا، بناڤێ ئاریاڤارتا Aryavarta هاتیە[١٣]. تا ئەڤرو پەیڤا Varta, Var, War د کوردیدا بو ناڤێ وەلاتی، جهی، ئاخێ ... مایە. پڕ گرنگە بزانین وارێ ئاریاڤارتا یان ئاریاناڤیج دکەڤیتە کودەرێ؟

**ڤاندیداد هنەک خاسیەت و نیشانێن ڤی واری دهژمێرە وەک:**

أ. وارەکێ سارە، دەهـ هەیڤا زڤستانە، دو هەیڤا هاڤین. د ڤان دەهـ هەیڤادا ئەردێ سارە، ئاڤا سارە، گیایێ سارە. ئەڤ جهە نیڤا زڤستانێیە، دکەڤیتە ددلێ زڤستانێدا، زڤستانێ سەرانسەرێ گرتی، دوورترین جهێن وی سیلاڤ وبەستینە (آن جا دە ماە زمستان است، دو ماە تابستان، واین دو ماە سرد آبها، سرد زمینها، سرد گیاهان. آن جا میان زمستان، آن جا در دل زمستان، زمستان سراسر فراگیرد، دوورترین جاهارا أز سیلابها ویخ)[١٤].

ب. ڤاندیداد ناڤێن گەلەک دەڤەرێن ئاریاناڤیج دهژمێرێ وەک: سوغدوا Saughdoa (سوغد)، مەئورو Mauru (مەرو)، باخدی Bakhdi (بەلخ) ب پەهلەوی بەخر Bakhr ، نیسایە Nisaya (نیسا) دکەڤیتە نێڤبەرا مەرو وبەلخدا، هەریڤە Hareva /هەریوە (هەرات)، ڤاکەرتە Vaekarta دوەرگێڕا پەهلەویدا کاولە Kaule ئانکو کابل، خڤائیریزم Khvairizem

(خـــەوارزم)، ئورڤـە Urva (ئورگەنــج نێــزی خیــوە)، هــەرەخوئیتی Haraxuiti (روخـــەج/قەندەهار)، هێتومەنـــت Hetaumand (هێلمەنــــد)، چەخـــــرەChaxra (چەهــــروم ل خوراسانــــا کەڤــــن)، رووبــــارێ رەنگها Rangha رووبارێ سیرداریا/سەیحون (ب هزرێن ڤەکولەران: شپیگل Fr. Spiegel، یوست F. Justi، گیگەرW. Gieger ) ... هتد[١٥].

جـ دپەرتووکا یەشتادا ژ ئاڤێستایێ ناڤێن: جنگل سفید و جنگل آریائیان وەک ئێک دارستان ل وارێ ئاریاناڤیج هاتیە[١٦]. ئاشکارە جنگل سفید/دارستانا سپی ئاماژەیە بو دارستانێن بتولا Betula . قورمێ دارا بتولا سپییە، ناڤێ وێ ب ئینگلیزی بتولا سپییە White Birch [١٧]. تا بیست مەتران بلند دبە، دارێن وێ بو کاغز چێکرنێ تێنە بکارئانین، ژ دارستانێن دەڤەرێن سارن[١٨]. گەلەک مینا سپیدارا کوردییە.

د. د مهر یەشتادا ناڤێ چیایێ هەرا Hara، هەرائیتی Haraiti، هەرابێرێزەئیتی Haraberezaiti هاتیە. گەلەکان ئەو ب چیایێ ئەلبورز ل ژوریا ئیرانێ زانیە. لێ ئای. بەشیری I. Bashiri وجەی. موشێ J. Moushet ب چیایێن هندوکوش Hindukesh ژ گرێیا پامیر Pamirs Complex زانیە[١٩]. چیایێن هندوکوش ژ ئەلبورز بەرئەڤلترن. چمکی هەر دمهر یەشتدا بەندا: ١٣ هاتیە: فریشتێ روناهیێ (مهر) بەری هەلاتنا روژێ، تاڤا خو ژ سەرێ چیایێ هەرا/هەرائیتی ددەتە گش دەڤەر وجهێن ئاریان[٢٠]. بەرێ ل جەم هنەک ڤەکولەران، جهێ کەڤنێ ئاریان ئەزەربیجان بوو، نهو دموڤکێن داهاتیدا دێ بوومە خویابیت، ناڤەراستێ ئاسیا بوو.

هـ ژ هنەک پەرتووکێن پەهلەوی و ژ پازەندێ[٢١] ژی خویایە ئاریاناڤیج/ ئیرانوڤیج دکەڤیتە روژهەلاتێ ئیرانێ، نەروژئاڤایێ وێ. دپەرتووکا پەهلەوی (مینوی خرد)دا، فەصلێ: ٦١، موڤکێن: ١٢ ــ ١٤ دا هاتیە: کەنگ دز ل ئالێ روژهەلاتیە، ل سەر سنوورێ ئیرانوڤیج[٢٢]. کەنگ دز کەلهەکە ل گوورِ داستانێن مللیێن ئیرانێ سیاوش کورِێ کەیکاوس ل دەڤەرا خەوارزم و دەوروبەرێن وێ ئاڤاکریە[٢٣]. ب هزرا

عنایت اللە رضا کەنگ دژ دکەڤیتە ژووریا رووبارێ سیرداریا (سەیحون) یانژی روژهەلاتێ وی[٢٤]. دپەرتووکێن پەهلەوی (دینکەرد)دا کتاب: ٧، فصل: ٣، موڤکا: ١٥، (زادسپرم)دا فصل: ٢١، موڤکا: ٥ ئیرانوڤیج دەڤەرا خەوارزم (خیوە)یا کەڤن و دەوروبەرێن رووبارێ دائیتیا Daitya (رووبارێ جەیحون) دگریت[٢٥].

دوور نییە ڤەکولەرێ ئەلمان جوزێف مارکڤارت J. Marquart ئێکەمین کەس بیت گەهشتیە راستیا ئاریاناڤیج، کو دەڤەرا خەوارزم و دەوروبەرێن وێیە. **ئەوژی ب (دوو) بەلگەیان نەژبەلگەیێن مە هژمارتین:**

١. مێژووڤانێ ئەرمەنی موسا خورێناسی Moses Xorenaci (٤٩٠–٤١٠ ب.ز )، دەڤەرا تور Tur ل هەرێما خەوارزم دانایە. ب هزرا (مارکڤارت) ئەڤە دەڤەرا توئیریە Tuirya یە، ئەوا د ئاڤێستادا هاتی و ئەڤرو د بێژنێ توران Turan[٢٦].

٢. ب هزرا (مارکڤارت) وەصف و پەسنێن ژێدەرێن پەهلەوی داینە دەڤەرا ئیرانوڤیج، گەلەک نێزی وەصف و پەسنێن ژێدەرێن ئیسلامینە، داینە دەڤەرا خەوارزم، لەوان هەردوو ئێکن[٢٧].

دڤان خالێن مە هژمارتیندا خویادبە، دەڤەرا ئاریاناڤیج یائاڤێستایی دەوروبەرێن خەوارزم و ئاڤرێژێن[٢٨] رووبارێن سیرداریا (سەیحون) و ئاموداریا (جەیحون) نە، ئەوێن درێژنە زەریاچا ئورال (زەریاچا خەوارزما کەڤن). دژێدەرێن عەرەبیدا ناڤێ وێ دەڤەرا (ماوراء النهر)ە.

بو پشتەڤانیا بوچوونێن ئاڤێستایێ کو دەڤەرا ئاریاناڤیج (خەوارزما ئەڤرو) دەڤەرەکا سارە، ئەردێ سارە، ئاڤا سارە، گیایێ سارە ... هتد. ئەستەخری (سەد سالیا دەهێ ز) نڤێسییە: سارترین دەڤەرێن ل سەر رووبارێ جەیحون (ئاموداریا) خەوارزمە ( وابرد ما علی جیحون من البقاع خوارزم)[٢٩]. ئیبن فەقیهێ هەمەدانی ژی (٩٥١ ز مریە) سەبارا ساریا وێ دبێژێ: خەوارزم سارترین دەڤەرە (من ابرد البلدان خوارزم)[٣٠].

هنەک ژ زانا و ڤەکولەرێن گەهشتینە راستیا دەڤەرا ئاریاناڤیج، دەڤەرا ژدێبونا زەرادەشت، کو دەوروبەرێن خەوارزم و رووبارێن سیرداریا و ئامودارياية، ئەڤ ڤەکولەرێن ژێرینە:

مارکڤارت Marquart دپەرتووکا: Iranshahr دا، جـ١ ب١٥٥. نیبرگ Nyberg دپەرتووکا: Die Religionen des Alten Iran دا، ب٢٤٤. مەسینا Messina دپەرتووکا: Orientalia دا، ب٨٤. هینینگ Henning دپەرتووکا: Die Welt der Perse دا، ب١٣٩. تیلە Tiele دپەرتووکا: Die religion bei den Iranischen Völkern دا، ب٥٦. شتراوسبێرگ Strausberg دپەرتووکا: Zarathustra und seine Religion دا، ب٣٠. بنڤێنیست Benveniste دگوتارا: La Eran-vez et Lorigine Legendaire des Iraniens[31]، ماری بویس M. Boyce دپەرتووکا: چکیدەء تاریخ کیش زرتشت دا، ب٤٩. دوشن گیمن D. Guillemin دپەرتووکا: دین ایران باستان دا، ب١٨٣. جلال الدین آشتیانی دپەرتووکا: زرتشت ـ مەزدیسنا وحکومت دا، ب٢٨. محمد جواد مشکور دپەرتووکا: خلاصەء ادیان دا، ب٩٢ ـ ٩٣ ... هتد.

مهریەشت بەندێن: ١٣، ١٤ باسی دەڤەرا ئاریاناڤیج دکە و دبێژێ: ل وێدێ رووبارێن فرەهـ ب تەنشتا ئیشکەت Ishkat، پئوروتا Pouruta (باختریا)، موئورو Mouru (مەرو)، هەرائیڤا Haraiva (هەرات)، سەغزە Sughza (سوغد) وخڤائیریزم Khvairizem (خەوارزم) دبورن[32]. پرانیا ڤان ناڤان ل سەر کنار ودەوروپشتێن رووبارێ ئامودریا وسیرداریا دکەڤن.

بێینە رووبارێن دائیتیا Daitya و داراجا Daraja . پشتی ئەم گەهشتینە راستیا دەڤەرا ئاریاناڤیچ کو دەڤەرا خەوارزم و دەوروبەرێن رووبارێن سیرداریا و ئامودارياية. ئاشکارە بژلی ڤان هەردوو رووباران، رووبارێن دنێن ناڤدێر ل ڤێدێ تونە. ب هزرا پرانیا ڤەکولەران وەک: ئیبراهیم پورداود، دوشن گیمن، بەهرام فرەوەشی، فەرهەنگ مهر و ئەمانوللا قەرەشی ... رووبارێ دائیتیا جەیحونێ کەڤن

و ئاموداریایێ ئەڤرویە، گریکان دگوتێ ئوکسوس Oxus . ڕووبارێ داراجا ژی سەیحونێ کەڤن و سیردارییایێ ئەڤرویە، گریکان دگوتێ جاخارتیس Jaxartes [٣٣].

**ئاریاناڤیج و ئەزەربیجان:**

پڕانیا ژێدەرێن پەهلەوی، نەمازە پەهلەویا ساسانی[٣٤] و پڕانیا ژێدەرێن ئیسلامی، ئەزەربیجان ب وارێ ئاریاناڤیج زانیە. زەرادەشت خەلکێ ویدێ دانایە، ل باژێرکێ (شیز) کنارێ زەریاچا چەئیچیستە Chaechiste (ئورمیێ) ژدێبویە. ژوێدێ مشەختی روژهەلاتی بوویە، چوویە (بەلخ) نک کەی گوشتاسپ[٣٥]، دەوروبەرێ سالا ٥٨٣ ب.ز چوویەبەر دلوڤانیا خودێ[٣٦].

بوچی ژێدەرێن ساسانی و ئیسلامی ئاریاناڤیج کریە ئەزەربیجان؟ ژبەر:

١. ئەزەربیجان هەر ژ سەردەمێ میدیان (٧١٣ ب.ز) تا کەتنا ساسانیان (٦٥٢ز) جهێ موغێن[٣٧] زەرادەشتی بوو. ئێک ژ مەزنترین ئاگردانێ زەرادەشتیان، ئاگردانێ ئازەرگوشنئەسب Azargoshnasp ل ویدێ بوو، ل شیز (تەختێ سلێمان) بوو[٣٨].

٢. دەڤەرێن روژهەلات و ژووریا روژهەلاتێ ئیرانێ، ل ژێر دەسهەلاتا ساسانیان نەمابوون. بەری وان ل ژێر دەسهەلاتا میدیان، هەخامەنشیان، ئەشکانیان و سلوکیاندا بوون. پڕانیا ئاگردانێن زەرادەشتی هاتنە روژئاڤا، هاتنە میدیا، فارس و روژئاڤایێ خوراسان. موغان شوڤێن (تێکستێن) ئاڤێستایێ دبەرژەوەندیا دەولەتا ساسانیدا شروڤە دکرن. ئاشکارە پەیدابوونا زەرادەشتی و ئاڤێستا ل روژئاڤا، دێ دەڤەرێ ناڤدێرتر، گراڤیتر و پیروزتر کەت[٣٩]. لەوان د وی سەردەمیدا پێکولەکا گەرم دهاتە کرن، کو هەردوو (زەرادەشت و ئاڤیستا) بێنە روژئاڤا بژین و گەشبن. ئەڤرو بەلگە و گروڤێن مێژوویی و زانستی د بەرژەوەندیا ئەزەربیجاندا نینن، ژبەر:

أ. ئاڤێستا بەرامبەر روژئاڤایێ ئیرانێ یا مت و بێدەنگە. نەباسی میدیان، نەهەخامەنشیان، نەئورارتیان، نەئاشوریان، نەبابلیان، نەیونانیان ... دکە، نەناڤێ هەکمتانە، نەشوش، نەپارسە، نەبیستون ... دبە. بەروڤاژی ناڤێن جهێن جوغرافی، ناڤێن دارستانان، جانەوەران ... ئەوێن د ئاڤێستادا هاتین و دسەرمەڕا بوورین، جهێن وان ل روژهەلات و ژووریا روژهەلاتێ ئیرانێنە. سوغدوا (سوغد)، مەئورو (مەرو)، باخدی (بەلخ)، هێتومەند (هێلمەند)، ئورڤە (ئورگەنچ)، خڤائیریزم (خەوارزم)، زڤستانا دەهـ هەیڤا درێژ، دارستانێن دارێن سپی White Betula ، حێشتر و دەڤە ... گش ل روژئاڤا تونە!

ب. زمانێ ئاڤێستا نەمازە گاتا پێ هاتیە نڤێسین، نە زمانێ روژئاڤایێ ئیرانییە، بەلکو زمانێ روژهەلاتێ وێیە، ژ گەلەک لایانڤە مینا زمانێ سانسکریتییە Sanskrit ، زمانێ ڤیدا Veda پێ هاتیە نڤێسین(٤٠). نە بەرئەڤلە زەرادشت نێزی ٢٥٠٠ کیلومتران ژ ئورمیێ حەتا بەلخ ببڕیت، ل وێرێ ژی ئاڤێستایێ ب زمانێ خویێ زکماکی نەنڤێسیت، ب زمانەکێ دن بنڤێسیت!

**دوو. سەردەمێ زەرادەشت:**

ل گوورڕ ژێدەرێن مێژوویی مللەتێن هندوئەورپیێن Indo-european شڤان وکوچەر، ل دەشتێن ئوراسیا Urasia دەوروبەرێن ٤٠٠٠ ـ ٣٠٠٠ سالان ب.ز دبەربەلاڤبوون(٤١). ل داویا هزارسالیا سێ ئانکو دەوروبەرێ ٢٢٠٠ ب.ز تایێ روژهەلاتێ وان ئەوێن دبێژنە خو هندوئیرانی یان ئاری Arier, Aryan ، ژ تایێ روژئاڤا جودابوون(٤٢). وارێ هندوئیرانیان (ئاریان) ژروئاڤایێ زەریاچا بالخاش Balkhash تا روژهەلاتێ رووبارێ ڤولگا Volga ڤەدگرت. پێدڤیە ئەم دڤێ ڤەکولینێدا، ل سەر هنەک خالان راوەستین:

**دوو.١. ناڤێن کەسان د ئاڤێستادا:**

ل گوورِ ئاڤێستایێ ناڤێن پرانیا خزم، خانەدان، کەسوکار، نیاس، هوگر، هەڤال وهەڤندێن زەرادەشت، دگەل ناڤێن جانەوەران پێکهاتینە. دگەل ناڤێن حێشترا، هەسپا، گا و چێلا ... پێکهاتینە.

دگەل ناڤێن حێشترا وەک: زەرەت ئوشترا Zarathushtra خودانێ حێشترا زەر یان حێشترا پیر. فەرەش ئوشترا Ferashushtra خودانێ حێشترا رەهوان، ئێک ژ موریدێن زەرادەشت. ئەرەڤائوشترا Aravaushtra خودانێ حێشترا تەنا و بێ دەنگ، هەڤوئوشترا Havoushtra خودانێ حێشترا جوان.

دگەل ناڤێن گاوچێلا وەک: هەڤوگوڤا Havoguva خودانا گایێ/چێلا جوان، ناڤێ کابانیا زەرادەشتە. گاڤایان Gavayan خودانێ گا (د کوردیا ئەڤرودا هەر گاڤانە)، پەرەشت گاڤ/پەرەشت گاو Parashtgav خودانێ گایێ/چێلا بەلەک، دوغدوڤا Dughdova شیردوشە یان (بێریڤان) ناڤێ دیا زەرادەشتە. زەئین گاڤ/گاو Zaingav دوژمنەک بو ژ خێلێن تورانی Turan .

دگەل ناڤێن هەسپا وەک: ئەرجەتئسپە/ئەرجاسپ Arjataspa خودانێ هەسپێ رەهوان/رەهوار، ئورڤەنتئسپە Aurvantaspa خودانێ هەسپێ بەزەک، ئەڤە هەر لوهراسپە Luhraspa باڤێ ویشتاسپ بەرەڤانێ ناڤدارێ زەرادەشت. ڤیشتئەسپە/ویشتاسپ Vishtaspa خودانێ هەسپێ ئەرنی، جامائەسپە Jama-aspa ، هیچەتئەسپە Haechataspa ، هەڤوئەسپە Havu-aspa ... هتد[٤٣].

ژ ناڤێن باژێرێن تا ئەڤرو ل دەڤەرا ئاریانا مایین وەک: دەرئەسپە Daraspa ، زەریئەسپە Zariaspa، ئورتئەسپە Ortaspa، ڤەزئەسپە Vazaspa ... هتد[٤٤]. ژ شیکارکرنا ناڤێن بووری خویا دبیت، جڤاکێ زەرادەشت تێدا ژیای، جڤاکەک شڤان و کوچەر بوو، خودانکرنا کەرێن پەزی، بەرخا، بزنا، تەرش و کەوالی، گارانێن هەسپا، ماهینا، گا، چێلا و حێشترا بوو.

حێشتر نە جانەوەرەکێ ئەنتیکە بوو ل ئاسیا ناڤەراست و نەیێ ئەنتیکەیە ژی. ژ شونوارێن باژێرێ (تەختێ جەمشید) ل ئیرانێ، گریکی دبێژنێ Persepolis ، د سەردەمێ داریوشێ ئێکێدا Darus 1 (٥٢١ــ ٤٨٦ ب.ز)، ئانکو د سەد سالیا پێنجێ بەری زاینیدا هاتیەئاڤاکرن. د کەڤرێن نکراندیێن دیوارێن باژێریدا، میناکێن گەلەک مللەتێن روژهەلات و ژووریا روژهەلاتێ ئیرانێ، هاتینە نکراندن. وەک: خەلکێ باکتریا Bakterya ، خەلکێ هەرات Haraiwer، خەلکێ خەوارزم Khorazmier، خەلکێ ئەراخوزیا Arakhozier (روخەج)، هەمی دمیناکاندا، حێشتران وەکو دیاری پێشکێشی شاهی دکەن[٤٥]. ئەڤرو ژی حێشترێن دوو دونگ (دوو سەنام) ل دەڤەرێن نیڤ کەڤیر semidesert وئێک دونگ ل دەڤەرا باکتریا Bakterya /باختەریا ژێریا رووبارێ ئاموداریا هەنە[٤٦].

ل شونوارێن دەڤەرا ئاسیا ناڤەراست، دەوروبەرێن رووبارێن سیرداریا و ئاموداریا، گەلەک پاشماییێن هەستیکێن جانەوەرێن وەک هەستیکێن پەزی، بزنان، گا و وچێلان، هەسپان، هێستران و حێشتران ... هاتینە دیتن[٤٧]. زانا ل وێ هزرێنە ئەڤ جانەوەرە وەختێ خو، ئاریان ل وێدێ خودانکرن.

پرانیا مێژووڤانان و ڤەکولەران پشتەڤانیا شڤانبوون و کوچەربوونا مللەتێن ئارییێن کەڤن دکەن، وەک: کریستنسن دپەرتووکا: کەیانیان دا ب٣، ماری بویس دپەرتووکا: چکیدەء تاریخ کیش زرتشت دا ب٥١، کای بار دپەرتووکا: دیانت زرتشتی دا ب٢٣، محمد جواد مشکور دپەرتووکا: تاریخ ایران زمین دا ب٦، رقیە بهزادی دپەرتووکا: آریاها وناآریاهادا ب١١، محمد هادی محمدی دپەرتووکا: سپیدە دم اندیشەء ایرانی دا ب٢٢، محمود رضا افتخارزادە دپەرتووکا: ایران ــ ایین و فرهنگ دا ب١٤٩، امان اللە قرشی دپەرتووکا: ایران نامک دا ب١٦٢.

**دوو.٢. شڤانی و جووتیاری دگاتاندا:**

بژلی ناڤێن کەسان ئەوێن دگەل ناڤێن هەسپا، گاو وچێلا، حێشترا و پەزی ... هاتین. زەرادەشت دگاتاندا گەلەک بەرەڤانییێ ژکارێ شڤانییێ وجوتیارییێ دکە. بو نموونە:

ــ ئەی (مەزدائاهورا) ئەفراندنا جانەوەران ژ تەیە. تە رێیا سەربەستییێ دایە وی کەسێ چاندنێ بکەت، یان چاندنێ نەکەت[٤٨].

ـ ئەی (ئاهورا) ڤێ دپرسم، سزایێ وی کەسێ ب درێژیا ژیانا خو، جانەوەران و جووتیارێن راستێن چاندنێ دئێشینە، چییە؟[٤٩]

ـ گوهێ خو نەدەنە کەسێ درەوپەرست، ئەوێ خانی، مالێ، گوندی و دەڤەرێ وێران دکە، ناڤێ روژێ و ناڤێ جانەوەران کرێت دکە، جهێ چاندنێ دکەتە بیابان وکەڤیر، بڤری ددانتە دیڤچوییێن راستیێ[٥٠].

ـ ئەی چەڤەنگێ (سونبلێ) جیهانا جانەوەران تو ئەفرینەری، وەک شڤانێن دلسوژ ژ خەمێ ژ تەرش و کەوالی و گارانێ بخو، وەک جوتیارێن دلسوژ سەرڤەگێرِیا چاندنا ئاڤاکەر بکە (کشاورز آبادگر)[٥١].

ــ دیڤچوییێن درەوێ، چاندنێ وێران دکەن، جانەوەران بو قوربانیان دکوژن (سەرژێدکەن)، بڤی کارێ خراب، ژیانێ تژی بەدی وشاشی دکەن[٥٢].

ژ ڤان نموونان خویادبە چەوان زەرادەشت گەرم پشتەڤانیا شڤانییێ و جووتیارییێ دکە. هیچ باسی دراڤی، سکەی (پارێ کانی)، بازرڤانییێ (بازرگانییێ)، کارمەندییێ، پیشەسازییێ ... ناکەت. چمکی د جڤاکێ ویدا تونەبوون.

**دوو.٣. پێوەندییێن مروڤان و جانەوەران:**

د یەسنادا (هەفتەن یەشت)، باسی پێوەندییێن گەرمێن نێڤبەرا مروڤان و جانەوەراندا دکەت. وەک:

ـ ئەز سوپاسداریێ جانێن مە و جانێن جانەوەرانم، ئەون خێم و بنواشێ ژینا مە، ئەم ب جانێن جانەوەران دژین، ئەوژی ب جانێن مە[٥٣].

ـ جانێن جانەوەرێن مفادارێن دەشت و کەڤیران (بیابانان) سوپاس دکەم، جانێن جانەوەرێن کیڤی ژی ئەوێن بێ زیان، سوپاس دکەم[٥٤].

ـ ئەی (مەزدائاهورا) وەبکە خەلک ل دوور دادپەروەریێ بجڤن وخرڤەبن، بەرڤ دادپەروەریێ بچن و بخازن، زیانێ نە گەهیننە کەرێن پەزی و تەرشی و گارانان[٥٥].

ژ موڤکێن بوری خویادبە، ژیانا ئاریێن کەڤن سەر پەزی، تەرشی و کەوالی، چێل و گولان، هەسپان و حێشتران ... بویە، لەوان ب روح و جان پێڤە دگرێداینە.

**دوو.٤. سەردەمێ ئاسنی** Iron Age :

ماری بویس M. Boyce نڤێسییە، زەرادەشت بەری سەردەمێ برونزی Bronze Age ژیایە، ب گروڤێ ناڤێ (برونزی) دگاتاندا نەهاتیە[٥٦]. راستە ناڤێ برونزی دگاتاندا نەهاتیە، مانابیت زەرادەشت پشتی سەردەمێ برونزی ژیابیت؟ ئەوێ بخو ژی ئانکو ماری بویس، دجهەکێ دندا، ئەو پشتی سەردەمێ برونزی دانایە[٥٧].

ڤەکولەر جلال الدین آشتیانی نڤێسییە، دگاتاندا ناڤێ ئاسنی نەهاتیە، لەوان زەرادەشت ل سەردەمێ ئاسنی Iron Age نەژیایە، بەلکو ل سەردەمێ برونزی ژیایە[٥٨].

یا راست ناڤێ ئاسنی دگاتاندا هاتیە. ناڤێ وی د ئەهونەوەد گاتدا (یەسنا: ٣٠)، موڤکا: ٧، (د سێ) وەرگێرانێن گاتاندا هاتیە[٥٩]. ب هزرا من وەرگێرانا ڤەکولەر (ئابتین ساسانفەر) ژئەڤێن دن زانستیترە.

زەرادەشت دبێژێ، پشتەڤانێن راستیێ پێشیا ئەهریمەنی دگرن. ل سەر وان سەردکەڤن، ژبەر تە ئەی (ئاهورا) ئەو ب ئاسنی، پشتەڤانێن ئەهریمەنی هەفساردکەن و گرێددەن ((هواداران راستی بر هواداران

دیو پیشی میگیرد و پیروز میشود، برای تو ای آهورا آنهارا با آهن لگام می کنند و دربند می کنند))[٦٠].

دپەرتووکا: پژوهشی در فرهنگ باستانی وشناخت اوستا ـ سوم همایشـدا، شونوارناسەکێ تاچیکی هنەک شونوارێن کەڤنێن ل تاچیکستان هاتینە دیتن بەلاڤکرینە، پێکهاتینە: ژ هنەک هەڤسارێن هەسپان، هنەک چەقوکان، ساتۆر وقەمان (شیرێن بچووک) ... ژ ئاسنی وهەستیکان هاتینە چێکرن، ل بن (کاربونێ ١٤) هاتینە هێڤکرن، دەرکەتیە دەوروبەرێ ١٨٥٠ ب.ز هاتینە چێکرن[٦١].

ئانکو (ئاسن) ل سەردەمێ زەرادەشت هەبوویە و بوهنەک پیشەسازیێن سڤک هاتیە بکارئانین. سەردەمێ ئاسنی Iron Age ل ئاسیا ناڤەراست کەنگی بوو؟

ویل دیورانت W. Durant خودانێ پەرتووکا: چیروکا ئاڤەدانیێ The Story of Civilization دبێژێ، ئەم نکارن گەلەک زانستییانە سەردەمێ برونزی دەسنیشان بکەین، چمکی ئەڤ کانە ل جەم مللەتێن جودا و د سەردەمێن جودادا پەیدابوویە. ئەڤ راستییە بوو سەردەمێ ئاسنی ژی تێگوتن[٦٢].

ل گوورێ ژێدەران سەردەمێ ئاسنی Iron Age ل ئاسیا ناڤەراست و هندستانێ دەوروبەرێ ١٩٠٠ ـ ١٥٠٠ ب.ز ئاسنێ ئامادەکری (ئاسنێ نەرم) Wrought Iron پەیدابوویە[٦٣].

بژلی ئاسنی دگاتاندا ناڤێ دراڤی، سکەی، خوێ .. نەهاتیە. کڕین و فروتن ب گوهوڕینێن تشتێن عەینی بوویە، ئانکو ب تشت گوهڕینێ بوویە. بو نموونە: حەقدەستێ دەرمانکرنا خودانێ مالێ، هەسپەکێ کێم بهایە. حەقدەستێ دەرمانکرنا رێبەرێ بـاژێڕی بهاترین هەسپە. حەقدەستێ دەرمانکرنا کابانیا رێبەری، ماهینەکە. حەقدەستێ دەرمانکرنا کابانیا موختارێ گوندی، چێلەکە ... هتد[٦٤].

**دوو.٥. سەبارا پەرتووکێن ڤیدا و ئاڤێستا:**

شـــەرەزایێن پەرتووکێـــن ڤیـــدا Veda و ئاڤێســـتا Avesta ل وێ هزرێنە، هەردوو ژئالییێن زمانیڤە، رێزمانێڤە، دینیڤە، خەیالیڤە، تیتـال و خوورەوشـتاڤە ... گەلەک مینا هەڤن. چ خش نامینیت هـەردوو ژ لایـێ ئێک مللەتیڤە، ل سـەر ئێـک واری، ئاریاناڤیـج Aryanavaeja (ئاریاڤارتـا Aryavarta ) هاتینــە ڤەهانــدن و ســتراندن[٦٥]. ڤەکولــەر دبێــژن ئەڤــ پەرتووکە هاتینە ڤەهاندن، دەمێ مللەتێن هندوئیرانی (ئـاری) هـێ پێکڤە دژیـان، ژێکجـودا، بەلاڤـە و پەلاتـە نـەببوون. هنـەک دبێژن ڤیـدا (پشـکا ریگڤیدا) ژ ئاڤێستا کەڤنترە[٦٦]، ل جەم هنەکێن دن ئاڤێستا (پشـکا گاتـا) ژ ڤیــدا کــەڤنترە[٦٧]. یاراســت هــەردوو د ســەردەمەکێ نێـزی هەڤـدا هاتینە ڤەهاندن.

دپێتریـا ژێدەرانـدا هــەردوو د سـەد سـالیا چاردێدا، دەوروبـەرێ ١٤٠٠ سـالان ب.ز، بـەری ژێکجودابوونـا ئاریـان، هاتینـە ڤەهانـدن. ئـەو ژێدەرێن ئەڤ سەد سالە راستەخو نڤێسی، یانژی نێزی ڤێ سەد سـالیێ بووین، ئەڤەنە:

ئـالان ئیسـاکس د Oxford Concise Encyclopedia دا ب٩٢٠، داڤیـد کریستال دPenguin Concise Encyclopedia دا ب٩٨٤، ئنگرید ئادەم د Das Neue Duden Lexikon دا جـ ١٠ ب٤٠٦١، هێرمـان پونگس د Lexikon der Weltliteratur دا جــ٣ ب ٧٤٨، مـاکس مویلــەر د The Vedas دا ب ١٧، کریسـتیان لاسـن دGeschichte der Sanskritphilologie دا ب ٤٣٢، مـاری بویس د A History of Zoratastians دا جـ١ ب ١٩٠، حسن پیرنیـا د تاریـخ ایران باسـتاندا جـ١ ب١٥٣، داریوش شایگـان د أدیـان مکتبهـای فلسفی هنـد دا جـ١ ب٣٠، محمـد جـواد مشـکور د تاریـخ ایـران زمینـدا ب٧، محمــد رضــا جلالــی نائینــی د هنــد در یــک نگاهــدا ب٦٣، جلیــل دوستخواه د اوسـتادا جـ١ ب سـێزدە، مهـرداد مهریـن د دیـن مزدائیدا ب١١، پییــر فیلیــوزات د معجـــم آداب الهنــد دا ب٢٨٣، مانکــا Manka دپەرتووکا: زرتشـت یا جلال آشتیانی دا ب١٠٢ ـ ١٠٣ ... هتد.

**دوو.٦. کەیانیان:**

دگاتاندا زەرادەشت ناڤێن کەڤی گوشتاسپە Kavi Gushtaspa (ڤیشتاسپە Kavi Vishtaspa)، جاماسپە Jamaspa وفەرەشەئوشترا Ferashaushtra وەک هەڤند و پشتەڤانێن دینێ خو، دینێ مەزدیسنا دوو-سێ جاران دهینیت[٦٨]. وەرگێرێن ئاڤێستا ل وێ هزرێنە، جاماسپە و فەرەشە ئوشترا برایێن هەڤبون و هەردوو وەزیرێن کەی ڤێشتاسپە (گوشتاسپە) بوون[٦٩]. کەی گوشتاسپ کورێ لوهراسپ د ئاڤێستادا شاهێ پێنجێیە ژ زنجیرا شاهێن کەیانیان و شاهێ داوییێیە[٧٠].

د ژێدەرادا زەرادەشت دژیێ ٤٢ سالیێدا، ژبەر کارکنیێ، زۆریێ و گڤشینا کەرەپانان Karpans ، ئوسیجان Usijs وگرێهمان Grehmas ... ژوارێ خو مشەختی دەڤەرا بن دەسهەلاتا کەی گوشتاسپ بوو، کو ژدل پشتەڤانیا وی دکر[٧١].

ژ گاتان خویایە دەمێ زەرادەشت ژجهێ خو مشەختبووی نەگەلەک دوورکەتیە. ژ دەوروبەرێن رووبارێن سیرداریا و ئامودریا، هنەک سەرنشیڤی دەڤەرا باکتریا، بەلخ و سیستان بوویە، کەی گوشتاسپ شاهێ ڤان دەڤەران بوو. ئاڤێستا هوسا پەسنێن دەڤەر و ژینگەها زەرادەشت و گوشتاسپ دکە:

دیەشتاندا هەرچەند گاتا ژوان کەڤنترن، لێ ئەوژی ل گوورێ ڤەکولینێن ابراهیم پورداود بەری مشەختبوونا ئاریان بو هندستانێ و ئیرانێ هاتینە گوتن[٧٢]. مە گو دیەشتاندا ناڤێ زەریاچا کەسائویا Kasaoya [٧٣] کو رووبارێ هاتومەنت Haetumant دریژیتێ، وەک دەڤەرەکا پیروز و جهێ بەلاڤبوونا دینێ زەرادەشت هاتیە[٧٤]. زەریاچا کەسائویا ب پەهلەوی بوویە کیانزێ Kyan-sih [٧٥]. کیان و کەیان و کایان ... ئێکن. Sih مینا See, Sea ب ئەلمانی و ئنگلیزی ئانکو زەریا. ئەڤە زەریا هامونە Hamun ، ئەو بخو زەریاچەیە ل دەڤەرا سیستان ل ئەفغانستانا ئەڤرو، رووبارێ هاتومەنت Haetumant /هێلمەند Helmand دریژیتێ[٧٦].

د زامیاد یەشتدا، موڤکا: ٦٧ ناڤێ (هەشت) رووبارێن درێژنە زەریاچا کەسائویا/ کیانزێ (هامون ل سیستان) هاتیە. ئەڤرو ناڤێ (چاران) ژوان تێتە زانین: خڤاسترا Xvastra (خاش رود Khashrud )، هەڤو/هووئەسپا Huvoaspa (خوساسرود Khusasrud )، فرەدەتا Fradatha (فرەهرود Farahrud )، هەر/هاروت Har, Harut (هەراترود)[٧٧] .. مخابن رووبارێن دن نەهاتن دیتن، دوورنییە هشک ببن، یان جوک و جەلالێن بچووک بن.

هەرچەند پرانیا ڤەکولەران سەردەمێ کەیانیان ب سەردەمەکێ ئەفسانەیی دزانن، لێ هنەک ڤەکولەرێن د مێژ وا واندا بسپور و شەرەزا، وەسا نابینن.

ژالە آموزگار J. Amozgar نڤێسیە، لایێ ئەفسانیێ سەردەمێ کەیانیان گەلەک ژ لایێ ئەفسانیێ پیشدادیان کێمترە. کەیانی ب رەنگەکێ ئاشکەراتر شەرکەربوون، سەردەمێ وان سەردەمێ مێرخاسیێ و قارەمانیێ بوو، شەرو لێکدان دنێڤبەرا وان و تۆران دا، پرانیا سەردەمێ وان دگریت[٧٨].

ئەمانوللا قەرەشی نڤێسیە، خانەدانا پیشدادی ئەفسانەکا تازی و رووتە، لێ خانەدانا کەیانی ئەفسانەکا تێکەلی کەتوارییە (واقعییە)، ئەوژی ژ بەر بنەمالا کەی گوشتاسپ/ ڤیشتاسپ، کو ناڤێ وی د ئاڤێستا کەڤناردا (گاتاندا) هاتیە[٧٩].

ب هزرا شونوارناسێن ئەلمان ئێرنست هێرتسفیلد E. Herzfeld ویوهانس هێرتل Hertel .J، کەیانی بەری سەردەمێ ئاڤێستایێ دەستەکەکا میرێن خوجهێن روژهەلاتێ ئیرانێ بوون، میرێ داویێ ڤیشتاسپە Vishtaspa هەڤچاخێ پێغەمبەر زەرادەشتی بوو[٨٠].

ئارتەر کریستنسن A. Christensen سەروکانیا ڤەکولینێن ئیرانی، نڤێسیە: کەیانی زنجیرەکا رێکوپێک پێکدهینن، کەسێن تەڤاڤێن ئارینە، مێژووا وان ل سەر بنواشێ ئەفسانەیی نەهاتیە ئاڤاکرن. سەربوریا کەی ڤشتاسپ ب سەربوریا زەرادەشتی ڤە گرێدایە، دگاتاندا کەسەکێ

گەلەکێ ناڤدارە، دڤێ وەک کەسەکێ مێژوویێ درست بێتە هژمارتن ((کوی ها کە سلسلەء منظمی را تشکیل میدهند، افرادی کاملا ایرانی میباشند، تاریخ آنان بر مبنای اساطیری استوار نیست. کوی ویشتاسپ کە سرگزشتش با سرگزشت زرتشت بستگی دارد، یکی از شخصیتهای بسیار مهم در گاتاهاست، باید بعنوان یک فرد کاملا تاریخی محسوب گردد))[٨١].

دجهەکێ دندا دبێژێ: نەگەلەک ژ راستیێ دوورە، ئەگەر بێژین فەروەریا زنجیرا کەیانیان نموونەکا مێژوویییە، ژ سەردەمێ پشتی ئاکنجیبوونا ئارییێن مشەختی روژهەلاتێ ئیرانێ بووین، ئو دیاربوونا وان ل بن فەروەریەکا رێکوپێکا، تا سەردەمێ پەیدابوونا زەرادەشت ڤەکێشای ((خیلی دور از حقیقت نیست، اگر فرض کنیم کە سلطنت سلسلەء کەویان نموداری تاریخی است، از عهد بعد از استقرار آریائیان مهاجر در ایران شرق، ودرآمدن آنان تحت روش سلطنتی منظمی، کە تا دورەء ظهور زرتشت بطول انجامید))[٨٢].

ب کورتی کریستنسن دگەل ئەفسانەبوونا کەیانیان نینە، کارێن وانێن مێرخاسیێ و قارەمانیێ ل سەر بنواشێ مروڤێن عادی پەیدابووینە، مێژووا وان کەتواریا درستە، تێکەلی ئەفسانە و خەیالێ بوویە.

مێژووڤان (ئەلتەبەری) ئاماژێ ددە، کەیانیان ئالایێ کەیانی (درەفشێ کابیان) بلند دکر، کەی لبشتاسپ (لیشتاسپ/ویشتاسپ) د شەڕو پەڤچونادا، ل بن سیبەرا ڤی ئالای دجەنگی[٨٣]. لەوان دوورنییە مێژووا ئالایێ کاویان (کابیان) دزڤڕیتە سەردەمێ کەیانیان ١٦٠٠ ـــ ١٢٠٠ ب.ز.

مێژووڤان (مەسعودی) دپەرتووکا: مروج الذهب .. دا، هنەک باسی شاه گوشتاسپ کوڕێ بوهراسپ (لوهراسپ) دکە. ل جهەکێ دن ناڤێ وی یستاسف (یشتاسپ/ڤیشتاسپ) کوڕێ بوهراسف (لوهراسپ) دنڤێسە. هنەک ژی باسی شاهێن دنێن کەیانی: کەیکاوس، کەیخسرەو،

بەهمەن و داراب ... دکە، دبێژێ: من ئەڤ زانیارییە ژپەرتووکا (سَكيسَران) ئەوا عەبدولایێ کورێ موقەففەع، ژفارسییا کەڤن (الفارسية الاولى) وەرگێڕایە زمانێ عەرەبی[٨٤].

ئاشکارە پەرتووکا: سەکیسەران ئانکو سەرانی سەک/سەکا[٨٥] Scyhtians ، ئێک ژمللەتێن هندوئەورپیێن تاک و شاکێن وان گەهشتینە دەڤەرا سیستان. زمانێ (الفارسية الاولى) مینا مەسعودی نڤێسی، بدرستی ناهێتە زانین، دوورنییە پەهلەویا ساسانی یان ئەشکانی بیت، یانژی زمانێ ئاڤێستا بخو بیت. چەوابیت پەرتووک و وەرگێڕانا وێ هەردوو ژناڤچووینە. ژێ ڤەگوهاستنا (مەسعودی) پشتەڤانییە بو هەبوونا مێژوویيا شاه گوشتاسپ/ ڤشتاسپ و هەبوونا کەیانیان.

هزرێن شونوارناسێن ئەلمان هێرتسفیلد Herzfeld وهێرتل Hertel دسەرمەڕا بورین، ئەوێن دبێژن ڤشتاسپێ/ گوشتاسپێ کەیانی هەڤچاخێ زەرادەشت بوو. د ژێدەراندا (نەهـ) شاهێن کەیانی فەروەریگێڕایە. (پێنجێن) ئاڤیستایی: کەی قوباد، کەی کاوس، کەی خسرو، کەی لوهراسپ، کەی گوشتاسپ[٨٦]. (چارێن) دنێن ژێدەران پشتی گوشتاسپ هژمارتین: بەهمەن، هوما (ژنە)، داراب، دارا[٨٧]. بەرئەڤل سەردەمێ کەیانیان دکەڤیتە نێڤبەرا ١٦٠٠ ـ ١٢٠٠ ب.ز.

### دوو.٧. نێرینێن مێژووڤانێن گریکی و رومانی:

ئەم دڤێ خالێدا، باسی مێژووڤانێن موسلمان ناکەین. چمکی مە بەری نهو گوت، پڕانیا ژێدەرێن پەهلەوی و ئیسلامی ل وێ هزرێنە، زەرادەشت ل ئاخا ئەزەربیجان د سەد سالیا شەشێ بەری زایینیدا ژیایە. ئەڤ بوچوونەژی ئەڤرو، بەرامبەر بەلگە و گروڤێن زانستی، خو ژپیاڤە ناگریت.

مێژووڤان و نڤێسەرێن گریکی و رومانی دڤەگێڕانێن خودا، دینێ موغان، دینێن خوجهێن ئیرانێ بەری هاتنا زەرادەشتیێ، پەرستنا

روژێ و ئاگری و دێوا ... ژ ئالەکیڤە و دینێ زەرادەشتی ژ ئالەکێ دنڤە، ژێکجودا نەکرینە. لەوان کەتینە شاشیان مینا دێ بومە خویابیت.

بەلکی خسانتوسێ لیدی Xantus of Lydia ئێکەمین مێژووڤانێ گریکی بیت باسی سەردەمێ هاتنا زەرادەشت کربیت. خسانتوس د سەد سالیا پێنجێ بەری زاینیدا ژیایە (٥٠٠ ــــ ٤٦٠ ب.ز)، پەرتووکا: Lydiaca ل سەر مێژووا لیدیا نڤێسیە. پەرتووک ژناڤچویە، هنەک مێژووڤانان تشت ژێ ڤەگوهاستینە، ژوان دیوجنیس لاریتیوس D. Laretus (دەوروبەرێ ٢١٠ ب.ز ژیایە)، نڤێسیە خسانتوس دبێژێ: زەرادەشت ٦٠٠ سالان بەری هێرشا خشایارشا Xshayarsha بو سەر یونانێ ژیایە[٨٨]. هێرشا خشایارشا سالا ٤٨٠ ب.ز بوو[٨٩]. ئانکو زەرادەشت دەوروبەرێ ١٠٨٠ سالان ب.ز ژیایە.

گیوسپە مەسینا G. Messina دپەرتووکا خو: Ursprung der Magier دا دبێژێ: دپرانیا لبێن دەسنڤێسێن دیوجنیس لاریتیوس دا، سالا ٦٠٠ ب.ز هاتیە، سالا شەش هزارێ ب.ز (٦٠٠٠ ب.ز) د دەسنڤیسێن ئورگینالدا نەهاتیە و شاشیە[٩٠].

ئودوکسوسێ کنیدوسی Eudoxus of Cnidus د سەد سالیا چارێ بەری زاینیدا ژیایە (٤٠٨ ــ ٣٥٥ ب.ز)، سەردەمێ زەرادەشت ٦٠٠٠ سالان بەری ئەفلاتون Plato ددانیت[٩١]. ئەفلاتون سالا ٣٤٧ ب.ز مریە. ئانکو زەرادەشت دەوروبەرێ ٦٣٤٧ ب.ز ژیایە.

ئەرستو Aristotle (٣٨٤ــ ٣٢٢ ب.ز) دپەرتووکا خو: سەبارا فەلسەفێدا Peri Phhilosophia هەمان زانیارییێن ئودوکسوسێ کنیدوسی دووبارە کرینە، گوتیە: زەرادەشت ٦٠٠٠ سالان بەری مرنا ئەفلاتون (٣٤٧ ب.ز مریە)، ژیایە[٩٢].

هێرمودوروس Hermodoros د سەد سالیا چارێ بەری زاینیدا ژیایە دبێژێ، زەرادەشت ٥٠٠٠ سالان بەری شەرێ ترویا Troya (تەروادە) ژیایە[٩٣]. شەرێ تەروادە دەوروبەرێ ١٢٠٠ ب.ز رویدایە[٩٤]، ئانکو ب هزرا هێرمودوروس زەرادەشت دەوروبەرێ ٦٢٠٠ ب.ز ژیایە.

مێژووڤانێ بابلی بێروسوس Berosos (سالا ٢٨٠ ب.ز دژیانێدا بوو)، دپەرتووکا خو Babyloniaka دا، زەرادەشت ب شاهەکێ میدی زانیە، ب هزرا وی دەوروبەرێ ٢٣٠٠ ـ ٢٠٠٠ ب.ز ژیایە[٩٥].

پلوتارک Plutarch (١٢٦ـ ٤٦ ب.ز) هەمان بوچوونێن هێرمودورس دووبارە کرینە، نڤیسیە زەرادەشت ٥٠٠٠ سالان بەری شەرێ ترویا Troya (تەروادە) ژیایە[٩٦].

پلینیێ مەزن Pliny (Gaius Plinius) The Elder د نێڤبەرا ٢٣ ــ ٧٩ زاینیدا ژیایە. د پەرتووکا خو: Natural History دا، هەرئەو زانیاریێن ئودوکسوسێ کنیدوسی جارەکا دن، ڤەگوهاستینە[٩٧].

بژلی بوچوونا خسانتوسێ لیدی Xanthus of Lydia ، بوچوونێن مێژووڤان و نڤیسەرێن دن دشاش ونە بەرئەقلن. ب گروڤێ بەری شەش هزار سالان بەری زاینی، ناڤێ مللەتێن ئاری حەتا مللەتێن هندوئەوروپی ژی، خو ل سەر کوچکێن بالاڤیان ژی نەبوو! سەبارا هزرا بێروسوس Berosos دبێژم، دەولەتا میدی سالا ٧١٣ ب.ز هاتیە ئاڤاکرن[٩٨]، چەوان شاهەکێ وێ د هزارساليا سێ بەری زاینیدا ژیایە؟

ل گوورِ خالێن بوریێن مە هژمارتین و شیکارکرین، ب مگرتیەکا مەزن زەرادەشت د سەد سالیا چاردێدا ١٤٠٠ ب.ز ژیایە. هێ مللەتێن هندوئیرانی ژێکڤە نەببوون، ل وارێ خو ئاریاناڤیج/ئاریاڤارتا دژیان. لەوان ب بوچوونەکا زانستی زەرادەشت پێغەمبەرەکێ ئاری بوو، نە تنێ ئیرانی. پێغەمبەرەکێ ئیرانی، کوردی، پشتویی، ئوردی، بلوچی، دراڤیدی، کشمیری، ئاسی، سوغدی ... بو. وەک نەوروزێ جەژنا گش مللەتێن ئاری بوو و گش مللەتێن ئارییە.

ل گوورِ ژێدەران ئەڤ مللەتە (هندوئیرانی/ئاری) دەوروبەرێ ١٢٠٠ ــ ١٠٠٠ ب.ز، ژ وارێ خو (ئاریاناڤیج/ئاریاڤارتا) ژووردا هاتنە خارێ بەرڤ ژێریا روژهەلات و ژێریا روژئاڤا مشەختبوون. ئانکو بەرڤ پەنجاب، کشمیر وهندستانێ ژئالەکیڤە، بەرڤ ئیرانێ، کوردستانێ، ئاران و ئەرمینیا ژئالەکێ دنڤە، مشەختبوون[٩٩]. دەنگوباس و نوچەیێن

مادای Maday و پارسوا Parsua د سەد سالیا نەهێ بەری زاینیدا دکەڤرنڤیسێن ئاشوریدا، ژنو بەلاڤەبوون.

بوچی ئەڤ مللەتە ژوارێ خو مشەختبوون و ژووردا هاتنە خارێ؟ ڤەکولەران دوو- سێ ئەگەر بوڤێ مشەختبوونێ هەلبژارتینە:

أ. ژبەر سڕ و سەرما زێدەیا جهێ وان[100].

ب. ژبەر تەنگاڤیا جهی و زێدەبوونا هژمارا خێلێن وان[101].

جـ ژبەر پالدان و گڤاشتنا خێلێن هەڤسوویێن وان، خێلێن نفشێ مەغولی[102].

بەلکو مشەختبوونا وان، ژبەر ڤان ئەگەران هەموویان بوویە.

سەبارا ژیێ زەرادەشت ئاڤێستا مت و بێدەنگە. بەلێ زەند ئاڤێستا[103] شروڤا پەهلەویا وێ، ژیێ زەردەشت ٧٧ سال دانابنە[104]. دپەرتووکا: دینکەرد Dinkard دا، کو پەرتووکەکا پەهلەوییە، زەرادەشت دژیێ ٧٧ سالیێدا، ب دەستێ برەتروکرێش Bratrokresh ل باژێرکێ (بەلخ) هاتیە کوشتن[105]. گەلەک ڤەکولەر و نڤێسەران ئەڤ نوچەیێ داویێ دووبارە کریە، وەک: ژالە ئاموزگار و احمد تفضلی دپەرتووکا: اسطورەء زندگی زرتشتدا ب٢٧، حوسێن وەحیدی دپەرتووکا: دین پایەء زرتشتیدا ب٢٢، مەحمود رەزا ئیفتیخارزادە دپەرتووکا: ایران ـ آیین و فرهنگدا ب١٤٠، مهرداد مهرین دپەرتووکا: آیین زرتشتدا ب٧ ... هتد.

**بەرئەڤل زەرادەشت نەهاتیە کوشتن، بەلکو ب رێیەکا خورستی چوویە بەر دلوڤانیا خودێ، ژبەر (سێ) ئەگەران:**

أ. د پەرتووکا: روایت پەهلەویدا هاتیە: برەتروکرێش Bratrokresh ب سیحر و جادووان، خو کرە گورگ و دکەڤلێ ویدا زەرادەشت کوشت![106] ئەڤەژی وەک روژا نیڤرو ئەفسانەکا دیارە، دێ چەوا خو کەتە گورگ؟

ب. د پەرتووکا: صد در بندهش دا هاتیە: پشتی کەی گوشتاسپ دینێ مەزدیسنا هەلبژارتی و ل دەڤەرێن دەوروبەرێن خو بەلاڤکری، زەرادەشت زڤڕی جهێ خو ایرانوڤیج(١٠٧). ئانکو نە هاتیە کوشتن.

ج. د ژێدەراندا برەتروکرێش دێوە، چار برایێن دنێن دێو بناڤێن: براترووەخش، براتروویشن، ئازان، ڤەدەست، هەنە. هەمیان پیلانا کوشتنا زەرادەشت دگێرا(١٠٨). مادەم بو سوحبەتا دێوان، ئانکو ئەفسانەیە و زەرادەشت نە هاتیە کوشتن.

هنەک ڤەکولەر و نڤێسەر ل وێ هزرێنە، زەرادەشت پشتی مرنێ ل باژێرکێ ئەڤرو دبێژنێ (مەزارێ شەریف) هاتیە ڤەشارتن(١٠٩). خەلکێ دەڤەرێ هزر دکەن، گوورێ زەرادەشت مەزارێ ئیمامێ عەلی کورێ ئەبو تالبە، لەوان دبێژنێ (مەزارێ شەریف). لێ وەک راستییەکا مێژوویی مەزارێ ئیمامێ عەلی ل باژێرێ (نەجەف)ە ژێریا عیراقێ، پێوەندییا وی ب ئەفغانستانێڤە تونە(١١٠).



کریستنسن سەروکانیا ڤەکولینێن ئیرانی.



ئیبراهیم پورداود ئێکەمین وەرگێرێ فارسیێ ئاڤێستا.



حێشتر و نونەرێن دەڤەرا روخەج/ئەراخوزیا Arakhozeir ،
نەخشێن دیوارێن تەختێ جەمشید، ژ پەرتووکا: A. Shabazi, Persepolis, P.90.



حێشتر و نونەرێن دەڤەرا هەرات Harat، نەخشێن دیوارێن تەختێ جەمشید، ژ پەرتووکا:
تخت جمشید یا رضا مرادی غیاث آبادی، ب ٤٣.



حێشتر و نونەرێن دەڤەرا باکتریا Bactrya (بەلخ)، نەخشێن دیوارێن تەختێ جەمشید،
ژ پەرتووکا: M.Bahar, Persepolis, P.47



حێشتر و نونەرێن دەڤەرا پارت Parthie، نەخشێن دیوارێن تەختێ جەمشید، ژ پەرتووکا: تخت جمشید یا رضا مرادی  غیاث آبادی، ب ٤٣.



پشکەک ژ وەلاتێ (ئاریاناڤیچ) جهێ پەیدابوون و ژینگەها زەرادەشت.

**سەربێژک:**

دپرانیا ژێدەرێن پەهلەوی و ئیسلامیدا، زەرادەشت خەلکێ ئەزەربیجانا روژئاڤایێ ئیرانێ بوو، د سەد سالیا شەشێ بەری زاینیدا (٥٨٣ ب.ز)، ژیایە.

ل گوورڕ پەرتووکا: ئاڤێستا، ب تایبەتی پشکا: گاتا، کو گۆتنێن زەرادەشت بخونە، دیسان ل گوورڕ ژێدەرێن مێژوویێن باوەرپێکری، زەرادەشت ل وەلاتێ ئاریاناڤیج/ئاریاڤارتا کو د کەڤیتە ئاسیا ناڤەراست ژدێبویە و د سەد سالیا چاردێدا بەری زاینی (١٤٠٠ ب.ز) ژیایە.

هەروەسا د ڤەکولینێدا خویابوو، پێغەمبەراتیا زەرادەشت هەر ل وێ دەڤەرێ (ئاریاناڤیج) پەیدا و بەلاڤبوویە. ئەوژی بەری مللەتێن هندوئیرانی ( یان ئاری) د نێڤبەرا ١٢٠٠ ــ ١٠٠٠ ب.ز یدا، بەرەڤ پەنجاب، هندستانێ، ئیرانێ و کوردستانێ ... مشەختبن. لەوان ب بوچوونەکا زانستی زەرادەشت پێغەمبەرەکێ هندوئیرانی (ئاری) بوو، پێغەمبەرێ هەموو مللەتێن ئاری بوو، نەیێ مللەتەکی تنێ بوو.

**ژێدەر و دەهمەن:**


١ـ جلال الدين آشتياني، زرتشت ـ مزديسنا وحكومت، شركت انتشارات سهامى، تهران، ١٣٦٨ش، ب ٤٩. دیسان:

محمد جواد مشكور، خلاصهء اديان در تاريخ دينهای بزرگ، انتشارات شرق، تهران، ١٣٦٨ش، ب٩٥ .

٢ــ محمد هادى محمدى، شكوه حاجى نصرالله، سپيده دم انديشهء تاريخ، انتشارات افق، تهران، ١٣٨٥ش، ب٨٧ .

٣ـ على اكبر جعفرى، پيام زرتشت، انجمن دوستداران اشو زرتشت، برلين، ١٩٩٦، ب١١ .

٤ـ حسين وحيدى، دين پايهء زرتشتى، سازمان چاپ خواجه، تهران، ١٣٥٩ش، ب٢٢ .

٥ـ هەرئەو ژێدەر.

٦ـ هاشم رضی، اوستا ــ کهنترین گنجینەء مکتوب ایران باستان، انتشارات بهجت، تهران، ١٣٨١ش، ب ٢٠٦. دیسان:

نجیب اللە توروایانا، سترابون واریانا، مؤسسەء انتشارات الازهر، پاکستان، پیشاور، ١٣٧٩ش، ب هاء.

7- Stuttgart, 1886, Band: I, p.48.

٨ـ ابراهیم پورداود، گاتاها، انتشارات دانشگاه تهران، تهران، ١٣٥٤ش، ب٣٣ ــ ٣٤. دیسان:

جلیل دوستخواه، اوستا ــ کهنترین سرودها ومتنهای ایرانی، انتشارت مروارید، تهران، ١٣٧٠ش، جـ١ ب پانزده ـ شانزده. دیسان:

هاشم رضی، گنجینەء اوستا، سازمان انتشارات فروهر، تهران، د.ت، ب٢١٤. دیسان:

محمد جواد مشکور، ایران در عهد باستان، سازمان انتشارات اشرفی، تهران، ١٣٦٩ش، ب٦٨ .

٩ ــ بلعمی، محمد بن محمد، تاریخ بلعمی ــ ترجمە وتکملەء تاریخ تبری، بە تصحیح: محمد تقی بهار، انتشارات وزارت فرهنگ، تهران، ١٣٤١ش، جـ١ ب٦٥٦ ـ ٦٥٧. دیسان:

جلیل دوستخواه، اوستا، ژێدەرێ بەرێ، جـ١ ب چهاردە.

١٠ ـ هاشم رضی، وندیداد ــ ترجمە از متن اوستایی، انتشارات فکر روز، تهران، ١٣٧٦ش، جـ٤ ب١٧٢٨. فەرگەردێ: ١٩، موڤکا: ٤.

١١ـ ئاڤێستا درەنگتر (متاخر): ڤەکولەر و نڤێسەر دبێژنە پشکا گاتا وهنەک یەشتێن تایبەتێن د سەردەمێ زەرادەشتدا هاتینە گوتن و د سەردەمێ هەخامەنشیاندا هاتینە نڤێسین دبێژنێ: ئاڤێستا کەڤنار . ئاڤێستا درەنگتر (متأخر) د سەردەمێ هەخامەنشیاندا و هێرڤە تا سەردەمێ ساسانیان هاتیە گوتن و نڤێسین (جهانگیر اوشیدری، دانشنامەء مزدیسنا، شرکت نشر مرکز، تهران، ١٣٧١ش، ب٣٥ ــ ٣٦. دیسان: ابراهیم پورداود، خردە اوستا، انتشارات انجمن زرتشتیان ایرانی، بومبای، سالا چاپێ تونە!، ب٢٧. جلیل دوستخواه، اوستا ..، ژێدەرێ بەرێ، جـ١ ب سێزدە).

١٢ــ کریستنسن، ارتور، مزداپرستی در ایران قدیم، ترجمەء: ذبیح اللە صفا، انتشارات هیرمند، تهران، ١٣٨٨ش، ب ٢٥ ــ ٢٦. دیسان: یشتها، یەشت: ٥ بەند: ١٠٤. یەشت: ٩ بەند: ١٤، ٢٥. یەشت: ١٧ بەند: ٤٥.

١٣ـ ابراهیم پورداود، یسنا، انتشارات دانشگاه تهران، تهران، ١٣٥٦ش، جـ١ ب٣٥. دیسان:

امان الله قرشی، ایران نامک ـ نگرشی نو به تاریخ و نام ایران، انتشارات هرمز، تهران، ١٣٨٠ش، ب١١٦. دیسان:

محمد جواد مشکور، تاریخ ایران زمین، ژێدەرێ بەرێ، ب٥ .

١٤ـ هاشم رضی، وندیداد، ژێدەرێ بەرێ، جـ١ فەرگەردێ: ١، ب١٩٣ ـ ١٩٤.

١٥ ـ هەرئەو ژێدەر. دیسان:

امان الله قرشی، ژێدەرێ بەرێ، ب١٥٨ ـ ١٥٩. دیسان:

جلال الدین آشتیانی، ژێدەرێ بەرێ، ب٢٨.

١٦ـ ابراهیم پورداود، یشتها، انشارات اساطیر، تهران، ١٣٧٧ش، جـ٢ ب١٥١. یەشت: ١٥، بەندێن: ٣١ ـ ٣٣. دیسان:

کریستنسن، آرتور، کیانیان، ترجمەء: ذبیح الله صفا، شرکت انتشارات علمی و فرهنگی، تهران، ١٣٨١ش، ب٢٦. دیسان:

ماری بویس، چکیدەء تاریخ کیش زرتشت، ترجمەء: همایون صنعتی زادە، انتشارات صفی علیشاە، تهران، ١٣٧٧ش، ب٤٨.

17- E. L. Thorndike: Thorndike Dictionary, Scott Foresman a. Company, New York, 1942, p.77.

١٨ـ محمد زكي الايوبي، القاموس الجغرافی الحدیث، دار العلم للملايين، بیروت، ١٩٨٨، ب٦٧ .

١٩ـ مسعود میرشاهی، پژوهش در فرهنگ باستانی وشناخت اوستا، انتشارات انجمن رودکی، پاریس، ١٩٩٨، جـ١ ب١٠٩.

٢٠ـ ابراهیم پورداود، یشتها، ژێدەرێ بەرێ، جـ١ ب١٣١ .

٢١ ـ پازەند Päzand : شروڤەکرنا زەند ئاڤێستایە. ئانکو شروڤا شروڤێیە. پەیڤێن ئارامیێن د زەند ئاڤێستادا بو زمانێ پەهلەوی هاتنە وەرگێران و بتیپێن ئاڤێستایی هاتنە نڤێسین. مخابن پرانیا پازەندێ ژناڤچویە (جهانگیر اوشیدری، دانشنامەء مزدیسنا، ژێدەرێ بەرێ، ب١٩١. دیسان: هاشم رضی، گنجینەء اوستا، ژێدەرێ بەرێ، ب٢٠٣).

٢٢ ـ احمد تفضلی (مترجم)، مینوی خرد، بە کوشش: ژالە آموزگار، نشر توس، تهران، ١٣٧٩ش، ب٦٩.

٢٣ ـ جهانگیر اوشیدری، دانشنامەء مزدیسنا، ژێدەرێ بەرێ، ب٤١٢ .

٢٤ـ عنايت الله رضا، ايران و تركان در روزگار ساسانيان، شركت انتشارات علمى وفرهنگى، تهران، ١٣٦٥ش، ب٦٢ .
٢٥ـ ابراهيم پورداود، يسنا، ژێدەرێ بەرێ، جـ١ ب٥٠ .
٢٦ــ توران Turan : ژپەیڤێن ئاڤێستایی Tura, Tuirya ب ئانكویا تورانی، وەک دوژمنێن دینێ زەرادەشت، هاتیە. ئەڤە هەر خێلێن كوچەرێن ئاریان بوون، ئەوێن نەچووینە سەر دینێ زەرادەشت. ل ژووریا رووبارێ ئاموداریا دژیان، دگوتە وارێ خو توئیریانا/توریاناTuiryana, Turyana . ژ ناڤێن سەركێش وریبەرێن وانێن بومە ماین وەک بنەمالێن (ئەسپە وگاو)، ئاسوئەسپە Asuaspa ، ئەرجەت ئەسپە Arjataspa ، زەئینگاو Zaingav ، ئانشیگاو Anshigao ... خویا دبە ئەو ژ توخمێ ئاریان بوون. پشتی ئارى ژجهێن خو ژووردا هاتینە خارێ، بەرڤ هندستان و ئیرانێ مشەخت بووین. مللەتێن مەغولی هاتنە شونێن وان، ناڤێن توران و توئیریانا ژى بو وان مان (كريستنسن، مزداپرستى در ايران قديم، ژێدەرێ بەرێ، ب٨٧، دەهمەنێ نەمرە: ١. دیسان: دوشن گیمن، دین ایران باستان، ژێدەرێ بەرێ، ب١٨٦. دیسان: نادر بيات، تورانيان از پگاه تاريخ تا بزيرش اسلام، انتشارات ايرانشهر، تهران، ١٣٦٧ش، ب١٢) .

27-J. Marquart: Iranshahr, Weidmannsche Buchhandlung, Berlin, 1901, Band: 1, p. 155.

٢٨ ــ مە پەیڤا (ئاڤرێژ) بو Riverbasin بكارئانیە. ئەو دەڤەرێن ئاڤا وان درێژتە رووبارى و رووبار ئاڤا وان دگەهینتە رێژگەهێ. ع.م .
٢٩ـ الاصطخري، ابراهيم بن محمد الفارسي، المسالک والممالک، تحقيق: د. محمد جابر عبدالعال الحيني، الهيئة العامة لقصور الثقافة، القاهرة، ٢٠٠٤، ب١٧٠ .
٣٠ـ ابن الفقيه الهمداني، احمد بن محمد، مختصر كتاب البلدان، منشورات دار احياء التراث العربي، بيروت، ١٩٨٨، ب٢١١ .
٣١ ـ ژاله آموزگار واحمد تفضلى، اسطورهء زندگى زرتشت، نشر چشمه، تهران، ١٣٧٥ش، ب٢٣.
٣٢ ـ ابراهيم پورداود، يشتها، ژێدەرێ بەرێ، جـ١ ب٤٢٩ ـ ٤٣١ .
٣٣ـ ابراهيم پورداود، يسنا، ژێدەرێ بەرێ، جـ١ ب٤٩ ـ ٥٠. دیسان:
دوشن گيمن، دين ايران باستان، ترجمهء: رويا منجم، انتشارات فكر روز، تهران، ١٣٧٥ش، ب١٨٧. دیسان: بهرام فرەوشى، ايرانڤيج، انتشارات دانشگاه تهران، تهران، ١٣٧٤ش، ب٨. دیسان:

فرهنگ مهر، دیدی نو أز دینی کهن، انتشارات جامی، تهران، ١٣٧٥ش، ب١٢٧ ـ ١٢٨. دیسان:
امان الله قرشی، ایران نامک، ژێدەرێ بەرێ، ب٧٢ .

٣٤ ـ دو زاراڤێن پەهلەوی هەنە، پەهلەویا ئەشکانی و پەهلەویا ساسانی (هێڤکە: بهرام فرەوشی، فرهنگ زبان پهلوی به فارسی، انتشارات دانشگاه تهران، تهران، ١٣٥٨ش، ب پنج ـ شیش. دیسان:

D. N. Mackenzie: A Concise Pahlavi Dictionary, Oxford University Press, London, 1971, p. 9 .

٣٥ـ محمد جواد مشکور، ایران در عهد باستان، ژێدەرێ بەرێ، ب٦٦. دیسان:
ماری بویس، چکیدەء تاریخ کیش زرتشت، ژێدەرێ بەرێ، ب٧. دیسان:
جلیل دوستخواه، اوستا ..، ژێدەرێ بەرێ، ج١ ب دوازدە.

٣٦ـ سوکولوڤ زمانی ئاڤێستا، وەرگێڕانی: محەمەد ئەمین هەورامانی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٨٨، ب٢٥.

٣٧ـ موغ (موغان): ژپەیڤا ئاڤێستایی mogu ب ئانکویا کارێ مەزن هاتیە. موغێن زەرادەشتی شەرەزایی فەلسەفە و رێبازا دینی بوون، ئەڤە جودابوون ژموغێن بابلی کو دسەر کارێ دینی را، سیحر و جادوو دگێڕان. دیسان موغ خێلەکا یان تەخەکا روحانیێن میدی بوون، پشتی بەلاڤبوونا دینێ زەرادەشتی ل فارس و میدیا، موغێن میدی بوونە رێبەرێن دینێ نو. گریکان گوتیە موغان mogus و مەجووسا عەرەبی ژوان هاتیە وەرگرتن (جهانگیر اوشیدری، دانشنامەء مزدیسنا، ژێدەرێ بەرێ، ب٤٣٦ ـ ٤٣٧. دیسان: جلیل دوستخواه، اوستا ..، ژێدەرێ بەرێ، ج٢ ب١٠٥٥).

٣٨ـ محمد جواد مشکور، ایران در عهد باستان، ژێدەرێ بەرێ، ب٦٦. هێژا (مەشکور) نڤێسیە: هەر ژسەردەمێ هەخامەنشیان. یاراست هەر ژسەردەمێ میدیان بەری هەخامەنشیان. چمکی میدی ژی زەرادەشتی بون. ڤەکولەرێ ئەلمان ئەدوارد مایەر E. Meyer دپەرتووکا: Geschichte des Altertums دا نڤێسیە: د کەڤرنڤیسەکیدا کو ل سەردەمێ سەرجونێ دوێ Sargon II ئاشووری (٧٢٢ ـ ٧٠٥ ب.ز)، ئانکو د سەد سالیا هەشتێ بەری زاینیدا هاتیە نڤێسین. ناڤێ مەزداکو Mazdaku وەک میرەکێ میدی/مادی تێدا هاتیە (هێڤکە:

Geschichte des Altertums, J. Cottasche Buchhandlung, Stuttgart u. Berlin, 1907, Zweite Auflage, p.145.

دیسان:
جلال الدین آشتیانی، زرتشت ـ مزدیسنا وحکومت، ژێدەرێ بەرێ، ب٨١ .
فرهنگ مهر، دیدی نو از دینی کهن، ژێدەرێ بەرێ، ب١٢٤) .
٣٩ ـ دوشن گیمن، دین ایران باستان، ژێدەرێ بەرێ، ب١٨٢ .
٤٠ـ ژاله آموزگار واحمد تفضلی، اسطورەء زندگی زرتشت، ژێدەرێ بەرێ، ب٢٣.
41- Crystal, David: The Penguin Concise Encyclopedia, Penguin Books, London, 2005, p. 464.
Szantyr, Kay (Redaktions Leitung): Lexikon der Geschichte, Voltmedia GmbH, Paderborn, 2005, p. 426.
٤٢ـ رقیه بهزادی، آریاها و ناآریاها در چشم انداز کهن تاریخ، انتشارات طهوری، تهران، ١٣٨٢ش، ب١٢. دیسان:
ذبیح الله صفا، سرگزشت سه هزار وپانصد سالەء ایران، مجلەء داشکدەء ادبیات، دانشگاه تهران، شمارەء: دیماه، ١٣٣٨ش، ب٢. دیسان:
امان الله قرشی، ایران نامک، ژێدەرێ بەرێ، ب١٨٤.
٤٣ ـ جلال الدین آشتیانی، زرتشت ـ مزدیسنا وحکومت، ژێدەرێ بەرێ، ب٤٦ .
٤٤ـ م. عثمان صدقی، شهرهای آریانا، بیهقی کتاب خبرلو مؤسسه، افغانستان، قوس، ١٣٥٤ش، ب٤٨، ٥٢، ٧٩.
45- A. Shahbazi: The Authoritative Guide to Persepolis, Safiran Puplishing Co., Tehran, 2011, p. 90, 119-120 .
٤٦ـ امین المعلوف، معجم الحیوان، مطبعة مجلة المقتطف، القاهرة، ١٩٣٢، ب٤٥ـ٤٦.
٤٧ـ ماری بویس، چکیدەء تاریخ کیش زرتشت، ژێدەرێ بەرێ، ب٥١ .
٤٨ـ ابراهیم پورداود، گاتها، ژێدەرێ بەرێ، ب٩. ئەهونەوەد گات، موڤکا: ٩ .
٤٩ـ هەرئەو ژێدەر. ئەهونەوەد گات، موڤکا: ١٥ .
٥٠ـ هەرئەو ژێدەر، ب٩٤، ١٠٤. ئەهونەوەد گات، موڤکا: ١٠، ١٨ .
٥١ ـ آبتین ساسانفر، اوستا ـ برگردان هفت هات از گاتها، انتشارات خاوران، پاریس، ١٣٨٢ش، ب١٢٩. گاتا، سرود: ٢، بەند:٦ .
٥٢ـ هەرئەو ژێدەر، ب٣٦٧. گاتا، سرود: ٥، بەند: ١٠ .
٥٣ـ ابراهیم پورداود، یسنا، ژێدەرێ بەرێ، جـ٢ ب٣٨. یەسنا: ٣٩. دیسان:
ماری بویس، چکیدەء تاریخ کیش زرتشت، ژێدەرێ بەرێ، ب٤٨ .
٥٤ ـ هەرئەو ژێدەر.
٥٥ـ ابراهیم پورداود، یسنا، ژێدەرێ بەرێ، ب٤٠. یەسنا: ٤٠. دیسان:

ماری بویس، چکیدەء تاریخ کیش زرتشت، ژێدەرێ بەرێ، ب٤٩.

٥٦ــ ژالە آموزگار، احمد تفضلی، اسطورەء زندگی زرتشت، ژێدەرێ بەرێ، ب٢١ـ٢٢.

57- Boyce, Mary: Zoroastrians-Their Religious, Beliefs and Practices, Routledge a. Kegan Paul Ltd. London, 1979, p.18.

٥٨ـ جلال الدین اشتیانی، زرتشت ـ مزدیسنا وحکومت، ژێدەرێ بەرێ، ب٩٧ .

٥٩ـ ابراهیم پورداود، گاتاها، ژێدەرێ بەرێ، ب٨٢ .

جەلیل دوستخواه، اوستا، ژێدەرێ بەرێ، جـ١ ب١٥ .

٦٠ـ آبتین ساسانفر، اوستا ـ برگردان هفت هات ..، ژێدەرێ بەرێ، ب١٩٧ .

٦١ــ مازیار قوی دل عسکری، پژوهشی در اوستا وایین یاباور زرتشتی، انتشارات پارس، لوس انجلس، ٢٠٠٣، ب١٣٢ .

٦٢ ــ ول دیورانت، قصة الحضارة، ترجمة: د. زکي نجیب محمود، مطبعة لجنه التالیف والترجمة والنشر، القاهرة، ١٩٦٥، م١ جـ١ ب١٧٩ ـ ١٨١ .

63- Szantyr, Kay, op. cit., p.130, 245.

Adam, Ingrid: Das Neue Duden Lexikon, Dudenverlag, Mannheim, 1989, Band: 10, p.4017.

دیسان: لیونارد کوتریل (المشرف العام)، الموسوعه الاثریة العالمیة، الهیئة المصریة العامة للکتاب، القاهرة، ١٩٩٧، ب١٦٣، ٢١٦ .

٦٤ـ ابراهیم پورداود، فرهنگ ایران باستان، انتشارات اساطیر، تهران، ١٣٨٠ش، ب١٤٩ ـ ١٥٠ .

65- H. S. Nyberg: Die Religionen des Alten Iran. Deutsch von: H. Schaeder, J. C. Hinrichs Verlag, Leipzig, 1938, Band: II, p. 50.

دیسان:

محمد رضا جلالی نائینی، هند در یک نگاه، انتشارات شیرازه، تهران، ١٣٧٥ش، ب٦٢.

پرویز رجبی، هزارهای گمشده، نشر توس، تهران، ١٣٨٠ش، جـ١ ب١٢٤ .

اورانسکی، یوسف، مقدمەء فقە اللغە ایرانی، ترجمەء: کریم کشاورز، انتشارات پیام، تهران، ١٣٥٨ش، ب٣٥ ـ ٣٧ .

ابراهیم پورداود، یسنا، ژێدەرێ بەرێ، جـ١ ب٣٥ .

دوشن گیمن، دین ایران باستان، ژێدەرێ بەرێ، ب٥٣ .

جلیل دوستخواه، اوستا ..، ژێدەرێ بەرێ، جـ١ ب بیست ویک .

٦٦ـ محمد جواد مشكور، ايران در عهد باستان، ژێدەرێ بەرێ، ب٦٦ .
٦٧ ـ مارى بويس، چكيدەء تاريخ كيش زرتشت، ژێدەرێ بەرێ، ب١٤. ديسان:
هاشم رضى، فرهنگ ايرانى در عصر اوستا، انتشارات بهجت، تهران، ١٣٨٩ش، ب٥٢٧ .
٦٨ـ ابراهيم پورداود، گاتاها، ژێدەرێ بەرێ، ب١٦٤ ـ ١٦٦، ١٨٦، ٢١٠.
٦٩ـ آبتين ساسانفر، ژێدەرێ بەرێ، ب٧٣، ٧٧. ديسان:
هاشم رضى، اوستا ..، ژێدەرێ بەرێ، ب١٩٢ ـ ١٩٣، ١٩٨ ـ ١٩٩ .
٧٠ ـ ابراهيم پورداود، يشتها، ژێدەرێ بەرێ، جـ٢ ب٢٨٨.ديسان:
احسان بهرامى، فرهنگ واژەهاى اوستائى، انتشارات بلخ، تهران، ٢٠٠٠، جـ٣ ب١٣٧٠.
٧١ـ فرهنگ مهر، ژێدەرێ بەرێ، ب٣٨. ديسان:
ژاله آموزگار، اسطورەء زندگى زرتشت، ژێدەرێ بەرێ، ب٢٦.ديسان:
مهرداد مهرين، دين مزدائى، سازمان انتشارات فروهر، تهران، ١٣٦٤ش، ب٧.
٧٢ ـ جلال الدين آشتيانى، زرتشت ـ مزديسنا وحكومت، ژێدەرێ بەرێ، ب١٠٠ـ١٠١ .
٧٣ـ كريستنسن ناڤێ وێ Kosavya دانايە، مزداپرستى در ايران قديم، ترجمەء: ذبيح الله صفا، انتشارات هيرندمند، تهران، ١٣٨٨ش، ب٢٦.
٧٤ـ ابراهيم پورداود، يشتها، ژێدەرێ بەرێ، جـ٢ ب٢٩٩. زامياد يەشت، يەشت: ١٩. ديسان:
كريستنسن، آرتور، مزداپرستى در ايران قديم، ژێدەرێ بەرێ، ب٢٦. ديسان:
هاشم رضى، اوستا ..، ژێدەرێ بەرێ، ب٤٣٨ .
٧٥ـ د بوندەهشدا لبا هندى، فەصلێ: ٢١، موڤكا: ٧، هاتيە: كيانزێ Kyansih (هامون) محل خاندان كيانى است. مخابن ئەڤ هەڤوكە دلبا فارسيدا، بەرچاڤ نەكەت. ع.م.
٧٦ ـ هێڤكە: زەرياچا هامون و رووبارێ هێلمەند د فەرهەنگا:
Historical and Cultural Dictionary of Afghanistan, by: M. Jamil Hanifi, the Scareerow Press, Inc. 1976, USA, p.52-4,113.
ديسان: بهرام فرەوشى، ايرانويچ، انتشارات دانشگاه تهران، تهران، ١٣٧٤ش، ب٩ .
٧٧ ـ ابراهيم پورداود، يشتها، ژێدەرێ بەرێ، جـ٢ ب٣٤٤. بو ناڤێن نوويێن رووباران هێڤكە:

Philips Modern School Atlas, by: M. Sc. Fullard, London, 1965, p. 60.

دیسان: بهرام فرەوشی، ایرانویج، ژێدەرێ بەرێ، خەریتا: ب٩.

٧٨ ـ ژاله آموزگار، تاریخ اساطیری ایران، سازمان مطالعه و تدوین کتب علوم انسانی دانشگاهها (سمت)، تهران، ١٣٨١ش، ب٦٦ .

٧٩ـ امان الله قرشی، ژێدەرێ بەرێ، ب١٦١ .

٨٠ـ کریستنسن، آرتور، کیانیان، ترجمەء: ذبیح الله صفا، شرکت انتشارات علمی وفرهنگی، تهران، ١٣٨١ش، ب نه.

٨١ـ هەرئەو ژێدەر، ب٤٥ ـ ٤٦ .

٨٢ـ هەرئەو ژێدەر، ب٤٩ .

٨٣ـ الطبري، محمد بن جریر، تاریخ الرسل والملوک، تحقیق: محمد ابو الفضل ابراهیم، دار المعارف، القاهرة، ١٩٨٧، جـ١ ب٥٦٢ ـ ٥٦٣ .

٨٤ـ المسعودي، علي بن الحسین، مروج الذهب ومعادن الجوهر، تحقیق: محمد محي الدین عبدالحمید، المکتبة العصریة للطباعة والنشر، بیروت، ١٩٨٨، جـ١ ب٢٢٦ ـ ٢٢٧ .

٨٥ـ سەک/سەکا Scythians: خێلێن هندوئەوروپی بوون، دەوروبەرێ ٣٠٠٠ سالان ب.ز وهێرڤە، ل هەموو دەڤەرێن ئاریان تایبەتی ئاسیا ناڤەراست، دبەربەلاڤبوون. باژێرێ کوردان (سەقز) و دەڤەرا سەگستان/سیستانا ئەفغانستان، ناڤێن خو ژوان وەرگرتینە. شاهێ میدی هوخشترە/کەی ئەخسارKyaxar ئەو ژمیدیا کرنە دەر. هێڤکە:

J. Irmscher: Lexikon der Antike, Gondrom Verlag, Leipzig, 1986, p. 49.

Szantyr, Kay: op. cit., p. 853.

٨٦ـ هنەک ژێدەران سیاوش کورێ کەیکاوس ژی وەک شاه هەلبژارتیە، لێ د ئاڤێستادا شاهبوونا وی تونە. ع.م

٨٧ـ محمد جواد مشکور، ایران در عهد باستان، ژێدەرێ بەرێ، ب٩٩ ـ ١٠٢.دیسان:

ژاله آموزگار، تاریخ اساطیری ایران، ژێدەرێ بەرێ، ب٧٧ .

٨٨ـ ابراهیم پورداود، یسنا، ژێدەرێ بەرێ، جـ١ ب٨٠ .

89- H. Bengtson: Griechen und Perse, Fischer Taschenbuch Verlag, Frankfurt am Mein, 1984, p. 53.

90- G. Messina: Der Ursprung der Magier und die Zarathustrische Religion, Romaverlag, Rom, 1930, p. 41.

٩١ـ ژاله آموزگار واحمد تفضلی، اسطورەء زندگی زرتشت، ژێدەرێ بەرێ، ب١٨.
٩٢ ـــ هاشم رضی، تاریخ مطالعات دینهای ایرانی، انتشارات بهجت، تهران،١٣٧١ش، ب١٤٠ .
٩٣ـ هەرئەو ژێدەر. دیسان:
ژاله آموزگار واحمد تفضلی، اسطورەء زندگی زرتشت، ژێدەرێ بەرێ، ب١٨ .
94- Szantyr, Kay: op. cit., p. 913.
95- A. Jackson: Zoroaster, Columbia University Press, New York, 1938, p.448-9.
٩٦ـ هاشم رضی، تاریخ مطالعات دینهای ایرانی، ژێدەرێ بەرێ، ب١٤٠ ـ ١٤١ .
٩٧ـ هەرئەو ژێدەر.
٩٨ـ د ژێدەرادا جوداهی نێڤبەرا سالێن ئاڤاکرنا دەولەتا میدیدا هەیە، ٧١٣ ب.ز، ٧٠٨ ب.ز، ٧٠٥ ب.ز. من بوچوونا ابراهیم پورداود وەرگرتیە ٧١٣ ب.ز. هێڤکە: یسنا، انتشارات دانشگاه تهران، تهران، ١٣٥٦ش، جـ١ ب١١٠.
99- Bar, Kay: Die Religion der Alten Iraner, in Handbuch der Religionsgeschichte, J. P. Asmussen Verlag, Göttingen, 1972, Band: II, p. 265, 273.
دیسان:
کای بار، دیانت زرتشتی، ترجمەء: فریدون وهمن، نشر ثالث، تهران، ١٣٨٦ش، ب٢٩. دیسان:
جورج کامیرون، ایران در سپیدەء دم تاریخ، ترجمەء: حسن انوشە، شرکت انتشارات علمی وفرهنگی، تهران، ١٣٦٥ش، ب١٠٦. دیسان:
ایلیا گرشویج (ویراستار)، تاریخ ایران کامبرج، ترجمەء: تیمور قادری، انتشارات مهتاب، تهران، ١٣٨٧ش، جـ٢ ق١، ب٥٨ .
١٠٠ـ بهرام فرەوشی، ایرانویج، ژێدەرێ بەرێ، ب٨. دیسان:
محمود رضا افتخارزاده، ایران ـ آیین و فرهنگ، ژێدەرێ بەرێ، ب١٣٦ .
١٠١ ـ محمد جواد مشکور، ایران در عهد باستان، ژێدەرێ بەرێ، ب٦٥ .
١٠٢ ـ بهرام فرەوشی، ایرانویج، ژێدەرێ بەرێ، ب٨. دیسان:
محمد هادی محمدی وشکوه حاجی نصرالله، سپیده دم اندیشە، ژێدەرێ بەرێ، ب٦٨ .
١٠٣ ـــ زەند ئاڤێستا: شروڤەکرنا ئاڤێستایە ب زمانێ پەهلەوی. ل سەردەمێ ساسانیان (٢٢٦ ـــ ٦٥٢ز) هاتیە کرن (جهانگیر اوشیدری، دانشنامەء مزدیسنا، ژێدەرێ بەرێ، ب٣٠٦. دیسان: محمد معین، فرهنگ فارسی ـــ أعلام، موسسەء انتشارات امیر کبیر، تهران، ١٣٧١ش، جـ٥ ب٦٥٦) .

١٠٤ ـ ماری بویس، چکیدهء تاریخ کیش زرتشت، ژێدەرێ بەرێ، ب٢١ .
١٠٥ ــ محمد جواد مشکور، گفتاری دربارهء دینکرد، وەشانخانە تونە!، تهران، ١٣٢٥ش، ب٣٦ ـ ٣٧ .
١٠٦ـ ماری بویس، چکیدهء تاریخ کیش زرتشت، ژێدەرێ بەرێ، ب٢٣ .
107- Bamanji, Ervad M. A.: Sad dar Nasr and Sad dar Bundehesh, British India Press, Byculla, Bumbay, 1909, p. 103 (کتاب صد در بندهش، فصل: ٣٥، موڤقا٣: .
١٠٨ــ عبدالعظیم رضائی، اصل ونسب ودینهای ایرانیان باستان، انتشارات دُرّ، تهران، ١٣٧٩ش، ب١٠٥.
١٠٩ ـ فرهنگ مهر، ژێدەرێ بەرێ، ب١٢٨. دیسان:
مازیار قوی دل عسکری، پژوهشی در اوستا وآیین زرتشتی، انتشارات پارس، لوس انجلس، ٢٠٠٣، ب١١٢ .
١١٠ـ نموونێن گوهارتنا ناڤێن مێژوویی بو ناڤێن ئەڤرو، دا ب دەستێن موسلمانان نەهێنەخرابکرن و وێرانکرن، ل ئیرانێ گەلەکن وەک: ژبەر پاراستنا گوورێ کوروشێ ئێکێ (٥٥٩ ـ ٥٢٩ ب.ز) ل دەشتا مورغاب، ئاستانا فارس، ناڤێ وی بو (مقبرهء مادر سلیمان)، ئاگردانا ئازەر گوشەنسپ (٥٩٠ ــ ٦٢٧ ز) ل شیز، ناڤێ وێ بو (تخت سلیمان)، ئاگردانەکا ئەشکانیان (٢٥٠ ــ ٢٢٦ ز) ل روژهەلاتێ شوشتەر، بو (مسجد سلیمان) ... هتد. باوربکەن نە سلێمان ونە دیا وی ئیران نەدیتبوو! ع.م.

## ملخص البحث

تذهب معظم المصادر الفهلوية والاسلامية، الى ان ولادة زرادشت كان في بلاد اذربيجان غرب ايران، وانه عاش في القرن السادس ق. م (ت ٥٨٣ ق. م).

إستناداً على كتاب الآفستا Avesta سيَّما القسم المعروف منه بالكاثا Gatha ، الذي ينسب الى زرادشت نفسه. واعتماداً على المصادر التاريخية الموثوقة القديمة منها والحديثة، فإن موطن زرادشت كان يعرف تاريخياً باسم اريانافيج (او اريافارتا) بمعنى ارض الآريين وموطنهم وكان يقع في آسيا الوسطى. وانه أي زردشت وفق تحليل جديد للمصادر، عاش في حدود القرن الرابع عشر ق. م (١٤٠٠ ق. م). وبلَّغ رسالته الدينية في موطنه ذاك، وذلك قبل هجرة الاقوام الهندوايرانية (الآرية) منها الى بلاد البنجاب والهند وايران وكوردستان ... وغيرها، في حدود سنة ١٢٠٠ ــ ١٠٠٠ ق. م. وكانت رسالته موجهة للاقوام الهندوايرانية (الآرية) كلها وللانسانية جمعاء، ولم تكن تخص قوماً معيناً او محدوداً.

## Abstract

Most of the Pahlavi and Islamic resources refers that Zoroaster's birth was in Azerbaijan (west of Iran), and he lived in the sixth century B.C., (Died in 583 B.C.).

According to Avesta book, particularly in its famous part which is called Gatha which is belonged to Zoroaster himself, and depending on the trusted ancient and modern historical resources Zoroaster's homeland was known as Arianavich or Aryavarta which means the Arian Land and it was situated in Middle Asia.

According to a new analyses of the resources, Zoroaster lived in the 14th B.C. century and at that time, (in within the years 1200 -1000 B.C.), he announced his message in his homeland before the arrival of the Indo – European nations and others to Punjab, India, Iran and Kurdistan…His message was addressed to all of the Indo – Europeans (Arian nations) and for all mankind, and it was not for a specific or a nominated nation.

# کەسایەتیی میر محەمەد ڕەواندزی و دیاردەی توندوتیژی لە فەرمانڕەوایەتیدا

## (١٧٨٤ - ١٨٣٧)

م. ی مەغدید حاجی ئەمین

بەشی مێژوو- فاکەڵتی ئاداب - زانکۆی سۆران

### پێشەکی

بێگومان تاکو ئێستا ژمارەیەک توێژینەوە و چەندین نووسینی هەمەجۆر دەربارەی مێژووی میرنشینی سۆران لە سەردەمی میر محەمەد ڕەواندزی (١٨١٣ – ١٨٣٦) نووسراون و بڵاوکراونەتەوە.

بیرۆکەی نووسینی ئەم توێژینەوەی ئێمەش بۆ سێ ساڵ بەر لەئێستا دەگەڕێتەوە، کە بیرەوەری (٢٠٠) ساڵ بەسەر وەرگرتنی دەسەڵاتی میرنشینی سۆران لەلایەن (میر محەمەد) بەبێ دەنگی تێپەڕی، بەبۆچوونی ئێمە دەبوایە زانکۆکانی کوردستان چەندین کۆنفرانسی زانستییان لەم بۆنەیەدا سازبکردایە.

کەسایەتی میر محەمەد (میری کۆرە) شایانی ئەوەیە لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەنامە و سەرچاوە کۆن و نوێکان بەردەوام توێژینەوەی زانستی لەبارەوە ئەنجام بدرێت، چونکە لە سەردەمی ئەم میرەدا قۆناغێکی نوێ لە مێژووی میرنشینی سۆران دەستی پێکرد و سنوورەکانی بەجۆرێک فراوان بوون، کە هیچ میرنشینییەتێکی کوردی لە سەدەی نۆزدەدا بەم جۆرە فراوانخوازی و ئاوەدانی و سەربەخۆیی بەخۆوە نەبینیوە.

میر محەمەد خاوەن کەسایەتییەکی فرەڕەهەند بوو: زانستخواز، ئاییندار، ئاوەدانیخواز، سەربەخۆییخواز، پەیڕەوکردنی دادپەروەری

لەبەر ڕۆشنایی شەریعەتی ئیسلام. لە هەمان کاتدا بەکارهێنانی ئەوپەڕی توندوتیژی لەبەرامبەر دز و ڕێگران، لەبەرامبەر کەسە نزیکەکانی کە نەیاری بوون لە دەسەلاتدارێتیدا، لە بەرامبەر دیان و کوردانی ئێزیدی لەوبەری زێی بادینانەوە کە دەچێتە چوارچێوەی (تاوانی کۆمەڵکوژی). بەڵام ئەم کارەشی لەدوای دەرچوونی فەتوای موفتی میرنشینییەکەی ئەنجامداوە. زۆربەی سەرچاوەکانیش ئەم ڕاستییە تاڵەیان سەلماندووە.

بۆیە ئێمە بەپێویستمان زانی لە بیرەوەری دوو سەد ساڵەی فەرمانڕەوایەتیی ئەم میرە ناودارەی کوردستان، کە خواستی دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی هەبووە، لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەنامە و سەرچاوەکان بەکۆن و نوێیانەوە، لەم کەسایەتییە مێژووییە بکۆڵینەوە، لەمیانەی چوار تەوەردا توێژینەوە لەسەر ژیان و کەسایەتی و سیاسەتی توندوتیژی و چارەنووسی ئەنجام بدەین.

## باسی یەکەم

### ناوی تەواو و لەدایکبوون و پەروەردە و چارەنووسی میر محەمەد

میر محەمەد کوڕی مستەفا بەگی کوڕی ئۆغزبەگی کوڕی ئەحمەد بەگە[1]، یەکێکە لە میرە فەرمانڕەوا ناودارەکانی میرنشینی سۆران [2]. لە سەردەمی ئەم میرەدا قۆناغێکی نوێ لە مێژووی ئەم میرنشینییە دەستی پێکرد[3].

میر محەمەد لە ژیانی فەرمانڕەوایی و لە بەڵگەنامەکانی عوسمانی و لە مێژووی نوێی کورددا بەم ناو و نازناوانەی خوارەوە ناوی هاتووە یان کەوتۆتە ناو لاپەڕەکانی مێژوو:

١- (میر محەمەد ئەمیری مەنسوور)، حوسێن حوزنی موکریانی لە (مێژووی میرانی سۆران)دا نووسیویەتی کە لەسەر ڕووێکی دراوەکانی میر محەمەددا نووسراوە ((الامیر المنصور محمد بیک))، هەروەها لەسەر

لووله تۆپه دروستکراوەکانیشدا جگه لەناوی وەستا رەجەب هەمان شت نووسراوه[٤].

٢- (رواندز بکی محمد پاشا) و (محەمەد بەگی رەواندوزی) بەم جۆره لەلای عوسمانییەکان ناوبراوه، هەروەکو له ئەرشیفی بەڵگەنامەکانی عوسمانی تۆمارکراوه [٥].

٣- به (میری کۆره) و (پاشای کۆره یان کۆر پاشا) ناسراوه[٦]. بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەم نازناوەش، که لەوەوه سەرچاوەی گرتووه میر محەمەد چاوێکی کەم بینا یان نابینا بووه، قسەکانی دکتۆر روس (ROOS)ه پزیشکی تایبەتی کونسڵخانەی بەریتانیا له بەغدا که له ساڵی ١٨٣٣دا له ئاکرێ لەگەڵ میر محەمەددا کۆبۆتەوه و نووسیویەتی کەوا شوێنەواری (خوریکه - ئاوڵه) بەدەم و چاویەوه دیاره و چاوێکی رۆشنایی کەم بووه و تاریک دێته پێش چاو[٧].

٤- (پاشای گەوره یان میری گەوره)، هەندێ نووسەر و کەسایەتی کورد له سەدەی بیستەمدا لەبەر رۆشنایی هەستی نەتەوەیی، پێیان نەشیاو بووه به (پاشای کۆره) ناوی میرمحەمەد بەرن . به گەورەیی سەیریان کردووه. هەروەکو (گیوی موکریانی) [٨] له پاشبەندی چاپی دووەمی (مێژووی میرانی سۆران)دا نووسیویەتی و دەڵێ : ((.... گرۆی پێشکەوتنی له هەموو میرەکانی کوردستان بردۆتەوه و لەگشتیان به دەستەڵاتتر و بەهێزترو پڕ شان و شکۆتر و گەورەتر بوو بۆیه (میری گەورەیان) پێ دەگوت))[٩].

میر محەمەد له ساڵی (١١٩٨ ک / ١٧٨٤ز) له شاری رەواندز لەدایک بووه [١٠]. دایکی ناوی (بووک شازەمان) بوو [١١]. زۆر ژنێکی کەیخوداژن و تێگەیشتوو بوو[١٢]. خاوەن پێگەیەکی بەرز و به ڕا و تەگبیر بوو. دوای لەناوبردنی میر محەمەدیش لەژیاندا مابوو[١٣]. هەندێ سەرچاوه ئاماژه بۆ ئەوه دەکەن که ئەم ئافرەته له بواری کارگێڕیشدا عاقڵمەند بووه[١٤]. بەگوێرەی پێداویستییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی له

کوردســـتاندا خێزانـــی ســـەرۆک هـــۆز یـــان میـــر بەشـــداربووە لە هەڵســـووڕاندنی کاروبـــاری هـــۆز یـــان هەرێمەکەیـــان. هەروەهـــا وەکـــو (ڕاوێژکار) یان (سکرتێرە)ی ئەم زەمانە و ئەمینداری سندووقی میر یان سەرۆک هۆز ڕۆڵی بینیوە[١٥]. لە مێژووی کورددا نموونەی لەم جۆرە ژنانە کەم نەبوون، وەکو: خانزاد خانی سۆران، عادلەخانی ئەردەڵانی، فاتمەخانی مەلا عەزیزی فەقیانی، لەعلی خانی ڕەواندزی و حەپسەخانی نەقیب[١٦].

مـــاوەی ژیـــانی منـــداڵی میـــر مـــحەمەد و جـــۆری پەروەردەکردنـــی ناڕۆشن نییە، وەکو قوتابییەکی ئاینی (فەقێ) زانستەکانی ئاینی ئیسلامی خوێنـدووە. ئەو کـات مزگەوتەکـان تـاکە مەڵبەنـدی خوێنـدن بـوون لە کوردستاندا[١٧]. موسڵمانە زاناکانیش تاکە مامۆستای خوێندگا ئاینییەکان بـوون، بـۆیە مســتەفا بەگ بـاوکی میـر مـحەمەد لە گونـدی دێڵـزە[١٨] مامۆستا (محەمەد ئیبنو ئادەم)[١٩] کە یەکێک بوو لە زانا ناسراوەکانی کوردستان، بۆ هێناوەتە رواندز و مزگەوت و قوتابخانەیەکی تایبەتی بۆ دروستکردووە[٢٠]. لەم مەڵبەندەدا محەمەدی تازە پێگەیشتوو لە ڕێگەی کتێـبە پەڕ زەردەکانـدا، وەکـو هەر فەقێیەکـی دیـکەی کـورد بنـاغەی ڕۆشنبیری داڕێژراوە[٢١]. مەلا محەمەدی ئیبنو ئادەم[٢٢] مرۆڤێکی دانا و زیـرەک و دنیادیـدە بـوو، زانیـویەتی ئەگەر بێـت و ئەم میـر مـحەمەدە بەشـێوەیەکی زانایـانە پەروەردە بکرێـت، بە مرۆڤێکـی نـاوداری کـورد دەردەچێـت. بـۆیە لەلای خـۆیەوە بـایەخێکی زۆری بە فێرکـردن و خوێنـدەواری و پێگەیانـدنی داوە. فێـری مەرجەکـانی ئـاینی ئیســلام و خوێندەوارییەکی چاکی کردووە[٢٣].

بێگومان چونکە میر محەمەد کوڕی مستەفا بەگی سۆران بووە، دەبێ لەباوەشـی نـاز و نیعمەتدا پەروەردە کرابێ و هەر لە منداڵییەوە لەلای باشترین مەلا و زانای سەردەمەکانی خراوەتە بەرخوێندن.. دیارە خوێندن لای کەسێکی وەکو ئیبنوئادەم تەنیا بریتی نەبووە لە فێرکردنی

خوێندن و نووسین، بەڵکو شتێکیشی لە قورئان و حەدیس و فیقە و شەرع پێداوە، مێشکی بە بیروبۆچوونێکی راستی دادپەروەری و بەزەیی و میهرەبانی و یەکسانی ئاوداوە، جگە لەوەی کە ئەم وەک میرێک سبەی بەرپرس دەبێ لە گوێلکێک ئەگەر لەو دۆڵ و هەرد و نێو شاخانەدا لە دایکەکەی دابڕێ ونبێ[٢٤].

سەرچاوەیەکی دیکەی ڕەواندزی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە میر محەمەد لە (دەرسخانەی گویزان) نزیک گوندی دارولسەلام سەر بەناوچەی باڵەک خوێندوویەتی[٢٥]. بەم جۆرە زانستەکانی ئاینی لە قوتابخانە ئیسلامییەکان (کە پاشکۆی مزگەوتەکان بوون) خوێندووە، وەکو کوڕە میرێک مامۆستای تایبەتی بۆ دابینکراوە[٢٦]. بەکورتی دەتوانین بڵێین میر محەمەد لە ماوەی خوێندنی ئاینیدا لەبەر رۆشنایی پەروەردە و رۆشنبیرییەکی موسڵمانانەی سوونی مەزهەب گۆشکراوە[٢٧]. ئەم پەروەردە ئاینییەی لەگەڵ کاریگەریی سروشتی کۆمەڵگەی کوردەواری، کە زۆر پابەندە بە ئاین و پیاوانی ئاینی، بەشێک لە پاشخانی هزری پێکدەهێنن. بۆیە دەبینین لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتیدا دەیەوێ پەیڕەوی شەریعەت بکات. سزای توند بەسەر ڕێگر و دزان جێبەجێ دەکات. بەچاوی یەکسان سەیری خەڵک بکات. لەم بارەیەوە لە (مێژووی میرانی سۆران)دا هاتووە: ((ڕەشبەڵەک، ژن و پیاو پێکەوە راوەستان و کۆمەڵەبەستن[٢٨]، لە مزگەوت دانیشتن بەبێ پەرستیش، بەجارێک لابران، رەعیەت و ئەهالی شارو دێهات و سپاه بەبێ پەردە دەچوونە کنی... خاوەن پیشە و کار و عولەما لەلای زۆر خۆشەویست بوون"[٢٩]...))

هەر ئەم پەروەردە ئاینییەیەتی کە میر محەمەد لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتیدا دەبێتە هۆی ئەوەی زۆر ڕێز لە موفتی و زانا و پیاوانی ئاینی بنێت، بەتایبەتی مامۆستای گەورەی محەمەد ئیبنوئادەمی باڵەکی[٣٠] و مەلای خەتێ[٣١] و مەلا یەحیای مزووری[٣٢]. لە

پیــادەکردنی دەســەڵات و کاروبــاری کــۆمەڵایەتی و ڕۆژانەدا[٣٣] . هەروەها هەندێ جار لەکاتی شەڕ و پێشڕەوییە سەربازییەکانیدا، بە قسەی موفتی و پیاوانی ئاینی بکات و دووچاری پیادەکردنی سیاسەتی توندوتیژی ببێتەوە[٣٤]. یان دواجار فەتوای (مەلای خەتێ) ببێتە یەکێک لە هۆکارەکــانی کۆتاییهێنــان بە بــزووتنەوە چەکــدارییەکەی و[٣٥] خۆبەدەستەوەدانی لە کۆتایی مانگی ئابی ١٨٣٦ دا[٣٦].

**چارەنووسی میر محەمەد ڕەواندزی:**

سوڵتان مەحموودی دووەم (١٨٠٨ – ١٨٣٩) بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆی بەهێز بکات، بڕیاری داوە میرنشینە سەربەخۆکان لەناوبەرێت، بەتایبەتی میرنشینە سەربەخۆکەی سۆران، بۆیە لە ئەنجامی هێرشی بەرفراوانی سێ سوپای دەوڵەتی عوسمانی بۆ سەر ناوچەکانی بن دەستی میرنشینی سۆران و نزیکبوونەوەیان لەشاری ڕەواندز، میر محەمەد خۆی بەدەستەوە دا، پاش ئەوەی لەلایەن محەمەد ڕەشید پاشا[٣٧] پەیمانی پێدراوە کە بە چاکی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، ناردرایە ئیستانبوڵ و زۆر کەس چاوەڕوان بوون کە میری سۆران وەکو لایەنگرێکی تورک بگەڕێتەوە. بەڵام لەبری ئەمە شوونبزر کرا و بوو بە قوربانی خۆپارێزی و خیانەتی تورکان[٣٨].

بەر لەوەی لە مێــژوو و شــوێن و شــێوازی لەنــاوبردنی یــان تیرۆرکردنی میر محەمەد ڕەواندزی بکۆڵینەوە بەپێویستی دەزانین ئاماژە بۆ هەوڵەکانی دیپلۆماسیی بەریتانی (ریچارد ئیدورد)[٣٩] بکەین لە خۆبەدەستەوەدانی میر محەمەد. دیپلۆماسیی ناوبراو هاوکات لەگەڵ لەشکرکێشــییەکانی هەر ســێ ســوپای عوسمانی بەرەو مەڵبەنــدی میرنشینی سۆران، بەناوی حکومەتی بەریتانیا داوای ئاشتی قبوڵکردن و خــۆ بەدەســتەوەدانی لە میــر مــحەمەد کــردووە[٤٠]. ئەم هەوڵەی نمایندەی ئینگلیز و ئەو بەڵێن و پەیمانەی ڕەشید پاشای عوسمانی بە

میــری ســۆرانی داوە، جــگە لە ژمــارەیەک هۆکــاری دیــکە[٤١]، ئەوە دەســـەلمێنن کە تەنیـــا فەتـــوای (مەلای خەتـــێ) نەبـــۆتە هـــۆی خۆبەدەســـتەوەدانی میـــری ســـۆران و لەنـــاوچوونی میرنشـــینە سەربەخۆکەی.

مەبەســـتی ڕاســـتەقینەی حکـــومەتی بەریتانیـــاش لەو کـــاتەدا پارێزگـــاریکردن بـــوو لە یەکپـــارچەیی دەوڵەتـــی عوســـمانی و هەڵنەوەشـــاندنەوەی[٤٢]، بـــۆیە ئەمـــانیش لەپێنـــاوی ئەم مەبەســـتەدا بەشداربوون لە پرۆسەی خۆبەدەستەوەدانی میر محەمەد کە لەئەنجامدا بووە هـۆی کوشـتنی لەلایەن دەوڵەتـی عوسـمانییەوە[٤٣] و لەنـاوچوونی گەورە میرنشـــینییە ســـەربەخۆکەی کوردســـتان. کە دیـــارە بـــوون و پەرەسەندنی لە بەرژەوەندیی بەریتانیا نەبوو.

میر محەمەد لەسەر دەست و پەیمانی ڕەشید پاشا والیی سیواس خـۆی بەدەســتەوەی دا. ڕەشـید پاشــاش ئاگـاداری ئەوەبـوو کە میـر محەمەد ناوێکی چەند گەورە و پایەکی چەند بەرزی هەیە، لەسـەر ئەوە بە ئەوپەڕی ڕێـزەوە پێشـوازی کـرد. لەسـەر فەرمـانی سـوڵتان میـری سۆرانی بە دیل گیرا و ڕەوانەی ئیستانبوڵ کرا[٤٤].

میر محەمەد، هەروەکو لە بەڵگەنامەیەکی عوسمانیدا هـاتووە: " لە دەرسەعادەت چاوی کەوت بە سوڵتان و هیچ سـزایەکی بۆ دەرنەچـوو، تەنانەت وەک پیشاندانی ((عافی عالی – لێبووردنی باڵا)) پلەی ((فەریـق)) ی پێدرا. هەروەها مۆڵەتی پێدرا بگەڕێتەوە بۆ کوردسـتان و ناوچەکانی کۆیە، هەریـر، ڕەوانـدز، ئـاڵتون کۆپری و هەولێـریش کە پێشـتر لەژێـر دەســەڵاتی خۆیـدا بـوون، بەفەرمـی خـرانەوە ژێـر دەســەڵاتی[٤٥] بەڵام ئەوەی ڕوویدا و لە بەرژەوەندی میر محەمەددا نەبوو ئەوەبوو ڕەشـید پاشا لەگەڕانەوەدا لە دیار بەکر مـرد[٤٦]. ئەم مـردنە دەرفەتـی بۆ عەلـی ڕەزا پاشــا والیــی بەغـدا و نەیــاری هەریەک لە ڕەشــید پاشــا و میـر محەمەد خۆش کرد کە لێنەگەڕێت میری سۆران بەسەلامەتی و بە پلەی

((فەریــق)) و دەســـەڵاتی ڕێپێــدراو لەیەلان ســـوڵتانەوە بگەڕێــتەوە ناوچەکەی.

هەروەکــو لە کتێــبەکەی (ســینان هاکــان)دا هــاتووە کە پشــت بە بەڵگەنامەکــانی عوسـمانی دەبەسـتێت، "لەسـەر هەڵوێسـتی پێداگیرانەی والیــی بەغــدا ڕۆژی ٢٩/ صــەفەر /١٢٥٣ (١٨٣٧/٦/٣) فەرماننــامەیەک دەرکرا سەبارەت بە مانەوەی فەریق محەمەد پاشا (میر محەمەد) بۆ مـاوەیەک لە ئەماسـیا. عەلـی پاشـا بە نهێنـی نـامەی بـۆ موتەسـەریفی ئەماسـیا نووســی و بەپێویسـتی زانـی میـری ڕەوانـدز نەترسـێنێت. لە ئاکامدا عەلی پاشای والیی بەغدا توانی بە پشتگیری والی نوێی سیواس کارێکی وا بکات دەرسەعادەت ڕازی بێت بۆ لەناوبردنی میر محەمەد. میـری ڕەوانـدزی کە بە پـێچەوانەی ویسـتی سـوڵتانەوە بە کـاریگەریی والییەکانی سیواس و بەغدا لە ئەماسیا ڕاگیرا هەرگیز بۆ کوردستان نەگەڕایەوە. دەستمان بەهیچ بەڵگەیەکی ڕوونیش نەگەیشتووە سەبارەت بە چۆنیەتی مردنی. بەڵام میر لە کارێکی تاوانکاریدا بووە بە قوربانی. لە ڕاپــۆرتی ٩/ شــەوال / ١٢٥٤ (٢٦-١٢-١٨٣٨)دا بە "متەوەفــا" (یــانی مردوو) ئاماژە بۆ میرمحەمەد بەگی ڕەواندز دەکرێت[٤٧].

لە سـەرچاوەی دیکەشـدا ئامـاژە بەوە کراوە کە دواجـار سـوڵتان فەرمــانی بــۆ کوشــتنی میــر مــحەمەد دەرکــردووە. لەو کــاتەش میــر گەیشــتۆتە ســیواس لە ڕێگــای گەڕانەوەیــدا بەرەو ڕەوانــدز. لەســاڵی ١٨٣٧دا، هەروەکو لە یاداشـتەکانی مەلا شـەفیعی دێڵزیـدا لە سـەردەمی میر تۆمار کراوە. بۆ مردنیشـی بە گوێرەی حیسـابی ئەبجەدی وشـەی کوردی (غریبم) دانراوە:

غ= ١٠٠٠، ر= ٢٠٠ ی= ١٠ب=٢م=٤٠ کــۆی دەکـــاتە ١٢٥٢ک هەردوو ساڵی ١٨٣٦ و ١٨٣٧ دەکەونە بەرامبەری[٤٨].

بە کوشـــتنی میـــر مـــحەمەد و دامرکانـــدنەوەی بـــزووتنەوە ســـەربەخۆخوازییەکەی ســـۆران کە شـــێوەی دەوڵەتێکـــی کـــوردی

ســـەربەخۆی لەخۆگرتبـــوو لە ســـنووریێکی بەرفراوانـــی باشـــووری کوردستان و بەشێکی باکوور و ڕۆژهەڵاتیش، لەنیوەی یەکەمی سەدەی نـۆزدەدا، ڕێگـا بـۆ دەوڵەتـی عوسـمانی خـۆش بـوو یەک لە دوای یەک میرنشـینە کوردییەکـانی دیـکەش لە بـاکوور و باشـووری کوردسـتان لەناوببـات و دەسـەڵاتی ناوەنـدی عوسـمانی داگیـرکەر بگەڕێـتەوە بـۆ کوردستان.

## باسی دووەم
## کەسایەتیی میر محەمەد

سـەرەڕای پیـادەکردنی سیسـتەمی پشتاوپشـت، یەکێکـی تـر لە هۆکارەکـانی بەردەوامیـدان بە ڕابەرایەتیکردنـی هـۆز یـان میرنشـینی لە کـۆمەڵگەی کوردیـدا لە سـەردەمی دووەمـین سیسـتەمی میرنشـینی لە کوردسـتاندا[٤٩] کەسـایەتی ئاغـا یـان سـەرۆک هـۆز یـان میـر بـوو، کـوردیش لەسـەر چەنـد بنەمـایەکی ورد ئەو کەسـایەتییەی لەنـاودا هەڵکەوتـووە، یـان دەستنیشـانکردووە، لەو بنەمـا و مەرجـانە: شـێوازی ئاخـافتنی، شـێوازی دانیشـتن، بەهێزی و کـاریگەری لەسـەر دەوروبەر، دادپەروەری، ئـارامگرتن و ئـازایەتی.. ئەگەر لە کەسـایەتی سـەرۆک هۆزێکدا کۆبوونەوە دەتوانی سـەرۆکایەتی هـۆزەکەی یـان دەڤەرەکەی بکات[٥٠].

بەوردبوونەوە لە تایبەتمەندییەکانی کەسایەتی میر محەمەد (میری کـۆرە) هەروەکـو لە زۆربەی سـەرچاوەکان ئاماژەیـان بـۆ کـراوە ئەو تایبەتمەنـدییانە بەدی دەکەیـن کە پێویسـت بـوو لە کەسـایەتی میرێکـی بەهێـزدا هەبێت. میرێـک ڕابەرایەتـی میرنشـینییەتێکی گەورە و فـراوان بکات نەک تەنیا هۆزێک یان ناوچەیەکی سنووردار.

میر محەمەدی کوڕی مستەفا بەگ، وەکو کوڕە میرێک لەدایک بـووە، بێگومـان لە باوەشـی نـاز و نـیعمەتەدا گەورە کـراوە و لەلایەن دایکێکی بەهۆش و تێگەیشتوو زانا پەروەردە کراوە[٥١]، لەسـەر دەسـتی

(ئیبنوئــادەم) نــاودارترین و بە بەرهەمتــرین زانــای ئــاینی ئەوســای کوردستان خوێندوویەتی و بەر لە وەرگرتنی دەسـەڵاتی میری سۆران لەلایەن باوکییەوە نێردراوەتە سەر دێهاتی (دۆڵی گەڕان و جۆڵەمێرگ و دۆڵــی هەرووتیــان و ســـەرچیا)، لەو ناوچــانەدا بە خــزمەت و ســوارچاکی کــاتی بەســـەر دەبـرد [٥٢] و ئەزمــوونی فەرمــانڕەوایی وەرگرتووە و مەشقی میرایەتی لەو ناوچانەدا کردووە[٥٣].

مستەفا بەگ بـاوکی میـر مـحەمەد لە گێچەڵ و دەستدرێژییەکانی براکانی بۆ سەر رەواندز بێزار بووە، چەندجار ویستوویەتی یەکێک لە براکـانی بکـاتە میـر و بـۆ خـۆی بە گۆشـەگیری دانیشـێ، بەڵام بـووک شــازەمانی خێزانــی بەمە رازی نەبــووە، پێشـنیازی یەکێـک لە چـوار کوڕەکانی بۆ کردووە تاکو ببێتە میر بەتایبەتی میر مـحەمەدی کوڕە گەورەیان کە ئەو کات لە جۆلە مێرگ[٥٤] دانیشتبوو[٥٥].

لێرەدا بووک شـازەمان وەکو ئـافرەتێکی هۆشـیار و بە دەسـەڵات لەنـاو بنەمـاڵەکەدا توانیـویەتی بیـروڕا و داواکـاریی خـۆی بسـەپێنێت. لەلایەکـی تریشـدا بـووک شـازەمان لە توانـا و تایبەتمەنـدییەکانی میـر مـحەمەدی کـوڕی بـۆ میـری سـۆران دڵنیـابوو، هەروەهـا لە سیسـتەمی بۆماوەییشـدا ئەگەر میـر کـوڕی گەورەی پێگەیشـتووی هەبووبێـت بە دەگـمەن روویـداوە دەسـەڵات لەبـری کوڕەکـانی رادەسـتی یەکێـک لە براکـانی بکـات. بەڵام سـەبارەت بە مسـتەفا بەگ شـارەزای ئـازایەتی و تونـدوتیژی و دیسـپلین و دەسـەڵاتی میـر مـحەمەدی کـوڕی بـوو، زانیـویەتی یـان ترسـاوە لەوەی ئەگەر دەسـەڵاتی پـێ بسـپێرێت خێـرا تـۆڵەی سـەرپێچی و گێچەڵەکـان و دەس تێکەڵکردنـی مامەکـانی لەگەڵ نەیارانی دەکاتەوە و کەسە نزیکەکانی لەناو دەبات، بۆیە دوودڵ بوو لە بڕیاری سپاردنی دەسەڵات بە کوڕی گەورەی، بەڵام دواجار کە مستەفا بەگ ئەو توانـایەی نـامێنێ رووبەڕووی پیلانەکـانی بەشـێک لە براکـانی ببێتەوە و کاروباری میرنشـینییەکە بەڕێوەببـات و سـەروەریی نـاوچەکە

بپارێزێت، ناچار بەمەرجەکانی میر محەمەدی کوڕی ڕازی دەبێت و دەسەڵاتی تەواوی لە ساڵی ١٨١٣دا ڕادەست دەکات و خۆشی دەچێت لە (قەڵای دمدم) لە گوندی ئاکۆیان نزیک شاری ڕەواندز دادەنیشێت[٥٦].

میر محەمەد کە دەسەڵاتی میرنشینی سۆران وەردەگرێت، بەبێ چاوەڕوانیکردن، وەکو میرێکی هۆشیار، زیرەک، شایستە و خاوەن تێگەیشتنی سیاسی[٥٧]، هەروەها وەکو قەرەبووکردنەوەی ئەو کەمایەتییەی لە جەستەیدا هەبووە کە چاوێکی کوێر بووە و قاچێکی کەمێک دەشەلی [٥٨]، هەڵساوە بە ئەنجامدانی بەرنامەیەکی فرەلایەنە، کاروباری میرنشینەکەی ڕێکخستووە، سەرپێچیکار و جوداخواز و هەڵگەڕاوەکان، بەشێکیانی بەتوندی لەناو بردووە و ئەوانی تری ملکەچ کردووە[٥٩]. دەستدەکات بە ئامادەکردن و ڕێکخستنی سوپایەکی بەهێز و مەشقپێکراو لە سوارە و پیادە[٦٠]. کارگەی سەربازی دادەمەزرێنێت و تۆپ و تفەنگ و کەرەستەی دیکەی جەنگی لە شاری ڕەواندز دروستدەکات[٦١]. کاروباری کۆمەڵایەتی ڕێکدەخات و بەتوندی سزای دز و جەردە و ڕێگران دەدات[٦٢]، مزگەوت و خوێندنگە و پرد و قوللە و قەڵایان دروستدەکات[٦٣] چەند ئەنجومەنێک بۆ ڕێکخستنی فەرمانڕەوایی دادەمەزرێنێت[٦٤]، سکەی پارە بەناوی خۆی لێدەدات[٦٥]، دواجار دەست بە لەشکرکێشی و فراوانخوازییەکانی دەکات[٦٦] و جاڕی سەربەخۆیی دەدات[٦٧]. ئایا ئەم هەڵوێست و کار و کردەوانە کەسایەتیی بەهێزی میر محەمەد میری سۆران ناسەلمێنن؟.

### کەسایەتیی میر محەمەد لە دیدگای جیاوازەوە:

زۆربەی سەرچاوەکان کە لە میرنشینی سۆران و بەتایبەتی لە ماوەی دەسەڵاتداریتی میر محەمەدیان کۆڵیوەتەوە، گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی کە کەسایەتی (میری کۆرە) جیاوازە لە هەموو میرەکانی تری میرنشینی سۆران.

د. کاوس قەفتان لەم بارەیەوە نووسیویەتی و دەڵێ : ((کەسایەتی پاشا کوێرەی میری سۆران ڕۆڵێکی ئێجگار باڵای هەبوو لە پێگەیشتن و پەرەسەندنی میرنشینی سۆراندا، بەڵگەش ئەگەر هیچمان پێ نەبێت، بەسە ئەوە بڵێین کە دەسەڵات و هێزی ڕەواندز قەت نەگەیشتە ئەو رادەیەی کە لە ڕۆژانی پاشا کوێرەدا هەیبوو، خۆ پاش ئەویش میرنشینییەکەی سۆران تەواو کوێر بووەوە))[٦٨].

سەرچاوەیەکی دیکە کە ئاماژە بۆ بەهێزی کەسایەتی فەرمانڕەوایی میر محەمەد دەکات، پرۆفیسۆر عیماد عەبدولسەلامە کە لە کتێبێکی بەڵگەنامەییدا باس لە پڕۆژە ستراتیژییەکانی میر محەمەد دەکات، بەتایبەتی دامەزراندنی کارگەی دروستکردنی تۆپ، توێژەری ناوبراو دەڵێ: ((هەموو چاودێر و توێژەران ئاگاداری ئەم کارگە گەورەیەن کە میری بەهێزی ڕەواندز محەمەد پاشا ناسراو بە (میری کۆرە) لە پایتەختی میرنشینەکەی بۆ دروستکردنی تۆپی قورس دایمەزراندووە، هەروەها میری سۆران پیاوێک بوو خاوەن خواست و ئارەزووی بەرفراوان بوو، بیری لە پڕۆژەی گەورە دەکردەوە، بۆ ماوەیەکی کەم توانی دەوڵەتێکی بەرفراوان دابمەزرێنێت[٦٩].

میر محەمەد بریتییە لەدیارترین نموونەی میرەکانی سۆران لە مێژووی کورددا واناسراوە کە دوا مەزنترین میری سۆران بوو، پیاوێکی بلیمەت و ئازا و بەجەرگە، هەوڵی فراوانکردنی دەسەڵاتی داوە[٧٠] . لەماوەی نێوان (١٨٢٦ – ١٨٣٦) بەشێوەیەکی تەواو سەربەخۆ لە باشووری کوردستان یەکەمین فەرمانڕەوا بووە، گەورەترین پیاوی دەوڵەت بووە لەناو کورد لە سەدەی نۆزدەدا و مەترسییەکی گەورەی لەسەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دروستکردووە کە لە مەترسییەکەی محەمەد عەلی پاشا لە میسر کەمتر نەبوو[٧١].

دکتۆر ڕۆس پزیشکی کونسڵخانەی بەریتانیا لە بەغدا لەمیانی سەردانیدا بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی میرنشینی سۆران لە هاوینی

١٨٣٣دا، لە ئاکرێ لە سەربازگەی میر محەمەد چەند جارێک لەگەڵ میری ڕەواندزی کۆبۆتەوە. سوپاکەی بە دە هەزار کەس مەزەندە کردووە. تەنیا پاسەوانە تایبەتییەکانی بە سێ هەزار پاسەوان مەزەندە کردوون کە چادرەکانیان لەدەورەی چادری میر هەڵدرابوون، د. رۆس نووسیویەتی و دەڵێ: ((میر محەمەد گفتوگۆی قووڵی لەگەڵمدا ئەنجامداوە. لەبارەی بابەتی گشتی پرسیاری دەکرد. لەبارەی شێوازی خوێندن لە ئینگلتەرا، لەبارەی ئاینی خەڵکی هیندستان و چین، وایدەزانی چینیش وەکو هیندستان داگیرگەی ئینگلتەرایە. میر دەیویست بزانی پەیوەندیمان لەگەڵ ئێران و روسیا چۆنە. لە دانیشتنێکی تردا لەبارەی بەکارهێنانی چەند جۆرە دەرمانێک و کاریگەرییان پرسیاری لێکردم. هەروەها دەربارەی لێدانی دڵ لە کاتی نەخۆشیدا. لەبارەی نەخۆشییەکانی رشانەوە و کولێرا پرسیاری دەکرد. دوایی چووە سەر باسی جەنگ و چەک و تەقەمەنی. دەربارەی تفەنگ و دەمانچە قسەی کرد. تفەنگێکی کۆنی ئینگلیزی نیشاندام. لە چادری تایبەتیدا تفەنگ و شیر و دووربین و چەتر و تەختێکی دارین دەبینران))[٧٢].

لە ناوەڕۆکی ئەو گفتوگۆیەی میر محەمەد لەگەڵ دکتۆر رۆسدا ئەنجامیداوە ئەوە دەخوێنرێتەوە کە (میری سۆران) خاوەن هۆشیاری و رۆشنبیرییەکی هەست پێکراو بووە. ئارەزووی لەوە بووە زیاتر زانیاریی هەمەجۆری دەستبکەوێت و بیری تەنیا لای شەڕو کوشتار نەبووە.

بۆچوونێکی دیکەی ئەرێنی لەبارەی کەسایەتیی میر محەمەد لەلایەن (ممدوح مزووری) زانای ئاینیی هاوچەرخ[٧٣] بەم جۆرە تۆمارکراوە: ((میر پیاوێکی خولق خۆش بوو، دانیشتنی لەگەڵ زۆر خۆش بوو، پیاوێکی ئازا بوو، بەڕادەیەک بەخۆی ئەچووە شەڕ بە تفەنگ و خەنجەر هێرشی سەر دوژمنی ئەکرد، ئاقڵ و زانا بوو، هەوەسی دینداری زۆر بوو، ئارەزووی بوو خزمەتی ئاین بکات. زانا و

پیاوی زانای زۆر خۆش ئەویست. زۆر خزمەتی زانست و زانایانی ئەکرد، زۆر لە مەجلیسی مەلایان دائەنیشت، گوێی لە بیروڕای ئەوان ئەگرت))[٧٤].

تەنانەت دەوڵەتی عوسمانی سەرەتا لە بەر هەر هۆکارێک بێت دانی بەم کەسایەتییە بەهێزەی کورد ناوە و خەلاتی پێشکەش کردووە. سینان هاکان[٧٥] لە کتێبە بەڵگەنامەییەکەیدا نووسیویەتی: ((میر محەمەد کە لای عوسمانییەکان بە "محەمەد بەگی رەواندوز " ناسراو بوو، لەساڵی ١٢٤٦ ک / ١٨٣١ – ١٨٣٢ ز بانگهێشت کرا بۆ موسڵ هیلاتی لەبەرکرا، ئەمیش بەمەبەستی دەربڕینی سوپاس و پێزانین سەردانی والی بەغدای کرد، والی ناسناوی پاشایەتی پێبەخشی. پاش ئەوە عوسمانییەکان میرنشینییەکەیان بە فەرمی ناسی[٧٦])).

لە بەرامبەر ئەم سەرنج و هەڵسەنگاندنانەی توێژەرانی پسپۆڕ و نووسەران لە بواری مێژووی نوێی کورد کە لەسەرەوە ئاماژەمان بۆ بەشێکیان کرد، سەرەڕای نووسینەکانی د. رۆس و سینان هاکان کە وەکو بەڵگەنامەی رەسەن سەیر دەکرێن، نووسەرێکی دیکە دێت زیاتر جەخت لەسەر کاریگەریی لایەنی دەروونی دەکاتەوە لە پێکهاتنی کەسایەتیی میر محەمەد رەواندزی[٧٧] و ئەو کەم و کوڕیەی لە جەستەیدا هەیبووە، وەکو کۆربوونی چاوێکی و شەلینی و وەجاغ کوێری[٧٨]، ئەمەش لە راپۆرتەکەی (د. رۆس) باسکراوە و (فرایزەر)یش لەگەشتنامەکەیدا تۆماری کردووە[٧٩]. کە وەکو سەرچاوەیەکی بنەڕەتی سەیردەکرێت.

بە بۆچوونی نووسەر (ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی) ناتەواوییەکانی جەستەی میر محەمەد و (وجاغ کوێری) "بوونەتە هۆکاری دروستبوونی گرێ و ئاڵۆزییەکی دەروونیی وا کە ئەو خوێندەواری و زانینە ئاینییەی لەو زانا بەناوبانگانە وەریگرتبوون و چاودێری دایکێکی فامیدە و ژیر و وریا، نەیانتوانیوە ببنە فاکتەرێکی

هێـورکردنەوەی دەروونــی و رەوانــدنەوەی ئەو ئــاڵۆزییەی کە ڕک و کینەیەکی لەڕادەبەدەری لە ناخدا کۆکردبۆوە، پلە و پایە و دەسـەڵاتی خـۆی بـۆ بەتـاڵکردنەوە و رەوانـدنەوەیانی بەکاردەهێنـا تـا دواجـار بحەوێتەوە و ئاسوودەبێ"[٨٠].

ئێمە لە هەردوو تەوەری سێیەم و چوارەمی ئەم توێژینەوەیدا کە باس لە سیاسەتی توندوتیژیی میر محەمەد دەکەین لەکاتی هەڵمەتەکانی فراوانخـوازی و شـەڕەکانیدا زیـاتر لەوە دەکۆڵینەوە کە (میـری کـۆرە) لەژێـر چ کـاریگەری و هۆکارێکـدا دەسـتی بە فراوانخـوازی و شـەڕو کوشـتارەکانی کـردووە و جیـاواز لە میرەکـانی پێش خـۆی توانیـویەتی سنووری میرنشینەکەی ئەوەندە فراوانبکات کە لە سەدەی نۆزدەدا هیچ میرنشینییەتێکی دیکەی کورد ئەوەندە فراوان و سەربەخۆ نەبووە.

بەبۆچوونی ئێمە سەرەڕای ئەگەری کاریگەریی دەروونـی بەهـۆی بـاری جەسـتەیەوە، میـرمحەمەد بەرهەمـی بنەمـاڵەکەی و پەروەردە و توخمەکـانی ئـازایەتی و سـوارچاکی و کـاریگەریی زانایـانی ئـاینی و هەسـتی کوردبـوونی بـووە، ویسـتوویەتی میرنشـینی سـۆران لەژێـر دەسـەڵاتی دەوڵەتـی عوسـمانی نەمێنێـت و هەوڵیـداوە و جەنگـاوە بـۆ دامەزرانـدنی قەوارەیەکـی سـەربەخۆی کـورد[٨١]، بێگومـان ئەوەی میـر مــحەمەد لەمــاوەی فەرمانڕەوایەتیــدا (١٨١٣ – ١٨٣٦) ئەنجامیــداوە، سـەرەڕای لایەنـی نەرێنـی لەسیاسـەتی توندوتیژی و پەیوەنـدی لەگەڵ میرنشـینییەکانی تـردا، کەسـایەتی بەهێـزی ئەو میـرە نـاودارەی سـۆران دەسەلمێنێت و یار و نەیارانی نەیانتوانیوە دانی پێدا نەنێن.

## باسی سێیەم

## دیاردەی  توندوتیژی لە فەرمانڕەوایەتیدا (١٨١٣ – ١٨٣٦)

لە هەردوو باسی یەکەم و دووەمی ئەم تـوێژینەوەیەدا تـا ڕادەیەک لایەنەکانی پەروەردە و کەسایەتیی میـر محەمەدمان روونکـردەوە. میـری نـاوبراو لە تەمەنـی دەوروبەری ٣٠ سـی سـاڵیدا دەسەڵاتی میرنشینی سۆرانی لە مستەفا بەگی باوکی وەرگرتووە [٨٢]، بێگومـان مـرۆڤ لەم تەمەنەدا لە رووی پەروەردە و کەسـایەتیدا پێگەیشـتووە. بۆمـان روونبـووەوە کە میـر مـحەمەد یەکەم جـار لەلایەن دایکێکی هۆشیار و زانـا و لە باوەشـی بنەمـاڵەیەکی میرانـی دەسـەڵاتدار بەخێـوکراوە و پەروەردە بـووە دواتـر لەسـەر دەسـتی زانایـانی ئـاینیی نـاودار خوێنـدوویەتی و پەروەردە کـراوە[٨٣] کە گەورە دەبێـت و فەرمـانڕەوایەتی میرنشـینی سـۆران وەردەگرێـت و دەسـت بە بەڕێوەبردنی کاروباری میرنشـینییەکەی دەکات و هەوڵـی فراوانخـوازی و دامەزرانـدنی قەوارەیەکـی سـەربەخۆ دەدات، راوێـژی بە مـوفتی و پیاوانی ئاینی کردووە[٨٤]. بەڵام مەرج نییە لەئەنجامدانی هەموو کارێک و وەرگرتنـی هەر هەڵوێسـت و بڕیارێکـدا پرسـی بە زانایـانی ئـاینی کردبێت و فەتوای پێ دەرکردبن. لەلایەکی تریشەوە هەروەکو لە ڕەوتی رووادوەکان و لەشکرکێشی و شەڕەکانی میر مـحەمەددا دەردەکەوێت، ئەگەر پێویستی بە فەتوای موفتییەکەی بوویێت بۆ ئەنجامدانی کارێک یان ئەنجامدانی هەڵمەتێکی سەربازی، ئەوە داوای دەرکردنی فەتواکەی کـردووە، هەروەهـا موفتییەکەشـی پابەنـد نەبـووە، بەو رێککەوتـنەی کە لەسـەرەتای دانـانی (مەلای خەتـێ) بە (بـاش مەلا) و مەرجەعـی دینـی لە قەلەمڕەوییەکەیـدا [٨٥]، هەروەکـو مەسـعود مـحەمەد لەم بـارەیەوە نووسیویەتی و دەڵێ : ((.. نە پاشـا تێکەڵ بێ لەکاری سـەر بەشـەرع و ئـایینەوە، نە مەلاش دەخلێکـی ببـێ بەسـەر کاروبـاری حـوکمڕانی و هەڵسـووڕاندنی ئیشـی دونیـاییەوە، هەر یەکەیـان لە مەیـدانی خۆیـدا

ئـازادبیّ و سـنوور و پەرژینـی لـیّ نەشـکیّ))[٨٦]. بەڵام مەرجـیش نیـیە هەردوولا تا سەر پابەند بووبن بەم ڕێککەوتنە و سنوور و پەرژینیان نەشکاندبیّ.

سەرچاوەکان کۆکن لەسـەر ئەوەی کە میر محەمەد توند بووە لە فەرمانڕەوایەتیـدا، مەیلـی بەرەو تونـدوتیژی دەچـوو، ڕەحمـی بە سـەرپێچیکاران نەدەکرد، لەترسـی ئەو توندوتیژییەیدا کەس نەیدەوێرا ئاسایش تێکبدات[٨٧].

هۆکارێکی هەڵسوکەوتی توندڕەوانەی میر محەمەد و ئەنجامدانی کـارە خزمەتگوزارییەکـانی و پاراسـتنی ئەمـن و ئاسـایش لە سـنووری میرنشینییەکەیدا لەوانەیە کاریگەریی دەروونـی بێت، کوێری چاوێکی و شـەلینی کاردانەوەیـان لەلا دروسـتکردووە [٨٨] هەولّـی داوە قەرەبـووی ئەم ناتەواوییە بەم کار و هەڵوێستانەی بکاتەوە. توندوتیژی لە بەرامبەر نـاحەزانی پیـادە بکـات. هەروەهـا ڕەفتـار و پیلانگێڕی مامەکـانی لەدژی دەسەڵاتدارێتی باوکی لەبەرچاو بووە، کە خۆی بۆتە میر بە پێویستی زانیوە وەکو هەنگاوی یەکەمی فراوانخوازی و چەسپاندنی دەسـەڵات و تۆقاندنی نەیارەکانی تۆڵە لە مامەکانی بکاتەوە[٨٩].

دیارە میر محەمەد وەکو کەسایەتییەکی زیرەک و بەهێز زانیویەتی پەیڕەوکردنـی سیاسـەتی لەنـاوبردنی پیلانگێـڕو نەیارەکـانی، هەروەهـا سـەپاندنی سـزای تونـد لەسـەر تاوانبـاران، دەبـنە هـۆی بڵاوکـردنەوەی تـرس و تۆقانـدن لەنـاو خەڵکـدا. بەم جـۆرە ڕێگـا لە سـەرپێچیکاران دەگرێـت و نـاحەزانی دەتۆقێنێـت و دەسـەڵاتی دەسـەپێنێت و بـرەوی پێدەدات. بەڵام لە ئاکامدا دڵـی خەڵکێکی زۆریش لەخۆی دەڕەنجێنێت، بـۆیە دواجـار کە دووچـاری پاشەکشـیّ کـردن دەکرێـت ئەو پشـت و پەنـایەی نامێنێـت، هەروەکـو (لونگریـک) دەڵێـت : ((کـوردی کـۆرە پاشەکشـەی کـرد بەرەو پـایتەختەکەی و ترسـێنەر بـوو زیـاتر لەوەی خۆشەویست بێت[٩٠])).

**میر محەمەد لە کەسە نزیکەکانی دەست پێدەکات:**

پەیڕەوکردنـی سیاسـەتی تونـدوتیژی لەلایەن میـر مـحەمەدەوە لەکوشتنی کەسە نزیکەکانی باوکی دەست پێدەکات، بێگومان بەلای میر محەمەدەوە کەسی بەبێ هۆ نەکوشتووە، هەرکە دەسەڵاتیشی لەباوکی وەرگرت، بە باوکی وتووە : ((من بەو مەرجە دەسەڵات وەردەگرم کە دەست لەئیش و کارم وەرنەدەیت و هەرچیم کرد ئازادی جووڵانەوەم لێ زەوت نەکەیت، تەنانەت ئەگەر ویستم مامەکانیشم بکوژم [٩١])).

دەسـتپێکردنی سیاسـەتی تونـدوتیژی لە کەسـە نزیکەکـانییەوە، دەکرێ بۆ ئەوە بووبێ مەترسی دەوروبەری دووربخاتەوە، وەک باو بووە لە دەسەڵاتدارێتی کۆمەڵگەی ئیسلامی و ڕۆژهەڵاتی، واتا مەترسی نێو ماڵی خۆی نەهێڵێ تاکو بپرژێتە سەر فراوانخوازی و مەسەلەکانی تر.

یەکەمین قوربانی سیاسەتی توندوتیژی و تۆقاندن کە میر محەمەد لەدوای وەرگرتنی دەسەڵات پەیڕەوی کرد، عەبدوڵڵا ئاغای خەزێنەدار بوو، کە لای مستەفا بەگ و لای میر محەمەدیش بوو بە خەزێنەدار[٩٢].

ئەم ناو عەبدوڵڵایە هاتوچۆی لای ماڵە مامەکانی میر محەمەدی دەکرد لە باپشتیان [٩٣] و دەوروبەری، بەتایبەتی تەمرخان بەگی مامی میر، ئەمانیش دوژمانیەتی میر محەمەدیان دەکرد و کۆسپیان دەخستە پێش کاروباری میرنشینییەکە[٩٤] . عەبدوڵڵا ئاغا چەند جار لەلایەن میر محەمەدەوە ئاگادار کراوەتەوە کە هاموشۆی تەمرخان نەکات، بەڵام ناوبراو گوێی لە ئامۆژگارییەکانی میر محەمەد نەگرتووە. لەدوای سێیەمین جار ئاگادارکردنەوەیدا میر بڕیاری دا کە دەستگیری بکەن و لەسێدارە بدرێت و لەسەر پردی ڕواندزیش هەڵواسرا[٩٥]. دیارە مەبەستی میر لەم شێوازە کوشتنە بۆ چاوترساندنی خەڵکی تر و، بڵاوکردنەوەی ترس و تۆقاندن بووە.

کوشتنی عەبدوڵڵا ئاغا، هەروەکو حوسێن حوزنی موکریانی نووسیویەتی : ((بوو بە ناوبانگێکی گەورە بۆ میر و بەهەموو لایەکەوە دەنگی داوەتەوە، دۆست و دوژمن داچڵەکین و سڵەمینەوە.. سامی میر بەسەر هەموو دراوسێکانیدا شکا و مامەکانی کەوتنە ترس و لەرزەوە[٩٦])).

لە ساڵی ١٨١٥ میر محەمەد شەڕی لەدژی مامەکانی راگەیاند [٩٧] کە دژی دەسەڵاتداریێتی باوکی و خۆی بوون، تەنانەت بۆچوونێکی واش هەیە کە یەکێ لە مامەکانی چاوێکیان کوێر کردبێت، [٩٨] چونکە بەپێی هەندێ سەرچاوە مستەفا بەگی باوکی میر لە دوایین ساڵەکانی حوکمیدا لەگەڵ براکانیدا گەلێک ناکۆک بوو. (تەمرخان و میر یەحیا) چەند جاران هەڵمەتیان بردۆتە سەر رەواندز و نێو بازاڕیان تاڵان کرد و جەور و ئەزیەت و ئازاری خەڵکیان دەدا[٩٩].

میر محەمەد لە ئەنجامی هێرش و شەڕی خوێناویدا توانی بەسەر هەردوو مامە نەیارەکەی (میر تەمرخان – میری هاودیان و دەوروبەری) و (میر یەحیا بەگ – میری سیدەکان و دەوروبەری) زاڵ بێت و بەخۆیان و بە کوڕەکانیان دەستگیر بکات و لە رەواندز لەسێدارەیان بدات [١٠٠].

میر محەمەد بەکوشتنی ئەوانە کاروباری خاکی سۆرانی بۆ رێکدەکەوێت. دڕک و بەرهەڵست و کۆسپەی گەورەی لە خاکیدا نامێنێت و بەئازادی دەست بە فراوانخوازی دەکات [١٠١] و پێگەی خۆی بەهێز دەکات و گوێ لە قسەی دەگیرا و بڕیارەکانی جێبەجێ دەکرا و بەزەبری هێز خۆی سەپاند[١٠٢] و لەمێژووی میرانی سۆراندا کەس وەکو ئەم بە توندوتیژی مامەڵەی لەگەڵ بەرهەڵستکاراندا نەکردووە.

**کاریگەری ئاین لەسەر پیادەکردنی سیاسەتی توندوتیژی :**

دوای فراوانخوازی و فراوانکردنی سنوورەکانی میرنشینی سۆران و راگەیاندنی سەربەخۆیی لەماوەی دەیەی بیستەکانی سەدەی نۆزدە تاکو نیوەی یەکەمی دەیەی سییەکانی هەمان سەدە، کە تیایدا هەروەکو خالفین لە کتێبی (ململانێ لەسەر کوردستاندا) دەڵێ : ((میر محەمەد خواستی دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆی هەبوو [(١٠٣)]))، لەبەر رۆشنایی شەریعەتی ئیسلام (میری کۆرە) کە لەساڵی ١٨٣٢دا لەلایەن عەلی رەزاپاشا والی بەغدا لەقەبی پاشایەتی پێبەخشرا و[(١٠٤)] بوو بە (پاشای کۆرە)، بەتوندی سزای ئەو کەسانەی داوە کە سەرپێچی ئەو رێنماییانەیان کردووە کە لەلایەن دەسەڵاتداریتی میرنشینی سۆران راگەیەنراون. سەرچاوەکانیش هەروەکو پێشتریش ئاماژەمان بۆ کردوون، کۆکن لەسەر ئەوەی کە میر محەمەد لە کاروباری فەرمانرەوایی و لەشکرکێشییەکانیدا بەقسەی موفتی و پیاوانی ئاینی کردووە، چونکە پیاوانی ئاینی ئیسلام رۆڵێکی بەرچاویان هەبووە و خاوەن پێگەیەکی تایبەت بوون لەلای میر محەمەد تاکو گەیشتۆتە پلەی دەسەڵات و فەرمان دەرکردن، میر و پیاوانی ئاینی لە کاروباری کۆمەڵایەتی و هەندێ مەسەلەی گرنگی دیکەدا هاورا بوون، بەپێی میتۆدێکی ئاینی کە بریتی بوو لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری ئیسلام . میر محەمەد دوو راوێژکاری لە زانایانی ئاینی هەبوو، کە یەکێکیان (مەلا محەمەدی خەتێ) ئەویتریان (مەلا یەحیای مزووری) بوو. مەلا محەمەدی خەتێ موفتیی میرنشین بوو[(١٠٥)] پێش ئەوانیش لە سەرەتادا ئیبنوئادەمی باڵەکی راوێژکاری میر محەمەد بووە، بەڵام دەڵێن : ((لەسەر مەسەلەی زیندان و شێوازی ئەشکەنجەدانی زیندانییەکان، ئیبنو ئادەم تووشی دەمەقاڵی بووە لەگەڵ میر و سەرەنجام بە توورەیی لە رەواندز رۆیشتووە))[(١٠٦)].

د. جەلیلــی جەلیــل و ئەدای شــێر [١٠٧] لە دانراوەکانیانــدا چەنــد نموونەیەکی سەرنجڕاکێشیان بۆ تۆمار کردووین دەربارەی سیاسـەتی تونــدی میــر مــحەمەد لەبەر ڕۆشــنایی شــەریعەتی ئیســلامدا[١٠٨]، پەیڕەوکردنی ئەم سیاسـەتە لەپێناوی بنبڕکردنی دزی و سـەقامگیریی ئاسـایش بـووە لە سـنووری قەوارە سـەربەخۆکەیدا، ئەم سیاسـەتەش بێگومان بێ هۆکار و ئەنجام نەبوو، بەڵکو دۆخی ئابووری و بازرگانی میرنشینییەکە کەوتە جمان و گەشەی کردووە[١٠٩].

لەمیانی لێکۆڵینەوە لە کەسـایەتیی میـر مـحەمەد و پەیڕەوکردنی سیاســەتی تونـدوتیژی، بۆمـان دەردەکەوێـت کە ئەم مـرۆڤە خـاوەنی کەسایەتییەکی فرە ڕەهەند بووە، لەلایەک ئازا و نەترس و توندوتیژ و بە دیسپلین، لەلایەکی دیکەشەوە هەروەکو عەبدولقادر کوڕی ڕۆستەمی بابـانی باسـی دەکـات دەسـەڵاتەکەی لەسـەر بنەمـای یاسـا و دادوەری دامەزراندووە و لە ستەم و گەندەڵی دوور بووە و لەماوەیەکی کورتدا توانیـــویەتی پـــێگەی دەســـەڵاتەکەی بچەســـپێنێت[١١٠]. هەنـــدێ لە ســەرچاوەکانیش سیاسـەتە توندەکەی میـر محەمەدیـان بەسـتاوەتەوە بەپیــادەکردنی یاســاکانی شــەریعەت و بە نەرێنــی لەســەر (پاشــای کۆرە)یـان تۆمـار نەکـردووە[١١١]. تەنـانەت میـر مـحەمەد کۆمەڵکـوژیی ئێزیدی و دیانەکانی ئەو دیوی زێی بادینان دوای دەرچوونی فەتوای موفتی و پیاوانی ئاینی ئەنجامداوە[١١٢].

## باسی چوارەم
## لە سیاسەتی توندوتیژییەوە بۆ کۆمەڵکوژی

هۆکاری ئەنجامدانی کۆمەڵکوژی لەلایەن میر محەمەد تەنیا ئاینی نەبووە، بەڵکو جگە لە هۆکاری ئاینی هۆکاری کۆمەڵایەتی و سیاسی و سەربازی لەدواوەیە. بەڵام تاکو ڕێبەرە ئاینییەکانی نزیک لەخۆی وەکو مەلای خەتێ و مەلا یەحیای مزووری فەتوایان بۆ دەرنەکردبێ دەستی نەکردووە بە کۆمەڵکوژی ئێزیدی[113]و دیانەکان لە هەردوو دەڤەری شێخان و ئەلقوشدا[114]، چونکە ئەگەر هۆکارەکە تەنیا ئاینی بوایە دەبوایە (میری کۆرە) بەر لەوەی بگاتە بادینان، لەماوەی فەرمانڕەوایەتی و لەشکرکێشییەکانیدا کوشتاری لە دیانەکانی شەقڵاوە و کۆیە و عەنکاوە ئەنجامبدایە. لەو کاتەدا لە عەنکاوە ٣٠٠ سێ سەد ماڵە دیان دەژیان و فەرمانڕەواکەشیان لەخۆیان بوو[115] بۆ سەلماندنی ئاسایش و ئارامی پارێزراوی دیانەکان لە سنووری دەسەڵاتی میری سۆراندا، سهیل قاشا لە کتێبی (مسيحيو العراق: دیانەکانی عێراق) نووسیویەتی و دەڵێ: ((سەرەڕای ئەوەی زۆربەی جووتیارە دیانەکانی ناوچەکانی هەولێر و سلێمانی بە هۆکاری بارودۆخی کۆمەڵایەتی سەر بە خێڵە موسڵمانە کوردەکانن، گەڕیدەکان سەرنجیان داوە بەشێوەیەکی دیار ڕێز و خۆشەویستی لەنێوان هەردوولادا هەبووە. رای گشتی دانیشتوان رازی نەبووە دەستدرێژی بکرێتە سەر دیانەکان. جووتیارە دیانەکانی شەقڵاوە کە کارەکانیان لە ناوچەیەکی خێڵایەتی سەخت ئەنجامداوە، مامەڵەیەکی باشیان لەبەرانبەر کراوە، کەس تێکەڵ بەکاروباری تایبەتییان نەدەبوو. سوودیان لە پاراستنی سەرۆک خێڵەکانی ناوچەکە وەرگرتووە[116].

میر محەمەد ڕەواندزی کە لەسەرەتای ئاداری ١٨٣٢دا هێرشی کردۆتە سەر بادینان و دەست بەسەر زۆربەی ناوچەکانیدا دەگرێت و لە دەستپێکی لەشکرکێشییەکانیدا کۆمەڵکوژی لەبەرانبەر ئێزیدی و

دیانەکـان ئەنجامـداوە، پـاڵنەر و هۆکـاری ناڕاسـتەوخۆ و راسـتەوخۆ لەدواوەی هەڵمەتەکانیـدا هەبـوون. بـا لە سـەرەتادا لە خسـتنەڕووی هۆکارە ناڕاستەوخۆکان دەست پێبکەین: خواستی فراوانخوازی لەسەر ئاستی کوردستان و دامەزراندنی دەوڵەتێکی دەرەبەگایەتیی سەربەخۆ لە کوردستان و دەستگرتنی بەسەر میرنشینی بادینـان و شـێخان بـۆ ئەوەی داهاتی پێویست بۆ خەرجی لەشکرە گەورەکەی دابین بکات. لە هەمان کاتدا لاوازیی میرنشینی بادینانی بەدەرفەت زانیوە، چونکە میری بادینـان نەیتوانیـوە چارەسـەری ئەو کێشـانە بکـات کە رووبەڕووی دەبـوونەوە و لە شـەڕی نـاوخۆی نـاو بنەمـاڵەی میرانـی بادینـان نزیـک ببووەوە[117].

گەڕیـدە بەریتانییەکـانیش جەخـت لەسـەر ئەوە دەکەنەوە کە میـر محەمەد سەرەڕای دەمارتوندیی ئاینی چاوی لە دەرامەتە ئابوورییەکانی ئێزیـدییەکان بڕیوە، چونکە شـێخان و دەشـتەکەی دەوروبەری خـاوەن بایەخێکی ئابووری گەورە بوون[118].

فرایزەریش کە هاوسەردەمی رووداوەکانە، لە گەشتنامەکەیدا باس لە لاوازی و ململانێی نێوان بنەماڵەی میرانی ئامێدی و سەرکەوتنەکانی میـری رەوانـدز دەکـات بەسـەر نـاوچەکەدا، بەڵام هـیچ ئامـاژەیەکی بـۆ کۆمەڵکـوژی ئێزیـدی و دیانەکـان لەلایەن لەشـکری میـر مـحەمەد نەکردووە[119].

ژمـارەیەکی بەرچـاویش لە سـەرچاوەکان ئامـاژە بـۆ دوژمنـداریی مێژوویی نێوان سۆرانییەکان و داسنییەکان[120] دەکەن، ئەمەشیان وەکو هۆکـارێکی مێژوویـی و ناڕاسـتەوخۆ سـەیر دەکرێـت[121]. رەگـی ئەو دوژمنداریە بۆ سەردەمی سوڵتان سولەیمانی قانونی (١٥٢٠ - ١٥٦٦) دەگەڕێتەوە، کە لە سـاڵی ١٥٣٤دا سـولەیمانی قـانونی عیـزەددین شـێر میـری سـۆرانی کوشـتووە و حوسـێن بەگـی داسـنی ئێزیـدی کـردە فەرمانڕەوای موسڵ و میرنشینی سۆران.

لە ئەنجامی ئەم پرۆسە مەبەستدارەدا شەڕی زۆر و خوێناوی لەنێوان سۆرانییەکان و داسنییەکان روویداوە. لە ئەنجامدا سۆرانییەکان سەرکەوتوون و دەسەڵاتی میرنشینەکەیان گرتۆتەوە دەست. دواجار بەفەرمانی سوڵتانی عوسمانی میر حوسێن داسنی لەسێدارە دراوە بەهۆی سەرنەکەوتنی لە کۆنترۆڵکردنی ناوچەکەدا(١٢٢).

هۆکاری راستەوخۆی هێرشی میری سۆران بۆ سەر ئێزیدییەکان بۆ کوژرانی عەلی ئاغای باڵتەیی مزووری و (سنجان)ی کوڕی دەگەڕێتەوە، لە زستانی ١٨٣١دا، لە کۆشکی عەلی بەگی داسنی(١٢٣) میری ئێزیدییان لەگوندی باعەدرێ(١٢٤). ئەم رووداوە وەکو پیلانێک بوو بە تەگبیر و هاندانی میری بادینان و بەدەستی میری ئێزیدییان ئەنجامدرا(١٢٥).

مەبەستی میری ئامێدی ئەوەبوو لەدەست سەرۆکێکی بەهێزی مزووری رزگاری بێت کە نەدەچووە ژێر فەرمانەکانی، بەڵام کارەساتێکی گەورەی نایەوە و لە ئەنجامدا میرنشینی بادینانیشی لەدەست دا(١٢٦).

عەلی ئاغا باڵتەیی (مزووری)ی کوژراو دەکاتە مامی مەلا یەحیای مزووری، زانای ئاینی ناودار، کە تاکو زستانی ١٨٣٢خەریکی کاری زانستی و وانەوتنەوە بووە لە ئامێدی، بەڵام دوای ئەم رووداوە و کوژرانی مەلا عەبدولرەحمانی کوڕی بەدەستی پیاوانی میری ئامێدی، دەستی لە وانەوتنەوە هەڵگرت و بڕیاری داوە هەموو هەوڵێک بدات بۆ تۆڵەسەندنەوە لە میرانی ئامێدی و شێخان(١٢٧).

دواجار هانای بۆ لای میر محەمەد پاشای رەواندزی برد تاکو تۆڵەی بۆ لەمیرانی ئامێدی و شێخان بکاتەوە. لە هەمان کاتدا موسا بەگی بادینان ناکۆک لەگەڵ هەردوو برای : محەمەد سەعید بەگ میری ئامێدی و ئیسماعیل بەگ میری ئاکرێ، ئەویش چووبووە رەواندز و داوای یارمەتی لە میری سۆران دەکرد و هانیداوە بۆ کۆنترۆڵکردنی

بادینــان [١٢٨]. میــر محەمەدیــش هەر ئەمەی دەویســت و چــاوەڕوانی ڕۆژێکـی وەهـا بـوو، بـۆیە ئەم دەرفەتەی قـۆزتەوە و (مەلای خەتـێ)ش فەتوای حەلالکردنی خـوێن و سـامانی ئێزیدییەکان و شـەڕکردن لەدژی میرنشینی بادینانی بەخێرایی بۆ دەرکرد[١٢٩].

میری سۆران دوای ئامادەباشیی پێویست بە لەشکرێکی گەورە[١٣٠] بەرەو بادینان بەڕێکەوتووە و لە سـەرەتای مـانگی ئـاداری ١٨٣٢ لەلای گوندی (کەلەکی داسنیان)[١٣١] لە زێی گەورە (زێـی بادینـان) پەڕیوەتەوە و بە هەڵمەتە سەربازییەکەی هێرشی کردۆتە سـەر کوردانی ئێزیـدی و کۆمەڵکـوژی کـردوون و دواتـر بەردەوام بـووە لە دەستبەسـەراگرتنی شارە سەرەکییەکانی میرنشینی بادینان[١٣٢].

سەرەڕای هەموو هۆکارە ناڕاستەوخۆ و ڕاستەوخۆکان، مـۆرکێکی ئـاینیی جیهـادی خـراوەتە سـەر لەشکرکێشـیی میـری سـۆران بـۆ سـەر ئێزیـدییەکان، بەهـۆی فەتـوا و هانـدانی هەردوو زانـای ئـاینیی کـاریگەر، مەلای خەتـێ و مەلا یەحیـای مـزووری، کە هەسـت و سـۆزی ئـاینیی سوپای سۆرانیان بەجۆرێک وروژانـدووە کوشـتار و ستەمی زۆریـان لە ناوچەکـانی شـێخان و ئەلقـوش و شـەنگار ئەنجامـداوە[١٣٣]، دەسـتیان بەسـەر تەواوی میرنشـینی بادینانـدا گرتـووە. لەشـکری میرانـی ئامێدی چوونەتە هانای ئێزیدییان، بەڵام لە بەرانبەر لەشکری گەورە و بەهێزی ســۆران خۆیــان ڕانەگرتــووە و شــکاون، یــان درەنــگ بەســەردا گەیشتوون[١٣٤].

لێـرەدا لەبەر ڕۆشـنایی سـەرچاوەکان، بۆمـان ڕوونـدەبێتەوە کە ئێزیدییەکان بوونەتە قوربانی:

١- ململانێی نێوان میرانی ئامێدی لەگەڵ گەورە هۆزی مزووری.

٢- هەڵەی گەورەی میرەکەیان (عەلی بەگی داسنی) کە عەلی ئاغای مـزووری و کـوڕەکەی لە مـاڵی خـۆی دوور لە هەمـوو ڕەوشـت و نەریتێکی هۆزایەتی و کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتی کوشتوون.

٣- سیاسەتی فراوانخوزایی میر محەمەد رەواندزی و خواستی بۆ دەستبەسەراگرتنی تەواوی میرنشینی بادینان و شێخان لەپێناوی مەبەستی سیاسی و ئابووری. بۆ گەیشتن بەم مەبەستە ئەوپەڕی سیاسەتی توندوتیژی بەکارهێناوە.

٤- رۆڵی ژمارەیەک لە زانایانی ئاینی موسڵمان کە چەندین جار لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا و لەسەر داوای فەرمانڕەواکان فەتوای کۆمەڵکوژی کوردانی ئێزیدییان دەرکردووە، دیارە کە مەلای خەتێ و مەلا یەحیای مزووری هەمان رێچکە و هەڵوێستیان گرتۆتەبەر.

### لە کۆمەڵکوژیی ئێزیدییان
### بۆ کۆمەڵکوژیی کریستیانەکانی ئەلقوش[١٣٥]:

دوای ئەنجامدانی کۆمەڵکوژیی کوردانی ئێزیدی لە دەڤەری شێخان لەلایەن سوپای میری سۆران لە سەرەتای ئاداری ١٨٣٢ تاکو ناوەڕاستی ئەم مانگە، رۆژی چوارشەممە (١٥ی ئاداری ١٨٣٢) سوپای سۆران بە سەرکردایەتی میر محەمەد رەواندزی و بە هاندان و دەرچوواندنی فەتوا لەلایەن مەلای خەتێ و مەلا یەحیای مزووری و مەلا عزرائیلی جزیری[١٣٦] هێرش دەکاتە سەر گوندی ئەلقوش و بە دەیان کەس لە دانیشتوانە کریستیانەکانی ئەم گوندە و چەندین پیاوی ئاینی ناوداریان لێ دەکوژێت[١٣٧]. لە کاتێکدا لە ٩ی ئاداری ١٨٣٢ واتا هەفتەیەک پێش ئەم هێرشە، سوپای میری سۆران کۆمەڵکوژیی ئێزیدییانی گوندی خەتارای نزیک ئەلقوش ئەنجامداوە و بەلای ئەلقوشدا نەچووە[١٣٨]. کەچی دوای هەفتەیەک هێرش دەکاتە سەر کریستیانەکانی ئەلقوش؟!.

بەرلەوەی لە هۆکارەکان بکۆڵینەوە، پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، کە ئەم رووداوەی ئەلقوش، بەتایبەتی کوشتنی قدیس بابا جبرائیل دنبو[١٣٩] و ژمارەیەک لە رەهبانەکان، دەنگدانەوەی زۆری لەلای

نێـــــردراوە موژدەبەخشـــــەکان و لەدوای ئەمـــــانیش لەلای وڵاتە ئەوروپاییەکان لێدەکەوێتەوە، چونکە ئەمان خۆیان بە پارێزەری تائفە و کەمینە ئاینییەکانی دەوڵەتی عوسمانی دەزانی و فشاریان خستە سەر دەوڵەتی عوسمانی و هاوکارییان کرد بۆ لەناوبردنی میرنشینی سۆران، ئەم مەبەستەشیان لە هاوینی ١٨٣٦ هاتە دی[١٤٠].

ئێمە لە هۆکارەکانی پرۆسەی کۆمەڵکوژی ئێزیدییەکانمان لەلایەن لەشـکری میـری سـۆران کۆڵیـوەتەوە و بۆمـان دەرکەوت کە جگە لە فاکتەری ئاینی چەند هۆکارێکی دیکە وەکو سیاسی و ئابووری رۆڵیان هەبـووە. جـا بـۆ ئەم هەنگـاوەی میـری سـۆران بە کۆمەڵکـوژیی کریسـتیانەکانی ئەلقـوش، بەپشـت بەسـتن بە دوو دەستنووسـی سریانی[١٤١] بۆمان روونـدەبێتەوە کە جگە لە فاکتەر و دەمارتوندیی ئـاینی، هۆکـاری سیاسـی و سـەربازی لەپشـت ئەم هێرشـە نـارەوایەی لەشکری میری سۆران بۆ سەر دانیشتووانی ئەلقوش دەوەستێت[١٤٢]، چونکە ئەگەر تەنیا مەسەلەی فەتوا و دەمارتوندیی ئاینی میری سۆران هۆکـار بوایە، دەبوایە پێشتر هێرشـی بکردایەتە سـەر کریسـتیانەکانی شـــەقڵاوە، عەنکـاوە، کـۆیە، قەرەقـوش، بەرتەلە، تلکیـف و باتوفـا و تلسـقف[١٤٣]، کە نەیکـردووە و ئـازاری پێنەگەیانـدوون، هەروەهـا میـر مـحەمەد ژمـارەیەک لە پیـاوە ئاینییەکـانی ئەلقوشـی نەکوشـتووە، یەک لەوانە بـاوکە دمیانوس حنا کوندیرا نووسـەری قەسـیدەی (مەرسـییەی کردەوەکانی شمشێر لە ئەلقوش ساڵی ١٨٣٢)، دووەمیان مەتران یوسف ئـۆدۆ[١٤٤]، لەو کـاتەی سـەربازەکانی میـر ویسـتوویانە بیکـوژن داوای بینینـی میر مـحەمەدی کردووە و رووبەڕوو پێی وتووە: ((شـاهم ئێمە بـۆچی دەبـێ لەدەسـت زوڵـم و زۆری تورکانـدا بپـارێزرێین بەڵان لە سەردەمی پادشایەکی دادگەریی وەکو تۆدا کەی رەوایە تووشـی ئـازار و کوشتار و تاڵان بین. پاشا زۆر پەشیمان بۆوە و دەستبەجێ فەرمانی

دا کەس نەکوژن و ئەو هەموو ژن و کچ و ماڵێکی کە بەتاڵان برابوون دایەوە بە مەتران یوسف ئۆدۆ))[١٤٥].

بێگومان دەست بەسەرداگرتنی میرنشینی بادینان بەزەبری هێز و دوورخستنەوەی میرانی بادینان، ماڵباتی میر سەیفەدینا لەدەسەلات، هەروەها کۆمەڵکوژی داسنییەکان لە دەڤەری شێخان و کریستیانەکانی ئەلقوش، لووتکەی سیاسەتی توندوتیژی میر محەمەد ڕەواندزی دەسەلمێنن لە بادینان، جا هۆکارەکان هەرچییەک بن. هەر ئەم ڕەفتار و سیاسەتەیە بۆتە مایەی ناڕەزایی دەربڕینی ٣٣ کەس لە ناودارانی بادینان (سەرۆک هۆز و زانای ئاینی و کەسایەتیی دیار)[١٤٦]، نامەیەک بۆ سوڵتانی عوسمانی لە ساڵی ١٢٥٠ ک / ١٨٣٤ز بەرز دەکەنەوە و زۆر بەزێدەڕۆیی باس لە ستەمەکانی میری سۆران دەکەن و نووسیویانە : ((میری ڕەواندز موسڵمانەکانی کۆتایی پێهێنا، چ موسڵمان نەمان، دوایی چ عەیالێ مە و چ عەیالی میر سەیفەدینای بنەماڵەی عەباسی، هەموو بردنە ڕەواندزێ و لە بەدبەختیمان لەوێ دەفرۆشرێن.))![١٤٧]

هەروەها لە نامەکەدا هاتووە : ((ئێمە ئەم کێشەیە دەخەینە روو هیواداریین زوو چارەسەر بکرێت. دەوڵەت ئەم یاسا شکێنە تەمبێ بکات و لەدەست ئەم زوڵمە رزگارمان بکات))[١٤٨].

لە شوێنێکی دیکەی نامەکەدا هاتووە : ((هیواداریین بیر لە حاڵی ئێمە بکەیتەوە، ئێمە خزمەتکاری گوێڕایەڵین. ئێمە پشت بە ئێوە دەبەستین، ئێوەش پشت بەخوا و پێغەمبەر دەبەستن. لەم فتنەیە رزگارمان بکەن، بەفەزڵی ئێوە هەموو هۆکارێکی جەنگمان ئامادەکردووە، لە کیسە پارە و تفاقی جەنگ لەگەڵ ئیسماعیل پاشا. خوا یاربێت ڕەواندز وێران دەکەین))[١٤٩]!!.

ناوەڕۆکی ئەم نامەیە ئەگەرچی زێدەڕۆیی و نادروستی زۆری تێدایە، مەبەستیشیان لە بەرزکردنەوەیدا هاندانی دەوڵەتی عوسمانی

بـووه بـۆ زوو لەنـاوبردنی میـری سـۆران، ئەوه دەسـەلمێنێت کە ئەم کۆمەڵە کەسایەتییەی بادینان نەک هەر لە دەسـەڵاتی میری ڕەواندزی ناڕازین، بەڵکو ئامادەن لەدژی بجەنگن و دەسـەڵاتی بنەماڵەی میرانی ئامێدی کە ئەویش خۆی لە ئیسماعیل پاشا دەبینێتەوه بگێڕنەوه. بۆ ئەم پرۆسەیەش داوای یارمەتی و بزووتنەوه لە سوڵتانی عوسمانی دەکەن.

تونـدوتیژی (میـری کـۆره) لە بادینـان بـۆ مـاوەی چەنـد نەوەیەک بەزینـدوویی لە هـزری دانیشـتوان مـاوەتەوه، سـەدیق دەمەلـوجی مێژوونـووس لە کتێبـی (الیزیدیـة)دا نووسـیویەتی و دەڵـێ : ((دایکـان لە بادینـان بـۆ ئەوەی منـداڵەکانیان بترسـێنن و کڕیـان بـکەنەوه دەڵـێن : (سۆرانی هات)[150]!!.

جەمـال نەبەزیـش لە دکتۆرانامەکەیدا گەیشـتۆتە ئەو دەرئەنجامەی کەوا : ((نەبـوونی (شـەعبیەتی) میـری کـۆره بەهـۆی تونـدوتیژییەوه، دۆسـتی باشـی بـۆ عوسـمانییەکان پەیـدا کـرد، کە ڕاسـتەوخۆ لە تەک سوپای عوسمانیدا شەڕی میری کۆره و سوپاکەی بکەن))[151].

سـەرەڕای هەمـوو لایەن و خـاڵە ئەرێنییەکـانی کەسـایەتی میـر محەمەد ڕەوانـدزی کە لە دووەمـین باسـی ئەم تـوێژینەوەیەدا تیشکمان خستۆته سەریان، بەڵام سیاسەتی توندوتیژی ئەم میره ناوداره نکۆڵی لێ ناکرێت و لەکۆتاییدا بۆته هۆکارێک لە هۆکارەکانی لەناوچوونی، یان ڕووخانی میرنشینه سەربەخۆکەی سۆران، لە کۆتایی ئابی ١٨٣٦دا[152].

**ئەنجام:**

١- میـر مـحەمەد ڕەوانـدزی (١٧٨٤ – ١٨٣٧) کە بە نازناوەکـانی (میـری کـۆرە) و (پاشـای کـۆرە) و (پاشـای گەورە) لە مێـژووی نـوێی کـورد ناسـراوە، یەکـێکە لە نـاودارترین و کـاریگەرترین کەسـایەتی فەرمانڕەوای کورد لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا.

٢- لەمیـانی پەروەردەکردنـی و لەمـاوەی خوێنـدنی ئاینیـدا لەبەر ڕۆشـنایی پەروەردە و ڕۆشـنبیرییەکی موسـڵمانانەی سـونی مەزهەب گۆشـکراوە. ئەم پەروەردە ئـاینییەی ڕەنگیـداوەتەوە لە کـاتی فەرمانڕەوایەتیـدا، هەروەهـا هەنـدێ جـار لە کـاتی شـەڕ و کاروبـاری کۆمەڵایەتی و سیاسەتی توندوتیژیدا.

٣- میـر مـحەمەد (میـری کـۆرە) بـریتییە لەبەرچـاوترین نمـوونەی میرەکانی سۆران، لەماوەی نێوان (١٨٢٦ – ١٨٣٦) بەشـێوەیەکی تەواو سـەربەخۆ لە باشـووری کوردسـتان گەورەتـرین پیـاوی دەوڵەت بـووە لەنـاو کورد، مەترسـییەکی گەورەی بـۆ سـەر ئیمپراتـۆریەتی عوسـمانی دروسـتکردووە، بۆیە دەوڵەتـی عوسـمانی بەهاوکـاری بەریتانیـا هەمـوو هەوڵێکی خستۆتە گەڕ بۆ لەناوبردنی میرنشـینە سـەربەخۆکەی سـۆران و دواجـار میـر مـحەمەد ڕەوانـدزیش بـۆتە قوربـانی خواسـتی سەربەخۆخوازییەکەی.

٤- ئەم مـرۆڤە خـاوەن کەسـایەتییەکی فـرە ڕەهەنـد بـووە، لەلایەک ئازا و نەترس و توندوتیژ و بە دیسپلین، لەلایەکی دیکەشەوە هەروەکو هەندێ سەرچاوە ئاماژەیـان بـۆ کـردووە دەسـەڵاتەکەی لەسـەر بنەمـای یاسـا و دادوەری و شـەریعەتی ئیسـلامی دامەزرانـدووە و لە سـتەم و گەنـدەڵی دوور بـووە و لە مـاوەیەکی کورتـدا توانیـویەتی پـێگەی دەسەڵاتەکەی بچەسپێنێت.

٥- سیاسـەتی تونـدوتیژی میـر مـحەمەد یەکـێکە لە سـیماکانی دەسەڵاتدارێتی ئەم میرە نـاودارەی سـۆران، توندوتیژی بـۆ لەنـاوبردنی

نەیارەکانی لەپێناوی چەسپاندنی دەسەڵاتیدا، توندوتیژی لەپێناوی بنەبڕکردنی دیاردەی ڕێگری و دزی لە سنووری میرنشینەتییەکەیدا. تەنانەت سیاسەتی توندوتیژی پەڕیوەتەوە بۆ کۆمەڵکوژی بەرامبەر بەکوردانی ئێزیدی و کریستیانەکانی دەڤەری ئەلقوش لەدوای پەڕینەوە و لەشکرکێشی بەرەو سنوورەکانی میرنشینی بادینان و شێخان و شەنگار.

هەندێ لە سەرچاوەکانیش سیاسەتە توندەکەی میر محەمەدیان بەستاوەتەوە بە پیادەکردنی یاساکانی شەریعەتی ئیسلام و جێبەجێکردنی فەتوای پیاوانی ئاینی، بۆیە بە نەرێنی لەسەر (میری کۆرە)یان تۆمار نەکردووە. بەڵام بە بۆچوونی توێژەر ئەم سیاسەتە توندەی میر محەمەد، بەتایبەتی ئەنجامدانی کۆمەڵکوژی لەژێر هەر پاساوێکدا بێت، بۆتە لاپەڕەیەکی رەش لە مێژووی میرنشینی سۆران لە سەردەمی میرە هەرە ناودارەکەیدا و بۆتە یەکێک لە هۆکارەکانی رووخانی میرنشینییەکە.

## پەراوێز و سەرچاوەکان :

(1) داماو حسێن حزنی موکریانی، مێژووی میرانی سۆران، چ٢، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٦٢، ل ١٩ – ٢٥ . نەوەد ساڵ بەر لەئێستا حوسێن حوزنی موکریانی لە گۆڤاری (زاری کرمانجی) لە ڕەواندز دەستی بە نووسینی مێژووی میرانی سۆران کردووە و لە نووسینەکەشیدا پشتی بە ژمارەیەک سەرچاوە و قسە و گێڕانەوەی ژمارەیەک لە بەتەمەنەکانی ئەو کاتی ڕەواندز بەستووە هەروەها (مەلیخا) یەک لە سەرچاوەکانیەتی کە لەلایەن میرزا محەمەدی رازنووس بەهەڵبەست و بەزمانی فارسی ڕووداو و شەڕەکانی میر محەمەدی نووسیوەتەوە. دواتر لە ١٩٣٥ بەشێوەی نامیلکەیەک بەناونیشانی (مێژووی میرانی سۆران) هەر لە ڕەواندز چاپی کردووە و بڵاوی کردۆتەوە. بڕوانە : گۆڤاری زاری کرمانجی، ژمارە ٢ تاکو ژمارە ٩، داماو حسێن حزنی موکریانی، هەمان سەرچاوە، ل ١ پێشەکی گ. موکریانی.

(2) ڕەچەڵەکی میرانی سۆران بۆ میر عیسا کوڕی کەڵۆس دەگەڕێتەوە، لە سەرەتای سەدەی پانزەی زاینیدا لەگوندی هاودیان کە دەکەوێتە باکوری رۆژئاوای ڕەواندز ژیاون. کەلۆس لەم گوندەدا شوان بووە. عیسای کوڕی هەروەکو لە شەرەفنامەدا هاتووە : " کوڕێکی هێژا و هەڵکەوتە و بەرچاو تێر و نێرە پیاو و دلاوا و مەشرەف خۆش بووە"، لە ئەنجام بۆتە میری سۆران. لە میر عیساوە تاکو رەسول پاشای کوڕی مستەفا بەگی دوا میری سۆران. زیاتر لە بیست میری بنەماڵەی سۆران بە گوێرەی سیستەمی پشتاوپشت فەرمانڕەوایەتییان کردووە.

سنووری میرنشینی سۆران لە ماوەی چوار سەد ساڵی تەمەنیدا جێگر نەبووە، بەڵام میرنشینی سۆران خۆیان بە خاوەنی (ڕەواندز و هاودیان و خەلیفان و هەریر و شەقڵاوە و هەولێر و کۆیە و سماقوڵی) زانیوە. بڕوانە : شەرەفخانی بەدلیسی، شەرەفنامە، هەژار کردوویە بەکوردی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد بەغدا، ١٩٧٣، ل ٤٨٤ – ٥١٧. داماو حسێن حزنی موکریانی، س .پ، ل ٢-١٠٩ . د. جەلیلی جەلیل، کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، و : د. کاس قەفتان، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا ١٩٨٧، ل١١٦ – ١٢٥، کامەران جەمال بابان زادە، میرنشینی سۆران، چ١، هەولێر، ١٩٩٧، ل ١٠ – ٨٧ .

(٣) زبير بلال اسماعيل، تاريخ اربيل، دراسة تاريخية عامة لاربيل وانحائها منذ أقدم العصور حتى الحرب العالمية الاولى، من مطبوعات مجلة (هەولێر)، مطبعة الثقافة، اربيل، ١٩٩٨، ص ١٧٨.

(٤) داماو حسێن حزنی موکریانی، س .پ، ل٥٠، ٥٤ .

(٥) سینان هاکان، کورد و بەرخودانەکانی ١٨١٧ – ١٨٦٧ لە بەڵگەنامەکانی ئەرشیفی عوسمانیدا، و : لە تورکییەوە : بەکر شوانی، پێشەکی و پێداچوونەوە د. جەبار قادر، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر، ٢٠١٢ ل ٨٢، ٣٦٦.

(٦) علاء الدین سجادی، شۆڕشەکانی کورد و کورد و کۆماری عێراق، چاپخانەی مەعارف، بەغدا، ١٩٥٩، ل ٦٤؛ مەمدوح سەلیم مزووری، مێژووی ڕواندز، چاپخانەی منارە، هەولێر، ل ٢١٩.

(٧) جيمس بيلي فرايزر، رحلة فرايزر الى بغداد في ١٨٣٤، ت : جعفر الخياط، ط١، مطبعة المعارف، بغداد، ١٩٦٤، ص ٢٣. لەم کتێبەیدا (فرایزر) یاداشتەکانی (دکتور ڕۆس)ی سەبارەت بە میر محەمەد بە وردی وەکو خۆی تۆمار کردووە. لە بنچینەدا گەشتنامەکەی فرایزەری ئینگلیز بەم ناونیشانە چاپکراوە : J. Baillie Fraser, Travels in Koordistan and Mesopotamia, LONDON 1840

بەڵام (جعفر الخياط) ئەوەندەی پەیوەندی بە عێراق و کوردستانی باشوور هەیە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و ناونیشانێکی تریشی بۆ داناوە، زانیاری باشی دەربارەی میر محەمەد ڕەواندزی تێدایە و وەکو سەرچاوەیەکی بنەڕەتی سەیر دەکرێت.

(٨) گیوی موکریانی ( ١٩٠٣ – ١٩٧٧) : زمانزان و نووسەر و کارمەندی چاپخانە و بڵاوکەرەوەی چەندین کتێب و خاوەنی چاپخانەی کوردستان بوو لە هەولێر، برای حسێن حوزنی موکریانییە و هەر لە بیستەکانی سەدەی ڕابوردوودا لەگەڵ حسێن حوزنیدا لە چاپکردنی گۆڤار و کتێب و بڵاوکراوەکانی تر بەشداربوو. بڕوانە : جمال بابان، اعلام كرد العراق، مطبعة شڤان، السليمانية، ٢٠٠٦، ص ٦٤٣ – ٦٤٤.

(٩) داماو حسێن حزنی موکریانی، س . پ، ل١٢٢.

(١٠) جمال نەبەز، الامير الكردي مير محمد الرواندزي الملقب بـ ((میری کۆرە))، ت : فخری سلاحشور، ط٢، دار آراس للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠٣، ص ٤٩.

(١١) داماو حسێن حزنی موکریانی، س.پ، ل٢٩.

(١٢) شەرەفخانی بەدلیسی، س.پ، ل٥٠٧ ( پەراوێزی مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی).

(١٣) طاهر عبدالله سليمان، محمد پاشا الرواندزي والاسباب المؤدية الى سقوط امارته مع نبذة من تاريخ حياة العلامة محمد الختي، مطبعة الثقافة، اربيل، ٢٠٠٢، ص١١.

(١٤) جمال نەبەز، م.س، ص٥٠.

(١٥) Millingen, Major Frederick: The Wild Life among the Kurds, London, 1870 بە گواستنەوە لە : جەمال نەبەز، م.س، ص ٥٠، ١٧٩.

(١٦) عەقیلە ڕەواندزی، یاد و ئافەرین، لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری شاووشکا بۆ چالاکی ڕۆشنبیری، چاپخانەی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥، ل ١٧ -٤١.

(١٧) لە سەرەتای هاتنی ئاینی ئیسلام بۆ ناوچە کوردنشینەکان تاکو چارەگی کۆتایی سەدەی نۆزدە، تەنها مزگەوت و حوجرە و قوتابخانە ئاینییەکان سەرچاوەی سەرەکی ڕۆشنبیری و خوێندەواری و فێرکردن بوون. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. ابراهيم خليل احمد، تطور التعليم الوطني في العراق (١٨٦٩ – ١٩٣٢) منشورات مركز دراسات الخليج العربي بجامعة البصرة، ١٩٨٢، ص ٢٦ – ٢٩ . فاخر عالی خان ئاودەلی، ڕۆڵی زانایانی ئاینی لە ژیانی سیاسی هەولێردا ١٩٤٥ – ١٩٧٥، چ١، چاپخانەی هێڤی، ٢٠١٤، ل ١٩.

(١٨) دێڵزە گوندێکە کەوتۆتە ڕۆژئاوای شارۆچکەی چۆمان لە ناوچەی باڵەک سەر بە پارێزگای هەولێر.

(١٩) محەمەد ئیبنو ئادەمی باڵەکی ( ١٧٥٠ – ١٨٤٤)، لەگوندی ڕوست ناوچەی باڵەک سەر بە پارێزگای هەولێر لەدایک بووە . لەسەردەستی مەلا ئادەمی باوکی لەگوندی ڕوست دەستی بە خوێندن کردووە. دواتر لەلای زانا ناودارەکانی کوردستان و عێراق خوێندوویەتی. لە ئەنجامدا بۆتە زانایەکی گەورە و هەڵکەوتوو. دانەرێکی خاوەن قەڵەمی بە بڕشت بوو. لە هەموو زانستێکی عەقڵی و نەقلیدا نووسین و دانراوی هەیە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، یادی مەردان، بەرگی یەکەم، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٩، ل١٧، مصباح الوصول الى تهذيب الاصول لابن آدم البالكي ( ت ١٢٣٧ هـ).. رسالة ماجستير مقدمة الى مجلس كلية العلوم الاسلامية في جامعة صلاح الدين من قبل الطالب ابوبكر ديوانه حمد حسێن، ٢٠٠٨، ص٨ (رسالة غير مطبوعة)، نادر ڕوستی، گوندی کوردی و گۆڕان لە پیشەدا گوندی ڕوست وەک نموونە، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٦١.

[٢٠] تاکو سەردەمی حسێن حزنی لە رەواندز (بیستەکان و سییەکانی سەدەی رابردوو) ئەو مزگەوتە و دیوارەکانی لە باشوور ( قیبلە)ی قەلاتی لۆکان شوێنەواری مابوو. بڕوانە : داماو حسێن حزنی موکریانی، س. پ، ل ٢٩، طاهر عبداللە سلیمان، م.س، ص٩ – ١٠ . ممدوح مزووریش دەڵێ: "دیواری ئەم دەرسخانەیە تا دەوروبەری ١٩٦٠ مابوو خۆم دیتبووم و پێیان ئەگۆ مزگەوتی مەلا ئەسعەد ئەفەندی " ممدوح سلیم مزووری، س . پ، ل٢١٧.

[٢١] جەمال نەبەز، م. س، ص ٥٠.

[٢٢] هەندێ سەرچاوە، وەکو داماو حسێن حزنی موکریانی و د. جەمال نەبەز. ئاماژە بۆ ناوی (مەلا ئەحمەدی ئیبن ئادەم – کوڕی گەورەی ئیبنوئادەم) دەکەن مستەفا بەگ هێنابێتیە رەواندز و مزگەوت و قوتابخانەیەکی بۆ دروستکردووە، تاکو دەرس بە میر محەمەد بڵێت، بەلام ئێمە لە ئەنجامی بەراوردکردنی تەمەن و پەیوەندیکردنی تەلەفۆنی لەگەڵ هەریەک لە مەلا عبداللە گرتکی (نەوەی ئیبنو ئادەم) (د. فائز ئەبوبکر کە تویژینەوەی لەسەر ئیبنو ئادەم ئەنجامداوە)، هەروەها پشت بەستن بە ماستەرنامەی ئەبوبەکر دێوانە حەمەد کە لەسەر دانراوێکی ئیبنو ئادەمی نووسیوە، بۆمان ساغ بووەوە کە (محەمەدی ئیبنو ئادەم) خۆیەتی مامۆستای میر محەمەد بووە نەک مەلا ئەحمەدی کوڕی.

[٢٣] مەولود بێخاڵی و تاریق جامباز، رەواندز شارەکەی پاشای گەورە، چاپخانەی بینایی، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل ١٣.

[٢٤] ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی، محەمەد پاشای رەواندز – لێکۆڵینەوەیەک لە کەسایەتی و قۆناغی حوکمەکەی لە روانگەی ئایین و دەروونناسییەوە، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ٥٥.

[٢٥] ممدوح سلیم مزووری، س. پ، ل٢١٩. نووسەری ئەم کتێبە لێرەدا قسەکانی کەسایەتی دێرینی رەواندز مامۆستا مەلا عەبدولکەریم ئەفەندی خەیلانی گێڕاوەتەوە.

[٢٦] احمد الورتي، رسالة، استراتيجية مدينة رواندز في كوردستان الجنوبية، مطبعة شهاب، اربيل، ٢٠٠٦، ص١٨.

[٢٧] جەمال نەبەز، م. س، ص٥١.

[٢٨] سەبارەت بە قەدەغەکردنی ((ژن و پیاو پێکەوە راوەستان و کۆمەڵە بەستن))؟ ئەگەر ئەمە راست بێت و میر محەمەد دژی ئەمە بووبێت، ئەمەیان لەگەڵ داب و نەریتی کۆمەلایەتی کوردەواری ناگونجێت، چونکە

ژنــی کوردســتان شــان بەشــانی پیــاو لە کــارکردن و کــاربەڕێوەبردن بەشداربووە. لە جەنگدا هاوکاری پیاو بووە. نموونە زۆرن، هەر لەنزیکی بنەماڵەی میرانی سۆران ( خانزادە خان و بووک شازەمان و فاتمەخانی فەقیانی و لەعلیخانی رواندز) ناسراون. گەڕیدە بیانییەکانیش لە سەدەکانی رابوردوودا ئاماژەیان بۆ رۆڵی ئافرەتی کورد کردووە. جا ئەگەر میر محەمەد هەڵوێستی وابووبێ، هەروەکو (حوزنی) نووسیویە، ئەمەیان پەیڕەوکردنی توندڕەوانەی هەندێ لایەنی شەریعەتە، هەروەکو لە بواری دیکەدا توندڕەوی ئەنجامداوە، دواتر دێینە سەریان.

[29] داماو حسێن حزنی موکریانی، س .پ، ل٣٢.

[30] ئیبنو ئادەم باڵەکی لەسەر داوای میر محەمەد بۆ جاری دووەم چۆتەوە رەواندز. دوای دروستبوونی ناکۆکییەک لەنێوانیاندا، ئیبنو ئادەم رەواندزی جێهێشــتووە و لە گونــدەکەی خــۆی (روســت) نیشــتەجێ بــووە و قوتابخانەیەکی تیا دامەزراندووە.. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: نورالدین سعید وەیسی، ئیبنوئادەمی کوردی.. زاناو رۆشنبیری ونبوو، رۆژنامەی گوڵان، ژمارە (١) ٢٤ی نیسانی ١٩٩٤، ل٦ ؛ زبیر بلال اسماعیل، من التراث الثقافي الكردي علماء ومدارس في اربيل، مطبعة الزهراء الحديثة، الموصل، ١٩٨٤، ص١٠٢.

[31] مەلا محەمەد کوڕی ئەحمەد کوڕی عەبدولرەحمان ناسراو بە (مەلای خەتێ) (١٧٨٥ – ١٨٦٠)، لەگوندی خەتێ ناوچەی خۆشناوەتی لەدایک بووە، زانایەکی ئاینی ناسراوە. بۆماوەیەک لە بەغدا لە کەسە نزیکەکانی والی داواد پاشا بوو، ئەڵقەی پەیوەندیی نێوان ئەم و میری سۆران بوو، بەدیاری زۆرەوە بۆ لای میری رەواندزی ناردووە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە : زبير بلال اسماعيل، من التراث الثقافي الكردي...، م.س، ص ١١٣ – ١١٦ ؛ طاهر عبدالله سليمان، م.س، ص ١١١-١٢٢؛ عبدالفتاح على يحيى، الهجوم العثماني على كردستان وسقوط امارة سوران، مجلة كاروان، العدد ٥٣، شباط وآذار ١٩٨٧، ص ١٥٠ – ١٥١.

[32] یەحیا کوڕی حسێن ساڵی ١٧٧٢ لەگوندی باڵتە دەڤەری مزووریيان لەدایک بووە. مامۆستایەکی ئاینی و زانایەکی ناسراو بوو، خاوەن دانراوی ئاینی زۆرە. لە ساڵی ١٨٣٩ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە. دەستوەردانی مەلا یەحیای مزووری و مەلا محەمەدی خەتێی برادەری لە رووداوە سیاسییەکانی کۆتاییەکانی هەردوو میرنشینی سۆران و بادینان، هۆکارێکی گرنگ بوو لە خێراییدان بە رووخانی هەردوو میرنشینییەکە. بۆ

زانیاریی زیاتر بڕوانە : عبدالكريم محمد المدرس، علماؤنا في خدمة العلم والدين، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٢، ص ٦٢١ – ٦٢٢؛ عبدالفتاح علی يحيی، الملا يحيی المزوري وسقوط امارة بادينان، مجلة كاروان، العدد ٤١، اربيل، ١٩٨٦.

(٣٣) داماو حسێن حزنی موکریانی، س.پ، ل٣٢.

(٣٤) د. سعدى عثمان هروتي، كوردستان والامبراطورية العثمانية دراسة في تطور سياسة الهيمنة العثمانية في كوردستان ١٥١٤ – ١٨٥١، مؤسسة موكرياني للبحوث والنشر، اربيل، ٢٠٠٨، ص ١٩٤.

(٣٥) حسێن حزنی موکریانی، س. پ، ل٨٣ –٨٧ ؛ علاء الدین سجادی، س.پ، ل ٦٨ ؛ محمدامين زكي، خلاصه تاريخ الكرد وكردستان من أقدم العصور التاريخية حتى الآن، ت: محمد علي عوني، ط٢، بغداد، ١٩٦١، ص ٢٣٢ ؛ جەمال نەبەز، م.س، ص ١٤ –١٤٦؛ د. جەلیلی جەلیل، س.پ، ل ١٨٤.

(٣٦) جیمس بیلی فریزر، م.س، ص٢٧ ؛ جمال نەبەز، م.س، ص١٤٦. لە کتێبی: سینان هاکان، س.پ، ل ٩٤دا هاتووە کە "میری سۆران لە کۆتایی ساڵی ١٨٣٦ (بێ ئەوەی ناوی مانگەکە بێنێ) خۆی رادەستی رەشید پاشا کرد و برایە دەرسەعادەت ئیستانبول.

(٣٧) محەمەد رەشید پاشا والی سیواس سەرکردایەتی هەڵمەتێکی گەورەی سەربازی کرد بۆ لەناوبردنی دەسەڵات و میرنشینە سەربەخۆکانی کورد بەتایبەتی میر محەمەد رەواندزی، رەشید پاشا بە لەشکرێکی ٤٠ هەزار کەسییەوە، هەر لە هاوینی ١٨٣٤ دەستی بەشەڕو پێشڕەوی کردووە دژی هەرێمە کوردییەکان لە باکور و لە کۆتایی مانگی ئابی ١٨٣٦ بەهاوکاری هەردوو لەشکری والیی بەغدا و موسڵ گەیشتۆتە ئامانجی سەرەکی کە میری سۆران بوو. بڕوانە : د. سعدي عثمان هروتي، م. س، ص ١٨٥.

(٣٨) ستيڤن هيمسلي لونگريك، اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ت : جعفر الخياط، ط٤، مطبعة المعارف، بغداد، ١٩٦٨، ص٣٤٣، هەروەها بڕوانە: حسێن حزنی موکریانی، س.پ، ل٨٧.

(٣٩) Richard Edward قونسڵی بەریتانیا بوو لە حەلەب. بڕوانە : جەمال نەبەز، م.س، ص ١٦٤، ٢٧٧.

(٤٠) هەمان سەرچاوە، ل ١٦٤.

(٤١) بۆ زانیاریی پێویست دەربارەی هۆکارەکانی شکستپێهێنانی بزووتنەوەی میر محەمەد رەواندزی و رووخانی میرنشینە سەربەخۆکەی سۆران، بڕوانە : د. جەلیلی جەلیل، س .پ، ل ١٦٥ – ١٨٨ ؛ جەمال نەبەز، م .س،

ص ١٤٠ – ١٦٩ ؛ د. سعدی عثمان هروتي، م.س، ص ١٨٨ – ٢٤٠ ؛ عثمان علي، الحركة الكردية المعاصرة، ط٢، مكتب التفسير للنشر والاعلان، اربيل، ٢٠١١، ص ٣٨ – ٤٣ ؛ عبدالفتاح علی يحيی، الهجوم العثماني على كردستان وسقوط امارة سوران، مجلة كاروان، الاعداد : ٥٢، ٥٣، اربيل، ١٩٨٧ .

(٤٢) جمال نەبەز، م.س، ص ١٦٤ ؛ د. سعدي عثمان هروتي، م. س، ص ٢٠٠؛ عبدالفتاح علی يحيی، الهجوم العثماني على كردستان وسقوط امارة سوران. مجلة كاروان، العدد ٥٤، ص١٤٦.

(٤٣) دیڤید مەکداول، مێژووی هاوچەرخی کورد، و: ئەبوبەکر خۆشناو، چاپخانەی رون، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل ٩٩ – ١٠٠.

(٤٤) د. جەلیلی جەلیل، س . پ، ل١٨٥.

(٤٥) سینان هاکان، س . پ، ل٩٥، ٣٣٠.

(٤٦) هەمان سەرچاوە، ل ٩٥.

(٤٧) BOA – FON KODU : HATD. NO : 396 G NO: 22 88 6 IB بە گواستنەوە لە: سینان هاکان، ل ٩٧ . بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە، حسێن حزنی موکریانی، س .پ، ل ٨٧.

لە کتێبی (سير الاكراد در تاريخ و جغرافیای كردستان) نووسینی (عبدالقادر بن رستم بابانی) کە ساڵی ١٨٦٩ بەفارسی دانراوە، چاپی ١٣٧٧ رۆمی، ل ١٨٥–١٨٦ هاتووە : ((.. دوای ئەوەی میر محەمەد فەرمانی سوڵتانی جێبەجێ نەکرد بەسەردانی عەلی رەزا پاشا والی بەغدا، سوڵتان لە میر محەمەد تووڕە بووە و فەرمانی لەناوبردنی دەرکردووە. بەم جۆرە حاکمی سیواس دەستگیری دەکات و هەردوو دەست و هەردوو قاچی دەبەستن و دەیخەنە ناو کیسێک و توند دەیبەستن و فڕێی دەدەنە ناو دەریا)) !.

لە سەرچاوەیەکی دیکەشدا ئاماژە بەوە کراوە کە لە ئەماسیا لەرێگای گەڕانەوەی (پاشای کۆرە) بەرەو رەواندز لە نکاوڕا لەئەنجامی خواردنەوەی فنجانێک قاوە گیانی لەدەستداوە. بڕوانە : جون س. گیست، الحياة بين الكرد .. تاريخ الايزديين، ت : عماد جميل مزووری، مؤسسة پیریز، دهوک، ٢٠٠٥، ص ١٦٧. یان رەوانەی ناوچەی شومنوی هەڵکەوتووی رومەلی ( باشووری بالکان) کراوە و شوونبزر کراوە. سینان هاکان، س، پ، ل٩٧.

(٤٨) طاهر عبدالله سليمان، م.س، ص ٣٠

(٤٩) بـۆ زانیـاریی زیـاتر دەربـارەی دووەمـین سیسـتەمی میرنشـینی لە کوردستاندا بڕوانە : د. سەعد بەشیر ئەسکەندەر، سەرهەڵدان و رووخانی سیستەمی میرنشینی لە کوردستاندا، و : جەوهەر کرمانج، چاپی دووەم، چاپخانەی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل ٥٥ – ٦٢ .

(٥٠) الدكتور بدرخان السندي، المجتمع الكردي في المنظور الاستشراقي، دار آراس للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠٢، ص ٦٩.

(٥١) دامـاو حسـێن حزنـی موکریـانی، س.پ، ل٢٨ ؛ ئەحـمەد سـەید عەلـی بەرزنجی، محەمەد پاشای ڕەواندز، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٥٥.

(٥٢) داماو حسێن حزنی موکریانی، س.پ، ل٢٩.

(٥٣) ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی، س . پ، ل٥٥.

(٥٤)جۆلەمێرگ گوندێکە کەوتۆتە دۆڵی ئـالانە سـەر بەنـاحیەی خەلیفـانە لە قەزای سۆران. سەردەمی میرنشینی سۆران گوندێکی گەورەبوو.

(٥٥) داماو حسێن حزنی موکریانی، س. پ، ل٢٨.

(٥٦) ه.س، ل٢٨ ؛ د. جەلیلی جەلیل، س .پ، ل١٣٤ ؛ طاهر عبدالله سليمان . م. س، ص ١١.

(٥٧) کەسایەتی و زانایانی هەولێر لە کتێبی (مەشاهیری کوردی بابا مەردوخی روحانی) دا، ئامادەکردن و وەرگێڕانی لە فارسییەوە : ڕەحیم سورخی، ئینسکلۆپیدیای هەولێر، چاپی یەکەم، لەبڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان، ٢٠٠٩، هەولێر، ل٤٢٩٦ .

(٥٨) ژمارەیەکی زۆر لە مرۆڤە مێژووییەکان کە نزیکبوونەتەوە لەوەی ببنە قوربانی و کوژراوی دەستی ناتەواوی لە ئەندامەکانی لەشیان، بەڵام بەبڕیاری بەهێزیان و بە پشووی درێژیان، توانیویانە سەرکەون و چەند کەسێتییەکی بەناوبانگ بۆخۆیان دروست بکەن، وەکو ئەسکەندەری گەورە، قەیسـەری ڕۆم، تەیمـووری لەنـگ، نـاپلیۆن بۆناپـارت و چەنـد کەسێکی دیکە. بڕوانە : د. نوری الحافظ، تكوين الشخصية، ط١، مطبعة المعارف، بغداد، ١٩٦١، ص ١٢٢. بە گواستنەوە لە : جەلال خەلەف ژاڵەیی، کەسێتی سەرکەوتوو، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ١٩٨٧، ل١١٣.

(٥٩) پرۆفیسۆر دکتۆر وەدیع جوەید، جووڵانەوەی نەتەوەیی کورد بنەما و پەرەسەندنی، و: پرۆفیسۆر د. یاسین سەردەشتی، چاپخانەی سیما، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل ١٢٨، دیڤید مەکداول، س .پ، ل ٩٥.

(٦٠) د. عەبدوڵڵا عەلیاوەیی، کوردستان لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٣٤.
(٦١) ه. س، ل ٣٤ ؛ سعدی عثمان هروتی، م.س، ص ١٩٠ – ١٩١ .
(٦٢)داماو حسێن حزنی موکریانی، س . پ، ل٥٥.
(٦٣) ه.س، ل ٥١ – ٥٣ .
(٦٤) طاهر عبدالله سلیمان، م.س، ص ١٥ – ١٦ .
(٦٥) داماو حسێن حزنی موکریانی، س. پ، ل ٥٠ .
(٦٦) میر محەمەد هەر لە ساڵی ١٨١٥ بە سەرکەوتنی بەسەر مامەکانی لەدەوروبەری ڕەواندز دەستی بە فراوانخوازی کرد. بڕوانە : د. سعدی عثمان هروتی، م. س، ص ١٨٩.
(٦٧) لە ساڵی ١٨١٨ میر محەمەد ناوی میری مەنسووری لەخۆی نا و بانگی سەربەخۆیی میرنشینەکەی دا. بڕوانە: جەلیلی جەلیل، س .پ، ل١٤٧. لە هەندێ سەرچاوەی دیکەدا ئاماژە بۆ ساڵی ١٨٢٦ یان ١٨٣٠ کراوە بۆ ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی بڕوانە : جەمال نەبەز، م.س، ص ١٠٤.
(٦٨) د. کاوس قەفتان، چەند لێکۆڵینەوەیەک لەمێژووی بابان .. سۆران .. بۆتان، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ١٩٨٥، ل ٤٦. لەدوای لەناوبردنی میر محەمەد میرنشینییەکەی سۆران تەواو کوێر نەبووەوە، هەروەکو د. کاوس قەفتان نووسیویەتی، بەڵکو بۆ ماوەی زیاتر لە دە ساڵ هەر سێ براکەی (پاشای کۆرە) (میر ئەحمەد و سلێمان بەگ و ڕەسول پاشا) یەک لەدوای یەک لە ڕەواندز فەرمانڕەوا بوون وەکو میری سۆران. بەڵام پابەندبوون بە دەوڵەتی عوسمانی و ئەو میرنشینییە فراوان و سەربەخۆیەی وەکو سەردەمی (میری کۆرە) نەمابوو. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە : داماو حسێن حزنی موکریانی، س.پ، ل ٨٨ – ١٠٠ ؛ علی سیدۆ الگۆرانی، من عمان الی العمادیة، دار اراس للطباعة والنشر، اربیل، ٢٠٠٢، ص١٤٤.
(٦٩) عماد عبدالسلام رؤوف، دراسات وثائقیة في تاریخ الکرد الحدیث وحضارتهم، ط١، دار الزمان للطباعة والنشر والتوزیع، دمشق، ٢٠١٢، ص ٣٩٢ ؛ عبدالفتاح علی یحیی، الهجوم العثماني علی کردستان وسقوط امارة سوران، م.س، العدد ٥٤، ص١٤٨.
(٧٠) پرۆفیسۆر دکتور وەدیع جوەیدە، س . پ، ل١٢٧؛ د. محسن محمد عمر، کورد و کوردستان عند الرحالة الفرنسیین في القرون ( ١٧ و ١٨ و ١٩)، ت: د حسیب الیاس، دار سردم للطباعة والنشر، السلیمانیة، ٢٠١٥، ص٢٨٧.

[٧١] عثمان علی، م.س، ص٣٥.
[٧٢] جیمس بیلی فریزر، م.س، ص٢٣ – ٢٤.
[٧٣] ممدوح سەلیم مزووری، ئیمام و پێشنوێژی مزگەوتی گەیلانی بووە لە ڕەواندز، لە حەفتاکان و هەشتەکانی سەدەی ڕابوردوو لە ڕەواندز ژیاوە. دوو کتێبی لەسەر مێژووی ڕەواندز نووسیوە : ١- مێژووی ڕواندز، ساڵی ٢٠٠٦ چاپکراوە، ٢- بنەماڵانی بەناوبانگی ڕواندز، چاپی دووەمی ٢٠٠٩.
[٧٤] ممدوح مزووری، مێژووی ڕەواندز، س.پ، ل٢٥٣.
[٧٥] د. جەبار قادر لە پێشەکی کتێبێکی توێژەری کورد ( سینان هاکان) نووسیویەتی و دەڵێ : "کتێبی (کورد و بەرخودانەکانی لە بەڵگەنامەکانی ئەرشیفی عوسمانیدا) بەرهەمێکی زانستی پڕ زانیاریی مێژوویییە، سەرچاوەی سەرەکی زانیارییەکانی ئەم کتێبە بەڵگەنامەکانی ئەرشیفی عوسمانییە". سینان هاکان، س. پ، ل ٧.
[٧٦] سینان هاکان، س.پ، ل٨٢-٨٣. (هیلات)یش جۆرێک لە پۆشاکی شاهانەیە پاشاکان دەستوور دەدەن بکرێتە بەر کەسانێکی دەستنیشانکراو لەکاتی ڕێزلێناندا. هەمان سەرچاوە، ل٨٢
[٧٧] ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی، س.پ، ل٥٣ – ٢٦.
[٧٨] بەگوێرەی سەرچاوەکان میر محەمەد وەجاغ کوێر بووە، د. ڕۆس دەڵێ : "میر محەمەد سێ ژنی هەیە و وەچەی نییە، ئێستاش کە لە ٤٥ ساڵیدایە هیوای ئەوەی لێ ناکرێ ئیتر منداڵیان بۆ پەیدا ببێ، بۆیە ڕەسول بەگی برای بە جێنشینی دادەنرێت". بڕوانە : جیمس بیلی فریزر، م.س، ص ١٨.
بەبۆچوونی نووسەر ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی : ئەم وەجاخ کوێرییەش هۆکارێکی ترە بۆ دروستبوونی گرێ دەروونییەکانی و هەست بەکەمی کردنێک و هەوڵدان بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەم گرێ دەروونییە. بڕوانە : ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی، س . پ، ل ٥٨ – ٥٩.
[٧٩] جیمس بیلی فریزر، م.س، ص١٨.
[٨٠] ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی، س.پ، ل٦١.
[٨١] د. سعدی عثمان هروتی، م.س، ص ١٨٨.
[٨٢] داماو حسێن حزنی موکریانی، س.پ، ل٢٩ ؛ جەمال نەبەز، م.س، ص٤٩.
[٨٣] ممدوح مزووری، مێژووی ڕەواندز، س.پ، ل٢١٧.
[٨٤] جەمال نەبەز، م.س.، ص ٦٢ – ٦٣

(٨٥) لە ساڵی ١٨١٥ دوای زانای ناودار (ئیبنو ئادەم) (مەلای خەتێ) بۆتە سەرچاوەی شەرعی و ئایینی میر محەمەد. دواتر مەلای خەتێ چۆتە بەغداو لەوێ هەر لەساڵی ١٨١٧ تاکو ١٨٣١ خەریکی کاری زانستی بووە و ئەڵقەی پەیوەندیی نێوان داود پاشای والیی بەغدا و میری ڕەواندز، هەروەکو پێشتر ئاماژەی بۆ کراوە، لە ساڵی ١٨٣١ مەلای خەتێ گەڕاوەتەوە ڕەواندز و بۆتە موفتی میرنشینی سۆران. بڕوانە : طاهر عبدالله سليمان، م.س، ص ١١٨ – ١١٩.

(٨٦) مەسعود محەمەد، حاجی قادری کۆیی، بەشی دووەم، لە بڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٤، ل١٠٨.

(٨٧) د.جەلیلی جەلیل، س.پ، ل١٣٤ . طاهر عبدالله سليمان، م.س، ص١٧.

(٨٨) ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی، س .پ، ل٦١ -٦٢.

(٨٩) د.سعدی عثمان هروتی، م.س، ص١٨٩.

(٩٠) ستیڤن هیمسلی لونگریک، م.س، ص٣٤٣.

(٩١) احمد الورتی، م.س، ص١٨.

(٩٢) داماو حسێن حزنی موکریانی، س.پ، ل٣٢ – ٣٣.

(٩٣) باپشتیان، گوندێکە کەوتۆتە نزیک شاری ڕەواندز، لای باکوری ڕۆژئاوای شارەکە، ئێستا لەگەڵ شاری سۆران تێکەڵ بووە.

(٩٤) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە : داماو حسێن حزنی موکریانی، س.پ، ل٣٣.

(٩٥) هـ س، ل٣٤ . د. جەلیلی جەلیل، س. پ، ل ١٢٧.

(٩٦) داماو حسێن حزنی موکریانی، س.پ، ل٣٤.

(٩٧) طاهر عبدالله سليمان، م.س، ص ١٨، لەم سەرچاوەیەدا هاتووە کە هێرشی میر محەمەد بۆ سەر مامەکانی لە ساڵی ١٨١٤ دەستی پێکرد. بەڵام لە هەردوو سەرچاوەی د. جەلیلی جەلیل، ل١١٧ و د. سعدی عثمان هروتي، ل١٨٩، ساڵی ١٨١٥ دیاریکراوە. حسێن حوزنی موکریانیش ساڵی ١٢٣٠ کۆچی بۆ ئەم ڕووداوە نووسیوە کە دەکاتە نێوان ١٨١٤ و ١٨١٥ ز.

(٩٨) ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی، س. پ، ل٦٠.

(٩٩) داماو حسێن حزنی موکریانی، س.پ، ل ٢٨ ؛ ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی، س.پ، ل٦٠.

(١٠٠) د. جەلیلی جەلیل، س.پ، ل ١٢٧ – ١٢٨، د.سعدی عثمان هروتی، م.س، ص ١٨٩.

(١٠١) داماو حسێن حزنی موکریانی، س.پ، ل ٣٨ ؛ د.سعدی عثمان هروتی، م.س، ص١٨٩.
(١٠٢) احمد الورتي، م.س، ص٢٠.
(١٠٣) ن. أ. خالفين، الصراع على كوردستان ((المسألة الكردية في العلاقات الدولية خلال القرن التاسع عشر))، ت : د. احمد عثمان ابوبكر، مطبعة – الشعب – بغداد، ١٩٦٩، ص٥٠.
(١٠٤) سینان هاکان، س.پ، ل٨٣.
(١٠٥) هۆگر حەسەن پیرداود، میرنشینی سۆران لە سەردەمی میر محەمەد (١٨١٣ – ١٨٣٦) ز، گۆڤاری مێژوو، ژمارە (٩) زستانی ٢٠٠٩، ل٨٦ .
(١٠٦) نورەدین سەعید وەیسی، س.پ، ل٦.
(١٠٧) د. جەلیلی جەلیل لەبارەی (ئەدای شێر) و (مەلیخا) دەڵێ : ((هەردوو سەرچاوەکە باسی شەڕەکانی میر محەمەد دەکەن لە موسڵ و ناوچەی کوردە ئێزیدییەکان. دەنگ و باسی وەها ئەنووسنەوە کە لەیەک ناکەن))، بڕوانە : د. جەلیلی جەلیل، س.پ، ل٣٠٠. لەبارەی (مەلیخا)شەوە حسێن حزنی موکریانی نووسیویەتی : ((مێژووی وڵاتی سۆران کە بەفەرمانی میری گەورە، هەر لە سەردەمی خۆیدا لەلایەن میرزا محەمەدی ڕازنووس (سکرتێر)ی تایبەتی خۆیەوە بە هەڵبەست و بەزمانی فارسی تۆمارکراوە و نووسراوەتەوە . بڕوانە : داماو حسێن حزنی موکریانی، س.پ، ل ب . دەربارەی ژیان و بەرهەمەکانی ئەدای شێر، بڕوانە: د. عماد عبدالسلام رؤوف، بعض الوقائع من تاريخ كردستان جمعة من مخطوطات كلدانية أدى شير، مجلة الاكاديمية الكوردية، العدد ٢٤، ٢٠١٣، ص٣٧٥.
(١٠٨) د. جەلیلی جەلیل، س.پ، ل ١٤٥ – ١٤٦؛ د. عماد عبدالسلام رؤوف، بعض الوقائع من تاريخ كردستان ....، م.س، ص٣٩١.
(١٠٩) د. جەلیلی جەلیل، س.پ، ل١٤٦.
(١١٠) عبدالقادر بن رستم باباني، سير الاكراد تاريخ و جغرافياى كردستان، به اهتمام : محمد رئوف توكلى، چاپخانه گلبانگ، چاپ دوم، ١٣٧٧، صفحه ١٧٨.
(١١١) محمد امين زكي، خلاصة تاريخ الكرد و كردستان من أقدم العصور التاريخية حتى الآن، م.س، ص ٢٣٠ – ٢٣١؛ سعدى عثمان هروتى، م. س، ص ١٩٤؛ د. محسن محمد عمر، كورد و كوردستان عند الرحالة الفرنسيين في القرون ( ١٧ و ١٨ و ١٩)، دار سردم للطباعة والنشر، السليمانية، ٢٠١٥، ص٢٨٨.

(١١٢) صـديق الـدملوجي، امـارة بهـدينان الكرديـة او امـارة العماديـة، تقـديم ومراجعة الدكتور عبدالفتاح على البوتاني، ط٢، دار ئاراس للطباعة والنشر، اربيـل ١٩٩٩، ص ٤٠ . عـدنان زيـان فرحـان، الكـرد الايزيـديون فـي اقلـيم كردستان، مركز كردستان للدراسات الاستراتيجية، السليمانية، ٢٠٠٤، ص ١٠٨؛ ا. د . عبدالفتاح على البوتاني، ثلاث سنوات دراسية في بردەرەش، مديرية الطباعة والنشر، دهوك، ٢٠١٤، ص١٥.

(١١٣) دەرکردنی فەتوا لەلایەن موفتییەکانی دەوڵەتی عوسمانی بۆ حەلاڵکردنی کوشتار لە ئێزیدییەکان و بەتاڵانبردنی سەرو ماڵیان رەگێکی مێژوویی هەیە تەنانەت هەر هۆزێک یان میرێکی کورد لە دەسەڵاتی عوسمانی یاخی بوایە، دەسەڵاتدارانی عوسمانی - هەروەکو لە سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی ئاماژەی بۆ کراوە- بە ئێزیدی و کافر تۆمەتباریان دەکردن. تاکو بەخێرایی بەسەریاندا زاڵ بن و کوردانیش لە هەڵمەتی سەرکوتکردنیاندا بەشداری بکەن. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا، سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، و : سەعید ناکام، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٩، ل٢٦٤ - ٢٦٥؛ سعيد الديوەجي، اليزيدية، مؤسسة دار الكتب للطباعة والنشر، الموصل، ١٩٧٣، ص٢٢٦؛ عدنان زيان فرحان، الكرد الايزيديون في اقليم كردستان،م. س، ص٣٤؛ داود مراد الختاري، الحملات والفتاوى على الكرد الايزيديين في العهد العثماني، دار سپيريز، دهوك، ٢٠١٠، ص١٤٨-١٨٣.

(١١٤) صـديق الـدملوجي، م. س، ص٤٠؛ عبـدالفتاح علـى يحيـى، المـلا يحيـى المزوري وسقوط امارة بادينان، م. س، القسم الاول، ص١٥٢.

(١١٥) د. عبدالفتاح علي البوتاني، دراسـات ومباحث في تـاريخ الكرد والعـراق المعاصر، دار سپيريز للطباعة والنشر، دهوك، ٢٠٠٧، ص٥٢.

(١١٦) سهيل قاشـا، مسـيحيو العـراق، ط٣، دار الـرواق للنشـر المحدودة، بيـروت، ٢٠٠٩، ص٢٩٣.

(١١٧) د. جەلیلـی جەلیـل، س. پ، ل١٥١؛ د. عبـدالفتاح علـى البوتـانى، دراسـات ومباحث ...، م.س،ص ٤١-٤٢.

(١١٨) ارشد حمد محو، الايزيديون في كتب الرحالة البريطانيين من مطلع القرن التاسع عشر الى نهاية الحرب العالمية الاولى، مؤسسة موكرياني، اربيل، ٢٠١٢، ص٨٢.

(١١٩) جيمس بيلى فريزر، م.س، ص ١٤-١٥.

[120] داسنییەکان، هۆزێکی دیاربوون لە دەوروبەری موسڵ، بەهۆی چیای داسن بە داسنی ناسراون، کە چیایەکی ناوچەی مزوورییانە، شوێنە هەرە پیرۆزەکەشیان لە دۆڵی (لالش)ە لەم ناوچەیە، هەروەها سەرچاوەکان باس لە میرنشینی دێرینی داسنی دەکەن لە باشووری رۆژئاوای بادینان. داسنییەکان لەسەر ئاینی ئێزدین کە وەکو نەژاد و زمان کوردن. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: صديق الدملوجي، م. س، ص٣٦؛ روجيه ليسكو، اليزيدية في سوريا وجبل سنجار، ت: احمد حسن، دار المدى للثقافة والنشر، بغداد، ٢٠٠٧، ص ٤٣؛ د. عدنان زيان فرحان و قادر سليم شمو، دراسات في تاريخ الكرد الايزيديين، مركز الدراسات الكردية وحفظ الوثائق، دهوك، ٢٠٠٩، ص١٢.

[121] محفوظ العباسي، امارة بهدينان العباسية، مطبعة الجمهورية، الموصل، ١٩٦٩، ص٢٢٢-٢٢٤؛ جمال نەبەز، م.س، ص١٥٦؛ د. عبدالفتاح علي البوتاني، دراسات ومباحث...، م.س ص٤٣.

[122] جون گيست، الحياة بين الكرد.. تاريخ الايزيديين، ت: عماد جميل مزوري، دار سبيريز للطباعة والنشر، دهوك، ٢٠٠٥، ص١١٢-١١٣ ؛ د. عبدالفتاح البوتاني، دراسات ومباحث...، م.س، ص٤٣؛ ارشد حمد محو، م. س. ص٨١؛ عدنان زيان فرحان، الكرد الايزيديون في اقليم كوردستان، م. س، ص٣٣.

[123] عەلی بەگ کوڕی حەسەن بەگ کوڕی چۆلۆ بەگ، میری میرنشینی شێخان بوو، پەیوەندی لەگەڵ میرنشینی بادینان دۆستانە بووە. زۆربەی سەرچاوەکان کە باس لە کوشتاری ئێزدییەکان دەکەن لەلایەن لەشکری میری سۆران، ئاماژە بۆ بەدیلگرتنی عەلی بەگ دەکەن و دەبردرێتە رەواندز و لەسەر هەڵوێستی نەبوونی بە موسڵمان، بە فەرمانی میر محەمەد لەسێدارە دراوە. بەڵام لە دۆکیومێنتی مێژووییدا کە لەم دواییە بڵاوکراوەتەوە، تایبەتە بە نامەی (٣٣) کەس لە سەرۆک هۆز و زانایانی ئاینی و پیاو ماقووڵانی بادینان کە لە (١٢٥٠ک / ١٨٣٤) بۆ سوڵتانی عوسمانی بەرزکراوەتەوە و تیایدا داوای یارمەتی دەکەن بۆ رزگارکردنیان لە (جەورو ستەمی) دەسەڵاتی میری سۆران و گەڕاندنەوەی دەسەڵات بۆ میرانی بادینان، ناو و مۆری عەلی بەگ میری شێخان دووەمین ناوە لە دامێنی نامەکەدا. لێرەدا بەگوێرەی ئەم دۆکیۆمێنتە ئەوە ساخ دەبێتەوە کە عەلی بەگ بەدیل نەگیراوە لەلایەن سوپای سۆران و لە رەواندز لەسێدارە نەدراوە، بەڵکو بەگوێرەی ساڵنامەی موسڵ ساڵی ( ١٣١٢ک / ١٨٩٤ز) محەمەد اینجە بیرقدار والیی

موسڵ هەریەک لە عەلی بەگ و هەندێک ئاغای تری لەساڵی ( ١٢٥٤ک / ١٨٣٨ز) لە (گـریێ عەربـا) کوشـتووە و سـەری براویشـیانی هاویشـتنە رووباری خازر. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە : تەحسێن ئیبراهیم دۆسکی، سێرەیا خەڵکێ بەهدینا ژ ئێرشا میرێ کۆرە د دۆکۆمێنتەکا دیرۆکیدا، گۆڤـاری دیـرۆک، ژمـارە ٧ زسـتانی ٢٠١٥، ل١٣٨. سـەبارەت بەناونـانی (گەلـی عەلـی بەگ)یش بۆ سـەدەی حەڤدەی زاینـی دەگەڕێتەوە، بەنـاوی میری سۆران عەلی بەگ ناونراوە. بڕوانە داماو حسێن حزنی موکریانی، س.پ، ل١٤.

(١٢٤) باعەدرێ: گوندێکی قەزای شێخانە، سەنتەری ئاینی ئێزیدییان و بارەگای سەرۆکایەتی لێ بووە. بڕوانە : جمال بابان، اصـول اسـماء المدن والمواقع العراقية، ج١، ط١ / مطبعة المجمع العلمي الكردي، بغداد، ١٩٧٦، ص٣٣.

(١٢٥) بۆ زانیـاریی زیـاتر بڕوانە : عبدالفتاح علـي يحيى، المـلا يحيى المـزوري وسقوط امارة بادينان، القسم الثالث، ص١٤٩ -١٥٠.

(١٢٦) صديق الدملوجي، م. س، ص ٤١.

(١٢٧) عبدالفتاح علي يحيى، الملا يحيى المزوري وسـقوط امـارة بادينـان، القسـم الاول، م.س، ص١٥٢.

(١٢٨) د. جەلیلی جەلیل، س.پ، ل١٥٢؛ جمال نەبەز، م.س، ص١٣٤ - ١٣٥.

(١٢٩) صـديق الـدملوجي، م.س، ص٤٠؛ انـور المـائي، الاكـراد فـي بهـدينان، ط٣، مطبعة هاوار، دهوك، ٢٠١١، ص٢٢٨؛ ارشد حمد محو، م.س، ص ٨٢-٨٣.

(١٣٠) سەرچاوەکان ژمارەی جیاوازیـان تۆمـارکردووە لەنێوان ٣٠ هەزار تـاکو ٦٠ هەزار جەنگاوەر. بێگومـان زێدەڕۆیی هەیە لەخستنەڕووی ژمارەکـان، بەڵام ئەوە دەسـەلمێنێ کە میـری سـۆران بە سـوپایەکی گەورە هێرشـی کـردۆتە سـەر هەردوو میرنشـینی شـێخان و بادینـان. بـڕوانە: صـديق الدملوجي، م.س، ص٤٠؛ عبدالفتاح علي يحيى، الملا يحيى المزوري وسقوط امارة بادينان القسم الثالث، ص١٥٥؛ ارشد حمد محو، م. س، ص٨٣.

(١٣١) گونـدی کەلەکـی داسـنییان دەکەوێـتە بـاکوری نـاحیەی کەلەکـی ئێسـتا لەسـەر زێـی بادینـان. دانیشـتوانی ئەم گوندە لە سـەرەتاکانی سـەدەی ١٩ ئێزیدی بوون و پاراستنی ڕێگای پەڕینەوە لە زێیان لەئەستۆ بوو خاوەن ئامرازی پەڕینەوە (کەلەک) بوون.. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە : عبدالفتاح علي يحيى، الملا يحيى المزوري و ...، القسم الثالث، ص١٥٠.

(١٣٢) د. سعدي عثمان هروتي، م . س، ص ١٩٤.

(١٣٣) المصدر نفسه، ص١٩٤.

(١٣٤) د. جەلیلی جەلیل، س .پ،ل١٥٣.

(١٣٥) ئەلقوش، مەڵبەندی شارەدێیەکە (ناحیة) بەهەمان ناو. دەوروبەری ٥٠کم کەوتۆتە باکوری ڕۆژهەڵاتی شاری موسڵ، سەر بەقەزای تلکیفە، لە چوارچێوەی جوگرافیای بادینانـدایە، هەر لەکۆنەوە مەڵبەنـدێکی ئاینی کریستیانەکانی ناوچەکە بووە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە : جمال بابان، م.س، ص ٢٢؛ د. عبدالفتاح علي البوتاني، دراسات ومباحث ...، م.س، ص٤٤.

(١٣٦) داماو حسێن حزنی موکریانی، س.پ، ل١٠٨.

(١٣٧) د.عبدالفتاح علي البوتاني، دراسات ومباحث ...، م.س، ص٣٩.

(١٣٨) المصدر نفسه، ص٤٨.

(١٣٩) بابا جبرائیل دنبو سەرۆک دێری ربان هرمزد، لە ١٧٧٥ لە ماردین لەدایک بووە. ئارەزووی لە ژیانی ڕەهبانییەت بووە، چۆتە ڕۆما و کۆمەڵگەی کەنیسەکان و پاپا پەسندیان کردووە. لە ١٢ی ئادار ١٨٣٢ گەڕاوەتەوە ئەلقوش و لە ١٥ی ئادار کوژراوە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د.عماد عبدالسلام رؤوف، بعض الوقائع من تاريخ كردستان، م. س، ص ٣٩٨؛ د. عبدالفتاح علي البوتاني، دراسات ومباحث ...، م. س، ص٥٤.

(١٤٠) المصدر نفسه، ص٣٩.

(١٤١) هەردوو دەستنووسە سریانییەکە لەلایەن دوو پیاوی ئاینی کریستیان نووسراون، یەکەمیان باوکە دمیانوس حەنا کونـدیرا (١٨٠٣ – ١٨٥٨) بەناونیشانی (مەرسییەی کردەوەکانی شمشێر لە ئەلقوش ساڵی ١٨٣٢) بەزمانی کلدانی نووسیویەتی، بریتییە لە قەسیدەیەکی دووروودرێژ لەژێر کاریگەری هەست و سۆزی ئاینی نووسراوە. نووسەر خۆی شایەدحاڵی کۆمەڵکوژییەکەی ئەلقوشە و یەکسەر لەدوای ڕووداوەکە تۆماری کردووە.

دەستنووسی دووەم لەلایەن قەشە یوسف هورمز عبیا ئەلقوشی (١٨٨٠ – ١٩٦٥) لە ساڵی ١٩٣٢ بەزمانی باوی سریانی لە بیرەوەری سەد ساڵەی ڕووداوەکە نووسراوە. بۆ دەقی هەردوو دەستنووسەکە بڕوانە : د. عبدالفتاح علي البوتاني، دراسات ومباحث ...، م.س، ص٤٧ – ٥١؛ داود مراد الختاري، م.س، ص ١٦٨ – ١٧٤.

(١٤٢) لەو هۆکارانەی لە دووەمین دەستنووسە سریانییەکە ئاماژەیان بۆ کراوە، عەلی بەگ داسنی چۆتە ناو ئەلقوشییەکان و داوای یارمەتی خەڵکەکەی کردووە بۆ شەڕکردن دژی میری سۆران، ئەلقوشییەکان

لەسـەر داوای میـری بادینـان ئامـادەبوون بـۆ یارمەتیـدانی عەلـی بەگـی داسنی، کە سوپای سۆران هێرشـی کـردۆتە سـەر گوندی ئەلقوش عەلـی بەگ میـری ئێزیـدییان خـۆی و لایەنگرانـی رایـانکردووە. مەلا یەحیـای مـزووریش کە بەمەی زانیـوە تـوورەیی و تونـدوتیژی دایگرتـووە و داوا و تکای لە میری رەواندزی کردووە تاکو تۆڵە لە کریسـتیانەکانی ئەلقوش بکـاتەوە و هەموویـان لەنـاو ببـات و ژنە جوانەکـان و مـاڵ و سامانیشـیان بەتاڵان ببات. بڕوانە: داود مراد الختاري، م. س، ص ۱۷٥؛ د.عبدالفتاح علي البوتاني، م. س، ص٥٢.

[١٤٣] د. عبدالفتاح علي البوتاني، م.ن، ص٥٢.

[١٤٤] مەتران یوسف ئۆدۆ لە ساڵی ۱۷۹۰ لە ئەلقوش لەدایک بووە لە ۱۸۰۹ چۆتە ریزی رەبەنەکانی دێی هرمزد، لە ۱۸۱۸ بۆتە کاهن و ئوسقوف لە موسـڵ دواتـر بـۆتە مەترانـی ئامێـدی لە ۱۸۷۸ لە موسـڵ کـۆچی دوایـی کـردووە. بـڕوانە: د. عمـاد عبدالسـلام رؤوف، بعـض الوقـائع مـن تـاريخ كوردستان، م.س، ص ۳۹۸.

[١٤٥] داماو حسێن حوزنی موکریانی، س.پ، ل۱۰۸.

[١٤٦] بـۆ زانینـی نـاوی ئەو کەسـایەتییانەی نامەکەیـان مـۆرکردووە، بـڕوانە : تەحسێن ئیبراهیم دۆسکی، س.پ، ل۱۳۷ – ۱۳۹ ؛ هەورەها بڕوانە: سـنان هاکان، س.پ، ل٨٥.

[١٤٧] تەحسێن ئیبراهیم دۆسکی، س .پ، ل۱۳٦

[١٤٨] هەمان سەرچاوە، ل۱۳٦ – ۱۳۷.

[١٤٩] هەمان سەرچاوە، ل۱۳۷.

[١٥٠] جمال نەبەز، م.س، ص١٦٠

[١٥١] المصدر نفسه، ص١٦٠.

[١٥٢] المصدر نفسه، ص١٦٠.

# ملخص البحث
## شخصية الامير محمد الرواندزي
## ومظاهر العنف في ممارساته السياسية
## ( ١٧٨٤- ١٨٣٧)

يتناول هذا البحث شخصية تاريخية مثيرة للجدل الا وهي شخصية الامير السوراني محمد الرواندزي الملقب تاريخيا بـ (الباشا الاعور) أو (الأمير الاعور) لخلل في احدى عينيه، المولود في مدينة راوندز سنه ١٧٨٤ والمتوفي اغتيالا من قبل السلطات العثمانية في مدينة سيواس التركية عام ١٨٣٧.

تكمن اهميه هذا الموضوع، لما يحتله الامير الرواندزي مكانة خاصة في تاريخ الكورد الحديث، حيث استقل بالإمارة السورانية لمدة تزيد عن عشر سنوات، وقام خلالها باصلاحات وتوسع في رقعة امارته خلال النصف الاول من القرن التاسع عشر.

دخلت الامارة السورانية في عهد الامير محمد مرحلة جديدة من تاريخها الطويل، وفي الوقت نفسه تنتهي الامارة ككيان إماراتى مستقل باستسلام الامير محمد للسلطات العثمانية في نهايه آب ١٨٣٦.

كان الامير محمد ذي شخصية متعددة الابعاد، فهو محب للعلم والدراسة والاعمار والاصلاحات، يصغي الى رجال الدين ويلتزم بفتاواهم، يعمل في سبيل حرية الامارة ومن أجل قيام كيان كوردي مستقل. كان صارما في محاسبة أقرب اقربائه المتآمرين على سلطات ابيه وسلطاته.

لقد اعتمد الشريعة الاسلامية في محاسبة اللصوص وقاطعي الطرق، لذا كان الامن مستتبا في امارته وانتعشت على اثره الحالة الاقتصادية.

واثناء توسعات الامير محمد باتجاه امارة بادينان وشيخان، استعمل العنف الشديد تجاه الايزيديين والمسيحيين حيث قتل منهم اعدادا كثيرة ولكن بعد صدور الفتوى من قبل مفتي الامارة . وهناک أسباب اخرى لا علاقة لها بالدين، منها تاريخية وسياسية واقتصادية، كما تذكر المصادر.

# Abstracts

**The Character of Mir Muhammad Al-Rawanduzi and the Violence Phenomena in his Political Practices (1784-1837)**

This thesis tackles the character of a controversial historical figure, that is, Mir Muhammad Al-Rawanduzi (1784-1837) who is also nicknamed (Pashay Kora, Kurdish for The Blind King, or the Blind Prince), born in the town of Rawanduz in 1784; finally, he was assassinated by the Ottoman authorities in the Turkish City of Sewas in 1837 .

The significance of this study lies in the position and value of Mir Muhammad Pasha Al-Rawanduzi as a notable modern Kurdish historical figure, who led the Soran Emirate for over ten years. During his reign, Mir Muhammad conducted unprecedented reforms and improvements in the first half of the nineteenth century .

Furthermore, during the reign of Mir Muhammad Pasha Al-Rawanduzi, Soran Emirate entered into a new stage of its long history. However, as an entity, the Emirate ended when Mir Muhammad Pasha surrendered himself to the Ottoman authorities in August 1836 .

Mir Muhammad Pasha was of a multi-dimensional character. He loved the pursuit of knowledge and education; he wanted to build and re-build his Emirate; he called for reforms; he listened to the Muslim Scholars (Mullas) and abode by their judgements (Fatwa); he was worked for the cause of his Emirate as well as for creating an independent Kurdish entity. Yet, he was decisive and tough in punishing even the closest of his kin if they ever plotted against his reign or the reign of his father. In his punishments, Mir Muhammad Pasha depended on Islamic Sharia for punishing the thieves and highwaymen; therefore, there was security and stability across his Emirate which led to a developed economy .

During the expansions of the Soran Emirate towards Badinan Emirate and Shekhan. Mir Muhammad practiced utmost violence and killed a large number of Yezidis and the Christians but only after he allowed doing so through the Fatwa (Sharia Authorization), that is, judgements by the Islamic Scholars of the Emirate. And there are many reasons which there haven't any relation with religion , like History, Politic and Economic. according to the historical sources.

# کاریگەریی بڕیارەکانی "ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش" لە عێراق لەسەر بارودۆخی ئابووریی کوردستان

## لەماوەی نێوان ساڵانی (١٩٨٠- ١٩٨٨)دا

**م. ی.نەجمەددین عەبدوڵلا ئیسماعیل**
بەشی مێژوو- کۆلێژی ئەدەبیات-
زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر

**م. ی. ئیسماعیل عەبدوڵلا ئیسماعیل**
بەشی مێژوو- کۆلێژی ئەدەبیات-
زانکۆی سەلاحەددین - هەولێر

**پێشەکی**

ئابووری یەکێکە لە کۆڵەکە سەرەکییەکانی کۆمەڵگە، هەروەها بە سەرچاوەیەکی بنەڕەتی دادەنرێت لەژیانی مرۆڤدا، چونکە پەیوەندییەکی بەرفراوانی ئابووری بەژیانی تاک و کۆمەڵگاکان و باڵادەستیی یاسا و بڕیارەکان بەسەر سەرجەم پەیوەندییە تاکەکەسی و کۆمەڵایەتییەکانەوە هەیە. هەر گۆڕانکارییەکیش لە کەرتە ئابوورییەکان ڕوودات ڕاستەوخۆ کاردەکاتە سەر بوارەکانی تری کۆمەڵگە و ئامادەی دەکات بۆ گۆڕانکاری، بۆیە توێژینەوە لەسەر بارودۆخی ئابووریی هەر ناوچەیەک وابەستەیە بەدیارخستنی ئەو گۆڕانکارییانەی کە ئەو کۆمەڵگایە بەخۆیەوەی بینیوە.

کاریگەری بڕیارەکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە عێراق لەسەر بارودۆخی ئابووریی کوردستان کە مەبەستمان پارێزگاکانی هەولێر و سلێمانی و دهۆکە لە نێوان ساڵانی ١٩٨٠-١٩٨٨، تایبەتە بە ماوەیەکی گرینگ لە مێژووی نوێ و هاوچەرخی عێراق و کوردستان، کە پڕە لە ڕووداوی سیاسی و بایەخدار لەوانە هەڵگیرسانی شەڕی هەشت ساڵەی نێوان عێراق و ئێران کە لە ٢٢ی ئەیلوولی١٩٨٠ تاکو ٨ی ئابی ١٩٨٨ بەردەوام بوو، جگە لەوەی حکومەتی عێراق بەدەرکردنی چەند بڕیارێک لەلایەن ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش کە خودی سەددام حوسێن سەرۆک کۆماری عێراق ئەمینداریەتی دەکرد، هەوڵەکانی بۆ گۆڕینی دیمۆگرافیای کوردستان و شار و

شارۆچکەکانی تێدا دارِشتبوو، هەروەها هێرش و پەلامارەکان و سیاسەتی ڕاگواستن و شالآوی ئەنفال و کوشتن و بێسەروشوێنکردنی گەلی کورد، جگە لەمانە تالآن و سووتان و خاپوورکردنی لادێیەکانی کوردستانیشی بەدوای خۆیدا هێنا، کە یەکێک لە ئامانجە سەرەکییەکانیان بریتی بوو لە نەهێشتنی سەرچاوە ئابوورییەکانی کوردستان هاتەدی. هاوکات ئەو سیاسەتەی حکومەت بەرامبەر بەگەلی کورد لە باشووری کوردستان سنووری هەموو ناوچەکانی کوردستانی گرتەوە، ئەم ڕووداوانەش ڕاستەوخۆ کاریگەرییان لەسەر ڕەوشی ئابووری کوردستان بەدیارکەوت.

نووسین و وردبوونەوە و هەڵسەنگاندن و شیکردنەوەی کاریگەری بڕیارەکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە عێراق لەسەر ڕەوشی ئابووری کوردستان لە ڕوانگەی بایەخی ئەو ماوە مێژووییەدا کارێکی ئاسان نییە، بەڵام گرینگیدان بەتوێژینەوە لە مێژووی ئابووری لە فەرهەنگ و ئەدەبیات و کتێبخانەی کوردیدا پێویستییەکی مێژووییە بۆ پڕکردنەوەی کەلێنێکی گەورە لە مێژووی ئابووری کوردستان و خزمەتکردنە بەو قوتابی و توێژەرانەی لەم بوارەدا کاردەکەن، سەرەڕای ئەوەی فاکتەرێکی گرنگە بۆ تێگەیشتن و بەدیارخستنی بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتیی ناوچەکە.

بایەخی توێژینەوە بریتییە لە بەدیارخستنی بارودۆخی ئابووری کوردستان لەسایەی بڕیارەکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە عێراق، تیایدا گشت کەرتە ئابوورییەکان بەپێی ئەو زانیاری و داتایانەی کە لەبەردەستدان خراوەتە ڕوو. ئەمەش بەپێی ڕووداوە مێژووییەکان باس لە کاریگەری بڕیارەکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لەسەر هەڵکشان و داکشانی کەرتەکانی کشتوکاڵ و پیشەسازی و بازرگانی و گەشتوگوزار لە پارێزگاکانی هەولێر و سلێمانی و دهۆکدا کراوە.

لەم توێژینەوەیەدا هەوڵماندراوە کاریگەری بڕیارەکانی ئەنجومەنی شۆڕش لە عێراق لەسەر بارودۆخی کوردستان لەماوەی نێوان ساڵانی (١٩٨٠-١٩٨٨)، لەگەڵ کاریگەری بنەما سروشتی و مرۆییەکان و هۆکارە سیاسییەکان لەسەر کەرتە ئابوورییەکانی کوردستان بخەینە ڕوو. هەروەها

لە توێژینەوەکەماندا میتۆدی خستنەڕوو و شیکردنەوە، واتە خستنەڕووی بڕیارەکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش و پاشان شیکردنەوەی ئەم بڕیارانە و کاریگەرییان لەسەر بارودۆخی کوردستاندا پەیڕەو کراوە.

لە ئاستەنگەکانی ئەو توێژینەوەیە: کەمی و پەرش و بڵاوی زانیاری و داتای دروست لەسەر کەرتە ئابوورییەکانی کوردستان لە ڕوانگەی بایەخی مێژووی ئابووری کوردستان. ئەو زانیاری و داتایانەی کە بەردەست کەوتوون زیاتر لە ڕێگای بڵاوکراوە حکومی و حزبییەکان و توێژینەوەکاندا بووە.

ناوەڕۆکی توێژینەوەکە : لە پێشەکییەک و سێ تەوەری سەرەکی و ئەنجامی توێژینەوەکە پێکدێت. هەریەک لە تەوەرەکانیش چەندین بابەتیان لە خۆوە گرتووە. لە تەوەری یەکەمدا : باس لە کاریگەری بڕیارەکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە عێراق لەسەر کەرتی کشتوکاڵ لە کوردستان کراوە.

تەوەری دووەم : لەم تەوەرەدا باسکراوە لە کاریگەری بڕیارەکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە عێراق لەسەر کەرتی پیشەسازی لە کوردستان، لەو ماوەیەدا ئەم کەرتە بەپێی بارودۆخی سیاسی و لەژێر کاریگەری ئەو بڕیارانەی کە ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لەعێراق بۆ ناوچەکانی عێراق و کوردستان دەریکردبوو بەپێی هەلومەرجە سیاسییەکان هەڵکشان و داکشانی بەخۆیەوە بینیوە. تەوەری سێیەمی توێژینەوەکە پۆلینکراوە بۆ سەر دوو لق. لەپێشدا جەخت کراوەتەوە لەسەر کاریگەری بڕیارەکانی ئەنجومەنی شۆڕش لەسەر کەرتی بازرگانی، هەروەها باس لە پرۆسەی بازرگانی و گواستنەوە لە ڕووی هاوردەکردن و هەناردەکردنی کەلوپەل و پێداویستی ناوچەکە کراوە، دواتریش تیشک خراوەتە سەر کاریگەری بڕیارەکان لەسەر کەرتی گەشتوگوزار لە کوردستان، تێدا ئەو بڕیارانەی خراوەتە ڕوو کە کاریگەرییان لەسەر دواکەوتن یان گەشەکردن و پەرەپێدانی کەرتی گەشتیاری لە پارێزگاکانی هەولێر و سلێمانی و دهۆکدا هەبووە. لە کۆتایی توێژینەوەکەدا، گەیشتوونەتە چەند دەرئەنجامێک کە لە چەند خاڵێکدا ئاماژەیان پێکراوە.

## تەوەری یەکەم :

## کاریگەریی بڕیارەکانی "ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش" لە عێراق لەسەر کەرتی کشتوکاڵی لە کوردستان لەماوەی ساڵانی (١٩٨٠-١٩٨٨)دا

لەو ماوەیەدا بارودۆخی ئابووری عێراق و کوردستان لە ژێر کاریگەریی بارودۆخی سیاسیی وڵاتدا بەردەوام لە گۆڕان دابوو بەشێوەیەک بارودۆخی سیاسیی عێراق ناسەقامگیر بوو[١]، ئەویش بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی ڕێکەوتننامەی جەزائیر لەلایەن حکومەتی عێراق لە ١٧ی ئەیلوولی ١٩٨٠ [٢]، لەئەنجامدا شەڕلە نێوان عێراق و ئێران بۆ ماوەی هەشت ساڵ بەردەوام بوو [٣]، بەهۆی ئەو شەڕەوە حکومەتی عێراق داهاتێکی زۆری دەوڵەتی خستە خزمەتی بواری سەربازی کە لە ساڵی ١٩٨٠-١٩٨٣ نزیکەی (١٩,٨) بلیۆن دۆلار بوو، بەلام ساڵی ١٩٨٤- ١٩٨٦ بەرزبۆوە بۆ (٢٥,٩) بلیۆن دۆلار واتە بەرێژەی (٣٠.٨٠%) زیادیکردووە کەچی لە ١٩٨٧-١٩٨٨ بەرێژەی (٤٠,١١%) زیادیکردووە[٤].

سەرەڕای کاریگەریی شەڕی عێراق و ئێران لەسەر بارودۆخی ئابووری عێراق و کوردستان، بەلام بڕیارەکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە عێراق[٥]، کاریگەری ڕاستەوخۆیان کردۆتە سەر چالاکی کشتوکاڵی لە عێراق بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی[٦]، هەر چەندە ئەم کەرتە بەگەورەترین کەرتی ئابووری عێراق دادەنرا، و نزیکەی (٤٠%) ی بەرهەمی نیشتمانی پێکدەهێنا، هەروەها لە کوردستانیش بەیەکەمین چالاکی لەڕووی دابینکردنی هەلی کار بۆ ژمارەیەکی زۆری کرێکار دادەنرا [٧]، چونکە لەو ماوە مێژووییەدا چالاکی کشتوکاڵی لە کوردستان سەرچاوەیەکی گرنگ بوو بۆ بەدەستهێنانی داهات لەلایەن دانیشتوانی گوندنشینی سنووری قەزا و ناحیەکانی کوردستان، سەرەڕای ئەوەی کە هەرێمی کوردستان خاوەن هێزی کار و ڕێگاوبان بوو[٨]، لەهەمان کاتدا خاوەن بنەما

سروشتییەکانیش بوو کە خۆی لە بوونی ڕووبەرێکی گەورەی زەویی شیاوی کشتوکاڵی دەبینێتەوە[٩].

هەرێمی کوردستان بەهۆی شوێنە جوگرافییەکەی کە دەکەوێتە نێوان دوو بازنەی پانی ( ٥٧،٣٧،٢٢) باکوور و دوو هێڵی درێژی (٤١,٠٨، ٤٦) ی ڕۆژهەلات[١٠]، بەو پێگەیە بێت دەکەوێتە ناوچەی نیمچە خولگەی باکوور، وە تاکە ناوچەیە لە عێراقدا کە خاوەنی ئاووهەوایەکی شێدار و نیمچە شێدار بێت. جگە لەمەش هەرێمی کوردستان دەوڵەمەندە بەسامانی ئاوی سەر زەوی و ژێر زەوی، بڕی ئاوی سەر زەوی نزیکەی (٤٧) بلیۆن و(٣٠٠) ملیۆن (م٣)یە کە دەکاتە (٩٤,٤%)ی سەرجەم دەرامەتی ئاوی هەرێم، وە بڕی ئاوی ژێری زەویش بە (٣) ملیار (م٣) مەزەندە دەکرێت کە دەکاتە (٥,٩٦% ) ی سەرجەم دەرامەتی ئاوی هەرێم[١١]، ئەمەش نەک تەنها لەڕووی چەندێتییەوە بەڵکو لەڕووی چۆنایەتیشەوە[١٢]. کوردستان بەهۆی بەپیتی خاکەکەی بەشی زۆری زەوییەکەی بۆ مەبەستی کشتوکاڵ بەکارهاتووە[١٣]، جگە لەمانە کوردستان خاوەن چەندین دەشتی بەپیت و فراوانە کە دەکرێ ببنە مەڵبەندێک بۆ بەرهەمهێنانی بڕێکی زۆری بەروبوومی کشتوکاڵی [١٤]، ڕووبەری ئەو زەوییانەی کە بۆ داچاندن سوودیان لێ وەرگیراوە بەشێوەیەکی گشتی دابەشکراون بۆ سەر چەند جۆرێک ئەوانیش بریتین لە خاکی بەروبوومی زستانە و هاوینە[١٥].

سەرەڕای هەموو ئەو بنەما سروشتی و مرۆییانەی کە لە کوردستاندا هەبوون، بەڵام بەهۆی دەرکردنی هەندێک بڕیار لەلایەن ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە عێراق لەماوەی ١٩٨٠-١٩٨٨ کەرتی کشتوکاڵ لە پارێزگاکانی هەولێر و سلێمانی و دهۆک هەڵکشان و داکشانیان بەخۆیانەوە بینیوە [١٦]، هەروەک لە خشتەی ژمارە (١) دەردەکەوێت.

**خشتەی ژمارە (١)**

**ڕووبەری چێندراوی زستانە لەوانە (گەنم و جۆ ) لە پارێزگاکانی هەولێر و سلێمانی و دهۆک لە ساڵانی ١٩٨٠-١٩٨٨[١٧].**

| ساڵ | پاریزگا | ڕووبەری چێندراوی زەوی بۆ بەرهەمی گەنم / دۆنم | بەرهەم (تۆن) | ڕووبەری چێندراوی زەوی بۆ بەرهەمی جۆ/ دۆنم | بەرهەم (تۆن) |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٨٠ | هەولێر | ٩٨٤٤٠٠ | ٩٠٧٥٠٠ | ٦٩٢٠٠ | ٤١٨٠٠ |
| | سلێمانی | ٦٥٢٨٠٠ | ٨٠٧٠٠ | ٦٨٩٩٠ | ٤٨٠٠٠ |
| | دهۆک | ٣٣٦٩٠ | ٧٠٧٠٠ | ٦١٥٠٠ | ٢٦١٠٠ |
| ١٩٨١ | هەولێر | ٦٥٢٩٠٠ | ٨٨١٠٠ | ٢١١٠٠ | ١٨٨٠٠ |
| | سلێمانی | ٢٢٣٠٠ | ١١٦٨٠ | ١٨٥٠٠ | ١٣٤٠٠ |
| | دهۆک | ١٣٦٠٠ | ٤٢٤٠٠ | ١١٤٠٠ | ١١٦٠٠ |
| ١٩٨٢ | هەولێر | ٦٠٢١٠٠ | ٧٩٦٠٠ | ٢٠٢١٠٠ | ٨٧٥٠٠ |
| | سلێمانی | ٢١٥٠٠٠ | ١١٥٤٠ | ١٦٦٠٠ | ٤٥٧٠٠ |
| | دهۆک | ١١٣٥٠ | ٣٤٣٠٠ | ١٠١٠٠ | ٧٦٠٠ |
| ١٩٨٣ | هەولێر | ٧٢٣٢٠٠ | ٨١١٠٠ | ٤١٦٤٠ | ٦٦٩٠٠ |
| | سلێمانی | ٤٦٤٩٠٠ | ١٢٨٢٠ | ٣٩٨٠٠ | ٥٥٣٠٠ |
| | دهۆک | ٢٠١٨٠٠ | ٦٣٧٠٠ | ٤١١٠٠ | ١١١٠٠ |
| ١٩٨٤ | هەولێر | ٧٣١٢٠٠ | ٨١٩٠٠ | ٤١٦٤٠ | ٦٧٦٠٠ |
| | سلێمانی | ٥١١٠٠٠ | ١٢٩٠٠ | ٣٩٨٦٠ | ٥٦١٠٠ |
| | دهۆک | ٢٤٣٤٠٠ | ٦٣٨٠٠ | ٤١١٠٠ | ١١١٠٠ |
| ١٩٨٥ | هەولێر | ٧٤١٨٠٤ | ٧٤٩٩٤ | ٤١٩١٠٠ | ٦٨٦٠٠ |
| | سلێمانی | ٥٤٢٧٠٩ | ١٠٥٧٢ | ٣٩٨٦٠ | ٥٦٨٠٠ |
| | دهۆک | ٢٤٤٥٢٠ | ٦٣٨٩٤ | ٤٢١٠٠ | ١١١٨٠ |
| ١٩٨٦ | هەولێر | ٦٣٤٥٠٠ | ١٢١٢٠٠ | ٢٧٨١٠٠ | ١٨٩٠٠ |
| | سلێمانی | ١٢١٣٠٠ | ١٠٧٦٠٠ | ١٥٤٦٠٠ | ٥٦٩٠٠ |
| | دهۆک | ١٢٩٩٠٠ | ١٠١٠٠٠ | ٦٥٤٠ | ١١٢٠٠ |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٨٧ | هەولێر<br>سلێمانی<br>دهۆک | ٥١٢٦٠٠<br>١١٠٢٠٠<br>٩٧٩٣٠٠ | ٦٦١٠٠<br>٦٠٨٠٠<br>١٦٦٧٠ | ٢٦٥٦٠٠<br>٤٣١٠٠<br>٢٥٨٠ | ١٧٧٠٠<br>٤٦٩٨<br>٩٠٠٠ |
| ١٩٨٨ | هەولێر<br>سلێمانی<br>دهۆک | ٣٨١٠٠٠<br>١٥٤٠٠<br>٩١٤٦٦٠ | ٦١٢٠٠<br>٥٠٠٠٠<br>٥٠٤٠ | ١٩٧٢٠٠<br>١٧٧٠٠<br>١٥٠٠ | ١١٩٠٠<br>٣٧٠٠<br>٢١٠٠ |

**خشتەی ژمارە (٢)**
**ڕووبەری چێندراوی زەوی کشتوکاڵی هاوینە ( بەرهەمی برنج) لە پارێزگاکانی هەولێر و سلێمانی و دهۆک بۆ ساڵانی ١٩٨١-١٩٨٨[١٨].**

| ساڵ | پارێزگا | ڕووبەری چێندراوی زەوی بۆ بەرهەمی برنج / دۆنم | بەرهەم (تۆن) |
|---|---|---|---|
| ١٩٨٠ | هەولێر<br>سلێمانی<br>دهۆک | ١٥٠٠<br>٣٠٠٠<br>٣٤٠٠ | ٦٥٠<br>١٨٠٠<br>٢٠٠٠ |
| ١٩٨١ | هەولێر<br>سلێمانی<br>دهۆک | ٩٠٠<br>٢٤٠٠<br>٣١٠٠ | ٤٨٠<br>١٦٠٠<br>١٧٠٠ |
| ١٩٨٢ | هەولێر<br>سلێمانی<br>دهۆک | ٧٩٠<br>٢٣٠٠<br>٣٠٤٠ | ٢٥٥<br>١٧٠٠<br>١٦٦٠ |
| ١٩٨٣ | هەولێر<br>سلێمانی<br>دهۆک | ٨٤٠<br>٣٧٠٠<br>٣٧٥٠ | ٥٠٠<br>٢٦٠٠<br>٢٦١٠ |
| ١٩٨٤ | هەولێر<br>سلێمانی<br>دهۆک | ٨٥٠<br>٣٨٥٠<br>٣٧٥٠ | ٥٠١<br>٢٦٦٠<br>٢٦٤٢ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٩٨٥ | هەولێر<br>سلێمانی<br>دهۆک | ٨٥٣<br>٣٨٥١<br>٣٧٥٤ | ٥٣٠<br>٢٦٦٥<br>٢٦٥٠ |
| ١٩٨٦ | هەولێر<br>سلێمانی<br>دهۆک | ٩٥٣<br>٣٨٥١<br>٣٨٤٢ | ٦٠٠<br>٢٨٠٠<br>٢٦٤٣ |
| ١٩٨٧ | هەولێر<br>سلێمانی<br>دهۆک | ٣٠٠<br>٢٠٠<br>٤٠٠ | ١٢٥<br>١٠٠<br>١٤٠ |
| ١٩٨٨ | هەولێر<br>سلێمانی<br>دهۆک | ٨٨<br>١٠٠<br>١٥٠ | ٥٠<br>١٠٠<br>١١٠ |

ئەگەر سەرنج بدەینە خشتەی ژمارە (١، ٢) بۆمان دەردەکەوێت کە تێکڕای ڕووبەری زەوی چێندراوی بۆ بەرهەمی گەنم و جۆ و برنج لە کوردستان لەساڵی ١٩٨٠ بەرزترین ئاستی تۆمارکردووە، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆکاریگەری بڕیاری ژمارە (١٣٣) ی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە عێراق کە لە ١٠ ی تەمووزی ١٩٨٠ دەرچووە، تیایدا ئەنجومەنی سەرکردایەتی وەزارەتی کشتوکاڵ و چاکسازی کشتوکاڵی ڕاسپارد بۆ ئەنجامدانی چاکسازی کشتوکاڵی وهاوکاریکردنی جووتیاران و قەرەبووکردنەوەی خاوەن زەوییە کشتوکاڵییەکان و پێدانی قەرز بە جووتیاران لە ڕێگەی بانکی هاریکاری کشتوکاڵی بەپێی ئەو بەرنامە و نەخشەیەی کە بۆ بەرەوپێشبردنی بارودۆخی ئابووری عێراق داڕێژرابوو[١٩]، پشکی هەرێمی کوردستان لە قەرزی کشتوکاڵی بریتی بوو لە (١٠,٧٢%) لە کۆی پارێزگاکانی عێراق[٢٠].

شایانی باسە سەرجەمی ڕووبەری چێندراوی زەوی بۆ بەرهەمی کشتوکاڵی لە کوردستان تا ٢٢ی ئەیلوولی ١٩٨٠ لە ئاستێکی باشدا

بوو، بەڵام لەدوای ئەو ماوەیە بەهۆی ئەوەی ئەنجومەنی سەركردایەتی شۆڕش لە عێراق بەئەمینداریەتی سەددام حوسێن لە كۆبوونەوەی ئەنجومەنی سەركردایەتی شۆڕش بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی ڕێكەوتننامەی جەزائیریان دا [٢١]، ئیتر بارودۆخی عێراق و كوردستان لە گشت بوارەكاندا بەتایبەتی لە بواری ئابووری بەرەو سستی و دواكەوتن چوو [٢٢]، چونكە بەهۆی هێرشەكانی ئێران بۆ سەر خاكی عێراق و كوردستان زۆربەی دامەزراوە ئابووری و ناوچەكانی بەرهەمهێنانی تووشی زیانێكی گەورەی گیانی و ئابووری هاتن[٢٣]. جگە لەوەی پرۆسەی سەربازگیری جووتیاران كرانە سەرباز، هەروەها دیاردەی بەكرێگیراوەكان (جاشایەتی ) كە زۆربەی خەڵكی جووتیار و باغەزان و شوانكارەكان بوون بە جاش[٢٤]. لەماوەی نێوان ساڵانی ١٩٨٠-١٩٨٨ ئەنجومەنی سەركردایەتی شۆڕش، چەند بڕیارێكی دەركرد ڕاستەوخۆ كاریگەرییان لەسەر چالاكییەكانی كەرتی كشتوكاڵی لەكوردستاندا هەبوو، لەئەنجامی ئەو بڕیارانە تا ساڵی ١٩٨٨ تەنها گوندێكیش نەما لە كوردستان كە ژیانی ئاسایی دانیشتوانەكەی تیادا بگوزەرێت، بەڵكو گشتیان ڕووخێندران و هەزاران زەوی كشتوكاڵیش سووتێندران یان لە جووتیاران قەدەغەكران كە بەرهەمەكانیان بدوورنەوە [٢٥].

ئیتر دوای دەستپێكردنی شەڕی نێوان عێراق و ئێران فاكتەری سەرەكی تێكچوون و شڵەژانی ڕەوشی ئابووری كوردستان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سیاسەتانەی كە حكومەتی عێراق بەرامبەر بەناوچە كوردییەكان پەیڕەوی دەكرد، ئەو سیاسەتانەش خۆی لە سڕینەوەی ناسنامەی نەتەوەیی كورد و لەناوبردنی ژێرخان و سەرخانی ئابووری كوردستان دەبینییەوە، بەتایبەتی پیادەكردنی سیاسەتی ڕاگواستن و بەعەرەبكردنی ناوچە كوردییەكان و دەستگرتن بەسەر ڕووبەرێكی فراوان لە زەوییە كشتوكاڵییەكانی كوردستان لەڕێگەی كڕینەوەی زەوییە كشتوكاڵییەكان لە جووتیارانی كورد دەستی پێكرد،

جێبەجێکردنی ئەم سیاسەتانەش لەڕێگەی دەرکردنی چەند بڕیارێک بوو کە لەلایەن ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لەعێراق دەرچوو، یەکێک لەو بڕیارانە بریتی بوو لە بڕیاری ژمارە (٤٨٩)ی کە لە ١١ی نیسانی ١٩٨١ دەرچوو، بەپێی ئەو بڕیارە حکومەت هەڵسا بەکرێنەوەی خاوەنداریەتی زەویـیە کشتوکاڵییەکان لە جووتیارانی کورد و دابەشکردنیان بەسەر ئاوارە نیشتەجێبووە عەرەبەکانی ناوچەکانی کوردستان [٢٦]. پاشان لە ١٦ی ئایاری ١٩٨١ بەبڕیاری ژمارە (٤) سەندیکای هاوبەشی جووتیارانی هەڵوەشێندرایەوە[٢٧]، هەروەها دەرکردنی بڕیاری ژمارە (١٣٩١)ی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش، کاریگەری نەرێنی کردە سەر ئابووری کوردستان، چونکە لەئەنجامی دەرکردنی ئەو بڕیارە ژمارەیەکی زۆر لەدەستی کار بە فەرمانبەر لە دام و دەزگاکانی حکومەت دامەزران [٢٨] سەربارى ئەمە حکومەت بەبڕیاری ژمارە (١٣٩١) ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە ٢٠ی تشرینی یەکەم ١٩٨١ دەستیکرد بەهەڵمەتێکی فراوان بۆ ڕاگواستنی دانیشتوانی چەند گوندێک لە باشووری کوردستان بۆ شارەکانی ناوەڕاست و باشووری عێراق جگە لە پارێزگاکانی (بەغدا و دیالە و سەلاحەدین )، بۆ ئەو مەبەستە لیژنەیەکی بۆ سەرپەرشتی کردنی دروستکردنی خانوو و کۆمەڵگا بۆ کوردە ڕاگواستراوەکان پێکهێنا [٢٩].

دەبێ بووترێ هەرچەندە حکومەتی عێراقی لە دوای بەستنی کۆنگرەی نۆیەمی پارتی بەعسی عەرەبی سۆسیالیستی لە حوزەیرانی ١٩٨٢، بڕیاری بەرەوپێشبردنی کەرتی کشتوکاڵی لە عێراق دا [٣٠]، بەڵام ئەم هەوڵانەی حکومەت بۆ بەرەوپێشبردنی کەرتی کشتوکاڵی لە کوردستاندا تەواو پێچەوانەی ئامانجەکانی بووە، چونکە لەماوەی ساڵانی ١٩٨٢-١٩٨٨ ڕووبەری چێندراوی زەوی و بەرهەمە کشتوکاڵییەکان لە کوردستان بەئاستێکی زۆر کەمبۆوە، ئەمەش بەهۆی ئەو سیاسەتە خراپانەوە بوو کە حکومەت بەرامبەر بە دانیشتوانی کوردستان پەیڕەوی دەکرد، کە خۆی لە شاڵاوی ڕاگواستن و

بەعەرەبکردن[٣١] و خاپووركردنی گوندەكان[٣٢] و پرۆسەی ئەنفاڵ و كیمیاباران دەبینییەوە، جگە لەوەی كە حكومەت هەوڵەكانی چڕ كردبۆوە بۆ لەناوبردنی شۆڕشی كورد و خاپووركردنی گوندە سنوورییەكانی كوردستان، لەو میانەدا لە ساڵی ١٩٨٢-١٩٨٤ ڕێكەوتننامەیەكی ئاسایش و پاراستنی لەگەڵ وڵاتی توركیا مۆركرد، بەپێی ئەو ڕێكەوتننامە ڕێگە درا بەهەردوو وڵات بۆ پاراستنی سنوورەكانیان بەقووڵایی ١٧كم خاكی وڵاتەكەی تر بەكاربهێنێت [٣٣].

ئەو بارودۆخە خراپە خەڵكی كوردستانی هێنایە دەنگ،لەئەنجامدا لە بەهاری ١٩٨٢ شەپۆلی نارەزاییەكان بەرز بۆوە و خۆپیشاندان لە ناوچەكانی كوردستان دەستی پێكرد، بەڵام خۆپیشاندانەكان هیچ ئامانجێكی نەپێكا و حكومەت لەڕێگای دەزگا داپلۆسێنەرەكانی سەركوتی خۆپیشاندانەكانی كرد و ژمارەیەكیش لەخۆپیشاندەران كوژران و برینداربوون و دەستگیركران[٣٤]. بەڵام ساڵی ١٩٨٣ حكومەتی عێراق بەهۆی پەرەسەندن و فراوان بوونی بزاڤی ڕزگاریخوازی كورد لەباشووری كوردستان و كەڵەكەبوونی زیانەكانی سوپاكەی بەناچاری پەنای بۆ گفتوگۆ لەگەڵ یەكێتی نیشتمانی كوردستان برد، لەئەنجامی گفتوگۆیەكان و ڕاوەستانی شەڕ بۆ ماوەیەك ئابلۆقەی ئابووری لەسەر ناوچەكانی ژێر دەسەڵاتی یەكێتی نیشتمانی كوردستان هەڵگیرا و خەڵكی بەئاسانی كەلوپەل و پێداویستیەكانیان لە شارەكان دەگەیاندە شارۆچكە و گوندەكان كە تاڕادەیەك كاریگەری لەسەر بووژاندنەوەی هەندێك ناوچەی كوردستان هەبوو،لەو ساڵەدا تێكڕایی بەرهەم و ڕووبەری چێندراوی زەوی كشتوكاڵییەكان بەتایبەتی گەنم و جۆ و برنج لەكوردستان بەئاستێكی بەرچاو زیادیكردووە[٣٥].

یەكێكی تر لەو بڕیارانەی كە ڕاستەوخۆ كاریگەری لەسەر ڕەوشی كشتوكاڵ لە كوردستاندا هەبوو، بریتی بوو لەبڕیاری ژمارە (٤٣٣) كە لە ١٠ی نیسانی ١٩٨٤ دەرچوو،تیایدا كاركردن بە بڕیاری بەخشینی

کـورد لە خزمەتـی سـەربازی ڕاگیـرا[٣٦]، دواتـر بڕیـاردرا کە دەبـێ قوتابیـانی ئامـادەیی و زانکۆکـانی کوردسـتان بێنە نێو ڕیـزی سـوپای میللی (جەیشی شەعبی) [٣٧]، بەڵام ئەم بڕیارە لەلایەن قوتابیانی کورد ڕەت کرایەوە و دژی ئەو بڕیارە خۆپیشـاندان لە شـارەکانی هەولێـر و سلێمانی و دهۆک دەستی پێکرد، بەڵام هێزە ئەمنییەکان هێرشیان کردە سـەر خۆپیشـاندەران و ژمارەیـەکی زۆریـان لـێ دەسـتگیرکردن[٣٨]. ئەم پێشـهاتەش کە بەهـۆی بڕیـاری ژمـارە (٤٣٣) ڕوویدا،کاریگەری خراپـی لەسـەر کەرتـی کشـتوکاڵی لە ناوچەکـانی کوردسـتاندا هەبـوو، چـونکە دوای سـەرنەکەوتنی خۆپیشـاندانەکان حکـومەت ژمـارەیەکی زۆری لەگەنـج و لاوانـی کـورد لەنـاو سـوپای عێـراق لەشـەڕی دژ بە سـوپای ئێـران بەکارهێنـا، هەروەهـا دەسـتگیرکردن و کوشـتنی ئەو لاوانەی کە ملکەچـی بڕیـارەکە نەبـوون، ئەمەش بـووە هـۆی کەمبـوونەوەی دەسـتی کـار و ڕووبەری چێـدراوی زەویـیە کشـتوکاڵییەکان و بەرهەمەکەی لە کوردستان. هەروەک لە خشتەی ژمارە (٢،١) بەدی دەکرێ.

لەلایەکـی تـر دوای کۆتاییهـاتنی گفتوگۆکـان لەنێـوان حکـومەت و یەکێتی بەبێ ئەنجام و دەستپێکردنەوەی شەڕ لە ١٥ی کانونی دووەمی ١٩٨٥ تا ١٩٨٨ بارودۆخی ئابووری کوردستان تووشی شڵەژان هـات و بەرهەم کەمـی کـرد هەروەک لە خشـتەی ژمـارە (٢،١) دەردەکەوێـت، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی حکومەتی عێراق لە کۆتایی ١٩٨٥ تا ١٩٨٨ درێـژەی بە سیاسـەتەکانی پێشـووی دا، کە بریتـی بـوو لەسـەرکوتکردن و گـرتن و لەسـێدارەدانی لاوانـی کـورد بەبیـانووی جۆراوجـۆر. هەروەهـا دوای تێپەڕبـوونی پێـنج مانـگ بەسـەر دەسـتپێکردنەوەی شـەڕ لەگەڵ یەکێتـی نیشـتمانی کوردسـتان، ئینجـا حکـومەت بەبڕیـاری ژمـارە (٤٦٨٤/٢٨)ی ئەنجـومەنی سـەرکردایەتی شۆڕش ٩ی حـوزەیرانی١٩٨٥ ئـابلۆقەی ئـابووری تونـدی خسـتە سـەر ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستان و ڕێگەی نەدا کەرەستەی خواردن و سـووتەمەنی و پێداویسـتییەکانی ڕۆژانەی خەڵـک لە بازگەکـان

دەربچێ[٣٩]، پاشان لە ١٧ی تشرینی دووەمی ١٩٨٥ قەدەغەکردنی هاتوچۆی لە شاری سلێمانی ڕاگەیاند،ئینجا کەوتە گیانی هاوڵاتیانی کورد و ژمارەیەکی لێ گرتن و بەدەیان خانووی هاوڵاتییانی لەگەڵ زەوی تەخت کرد [٤٠].

دوا بەدوای ئەمە چالاکییە هاوبەشەکانی سوپای ئێران و هێزی پێشمەرگە زیادیکرد، بۆیە حکومەت بە برووسکەی ژمارە (٢٣٩٤) لە ٢١ی تەموزی ١٩٨٦ بڕیاری سەپاندنی زیاتری ئابلۆقەی ئابووری بۆ سەر ئەو ناوچانە دا کە لەژێر هەژموونی هێزی پێشمەرگەدا بوون[٤١]. پاشان حکومەت نەخشەیەکی نوێی بۆ لەناوبردن و کوشتن و دەربەدەرکردن و ڕاگواستن و کیمیاباران و زەوی سووتاندن و تێکدانی گوندەکانی کوردستاندا دارشتبوو [٤٢]، لەو میانەدا حکومەت لە ١٩٨٧/٣/٢٩ بەبڕیاری ژمارە (١٦٠) ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش عەلی حەسەن مەجید وەک بەرپرسی باکوور بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتەکانی بەعس دژ بە خەڵکی کوردستان دانرا[٤٣]، دوای تەنها حەوت ڕۆژ لەدانانی عەلی حەسەن مەجید بڕیاری دا بەسەرپەرشتیکردنی سەرۆکی لیژنەی ئەمنی پارێزگاکانی کوردستان دەست بەسەر موڵک و ماڵی پێشمەرگەی کوردستان دابگیرێت[٤٤]، دەستیکرد بەجێبەجێکردنی ئەو نەخشە و پیلانەی کە بۆ لەناوبردنی کورد دارێژرابوو، سەرەتا بەتێکدانی گوندەکان[٤٥] و کیمیابارانکردنی چەند ناوچەیەکی کوردستانی دەستی پێکرد[٤٦]، سەرباری ئەمانە ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە ٣ی حوزەیرانی ١٩٧٨ بەبڕیاری ژمارە (٤٥٧) هەموو بەرێوەبەرایەتییە کشتوکاڵییەکانی لە پارێزگاکانی کوردستان بەهەموو بڕیار و بەڵگەنامەکانیەوە هەڵوەشاندەوە، ئەمەش کاریگەری خراپی کردە سەر کەرتی کشتوکاڵ، چونکە دوای ئەو بڕیارە پالپشتی کردن و پێشکەشکردنی هاوکاری بەجووتیاران ڕاگیرا، بەڵکو بەپێچەوانەوە حکومەت دەستی کرد بە تێکدانی گوندەکان و لەناوبردنی خەڵکی کوردستان، لەو ڕوانگەوە ئەمجارەیان پیلانەکە کیمیابارانکردنی شاری هەڵەبجەی لێکەوتەوە [٤٧].

## تەوەری دووەم :

## کاریگەریی بڕیارەکانی "ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش" لە عێراق لەسەر کەرتی پیشەسازی لە کوردستان لەماوەی ساڵانی (١٩٨٠-١٩٨٨)دا

بڕیارەکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە عێراق کاریگەری ڕاستەوخۆیان کردۆتە سەر ڕەوشی پیشەسازی لە کوردستان، هەرچەندە ئەم کەرتە بەیەکێک لە کەرتە ئابووری و بناغە سەرەکییەکانی پێشکەوتنی شارستانیەتی کوردستان دادەنرا [٤٨] کەرتی پیشەسازی لە کوردستان تا سەرەتایی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو لە گەشەکردن و بەرەوپێشچووندا بوو،هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پلانە ئابوورییەی کە حکومەتی عێراقی بۆ بەرەوپێشبردنی کەرتی پیشەسازی لە عێراقدا دایڕشتبوو، بەپێی ئەو پلانە هاوکاری گەشەپێدانی بانکی پیشەسازی دەکرد، وە لەڕێگەی ئەو بانکەوە بڕە پارەیەک بەسووی (٤%) ڕاستەوخۆ دوای دامەزراندنی هەر پرۆژەیەکی پیشەسازی پێشکەش بە وەبەرهێنەکان دەکرا[٤٩]. بەڵام لەماوەی نێوان ساڵانی (١٩٨٠–١٩٨٨) کەرتی پیشەسازی لە عێراق و کوردستان لەڕووی پێشکەوتنەوە تاڕادەیەک سستبوون و دواکەوتنی بەخۆیەوە بینیوە[٥٠]، ئەمەش بەهۆی کاریگەری ئەو بڕیارانەوە بووە کە ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە عێراق لەوماوەیەدا دەریکردووە، کە لە ئەنجامدا بووە هۆی تێکچوونی ڕەوشی سیاسی و ئابووری عێراق بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی سەرباری هەڵگیرسانی شەڕ لەنێوان عێراق و ئێران کە کاریگەری کردبووە سەر کەمبوونەوەی ژمارەی کارگە و دامەزراوە پیشەسازییەکان و دەستی کار لەکوردستان، هەروەها بەهۆی ئەو شەڕەوە خەرجییەکانی حکومەتی عێراق زیادیان کرد، بۆ نموونە خەرجی حکومەت بۆ کڕینی چەک و پێداویستی جەنگ گەیشتە زیاتر لە (٢٠٠) ملیار دۆلاری ئەمەریکی[٥١].

جگە لە کاریگەری جەنگ، ئەو بڕیارانەی کە ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لەو ماوەیە دەریکرد، دواتر ئاماژەیان پێدەکەین،

کاریگەری ڕاستەوخۆیان کردە سەر کەمبوونەوەی کەرستەی خاوی پیشەسازی و دەستی کرێکار و سەرمایە و بنەماکانی تری جێگیربوونی گشت دامەزراوە گەورە و ناوەندی و بچووکەکانی پیشەسازی لە عێراق و کوردستاندا[٥٢]. بۆ ئاشنابوون بە ژمارەی کارگەی (گەورە و بچووک) و کرێکار لەکەرتی پیشەسازی لەپارێزگاکانی کوردستان لەماوەی نێوان ساڵانی ١٩٨٠-١٩٨٨ سەیری خشتەکانی ژمارە (٣، ٤، ٥) بکە.

**خشتەی ژمارە (٣)**

**ژمارەی کارگە گەورە و بچووکەکان و ژمارەی کرێکاران لە کەرتی پیشەسازی گشتی و تایبەت لە پارێزگای هەولێر لەماوەی نێوان ساڵانی ١٩٨٠-١٩٨٨دا[٥٣].**

| ساڵ | ژمارەی کارگە گەورەکان | ژمارەی کرێکار | ژمارەی کارگە بچووکەکان | ژمارەی کرێکار |
|---|---|---|---|---|
| ١٩٨٠ | ٤٦ | ٨٨٧٦ | ١٥٢٩ | ٤٢٨٧ |
| ١٩٨١ | ٤٥ | ٧٣١٦ | ١١٧٢ | ٢٣٥٣ |
| ١٩٨٢ | ٣٢ | ٦٥٥٦ | ٢٠٩٨ | ٤٩٥٠ |
| ١٩٨٣ | ٣٤ | ٣٤٨٩ | ١٨٥٣ | ٤٣٦٦ |
| ١٩٨٤ | ٢٩ | ٣٣١٧ | ١٧٢٥ | ٤٢٣٤ |
| ١٩٨٥ | ٢٢ | ٣١٠٥ | ١٥٧٣ | ٣٦٩٠ |
| ١٩٨٦ | ٣٨ | ٤٩٤٧ | ٢٤٩٠ | ٤٠٩٧ |
| ١٩٨٧ | ٣٧ | ٤٠٠٧ | ٢٤٠١ | ٤٥٤٤ |
| ١٩٨٨ | ٣٠ | ٢٦٠٠ | ١٢٥٠ | ٢٦٥١ |

**خشتەی ژمارە (٤)**
**ژمارەی کارگە گەورە و بچووکەکان و ژمارەی کرێکاران لە کەرتی پیشەسازی گشتی و تایبەت لە پارێزگای سلێمانی لەماوەی نێوان ساڵانی ١٩٨٠-١٩٨٨دا[٥٤].**

| ساڵ | ژمارەی کارگە گەورەکان | ژمارەی کرێکار | ژمارەی کارگە بچووکەکان | ژمارەی کرێکار |
|---|---|---|---|---|
| ١٩٨٠ | ٤١ | ٢٩٤٥ | ١٦٩٥ | ٣٣٩٩ |
| ١٩٨١ | ٤٠ | ٢٥١٦ | ١٤٧٢ | ٢٨٥٦ |
| ١٩٨٢ | ٣٧ | ٢٢٣٠ | ٢٣٤٢ | ٥١١٢ |
| ١٩٨٣ | ٤٠ | ٤٨٣٤ | ٢٤٧٩ | ٥٥٢٣ |
| ١٩٨٤ | ١٧ | ٤٥١٥ | ١٨٧٠ | ٣٤٦٤ |
| ١٩٨٥ | ٢٢ | ٤١٨٨ | ١٦٩٩ | ٣٢٣٨ |
| ١٩٨٦ | ٢٤ | ٥٠١٣ | ٣٦٢٣ | ٦٢٨٠ |
| ١٩٨٧ | ٢٤ | ٤٢٤٧ | ٢٩١٥ | ٥٠٠٠ |
| ١٩٨٨ | ١٨ | ٣٩٢٤ | ١٨٨٠ | ٤١٠ |

**خشتەی ژمارە (٥)**
**ژمارەی کارگە گەورە و بچووکەکان و ژمارەی کرێکاران لە کەرتی پیشەسازی گشتی و تایبەت لە پارێزگای دهۆک لەماوەی نێوان ساڵانی ١٩٨٠-١٩٨٨دا[٥٥].**

| ساڵ | ژمارەی کارگە گەورەکان | ژمارەی کرێکار | ژمارەی کارگە بچووکەکان | ژمارەی کرێکار |
|---|---|---|---|---|
| ١٩٨٠ | ١١ | ٦١٠ | ٢٤٤ | ٤٤٦ |
| ١٩٨١ | ٨ | ٥٥٢ | ٢١٨ | ٣٦٧ |
| ١٩٨٢ | ٧ | ٣٠٩ | ٤٣٣ | ٨٨١ |
| ١٩٨٣ | ١٠ | ٥٨٣ | ٤٦٢ | ٩٠٦ |
| ١٩٨٤ | ٨ | ٤٥٤ | ٤٢٦ | ٨١٧ |
| ١٩٨٥ | ٦ | ٦٤١ | ٣٢٧ | ٦٥١ |
| ١٩٨٦ | ١٣ | ٦٥١ | ٦٦٩ | ١١٧١ |
| ١٩٨٧ | ١١ | ٦٣٢ | ٦٤٩ | ١٠٨٣ |
| ١٩٨٨ | ٨ | ٦٢٢ | ٣٦٦ | ٦٤٢ |

ئەگەر سەیری خشتەی ژمارە (٣، ٤، ٥) بکەین بۆمان دەردەکەوێ کە ژمارەی کارگە گەورە و بچووکەکان و ژمارەی کرێکاران لە پارێزگاکانی هەولێر و سلێمانی و دهۆک لەساڵی ١٩٨٠ بە بەراورد لەگەڵ هەمان ژمارە لە ساڵانی دواتر بەڕێژەیەکی جیاواز هەڵکشان و داکشانیان بەسەردا هاتووە، هۆکارەکەی لەلایەک دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری شەڕی عێراق و ئێران کە بەهۆیەوە ژمارەیەک کارگە لەکار کەوتن، لەلایەکی تریش هۆکارە ڕاستەوخۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ بڕگەی (٢٢) لە بڕیاری ژمارە (١١٦) ی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە عێراق کە لە ١٠ی کانونی یەکەمی ١٩٨٠ دەرچوو، ئەم بڕیارە باسی لە گرنگیدان بەکەرتی پیشەسازی لە عێراقدا دەکرد [٥٦]. پشکی قەرزی بۆ پێشکەوتنی پیشەسازی لە پارێزگاکانی عێراق دیاریکرد، لەو قەرزە پشکی هەولێر ٧,٨% و سلێمانی ٧,٧% و دهۆک ٣,٠٦% بوو[٥٧].

دوابەدوای ئەمە ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بەمەبەستی بووژاندنەوەی بارودۆخی ئابووری وڵات، بە بڕیاری ژمارە (٣)ی کانونی دووەمی ١٩٨١ بڕێک پارەی بۆ جێگیرکردن و دامەزراندنی پرۆژەکانی پیشەسازی لە پارێزگاکانی عێراق تەرخانکرد، بەشی کوردستان ٩% تێپەڕی نەدەکرد [٥٨]، پاشان بە بڕیاری ژمارە (٩٠) لە ٢٢ی تەموزی ١٩٨١ ڕەسمی گومرگی لەسەر کەلوپەلی هاوردەکراو بۆ ماوەی دوو ساڵ هەڵگیرا[٥٩]، کەچی هیچ سوودی بۆ ناوچەکانی کوردستان نەبوو، ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بڕیاری ژمارە (٩١) ی لە ١٠ی ئابی ١٩٨١ دەرکرد، تیایدا بڕیاری دەستکاریکردنی یاسای بانکی پیشەسازی ژمارە (٦٢)ی ساڵی ١٩٦٢ دا و پشکی قەرزی وەبەرهێنان بۆ گشت پارێزگاکانی عێراق دیاری کرد[٦٠]. پشکی کوردستان لەو قەرزە کەمکرایەوە، هەرچەندە حکومەتی عێراقی هەوڵی داوە بۆ باشترکردنی کەرتی پیشەسازی لەڕووی چەندایەتی و چۆنایەتی لە عێراق، بەڵام ئەم هەنگاوەی حکومەت لە کوردستاندا تەواو پێچەوانەی ئامانجەکانی بووە، چونکە لە ١٨ ئەیلوولی ١٩٨١ بەبڕیاری

ژمارە (١٣٩١)ی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش، ژمارەیەکی بەرچاو لە کرێکاران بەفەرمانبەر لەدام و دەزگاکانی حکومەت دامەزراند [٦١]، ئەمەش بووە هۆی کەمبوونەوەی ژمارەی کارگە و دەستی کارکەران لەکەرتە ئابوورییەکان بەگشتی و پیشەسازی بەتایبەتی، دەرخستنی ئەم ڕاستییەش لە خشتەی ژمارە ( ٥،٤،٣) بە ڕوونی بەرچاو دەکەوێت.

ساڵی ١٩٨٢ چەند بڕیارێکی تر دەرچوون، ڕاستەوخۆ کاریگەرییان لەسەر ڕەوشی پیشەسازی لە کوردستاندا هەبووە، بەتایبەتی بڕیاری ژمارە ( ١٣١٦) کە لە١٧ی شوباتی ١٩٨٢ دەرچوو، بەپێی ئەو بڕیارە وەزارەتی پیشەسازی ڕێگەی پێدرا کرێکار وەک فەرمانبەر دابمەزرێنێت[٦٢]، دواتر بەبڕیاری ژمارە (١٤٦٣) لە٢٣ی تشرینی دووەمی ١٩٨٢ یاسای وەبەرهێنانی پیشەسازی لە هەردوو کەرتی گشتی و تایبەتی پەسند کرا، کە لە ماددەی (٩) لە بڕگەی یەکەم (أ) و ماددەی (١٢)ی یاساکە هاتووە کە حکومەت وەبەرهێنەکانی کەرتی پیشەسازی لە پێدانی باج دەبەخشێت، بەبێ دیاریکردنی ماوەی بەخشینەکە[٦٣].

دەکرێ بڵێین ئەو بڕیارانەی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش کە ساڵی ١٩٨٢ دەریکرد، کاریگەری نەرێنی لەسەر کەرتی پیشەسازی لە پارێزگاکانی هەولێر و سلێمانی و دهۆک دروست کردووە، چونکە ژمارەی کارگەی گەورە و ژمارەی کرێکاران لە کارگە گەورەکان کەمیان کردووە، ژمارەی کارگە بچووکەکان و کرێکارانی ئەم کارگە بچووکانە زیادی کردووە، ئەمەش کەرتی پیشەسازی بەرەو کەرتی تایبەت دەبات و خەڵکی کوردستان ناتوانن بە گوێرەی پێویست سوودمەندبن، چونکە وەبەرهێنەکان تەنها مەبەستیان قازانجە نەک پێشکەوتنی کەرتی پیشەسازی، ڕاستیی ئەم وتانەش لە خشتەی ژمارە (٥.٤.٣) بەدی دەکرێت.

لەهەمان کاتدا تێبینی ئەوە دەکەین لەدوای ساڵی ١٩٨٣ ژمارەی کارگە گەورە و بچووکەکان و ژمارەی کرێکارانی ئەم کارگانە لە

پارێزگـای هەولێـر و سـلێمانی و دهـۆک زیادیـان کـردووە، هۆکـای زیـادبوونەکەش دەگەڕێـتەوە بـۆ هێوربـوونەوەی ڕەوشـی سیاسـیی کوردستان بەهۆی گفتوگۆی نێوان حکومەتی عێراق و یەکێتی نیشتمانی کوردستان، جگە لەوەش ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بەبڕیاری ژمـــارە (١٤٦٦) کە لە ١٩٨٣/١/٢٣ یاســـای وەبەرهێنـــانی کەرتـــی پیشەسـازی ژمـارە ١١٥ لەشـوێنی یاسـای پەرەپێـدان و ڕێکخسـتنی کەرتی پیشەسازی ژمارە ٢٢ی ساڵی ١٩٧٢ی دانا[٦٤]، بەپێی ئەو یاسا حکومەت هانی وەبەرهێنەکانی دا تا وەبەرهێنان لەکەرتی پیشەسازی لەعێراق ئەنجام بدەن، دوای ئەو بڕیارە ژمارەیەک کارگە لە هەولێر و سلێمانی و دهۆک دامەزران [٦٥].

ئەگەر سەرنج بدەینە خشتەی ژمارە (٥,٤,٣) بۆمان دەردەکەوێ کە سـاڵی ١٩٨٥ ژمـارەی کـارگە گەورەکـان و کرێکـاران لەو کارگـانەدا لە پارێزگاکانی هەولێر و سلێمانی و دهۆک زیادیانکردووە، بەڵام ژمـارەی کارگە بچووکەکان و کرێکارانی ئەم کارگانە ڕووی لە کەمی کردووە، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ناسەقامگیری سیاسیی کوردستان بەهـۆی کۆتاییهاتنی گفتوگۆی نێوان حکومەت و یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەبـــێ ئەنجـــام، و دەســـتپێکردنەوەی شـــەڕ لە ١٥ی کـــانوونی دووەمی١٩٨٥،و ئەو خۆپیشاندانانەی کە لە هەندێک ناوچەی کوردستان دژ بەحکـومەتی عێـراق ئەنجامـدرا [٦٦] ئەمەش کـاریگەری کـردە سـەر کەرتـی پیشەسـازی و کەمبـوونەوەی ژمـارەی کـارگە و دەسـتی کـار لە کوردستان.

پاشان ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە عێراق لەساڵانی ١٩٨٦ هەوڵی دا بایەخ و گرنگی بە کەرتی پیشەسازی بدات و بۆ ئەو مەبەستە هـانی وەبەرهێـنە عەرەبەکـانی دا بـۆ ئەوەی وەبەرهێنـان لەکوردسـتان بـکەن، هەروەهـا حکـومەتی عێـراق نەخشـەی کێشـا بـۆ کەمکـردنەوەی هاونیشتمانیانی نەتەوەی کورد لە کوردستاندا لەو میانەدا کە باسمانکرد بڕیـــاری ژمـــارە (٤٢)ی لە ١١ی کـــانوونی یەکەمـــی ١٩٨٦ بـــۆ

نیشتەجێکردنی هاوڵاتیانی عەرەب لە کوردستاندا دەرکرد، بۆیە کاتێک کە سەرنج دەدەینە خشتەی ژمارە (٣،٤،٥) بۆمان دەردەکەوێت کە ژمارەی کارگە و دامەزراوە پیشەسازییەکان و دەستی کارکەر لەم کەرتەدا لە کوردستان بەشێوەیەکی بەرچاو زیادیانکردووە، ئەمەش بەهۆی کاریگەری بڕیاری ژمارە (٤٢) ی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بووە.

هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێکرد حکومەت ساڵی ١٩٨٧ پیلانی لەناوبردنی ناسنامەی کورد و ژێرخان و سەرخانی ئابووری داڕشت، بۆ ئەو مەبەستە لە ٢٩ی ئاداری١٩٨٧ بەبڕیاری ژمارە (١٦٠) ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش عەلی حەسەن مەجید وەک بەرپرسی باکوور بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتەکانی پارتی بەعس دژ بە خەڵکی کوردستان دانرا، بۆیە  لە ١٥ی ئایاری ١٩٨٨ عەلی حەسەن مەجید دەستی کرد بەجێبەجێکردنی پیلانەکە، دەستپێکی پیلانەکە بە کوشتن و تۆقاندن و بەئەنفال و کیمیابارانکردنی شار و شارۆچکەکان و خاپوورکردنی زۆربەی گوندەکانی کوردستان دەستی پێکرد. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە بڕیاری ژمارە (١٦٠) کاریگەری خراپی کردە سەر ڕەوشی پیشەسازی لە کوردستان و بەرەو لاوازی برد، بەئاستێک ژمارەی کارگەی گەورە و بچووک و ژمارەی کرێکاران بەڕێژەیەکی بەرچاو کەمی کرد.

## تەوەری سێیەم :

## کاریگەریی بڕیارەکانی "ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش" لە عێراق لەسەر کەرتی بازرگانی و گەشتوگوزار لە کوردستان لەماوەی ساڵانی (١٩٨٠-١٩٨٨)دا

### – کەرتی بازرگانی:

کەرتی بازرگانی بەلایەنێکی گرنگی چالاکییە ئابوورییەکانی کوردستان دادەنرا، و ڕۆڵێکی گرنگی لەبەرەو پێشبردن و بنیادنانی ژێرخانی ئابووریدا هەبووە[٦٧]، لەو نێوەندەدا بازرگانی کردارێکە بەستراوەتەوە بە بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕکردنی کاڵا جیاوازەکان بەپێی خواست و خستنەڕوو بەگوێرەی پێداویستی بەکاربەرەکانەوە[٦٨].

پرۆسەی بازرگانی لە کوردستان دوو جۆرە یەکەمیان بازرگانی ناوەخۆیی: بریتییە لە کرداری کڕین و فرۆشتن و ئاڵوگۆڕکردن لە ناوەخۆی وڵات[٦٩]، لە کوردستان بازاڕەکان پشتیان بەو کەلوپەل و بەرهەمە خۆماڵییانە بەستووە کە لە شار و شارۆچکە و لادێیەکان بەرهەم دەهاتن، و دەهێنران بۆ بازاڕەکان، لەو بازاڕانەدا ئەو کاڵا و بەرهەمانە ساغ دەکرانەوە و دەفرۆشران، بەرهەمە نێو خۆیەکان سەرچاوەیەک بوون بۆ پڕکردنەوەی پێدوایستییەکانیان وەک بەرهەمە سپیاییەکان و دانەوێڵە و پەلەوەر، هەروەها خەڵکی گوندەکانیش پێداویستەکانیان لە شارەکان دەستەبەر دەکرد، زۆر جاریش ئەو جۆرە بازرگانییە ناوەخۆییە لەنێوان شارەکانی کوردستان و هەندێک شاری عێراقیش ئەنجامدراوە دووەمیان بازرگانی دەرەکی : بریتییە لە کرداری کڕین و فرۆشتن و ئاڵوگۆڕکردن[٧٠] لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ و وڵاتانی تر[٧١]، ئەو جۆرە بازرگانییە لە کوردستان بەر لە شەڕی عێراق و ئێران لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ و وڵاتانی ئەورووپی ئەنجامدراوە[٧٢].

باشووری کوردستان هەر لەکۆنەوە چالاکی بازرگانی تیادا ئەنجام دراوە ئەمەش بەهۆی بوونی ئەو بنەما و هۆکارانەی کە کار دەکەنە سەر چالاکی بازرگانی، لەوانە هەڵکەوتە و شوێنی جوگرافی و ژینگەی سروشتی کە یەکێکە لەم فاکتەرە سەرەکییانەی کاریگەری بەهێزی

لەسەر چالاکی بازرگانی هەیە بەجۆرێک دەبێتە هۆی گەشەکردن و پەرەسەندنی بازرگانی، لەهەمان کاتدا دەبێتە پردێک لەنێوان بەرهەمهێن و بەکاربەر لە نێوەخۆ و دەرەوەی وڵات [٧٣]و دانیشتوان و کەرستەی خاو و کانزا و بەرهەمە ناوەخۆیەکان (کشتوکاڵی و ئاژەڵی) و دارستانیش کاریگەرییان لەسەر چالاکییەکانی کەرتی بازرگانیدا هەیە[٧٤]. جگە لەمانە وڵاتی عێراق خاوەنی چەند ڕێگای نێو دەوڵەتییە کە دابەش دەکرێت بۆ (١٢) تەوەر لەناو ئەو ڕێگایانەدا (٥) تەوەریان پەیوەستە بە هەرێمی کوردستان ئەمەش بووە هۆکارێکی یارمەتیدەر بۆ بەهێزبوونی چالاکی بازرگانی لە کوردستان [٧٥]، جگە لەوەی کوردستان خاوەنی چەندین ڕێگاوبانی ناوەخۆییە ئەم ڕێگایانەش فاکتەری گرنگ و پڕبایەخن بۆ چالاکی بازرگانی، بەڵام لەماوەی توێژینەوەدا حکومەتی عێراق ئەو ڕێگایانەی بۆ مەبەستی سەربازی بەکاردەهێنا نەک بازرگانی.

سەرەڕای هەموو ئەوانەش بەڵام کەرتی بازرگانی لە کوردستان لەماوەی ساڵانی ١٩٨٠-١٩٨٨،کەوتبووە ژێر کاریگەری بڕیارەکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لەعێراقدا، یەکێک لەوانە بڕیاری شەڕ بوو لەنێوان عێراق و ئێران[٧٦]، هەروەها ناسەقامگیری بارودۆخی سیاسیی لە کوردستان بەهۆی شەڕی نێوان سوپای عێراق و هێزی پێشمەرگەی کوردستان لەلایەک، و شەڕی نێوان هێزە کوردستانییەکان لە باشووری کوردستانیش لەلایەکی تر، کاریگەری نێگەتیڤیان لەسەر کەرتی بازرگانی دروست کرد [٧٧]. جێگای ئاماژەیە ڕەوشی بازرگانی لەکوردستان لەسایەی چەند بڕیارێکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لەماوەی ١٩٨٠-١٩٨٨ کە دواتر ئاماژەیان پێدەکەین، هەڵکشان و داکشانی زۆری بەخۆیەوە بینیوە، چونکە ئەم بڕیارانە ڕاستەوخۆ کاریگەرییان لە سەر بنەماکانی گەشەکردن و دواکەوتنی کەرتی بازرگانی لە کوردستاندا دروست کردووە، و قەبارەی نێردراو و هێنراو لە کوردستان گۆڕانکاری بەرچاویان بەخۆیانەوە بینیوە، هەروەک لە خشتەی ژمارە (٦) دەردەکەوێت.

**خشتەی ژمارە (٦)**

**ژمارەی کەلوپەل و کەرستە و بەرهەمی هێنراو و نێردراو لە بازرگانی دەرەکی عێراق و کوردستان لەساڵانی ١٩٨٠-١٩٨٨دا[٧٨].**

| ساڵ | نێردراوی نەوت (ملیۆن بەرمیل) | | نێردراوی بەرهەمی کشتوکاڵی وئاژەڵی وداربستان و ڕووەکی سروشتی (تۆن) | | هێنراوی بەروبوومی خواردن و خواردنەوەو (کەرستەی خاوی کشتوکاڵی و پیشەسازی و هۆیەکانی گواستنەوە/تۆن) | | هێنراوی چەک و تفاق و کەلوپەلی سەربازی بەبڕی / ملیۆن دۆلار |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | عێراق بەگشتی | کوردستان | عێراق بەگشتی | کوردستان | عێراق بەگشتی | کوردستان | عێراق بەگشتی |
| ١٩٨٠ | ١٥٧٣٧٤ | - | ٢٨٨٠٠٢ | ١٩٩٩١ | ١٣٩٠٠٠ | ١٣٠٠٠ | ١١٩٠٠ |
| ١٩٨١ | ١٤١٤١٢ | - | ١٠٦٠٠١ | ٨٩٧١ | ٢٠٧٠٠٠ | ٢٠٢٠٠ | ١٧٠٩٧ |
| ١٩٨٢ | ١٣٥٠١٨ | - | ١٠٠٠١ | ٣٥٠١ | ٢١٥٠٠٠ | ٢٠٨٠٠ | ١٨٤٢٤ |
| ١٩٨٣ | ١٠٣٨٤٢ | - | ٨٢٠٠٣ | ٣٣٠٥ | ٢٣٢٠٠٠ | ٢١٦٠٠ | ١٨٨١٠ |
| ١٩٨٤ | ١٠٠٣٠٩ | - | ٩٢٠٠٤ | ٣٠٠٦ | ٢٩٩٠٠٠ | ٢٢٤٥٠ | ٢٠٧٢٠ |
| ١٩٨٥ | ١٧٦٥٦٦ | - | ١٠٤٠٠٢ | ٢٨٩٧ | ٣٠٠٥٤٧ | ٢٣٣١٤ | ٢٥٢٨١ |
| ١٩٨٦ | ١٠٩١١٦ | - | ٧٤٦٤٨ | ٢٨٨٣ | ٣٥٩٢٠٠ | ٢٤٢٢٠ | ٢٨٧٦٠ |
| ١٩٨٧ | ١٣٣٧٢٣ | - | ٩٧٠٥٦ | ١٩٩٢ | ٤٠٣٤١٠ | ٢٥٧٠٠ | ٢٩٨٧٠ |
| ١٩٨٨ | ١٥٠٨٢٨ | - | ٩٦٨٨٩ | ١٩٨١ | ٦٦٨٣٣٢ | ٢٦٢٠٠ | ٣٠١٤٥ |

ئەگەر سەرنج بدەینە خشتەی ژمارە (٦) بۆمان دەردەکەوێت کە قەبارەی نێردراوی کاڵا و بەرهەمەکانی کوردستان (مەبەستمان پارێزگاکانی هەولێر و سلێمانی و دهۆکە) لەڕێگەی بازرگانی دەرەکی عێراق لە ساڵی ١٩٨٠-١٩٨٨، ساڵ لەدوای ساڵ ئاستەکانی

لەنزمبـــوونەوەدان، بەڵام قەبـــارەی هێنـــراو زیـــادیکردووە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری ئەو بڕیارانەی کە ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە عێراق لەو ماوەیە دەریکردوون،لەوانە بڕیاری هەڵگیرسانی شەڕ لەگەڵ ئێران[٧٩]، شایانی باسە ئەو بڕیارە کاریگەری خراپی لەسەر کەرتـی بازرگـانی دروسـتکرد، چـونکە بەهـۆی ئەو شـەڕەوە ڕێـگەی بازرگـانی نێـوان باشـووری کوردسـتان وئێـران پەکـی کەوت و تەنهـا بازرگـانی بەڕێـگەی قاچـاغ نەبێـت، ئەمەش بەهـۆی شـەڕ و پێکـدادان لەنێـوان هێزەکـانی پێشـمەرگەی کوردسـتان و سـوپای عێـراق لەنـاوچە سنووررییەکانی باشووری کوردستان بەرێژەیەکی سنووردار دەکرا[٨٠].

یەکێکی تر لەو بڕیارانە کە کاریگەری لەسـەر ڕەوشـی بازرگـانی کوردستان هەبوو، بریتی بوو لە هەر یەک لە بڕیاری ژمارە (١١٠٦) کە لە ٢٩ی ئـــابی ١٩٨١ ئەنجـــومەنی ســـەرکردایەتی شـــۆڕش بڕیـــاری گەڕانەوەی کارمەندانی کەرتی بازرگانیدا بۆ سەرکارەکانیان[٨١]. بەمەش چـالاکی بازرگـانی لەکوردسـتان بەرەوپـێش چـوو، جـگە لەمە بڕیـاری ژمـارە (١١٠٦) بڕیـارێکی بەسـوود بـوو بـۆ کەرتـی بازرگـانی بەڵام نەچووە بواری جێبەجێکردن، بەڵکو لەشوێنی ئەو بڕیاری ژمارە (١٣٩١) دەرچوو کە پێشـتر ئاماژەمـان بەنـاوەرۆکی بڕیـارەکە کـردووە، شـایانی باسـە ئەم بڕیـارە کـاریگەری نەرێنـی کـردە سـەر کەرتـی بازرگـانی، و لەئەنجامـدا بـووە هـۆی کەمبـوونەوەی بەرهەم و سسـتبوونی جـوولەی بازرگـانی لە کوردســتان هەروەک لە خشــتەی ژمــارە (٦) ئەمە بەدی دەکرێت.

ڕەوشـــی بازرگـــانی لە ســـاڵانی ١٩٨٢-١٩٨٣ تووشـــی دارمـــانێکی گەورە هات، چونکە لەوماوەیەدا حکومەت دەستی کرد بە ئەنجامدانی پرۆســـەی ڕاگواســـتن و خـــاپوورکردنی گونـــدە ســـنوورییەکانی کوردســتان[٨٢]، بەڵام لەســاڵی ١٩٨٣ -١٩٨٥ بەهـۆی گفتوگـۆی نێـوان حکـومەتی عێـراق و یەکێتـی نیشـتمانی کوردسـتان، بـازاڕێکی گەورە و چالاکییەکی بەهێز کەوتە ناوچەی کوردستان، بەتایبەتی مەرزی میراوە

و کورەداوی لەلایەک و مەرزی سەفرە لەلایەکی تر، سەرەڕای ئەوەی ئەو مەرزانە فرۆشگایەک بوون بۆ کڕین و فرۆشتنی کاڵا و کەلوپەل[٨٣]، بەڵام ئەو گفتوگۆیەش کاریگەرییەکی زۆری نەکردە سەر چالاکی بازرگانی لەگشت ناوچەکانی کوردستان، چونکە حکومەت هیچ بایەخی بەناوچەکانی کوردستان نەدەدا، تەنها هەندێک گرنگی بەپارێزگای هەولێر دەدا بەو پێیەی ئەوکات ناوەندی ناوچەی ئۆتۆنۆمی بوو، و هەردوو دەزگای ڕاپەڕاندن و یاسادانانی لێ بوو[٨٤]، سەرەڕای ئەوەش تێکڕای نێردراوی کاڵاکانی کوردستان لەڕێگەی بازرگانی دەرەکی عێراق ڕووی لەکەمبوون کرد هەروەک لە خشتەی ژمارە (٦) تێبینی دەکەین.

ئەوەی تێبینی دەکرێت لەخشتەی ژمارە (٦)، ئەوەیە کە ڕەوشی بازرگانی لەساڵانی ١٩٨٥-١٩٨٨ بەرەو خراپترین ئاست دابەزییە، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سیاسەتە خراپانەی کە حکومەتی عێراق لە ڕێگەی چەند بڕیارێکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بەسەر خەڵکی کوردستان جێبەجێی دەکرد، کە پێشتر ئاماژەمان پێیان کردووە.

**- کەرتی گەشتوگوزار:**

گەشتوگوزار بریتییە لە جوولەی دانیشتوان و دوورکەوتنەوەی لەشوێنی نیشتەجێبوونی هەمیشەیی بۆ شوێنێکی تر[٨٥]، لەڕێگەی بەکارهێنانی توانستی ئابووری و ڕۆشنبیری بۆ بەدەستهێنانی داواکاری ژیان و ڕۆشنبیری و ئارەزووە تایبەتییەکان یان هەر جۆرێکی تر[٨٦]. ئەم کەرتە لە کوردستان بەیەکێک لە کەرتە ئابوورییە هەرە گرنگەکان هەژمار دەکرێت، چونکە لەڕێگەیەوە داهاتێکی زۆر دەست خەڵکی کوردستان دەکەوت، سەرەڕای ئەوەی هۆکارێکە بۆ بنیاتنانی ژێرخانی ئابووری کوردستان، جگە لەوەی بنەماکانی گەشتوگوزار کە پێکهاتووە لە ( ئاووهەوا، شوێنی کەلتووری و شوێنەواری دێرین و هاوینەهەوار

و میوانخانە [٨٧] و شوێنی حەوانەوە و خواردنگا و بازاڕ[٨٨] و کافتریا و ڕێگاوبان [٨٩] و کەمکردنەوەی کرێی گواستنەوە [٩٠] لەکوردستان بوونیان هەبوو، هەموو ئەمانە ئەوە دەردەخەن کە هەر لەکۆنەوە گەشتیارانی ناوەخۆیی و بیانی ڕوویان لەناوچە گەشتیارییەکانی کوردستان کردووە، بەڵام ئەم کەرتە لەساڵانی ١٩٨٠–١٩٨٨ لەلایەک بەهۆی ناسەقامگیر بوونی ڕەوشی سیاسیی ناوچەکانی کوردستان چ بەهۆی شەڕی نێوان عێراق و ئێران یان بەهۆی شەڕی نێوان هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان و سوپای عێراق، لەلایەکی تریش بەهۆی کاریگەری بڕیارەکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لەعێراق ڕەوشی گەشتوگوزار لە کوردستان هەڵکشان و داکشانی بەخۆیەوە بینیوە.

یەکێک لەو بڕیارانەی کە کاریگەری لەسەر ڕەوشی گەشتوگوزار لە کوردستان هەبوو بریتی بوو لە بڕیاری ژمارە (٣٥٣) کە لە ٢٨ی شوباتی ١٩٨٠ دەرچوو، بەپێی بڕگەی (أ– ب) ی بڕیارەکە حکومەتی عێراق هەڵسا بەتەرخانکردنی زەوی و پێدانی قەرز و سولفە بە وەبەرهێنەکانی کەرتی گەشتوگوزار لە ناوچەکانی کوردستان[٩١]، ئەمە هەنگاوێکی باش و گرنگ بوو بۆ بەرەوپێشبردنی کەرتی گەشتوگوزار لە کوردستان، چونکە دوای جێبەجێکردنی ئەم بڕیارە ژمارەیەکی بەرچاو شوێنی حەوانەوە و کافتریا لە ناوچە گەشتیارییەکانی کوردستان دروست کران، بەڵام لە ٢٢ی ئەیلوولی ١٩٨٠ بەهۆی دەستپێکردنی شەڕ لەنێوان عێراق و ئێران، ژمارەی گەشتیارانی بیانی ڕوویان لە کەمبوونەوە کرد، ئەمەش کاریگەری خراپی لەسەر داهاتی ئەم کەرتە دروست کرد[٩٢]، ساڵی ١٩٨١ حکومەتی عێراق هەوڵیدا گەشە بە کەرتی گەشتوگوزار لە ناوچەکانی کوردستان بدات، بۆ ئەو مەبەستە ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بە بڕیاری ژمارە (٩٠٠) ی لە ٢٥ی تەمووزی ١٩٨١ چەند شوێنێکی حەوانەوەی گەشتیاری لە هاوینە هەوارەکانی کوردستان دروست کرد[٩٣]، شوێنە گەشتیارییەکانی

پارێزگای هەولێر بەو پێیەی ئەو کات مەڵبەندی ناوچەی ئۆتۆنۆمی بوو پشکی شێری لەو بڕیارە بەرکەوت[٩٤]. هەر چەندە شەڕ لەنێوان عێراق و ئێران لەلایەک و شەڕی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و سوپای عێراقیش لەلایەکی تر لە ناوچە سنوورییەکان بەردەوام بوو، بەڵام حکومەتی عێراق بۆ ئەوەی پەردەپۆشی شکستەکانی سوپاکەی لە بەرەکانی جەنگدا بکات، و وا پیشانی جیهانی دەرەوە بدات کە جەنگ هیچ کاریگەری لەسەر وڵاتەکەی دروست نەکردووە، لە ١٠ی ئایاری ١٩٨٢ بەبڕیاری ژمارە (٦٢١)ی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش باجی گومرگی لەسەر هاوردەکردنی خواردن و خزمەتگوزاری و پێداویستییەکانی گەشتوگوزاری کەمکردەوە، دواتریش ئاسانکاری پێشکەش بە هاوڵاتیانی عەرەب لە کەنداو و وڵاتانی عەرەب کرد بۆ ئەوەی سەردانی شوێنە گەشتیارییەکانی عێراق بکەن [٩٥]. ئەو بڕیارەی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش تاڕادەیەک کاریگەری لەسەر بەرەوپێشبردنی کەرتی گەشتوگوزار هەبوو، بەڵام سوود و داهاتێکی کەمی بۆ خەڵکی ناوچە گەشتیارییەکان بوو، چونکە زۆربەی خەڵکی کوردستان کەوتبوونە ژێر کاریگەری سیاسەتەکانی بەعس کە خۆی لە ڕاگواستن و تەعریب و خاپوورکردنی لادێیەکانی کوردستان دەبینییەوە[٩٦]، جگە لەوەی ژمارەیەکی زۆری لاوانی کوردیش یان لە ڕیزەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان یان لە ڕیزی سوپای عێراقدا بوون، بۆیە ئەوانەی لەکەرتی گەشتیاری کاریان دەکرد زۆربەیان خەڵکی بیانی یان سەر بە حکومەت بوون[٩٧].

لەلایەکی تر حکومەتی عێراق بۆ جێبەجێکردنی ئەو سیاسەتەی کە دژ بەنەتەوەی کورد دایڕشتبوو، یەکێک لەوسیاسەتانەی بریتی بوو لە زیادکردنی هاونیشتمانی عەرەب لە ناوچەکانی کوردستان، بۆ ئەو مەبەستە لەڕێگەی کەرتی گەشتوگوزارەوە، لەرێگەی بڕیاری ژمارە (٤٩)ی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە ١٤ی حوزەیرانی ١٩٨٣ چووە بواری جێبەجێکردن، لەناو ئەو بڕیارەدا حکومەت هەڵسا بە

ڕێکخستنی کارکردنی کۆمپانیاکانی گەشتوگوزاری[٩٨] و هاوکاریکردنی کۆمپانیاکان لەهێنانی هاوڵاتیانی عەرەب بۆ ناوچە گەشتیارییەکان. لەوانە کۆمپانیای گەشتوگوزاری عەرەبی، کۆمپانیای نیشتمانی بۆ گەشتوگوزار و کۆمپانیای نەهزەی کویتی بۆ گەشتوگوزار [٩٩].

ساڵانی ١٩٨٤-١٩٨٦ کەرتی گەشتوگوزار سست و لاواز بوو، ئەمەش بەهۆی کەمکردنەوەی پشکی کەرتی گەشتوگوزار لە بودجەی پەرەپێدانی کەرتە ئابوورییەکان، هۆکارەکەشی زیادبوونی خەرجیی جەنگ بوو کە ڕێژەکەی گەیشتبووە (١٥٢٨١) ملیۆن دۆلاری ئەمریکی[١٠٠]، هەرچەندە لەو ماوەیەدا بەبڕیاری ژمارە ( ١٣٩٦) ی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە ٢ی کانوونی دووەمی ١٩٨٥ ڕەسمی گومرگی لەسەر وەبەرهێنەکانی کەرتی گەشتوگوزاری هەڵگیرابوو[١٠١]، بەڵام ژمارەی گەشتیاران هەر ڕوو لە کەمبوونەوە بوو[١٠٢].

دوابەدوای ئەمە حکومەت لە ١١ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٦ بەبڕیاری ژمارە (٤٢) ی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش دەستی کرد بە ڕاگواستنی ژمارەیەک خێزانی کورد لە ناوچە سنوورییەکان بۆ ناوەڕاست و خوارووی عێراق[١٠٣]، ئەم بڕیارە کاریگەری خراپی لەسەر کەرتی گەشتوگوزار لە کوردستاندا دروست کرد، چونکە ژمارەی دەستی کار بەڕێژەیەکی بەرچاو لەم کەرتەدا کەمی کرد تا ساڵی ١٩٨٧ ڕێژەی بێکاری لە پارێزگای هەولێر گەیشتە (٨,٣٦%) و لە سلێمانی گەیشتە (٩,٣٧%) و لە دهۆک (٠,٩٦%) بوو[١٠٤].

کەرتی گەشتوگوزار لەساڵانی ١٩٨٧-١٩٨٨ بەتەواوی تووشی بارێکی زۆر خراپ هات ئەویش بەهۆی ناسەقامگیری سیاسیی ناوچەکانی کوردستان، کە پێشتر ئاماژەمان پێکردبوو.

جێگای ئاماژەیە هەرچەندە ئەو ڕێبازەی کە حکومەتی عێراق پەیڕەوی دەکرد ڕێبازێکی سۆسیالیستی نەتەوەیی عەرەبی بوو، بەتێڕوانینی بەعس و لەپێناو ئەم حزبەدا بووە، کەچی ئەو ڕێبازە لەسایەی بڕیارەکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش ئەنجام و پێشکەوتنی ئەوتۆی بەخۆیەوە نەدی وسەرنەکەوت.

**دەرئەنجام :**

لە ڕێگای ئەم توێژینەوە گەیشتینە چەند ئەنجامێک کە لەم خاڵانەی خوارەوە ئاماژەیان پێدەکەین:

١- کوردستان بەهۆی پێگە و شوێنە جوگرافیەکەی و ئاووهەوا و بەپیتی جۆری خاکەکەی لە بواری کشتوکاڵ و بەروبوومی زستانە و هاوینە، کاریگەری ئەوتۆی لە بەدەستهێنانی داهاتی نەتەوەیی هەبووە، لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٨٠-١٩٨٨ کەرتی کشتوکاڵ لەکوردستان هەڵکشان و داکشانی بەخۆیەوە بینیوە، ئەمەش لەلایەک بەهۆی هەڵگیرسانی شەڕ لەنێوان عێراق و ئێران، و لەلایەکی تریش بەهۆی ئەو سیاسەتانەی کە حکومەتی عێراق لەڕێگای چەند بڕیارێکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لەعێراق دژ بە ناوچە کوردنشینەکان دەریکردبوو، بەتایبەتی سیاسەتی کاولکردنی گوندەکان و ئەنجامدانی شاڵاوی ڕاگواستن و کیمیاباران و ئەنفال، گۆڕینی پیشەی جووتیار و دامەزراندنیان لە دامودەزگاکانی حکومەت، چوونی بەشێکی بەرچاو لە هێزی کار بۆ بەرەکانی جەنگ و هاوردەکردنی زۆربەی کەرستە خۆراکییەکان لەدەرەوە، و پشتگوێ خستنی کەرتی کشتوکاڵی و چارەسەرنەکردنی گرفتەکانی هەموو ئەمانە کاریگەری ڕاستەوخۆیان لەسەر ئەم کەرتە هەبوو، بووە هۆی لەناوچوونی بەشێکی زۆری زەوی و بەروبوومە کشتوکاڵی و دارستان و کەمبوونەوەی بەرهەم و پاشەکشەی کشتوکاڵ و نەبوونی بەشدارییەکی کارا لە دەستەبەرکردنی ئاسایشی خۆراک لە کوردستان.

٢- کەرتی پیشەسازی فاکتەرێک بوو بۆ ڕەخساندنی هەلی کار بۆ ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی کوردستان، و بە بەرهەمێکی زۆر بەشداری لە پڕکردنەوەی بەشێک لە پێداویستییەکانی بازاڕ دەکرد، بەڵام بەهۆی دەرکردنی هەندێک بڕیار لەلایەن ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە عێراق، لەوانە بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی ڕێکەوتننامەی جەزائیر و هەڵگیرسانی شەڕ لەگەڵ ئێران و

جێبەجێکردنی سیاسەتی ڕاگواستنی بەشێک لە خەڵکی شار و گوندنشینەکان و دوورخستنەوەیان لە زەوی و کێڵگە کشتوکاڵییەکان، و گرنگی نەدان بەلایەنی پسپۆری و شارەزایی و پێشکەوتنی زانستی لەدامەزراوە پیشەسازییەکان، هەر بۆیە ژمارەیەکی زۆری کارگەکان لەکار کەوتن و بەرهەم کەمی کرد، ئەوە سەرباری لەناوبردنی ڕێژەیەکی زۆری هێزی کار و بردنیان بۆ بەرەکانی جەنگ، هەموو ئەمانە هۆکار بوون بۆ دواکەوتوویی و لاواز بوونی کەرتی پیشەسازی لە کوردستان.

٣ – کەرتی بازرگانی بایەخێکی تایبەتی لە ئابووری کوردستان بۆ خۆی داگیر کردووە و کاریگەری بەرچاوی لەسەر چالاکییە ئابوورییەکانی ناوچەکە داناوە، ئەمەش بەهۆی تایبەتمەندی ڕەوشی جوگرافییەوە بووە، هەروەها بازرگانی یەکێک بووە لەو چالاکییانەی کە دانیشتوانی کوردستان لە کۆنەوە ئەنجامیانداوە. سەرەڕای کاریگەری شەڕی عێراق و ئێران لەسەر دواکەوتنی بازرگانی لە کوردستان، بەڵام دەرکردنی چەند بڕیارێک لەلایەن ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە عێراق کاریگەری ڕاستەوخۆیان لەسەر ڕەوشی بازرگانی لە ناوچەکانی کوردستاندا هەبووە، لە ساڵانی ١٩٨٠-١٩٨٨ کەرتی بازرگانی لە کوردستان هەڵکشان و داکشانی بەخۆیەوە بینیوە، بەتایبەتی بڕیاری کاولکردن و وێرانکردنی بەشێک لە گوند و قەزاکانی کوردستان و ڕاگواستنی خەڵکی ئەم ناوچانە بۆ کۆمەڵگا زۆرەملێیەکان و سەرهەڵدانی دیاردەی بێکاری و دانانی ئابلۆقەی ئابووری بەسەر بەشێک لە ناوچەکانی کوردستان، کە بووە هۆکاری کەمبوونەوەی بەرهەم و سستبوونی پرۆسەی ئاڵوگۆڕکردنی کاڵاکان و دواکەوتنی کەرتی بازرگانی لە کوردستان.

٤- کەرتی گەشتوگوزار، ئەم کەرتە بەهۆی بوونی هاوینەهەوار و شوێنە دێرین و دیمەنە سروشتییە سەرنجڕاکێشەکانی کوردستان هەر لە کۆنەوە سیمایەکی جوانی گەشتیاری هەبووە کە بووەتە هۆکارێکی

سەرنجراکێش بۆ فراوانبوونی ژمارەی گەشتیاران لە ناوچەکەدا، لەماوەی سالآنی ١٩٨٠-١٩٨٨ حکومەتی عێراق لەڕێگەی دەرکردنی چەند بڕیارێکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە عێراق تاڕادەیەک گرنگی بەم کەرتە داوە لەهەندێک ناوچەی کوردستان، بەلآم ئەم گرنگیدانەی حکومەت بۆ خزمەتی کەرتی گەشتوگوزار لە کوردستاندا نەبووە، بەلْکو مەبەستی حکومەت شاردنەوەی شکستەکانی سوپاکەی بوو لە بەرەکانی جەنگ، هەروەها هەولْەکانی حکومەت بۆ ئەوە بوو کە زۆربەی داهاتەکانی ئەم کەرتە بۆ وەبەرهێنەرانی عەرەب بێت، جگە لەوەی کە ویستی ژمارە، هاونیشتمانیانی عەرەب لە کوردستان زیاد بکات، بەلآم بەهۆی ناسەقامگیری سیاسیی کوردستان بەهۆی سیاسەتەکانی حکومەت بەرامبەر دانیشتوانی کوردستان لەلایەک و شەڕی عێراق و ئێران و شەڕی هێزەکانی پێشمەرگە و سوپای عێراق لەلایەکی تر، کەرتی گەشتوگوزار ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ڕووی لەدواکەوتن کرد و ژمارەی گەشتیاران تا سالْی ١٩٨٨ بەڕێژەیەکی بەرچاو کەمی کرد.

٥- بەهۆی دەرکردنی چەند بڕیارێک لەلایەن ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە عێراق لەماوەی نێوان سالآنی ١٩٨٠-١٩٨٨، کوردستان تووشی دارمان و لاوازبوون چوو نەتوانرا کەرتە ئابوورییەکان لە کوردستان لەپێناو دانیشتوانی ناوچەکە بەشێوەیەکی ڕێک و تەندروست بەکاربهێنرێت، بەلْکو لەپێناو بەدیهێنانی سیاسەتی لەناوبردنی ئابووری کوردستان بەکارهێنرابوو.

## پەراوێز و سەرچاوەکان:

[1] محمد علي زيني، الاقتصاد العراقي في ظل نظام صدام حسين، مؤسسة الرافد للنشر والتوزيع، لندن،١٩٩٥، ص٢٥١-٢٩٨.

[2] الجمهورية العراقية، وزارة الخارجية،اللجنة الاستشارية،النزاع العراقي –الايراني (ملف وثائقي )،كانون الثاني ١٩٨١، ص٢١٤.

[3] عەلی تەتەر توفیق نێرەوەیی،بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کورد لە کوردستانی عێراق لە ساڵەکانی جەنگی عێراق- ئێراندا ١٩٨٠-١٩٨٨، تێزی دکتۆرا، زانکۆی دهۆک، ٢٠٠٨، ل١.

[4] عباس النصراوي، الاقتصاد العراقي، ت : محمد سعيد العزيز، دار الكنوز الادبية، بيروت،١٩٩٥، ص١٢٦-١٣٥.

[5] ئەم ئەنجومەنە لە مانگی نیسانی ١٩٦٣ لەلایەن سەرکردایەتی کودەتاچییەکان لە عێراق پێکهات، تاکو ببێتە سەرچاوەی دەسەڵات و ڕژێمی نوێی عێراق لەو سەردەمەدا، تا وای لێهات بووە خاوەنی دەسەڵاتێکی ڕەها و فراوان لەبواری یاسادانان و جێبەجێکردندا، وەک دانان و لادانی وەزیرەکان . هەروەها سەرکردایەتیکردنی هێزە چەکدارەکان و پۆلیس و پاسەوانی نەتەوەیی، ئەم ئەنجومەنە لە ١٨ کەس پێکهاتبوون کە زۆرینەیان لەلایەن حزبی بەعس قۆرخ کرابوون، کارو بڕیارەکانی ئەنجومەن بریتی بوو لە پەیڕەوکردنی سیاسەتی ڕەشەکوژی و چەسپاندنی بنەماکانی ڕژێمی دیکتاتۆری لە عێراق، لەماوەی دەسەڵاتی ئەم ئەنجومەنەدا گەلی عێراق بەگشتی و گەلی کورد بەتایبەتی دووچاری جەور و ستەمی زۆر ببوونەوە، بڕوانە : حەسەن ئارام، مەوسوعەی پارتە سیاسییەکانی کوردستان و عێراق ١٩٠٨-٢٠٠٥، چاپخانەی ڕەهەند، سلێمانی،٢٠١٢، ل ٢٤٠-٢٤١.

[6] جبار قادر، طارق جامباز، قرارات مجلس قيادة الثورة المنحل الخاصة بالكورد وكوردستان، مطبعة الحاج هاشم، أربيل،٢٠١٣، ص١٨٣-١٨٥.

[7] سەلاحەددین حەفید، ئابووری کوردستان (١٩٧٧ – ١٩٩٠ )، بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان، سلێمانی : ٢٠٠٠،ل ١١١ ؛ عەبدوڵڵا غەفور، جوگرافیای کوردستان، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٠٥، ل٢٩٥.

[8] ڕێبوار خالد مصطفى، پارێزگای سلێمانی (١٩٦٨-١٩٨٨) توێژینەوەیەکی مێژوویی ئابووری، ماستەرنامە (بڵاونەکراوە)، کۆلێژی ئەدەبیات، بەشی مێژوو، زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر،٢٠١٤، ل ٣١-٣٦.

(٩) ساکار محمد حسن گەردی،ڕۆڵی دانەوێڵە لە زامنکردنی ئاسایشی خۆراک لە هەرێمی کوردستان، ماستەر نامە (بڵاونەکراوە )، کۆلێجی زانستە مرۆڤایەتییەکان، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٨، ل ٥٢-٨٤.

(١٠) هەمان سەرچاوە، ل ٤٢.

(١١) ئومێد نوری حەمە ئەمین، سەرچاوە بنچینەییەکانی کشتوکاڵ و ئەمنی خۆراک لە کوردستاندا، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە (٤) ساڵی حەوتەم، سلێمانی،١٩٩٩، ل٢١٥-٢٢٣.

(١٢) ئازاد نەقشبەندی، هەڵسەنگاندنی جیۆپۆلەتیکی توخمە سروشتییەکانی هەرێمی کوردستانی عێراق، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (٢٣) ساڵی پێنجەم، هەولێر، ٢٠٠٠، ل ٦ ؛ جزا توفیق طالب، المقومات الجیوبولتیکیة للامن القومی فی اقلیم کردستان، مرکز کردستان للدراسات الاستراتجیة، السلیمانیة،٢٠٠٥، ص٦٩-٧٧.

(١٣) ابراهیم شریف وعلي حسین الشلش، جغرافیة التربة، مطبعة جامعة بغداد، بغداد، ١٩٨٥، ص٩٣-٩٦.

(١٤) شاکر خصباک، العراق الشمالی (دراسة لنواحیه الطبیعیة والبشریة)، مطبعة شفیق، بغداد، ١٩٧٣، ص ٣٠- ٣١؛ عەبدوڵڵا عامر عومەر، بەرز و نزمی ڕووی زەوی هەرێمی کوردستان، جیۆگرافیای هەرێمی کوردستانی عێراق، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ١٩٩٨، ل ٥٤-٥٩ ؛ محمد عبدالله الهوني، التحلیل الجغرافي للاستیطان الریفي فی اقلیم کردستان، مرکز الدراسات الاستراتیجیة، السلیمانیة، ٢٠٠٥، ص٨٤-٨٧.

(١٥) کامەران تاهیر سەعید، جوگرافیای عێراق (مرۆیی و چالاکی ئابووری )، چاپخانەی نارین، هەولێر، ٢٠١٤، ل ١٣٦-١٥٥.

(١٦) جبار قادر، طارق جامباز، المصدر السابق، ص١٨٣-١٨٨.

(١٧) ئەم خشتەیە لەلایەن توێژەران ئامادەکراوە بەپشت بەستن بەم سەرچاوانە : الامانة العامة لادارة الزراعة والاصلاح الزراعي لمنطقة الحکم الذاتي، مدیریة التخطیط والمتابعة،التقاریر السنویة لمتابعة ماتم تنفیذه من مؤشرات خطة عمل الامانة العامة لادارة الزراعة والاصلاح الزراعي للسنوات (١٩٨٠-١٩٩٠) طبع في المطبعة الوطنیة، بغداد، ١٩٩٢، ص ١٨-١٢٩ ؛ الجمهوریة العراقیة، وزارة التخطیط، الجهاز المرکزي للاحصاء، مجموعة الاحصاءات السنویة للسنوات ١٩٧٠-١٩٨٨، طبع في المطبعة الوطنیة، بغداد، ١٩٩٠، ص ٤٧-١٤٨ ؛ محسن ابراهیم احمد، واقع القطاع الزراعي فی اقلیم کردستان العراق وسبل تنمیته خلال المدة (١٩٧٤-١٩٩٣)، رساله ماجستیر (غیرمنشورة)، مقدمة الی مجلس کلیة

الادارة والاقتصاد في جامعة صلاح الدين – اربيل، ١٩٩٤، ص٩٥ ؛ ناهدة احمد محمود، دراسة امكانات منطقة كردستان للحكم الذاتي ودورها في تحقيق الامن الغذائي في العراق، رسالة مقدمة الى مجلس كلية الادارة والاقتصاد، جامعة صلاح الدين–اربيل،١٩٩٢، ص٧٢– ١٠٦.

(١٨) الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء،مجموعة الاحصاءات السنوية للسنوات ١٩٧٠–١٩٨٨، المصدر السابق ١٢٨–١٣٣.

(١٩) الوقائع العراقية، "جريدة "، ع( ٢٨٤٣)،١٩٨٠/٨/٣، ص٢٢.

(٢٠) الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء، المصرف الزراعي التعاوني، المركز العام، التقارير السنوية للمصرف الزراعي التعاوني للسنوات (١٩٧٤–١٩٨٨)، ص٤٧، غير منشورة.

(٢١) دلێر أسماعيل حقي، العامل الكردي في الحرب العراقية – الايرانية، مجلة (جامعة صلاح الدين )، جلد (١)،ع (٢)، هولير، ١٩٩٩، ص١٢.

(٢٢) ئەمین قادر مینە، تەرحیل تەعریب تەبعیس، چ٢، سەنتەری ستراتیجی كوردستان،سلێمانی، ١٩٩٩، ل١٠٠–١٠١

(٢٣) ڕێبوار خالد مصطفى، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤٧.

(٢٤) دیدار لەگەڵ تاهیر وەسمان عەبدوڵلا، ساڵی ١٩٣٨ لەگوندی كەور سەربە پارێزگای هەولێر لەدایک بووە، ناوبراو تا ساڵی ١٩٨٨ بەكاری جووتیاری خەریک بووە، دوای شالاوی ڕاگواستن لەلایەن ڕژێمی بەعس گواستراوەتەوە بۆ هەولێر، ئێستاش لە شاری هەولێر نیشتەجێیە، بەردەوامیشە لەسەر چاندنی بەروبوومی دانەوێڵە . هەولێر،٢٢ ئەیلوولی ٢٠١٥.

(٢٥) گۆران مصطفى محمد،كاریگەرییە ئابوورییەكانی پڕۆسەكانی جینۆسایدی گەلی كورد لە گەرمیان، دبلۆمی باڵا لە ئابووری (بڵاونەكراوە )، كۆلێژی كارگێڕی و ئابووری، زانكۆی سەلاحەددین – هەولێر، ٢٠٠٥، ل ٤٨.

(٢٦) غفور مخموري، تعريب كوردستان، مطبعة ڕۆژهەلات، اربيل، ٢٠١٣، ص٤٩–٥٠.

(٢٧) الوقائع العراقية، "جريدة "، ع (٢٨٣٠)، ١٩٨١/٥/١٨،ص١٢١.

(٢٨) الوقائع العراقية، "جريدة "، ع(٢٨٥٦)، ١٩٨١/١١/٢، ص١٠٤٩.

(٢٩) خليل اسماعيل محمد، مؤشرات سياسة التعريب والتهجير في اقليم كردستان العراق، ط٢، مطبعة جامعة صلاح الدين – اربيل، ٢٠٠٢، ص٢٦ ؛ قرار مجلس قيادة الثورة تشكيل لجنة تنفيذ للاشراف على بناء المجمعات السكنية في المحافظات الوسطى والجنوبية رقم (١٣٩١) ؛ الوقائع العراقية،ع( ٢٨٥٦) ١٩٨١/١١/٢، ص١٠٢.

(٣٠) بەختیار صابر محمد، الريف الكردستاني، الواقع الاقتصادي– الاجتماعي وملاحظات بشأن اعمار القرى الكردية، منشورات أعلام المركز الرابع للاتحاد الوطني الكردستاني، د . مط، ١٩٩٢، ص ٥ .

(٣١) ليلاف حمدامين عزيز، الحقوق السياسية للكرد فى الدول التي ضم كردستان، مؤسسة حمدي للطباعة والنشر، السليمانية، ٢٠٠٧، س١١٥.

(٣٢) چیا، ئەمنی ستراتیجیی عێراق و سێكوچكەی بەعس یان "تەرحیل، تەعریب، تەبعیس "، لە بڵاوكراوەكانی دەزگای ناوەندی ڕۆشنبیریی كۆمەڵە، ئایاری ١٩٨٧، ل٢١٤.

(٣٣) غفور مخموري، المصدر السابق، ص٤٨-٥١.

(٣٤) نەوشیروان مستەفا ئەمین، پەنجەكان یەكتری دەشكێنن، چ٢، سلێمانی،١٩٩٨، ل٢٥٦-٢٥٨.

(٣٥) ڕێبوار خالد مصطفى، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥١-١٥٢.

(٣٦) جبار قادر، طارق جامباز،المصدر السابق، ص٢٠٦.

(٣٧) سوپای میللی لە ٨-٢-١٩٧٠ بەپێی بڕیاری ژمارە (٣٥٥) ی ئەنجومەنی سەركردایەتی شۆڕش لەعێراق دامەزراوە، ئەم سوپایە دامەزراوەیەكی حزبی بووە بەسیمایەكی سەربازی،لەناوەڕاستی حەفتاكانی سەدەی ڕابردوو ژمارەیان گەیشتە (٥٠) هەزار چەكدار، دواتر ئەم ژمارەیە دووبەرامبەر زیادی كردو گەیشتە ١٠٠ هەزار چەكدار . بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە، حزب البعث العربي الاشتراكي، القيادة القومية، مكتب الثقافة والاعلام، المنهاج الثقافي المركزي، دار الحرية للطباعة، بغداد،١٩٨٥، ص٢٠٦-٢٠٧.

(٣٨) عبدالمجيد عبدالرزاق (مام قادر)، مذكرات، مطبعة آزادي، اربيل،٢٠١٢، ص١٤٣-١٤٤.

(٣٩) كەریم یەڵدز، كورد لە عێراق، و: شاهۆ بورهان، چاپخانەی كاردۆ، سلێمانی،٢٠٠٧، ل١١١.

(٤٠) بێ ناوی نووسەر، كارەساتی منعی تەجەولی ١٩٨٥ شاری سلێمانی،چاپخانە و ئۆفسێتی شڤان،سلێمانی،٢٠٠٢، ل١٦ -١٢١.

(٤١) نەوشیروان مستەفا ئەمین، خولانەوە لەناو بازنەدا - دیوی ناوەوەی ڕووداوەكانی كوردستانی عێراق ١٩٨٤-١٩٨٨، چاپ و بڵاوكردنەوەی مەڵبەندی ئاوەدانی كوردستان، بێ شوێنی چاپ، ١٩٩٩، ل٢١٩.

(٤٢) جاسم محەمەد محەمەد عەلی، ڕۆڵی هۆكارە سیاسییەكان لە دابەشبوونی دانیشتوان لە پارێزگای سلێمانیدا، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل١٨٥.

(٤٣) عەلی تەتەر نێروەیی، سیاسەتی حکومەتی عێراق لە کوردستان لەسایەی بەڵگەنامە فەرمییەکاندا (١٩٧٥-١٩٩١)، ب٢، چاپخانەی زانکۆیا دهۆک،(دهۆک ٢٠١٠)، ل٢٥٤.

(٤٤) میدڵ ئیست وۆچ، جینۆساید لەعێراق و پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد، و: سیامەندی موفتی زادە، چاپخانەی خاک، سلێمانی، ١٩٩٩، ل١٦٦.

(٤٥) هەمان سەرچاوە، ل١٣٥ ؛ غفور مخموري، المصدر السابق، ص ٥٢.

(٤٦) قارەمان حەیدەر ڕەحمان، بزووتنەوەی ڕۆشنبیری کوردی لە شاری هەولێر ١٩٧٥-١٩٩١، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر،٢٠١٦، ل٣٧-٣٨.

(٤٧) آزاد محمد سعيد، كوردستان في استراتيجية القوى الكبرى (القرن العشرون ومابعد)، اطروحة دكتورا (غيرمنشورة) مقدمة الى مجلس كلية القانون والسياسة، جامعة صلاح الدين –اربيل، ٢٠١٠، ص١٦٣-١٦٤.

(٤٨) یادگار خدر ڕەشید، شیکردنەوەی جوگرافی دابەشبوونی پیشەسازی لە پارێزگای هەولێر، نامەی ماستەر "بڵاونەکراوە"، پێشکەش بە زانکۆی سەلاحەددین کۆلێژی ئەدەبیات – بەشی جوگرافیا کراوە، ( هەولێر- ٢٠١٤)، ل١.

(٤٩) صلاح الدين محمد الحفيد، الوضع الاقتصادي في كردستان العراق وأهم المشاكل (اقتصاديات محافظة أربيل )، الجزء الثاني، بدون اسم المطبعة، اربيل، ١٩٩٣، ص٦٤.

(٥٠) نسرين سليمان حسين، النشاط الصناعي للمنشآت الصناعية الكبيرة للقطاع العام في محافظة أربيل (دراسة تحليلية للفترة ١٩٩٧-٢٠٠٠)، رسالة (غير منشورة) مقدمة الى مجلس كلية الادارة والاقتصاد في جامعة صلاح الدين – اربيل، ٢٠٠٢، ص٤٢-٤٥.

(٥١) كاظم حبيب، لمحات من نضال حركة التحرر الوطني للشعب الكردي في كردستان العراق، ط٢، دار آراس للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠٥، ص٥٠٨ ؛ جەمال فەتحوڵڵا تەیب، بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە باشووری کوردستان (١٩٧٥/٣/٢١ – ١٩٨٠/١١/٢٨)، چاپخانەی شەهاب،هەولێر،٢٠١٢، ل١٤٧.

(٥٢) یادگار خدر ڕەشید، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤.

(٥٣) ئەم خشتەیە لەلایەن توێژەران ئامادەکراوە بەپشت بەستن بەم سەرچاوانە : الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء – نتائج الاحصاء السنوي للمنشآت الصناعية الكبيرة والصغيرة فى محافظة اربيل للسنوات ١٩٧٦-١٩٨٩، مطبعة الوطنية، بغداد،١٩٩٠، ص ٤٧-٤٨ ؛ ياسين رسول يونس، تحليل مسار الصناعات التحويلية في محافظة اربيل للمدة ١٩٧٥-٢٠٠٢، اطروحة مقدمة الى مجلس كلية الادارة والاقتصاد في جامعة صلاح الدين –اربيل، ٢٠٠٥،

ص٢٤؛ نوزاد محمد حسن، واقع وآفاق التنمية الصناعية في منطقة كردستان للحكم الذاتي، رسالة ماجستير (غيرمنشورة )، مقدمة الى كلية الادارة والاقتصاد، جامعة صلاح الدين –اربيل، ١٩٩٢، ص٩٧-١٤٢؛ نسرين سليمان حسين، المصدر السابق، ص٤٢-٤٣.

(٥٤) ئەم خشتەیە لەلایەن توێژەران ئامادەکراوە بەپشت بەستن بەم سەرچاوانە : الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء – نتائج الاحصاء السنوي للمنشآت الصناعية الكبيرة والصغيرة في محافظة السليمانية للسنوات ١٩٧٦-١٩٨٩، مطبعة الوطنية، بغداد، ١٩٩٠، ص٩٨-٩٩؛ نوزاد محمد حسن، المصدر السابق، ص٩٧-١٣٩ .

(٥٥) الوقائع العراقية، ع(٢٨٠٨)،١٩٨٠/١٢/٢٢، ص١٦١١.

(٥٦) حبيب محمد فرحان، سياسة التنمية الاقليمية ودورها في تنشيط مساهمة القطاع الصناعي الخاص في التنمية المكانية (منطقة اقليم اربيل)، رسالة ماجستير (غيرمنشورة)، مقدمة الى كلية الادارة والاقتصاد، جامعة بغداد، ١٩٩٠، ص٣٩.

(٥٧) ئەم خشتەیە لەلایەن توێژەران ئامادەکراوە بەپشت بەستن بەم سەرچاوانە : الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء – نتائج الاحصاء السنوي للمنشآت الصناعية الكبيرة والصغيرة في محافظة دهوك للسنوات ١٩٧٦-١٩٨٩، مطبعة الوطنية، بغداد، ١٩٩٠، ص١٤٧-١٤٨؛ نوزاد محمد حسن، المصدر السابق، ص٩٧-١٤٦.

(٥٨) بۆ زانیاری زیاتر لەسەر بڕی پارەی دیاریکراو بۆ پارێزگاکانی کوردستان بڕوانە : الوقائع العراقية، ع(٢٨١٢)، ٥ /١٩٨١/١، ص١١٠٢ .

(٥٩) الوقائع العراقية، ع(٢٨٤٦)،١اب/١٩٨١، ص١١٠١

(٦٠) الوقائع العراقية، ع(٢٨٤٧)،٣١/اب/١٩٨١، ص١١٢١.

(٦١) الوقائع العراقية، ع( ٢٨٥٦)،١٩٨١/١١/٢، ص١٠٤٩.

(٦٢) الوقائع العراقية، ع( ٢٨٧٤)،١٩٨٢/٣/٨، ص١٢٣٠.

(٦٣) آزاد شكور صالح، قوانين تشجيع الاستثمار في العراق واقليم كوردستان العراق، مؤسسة O.P.L.C للطباعة والنشر، كوردستان،٢٠٠٦، ص٨٧.

(٦٤) المصدر نفسه، ص٨٤.

(٦٥) محمد صابر كريم، شەڕی ناوەخۆ لە کوردستان، زنجیرە نووسراوە نەتەوەییەکان (ب.ش)،کانوونی دووەمی ١٩٩٦، ل١٠-١٥.

(٦٦) کەریم یەڵدز، سەرچاوەی پێشوو، ل١١١.

(٦٧) فيصل زيدان سهر، التصنيع والصادرات في الدول النامية مع اشارة الى العراق، رسالة ماجستير (غير منشورة)، مقدمة الى كلية الاداره والاقتصاد، جامعة المستنصرية، بغداد، ١٩٧٩، ص١٨-٢٢.

(٦٨) عەبدوڵڵا غەفور، جوگرافیای باشووری کوردستان، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، چ٢، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٤٣٢.

(٦٩) صلاح الدين محمد الحفيد، المصدر السابق، ص٧٨.

(٧٠) يوسف السلطان وآخرون، جغرافية النقل والتجارة الدولية، جامعة البصرة، ١٩٨٨، ص٢٠.

(٧١) صلاح الدين محمد الحفيد، المصدر السابق، ص٧٨-٧٩.

(٧٢) دیدار لەگەڵ ئاراز محمد هەینی، ناوبراو ساڵی ١٩٣٢ لەشاری هەولێر لەدایک بووە، ساڵی ١٩٥٢ قۆناغەکانی خوێندنی تەواو کردووە، لە ساڵی ١٩٥٨- ٢٠١٢ کاری بازرگانی کردووە، ئێستاش کوڕەکانی کارەکەی ئەو بەڕێوە دەبەن، دانیشتووی شاری هەولێرە . ٢٠١٦/٦/٢٢.

(٧٣) خطب صكار العاني، جغرافية العراق (ارضا وسكانا وموارد اقتصاديا)، مطابع دار الحكمة والنشر، القاهرة، ١٩٨٨، ص٣٦٨-٣٦٩.

(٧٤) ڕێبوار خالد مصطفى، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٧-١٠٥.

(٧٥) بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ڕێگاوبانە ناوەخۆیی و نێودەوڵەتییەکانی هەرێمی کوردستان بڕوانە : هاوڕێ یاسین، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٠٤-٣١١.

(٧٦) سيف سالم القايدى، الجغرافيا الاقتصادية، دار القلم للنشر والتوزيع، بغداد،١٩٩٩،ص٤٥٦-٤٥٧.

(٧٧) ڕێبوار خالد مصطفى، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٦-١٠٧.

(٧٨) ئەم خشتەیە لەلایەن توێژەران ئامادەکراوە بەپشت بەستن بەم سەرچاوانە : الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء،( التجارة الخارجية أرقام ومؤشرات ) للفترة (١٩٦٨-١٩٩٠)، جداول غير منشورة ؛ الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط،الجهاز المركزي للاحصاء - احصاءات التجارة العامة للفترة ١٩٨١-١٩٨٩، بيانات وجداول غير منشورة ؛ عطوف عبدالمهيمن البارزاني، أثر الصادرات النفطية في النمو الاقتصادي للعراق وانعكاساته على أقتصاد اقليم كوردستان، بدون مطبعة ومكان وسنة الطبع، ص٧٢ ؛ صلاح الدين محمد الحفيد، المصدر السابق، ص٨٠ ؛ عەبدوڵڵا غەفور، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٧٧-٤٢٨.

(٧٩) گولـدران عبـدالرحيم عزيـز، واقـع النشـاط التجـاري فـي اقلـيم كوردسـتان – العراق،رسالة ماجستير (غير منشورة)، مقدمة الى كلية الادارة والاقتصـاد، جامعـة دهۆك، دهۆك، ١٩٩٩، ص٤٥- ٤٦ .

(٨٠) دیدار لەگەڵ ئاراز محمد هەینی، هەولێر . ٢٠١٦/٦/٢٢.

(٨١) الوقائع العراقية، ع( ٢٨٤٧)،١٩٨١/٨/٣١، ص٨١٩.

(٨٢) دیدار لەگەڵ ئاراز محمد هەینی، هەولێر . ٢٠١٦/٦/٢٢.

(٨٣) ڕێبوار خالد مصطفى، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٧.

(٨٤) دیدار لەگەڵ ئاراز محمد هەینی، هەولێر . ٢٠١٦/٦/٢٢.

(٨٥) محمد عبدالفتاح احمد، طايح عبداللطيف طه، الجغرافيا السياحية، دار الوفـا للنشـر، الاسكندرية،٢٠٠٧، ص٧٣.

(٨٦) محمد منير حجاب، الاعلام السياحي، دار الفجـر للنشـر والتوزيـع، ط(٢)، القـاهرة، ٢٠٠٣، ص٢٢.

(٨٧) مثنى معـان ابراهيم، تحليل واقـع الاسـتثمار السـياحي في العـراق للمـدة ١٩٨٠- ١٩٩٧، وامكانات تطويره، رسالة ماجستير (غير منشورة )، مقدمة الى كلية الادارة والاقتصاد، جامعة المستنصرية، بغداد، ١٩٩٩، ص٤١-٤٢.

(٨٨) عبدالمطلب محمود الخوام، العلاقة بين الاستثمارات السياحية وتاثيرات البيئـة مـع اشارة خاصةلتجربة العراق، اطروحة دكتوراه، مقدمة الى كليـة الادارة والاقتصـاد، جامعة المستنصرية، بغداد، ٢٠٠١، ص٣٣.

(٨٩) اسماعيل العربي، هيئة الامـم المتحـدة والتنميـة الاقتصـادية في البلـدان المتطـورة، دار الآفاق الجديدة، بيروت، دون سنة الطبع، ص١٩٥.

(٩٠) نضـال عبـاس الجـواري، ادارة وكـالات وشـركات السـياحة والسـفر، دار البركـة للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٣، ص٢٢٤-٢٣٢.

(٩١) الوقائع العراقية، ع( ٢٧٦٥)،١٩٨٠/٣/٢٤،ص٥٠٩

(٩٢) دیدار لەگەڵ حاجی خالد محمد کەریـم، نـاوبراو سـاڵی ١٩٣٤ لە قەزای دوکـان لەدایـک بـووە، هەر لەتەمەنـی لاویـدا بەپیشـەی کشـتوکاڵ و بازرگـانی خەریـک بووە، لەساڵی ١٩٧٧ -١٩٩٩ لەکەرتی گەشـتیاری کـاریکردووە، خـاوەن کافتریـای گەشـــتیاران بـــووە لە هـــاوینەهەواری بێخـــاڵ، یەکێـــک بـــووە لەو کەســـانەی کە سوودمەند بووە لە بڕیاری ژمارە (٣٥٣) کە لەساڵی ١٩٨٠ لەلایەن ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش دەرچووبوو، هەولێر، ٢٠١٦/٦/٢٢.

(٩٣) الوقائع العراقية، ع(٢٨٤٢)، ١٩٨١/٧/٢٧، ص٢٠١.

(٩٤) دیدار لەگەڵ حاجی خالد محمد کەریم، هەولێر، ٢٠١٦/٦/٢٢.

(٩٥) الوقائع العراقية، ع(٢٨٨٦)، ١٩٨٢/٥/٣١، ص٣٤٢.

(٩٦) گۆران مصطفى محمد، سەرچاوەی پێشوو، ل٣١-٣٢.
(٩٧) دیدار لەگەڵ حاجی خالد محمد کەریم، هەولێر، ٢٠١٦/٦/٢٢.
(٩٨) الوقائع العراقية، ع(٤٦٦)، ١٩٨٣/٩/٢٠، ص٤٤٦-٤٤٧.
(٩٩) دیدار لەگەڵ حاجی خالد محمد کەریم، هەولێر، ٢٠١٦/٦/٢٢.
(١٠٠) محمد على زيني، المصدر السابق، ص٢١٠.
(١٠١) الوقائع العراقية، ع (٣٠٧٦)، ١٩٨٥/١٢/١٦، ص٨٣٨.
(١٠٢) دیدار لەگەڵ حاجی خالد محمد کەریم، هەولێر، ٢٠١٦/٦/٢٢.
(١٠٣) الوقائع العراقية، ع(٢٢٤٨)، ١٩٨٦/١٠/٢٢، ص٧٤٥.
(١٠٤) زكي حسين قادر، قياس وتحليل البطالة في مدينة اربيل، اطروحة دكتورا (غير منشورة)، كلية الادارة والاقتصاد، جامعة صلاح الدين – اربيل، ٢٠١٣، ص١٤٢.

**ملخص البحث**

موضوع هذا البحث عبارة عن دراسة تأريخية حول تأثير قرارات مجلس قيادة الثورة في العراق على اقتصاد كوردستان العراق ما بين سنوات ١٩٨٠-١٩٨٨. وفيها حاولنا دراسة تلك التأثيرات أعني تأثيرات قرارات مجلس قيادة الثورة في تلك الفترة على القطاعات الاقتصادية منها القطاع الزراعي والصناعي والتجاري والسياحي، بإسلوب علمي. ويتكون البحث من مقدمة و ثلاثة مباحث.

وفي هذه الدراسة سلطنا الضوء على تلك القرارات التي أثرت بشكل مباشر على الظروف الإقتصادية في كوردستان العراق ما بين سنوات ١٩٨٠-١٩٨٨. ودرسنا تلك العوامل المساعدة والتي إنعكست أثرها على القطاعات الإقتصادية في كوردستان. ونتيجة لذلك نجد أن تلك القطاعات تصاب بالمد والجزر من حين لآخر. تناول المبحث الأول، التحدث بايجاز عن أهم مؤثرات القرارات على نشاطات القطاع الإقتصادي في كوردستان ومن وجهة النظر حاولنا أن نستعرض أهم القرارات التي أثرت بشكل مباشر على أداء نشاط القطاع الزراعي. علاوة على ذلك فقد تعرضنا للأحداث السياسية التي حدثت في تلك الفترة وأثرت بشكل أو بآخر على تأخير وتنمية القطاع الزراعي في كوردستان.

أما في المبحث الثاني : تحدثنا عن تأثير قرارات مجلس قيادة الثورة في العراق على القطاع الصناعي في كوردستان العراق. ففى هذه الفترة نرى أن القطاع الصناعي قد تأثرت بالظروف والأحوال السياسية مدا وجزرا. وقد خصص المبحث الأخير إلى فرعين. ففي الفرع الأول تكلمنا عن تأثير قرارات مجلس قيادة الثورة على القطاع التجاري وتكلمنا عن العملية التجارية من حيث الإستيراد والتصدير لاشباع حاجات المنطقة. ثم سلطنا الضوء بعد ذلك على تأثير قرارات مجلس قيادة الثورة على القطاع السياحي في كوردستان تعرضنا لتلك العوامل التي أثرت على إبطاء وتأخير تنمية السياحة في محافظات أربيل والسليمانية ودهوك. وفي ختام البحث توصل الباحث الى جملة من الاستنتاجات، وملخصا باللغتين العربية والانجليزية.

## Abstract

This topic is a historical research about the impact of revolutionary command council decisions in Iraq on the Kurdistan economic situation during the years 1980-1988. The impact of these decisions which were issued by the revolutionary command council on the agriculture, industrial, trade and tourism's sectors will be academically illustrated. The research includes an introduction and three chapters.

In the research we more focus on these decisions which were issued by the revolutionary command council in Iraq and have directly effect on the Kurdistan economic situation during the years 1980-1988, as a result of those decisions have effect on decline and increased of all sectors in Kurdistan. Therefore in the first chapter, we will point on the influence of these decisions on the agriculture sectors activity in the Kurdistan, also will be tried to show the significant assessment which had a direct effect of the agricultural activity. Moreover, we will present those political events which happened during that time, which had effects in a limited level on the growing and decline agricultural sector in the Kurdistan.

In the second chapter we will talk about the impact decisions of the revolutionary command council in Iraq on the industrial sector in the Kurdistan, according to the political situation during that time, this sector was under the decisions which issued by the revolutionary command council, according to the political situation, the decline and growing have be seen in this sector.

The third chapter of the research is divided into two parts. At the first, we will point the effect of the revolutionary command council's decision on the trade sector; also we will talk about the business process and transportation from export and import substances and materials which necessary to the area. After that, the impact of the decisions on the tourism sector in Kurdistan will be mentioned, furthermore the factors which have effects on the weakening and fails or growing and developing the tourism sector in the Erbil, sulaimanya and duhok.

In the conclusion, we have got some outcomes which will be mentioned in some points. Also we have an abstract of the research by the Arabic and English language.

# نەخش و زەخرەفەی
# سەر کێلەکانی گۆڕستانی گوندی یالآنپێ

**( توێژینەوەیەکی مەیدانییە )**

**م. ی. مەهدی جەلال مستەفا بەرزنجی**
بەشی شوێنەوار– کۆلێژی ئەدەبیات
زانکۆی سەلاحەددین– هەولێر

**پێشەکی :**

ئـەم توێژینەوەیـە تایبەتـە بـە هونـەری نـەخش و زەخرەفـەی سـەر کێلـی گۆڕەکانی گۆڕستانی گوندی یـالآنپێ، کـە دەکەوێتـە سـنووری ناحیـەی خورمـاڵ. لەبەرئـەوەی ناوچـەی شـارەزوور بەگشـتی گونـد و شـار و شارۆچـکەکانیەوە لـە ڕەوڕەوەی مێژوودا گرنگی تایبەتی هەبوو لە ڕووی سیاسی و سەربازی و ئـابووری و کۆمەڵایـەتی و شارسـتانیەتەوە، هـەروەها لـە ڕووی ڕۆشـنبیری و زمانـەوانی و ئـەدەبیات و هـۆنراوە و چـەندین کەڵـە شـاعیر و زانـای تێـدا هەڵکـەوتووە، ڕەنگدانەوەی هۆنراوەکانیـان لـە نـاو خـەڵکی نـەك لـە ژیـان و خۆشـیدا بـەڵکو لـە شیوەن و ڕازاندنەوەی کێلی گۆڕەکانیشدا بە شێوازێکی هونـەریی سـەرنجڕاکێش لە بواری خۆشنووسیدا ڕەنگی داوەتەوە.

گۆڕستانی شێخ سلێمان لە گونـدی یـالآنپێ هەشـت کێلـی نەخشـێنراو لـەخۆ دەگرێـت، کـۆنترین کێـل مێژووەکـەی دەگـەڕێتـەوە بـۆ سـاڵی (١٢٠٨ك) بەرامبەر(١٧٩٣ز) ئـەم کێلانـە نـەخش کـراون بەزەخرەفـەی نووسـین ، بـە زمـانی عـەرەبی و فارسـی، جـۆری نووسـینەکان بـریتین (نـوع الخـط) لـە (نسـتعلیق)ی فارسـی، لەگـەڵ جـۆری (نسـخ)ی، عـەرەبی بـەکار هـاتووە، هەنـدێك لەکێلـەکان ڕازێنراوەتەوە بە نەخش و نیگاری ڕووەکی شێوە گـەڵا و گـوڵ بـەدەوری چـیوەی کێلەکەدا هەڵکۆڵدراوە.

ئـــەم کێلانـــە نووســـینە هەڵکەنـــدراوەکانیان زۆر بەئاســـانی و ڕوونـــی دەخوێندرێنەوە تەنها یەك لەو کێلانـە نـەبێت کـە ناتوانرێـت بخوێندرێتـەوە چـەند

وشـەیەکی کـەمی نـەبێت بـەهۆی کاریگـەری کـەش و هـەوا بۆتـە هـۆی داخـورانی پیتەکانی. هەروەها دوو کێلی تر لەم کێلـە نەخشـێندراوانە شـکاون چـەند دێـڕێك نووسینیان لەسەر ماوە.

لەم توێژینەوە مەیدانییەدا جەخت لەسەر مێژوو و شوێنی جوگرافیای گوندی یالآنپێ دەکەین، چونکە گوندەکانی دەوروبەری خورماڵ کەسـانی زانـا و شـاعیر و پیاوچاك و شێخ و بنەماڵەی گەورە و کەسانی ناوداری تێـدا هەڵکـەوتووە، گونـدی یـالآنپێ یەکێکـە لـەو نموونـە زیندووانـەی کـە ڕۆڵـی هـەبووە لـە هونـەری خـۆش نووسین، لە ڕێگای ئەم جۆرە توێژینەوانە دەتوانین دەستنیشانی پێگەی مێـژوویی و شوێنەواریی ناوچەکە بکـەین لـە ڕووی هەڵکەوتـەی کەسـایەتی و بنەماڵـەکان ، هەروەها لە ڕێگای ئەم نەخش و نووسینانەوە کە وەك تۆمارێکی گـرنگ دەتـوانین نـاوی بنەماڵـە و کەسـایەتی و مێـژووی ژیـان و مردنیـان دەستنیشـان بکـەین، لـە ڕێگای ئەم نەخش و زەخرەفانـە کـە لەسـەر بـەرد هەڵکەنـدراون تیشـك دەخەینـە سەرلایەنی هونەری و ڕۆشنبیریی ناوچەکە.

ئەم جۆرە توێژینەوەیە دەبێتە هۆکارێك بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشـاییەی کـە لە کتێبخانە و فەرهەنگی شوێنەواری کوردیدا هەیـە، ئاشـنابوونی خوێنـەری کـورد بە هونەری نەخش و نیگاری سەرکێلەکان چونکە تاوەکو ئێستا تەنها پاشمـاوەی زێڕ و زیوو بیناسازی و پەیکەر وەك شوێنەوار ئەژمار دەکرێت. ئەم نەخشـانە وەك شاکارێکی هونەریی گەورە تۆمـارکراوە، تـاوەکو ئێسـتا نـە تـوانراوە هەسـت بـەو گرنگییـەی بکرێـت کـە بۆتـە بەشـێك لـە سـەرمایەی مێـژوویی و شـوێنەواری نەتەوەکەمان.

## زاراوەی گۆڕستان و گۆڕ:

گۆڕسـتان بـە واتـای شـوێنی بـەخاك سـپاردن و کۆکردنـەوەی مـردووان لـە جێگایەکی دیاریکراودا. لە زمانـەوانی کوردیـدا بـەم شـێوانە هـاتووە (گۆڕسـتان)، (ئارامگـە)، یـان (قەبرسـتان)، (گڵکـۆ)، (مـەزارگا)، لـە زمـانی فارسـیدا بـەناوی (قبرستان) هاتووە (Qabrstan) وە لە عەرەبیدا پێـی وتـراوە (مقـبرة)(١) . مقـبرة لـە وشەی (قبر)ی عەرەبی وەرگیراوە(٢).

گۆڕ شوێنی بەخاك سپاردنی مردووە[٣]. یاخود شوێنی مانەوەی مردووە. زاراوەی گۆڕ لە زمانی عەرەبیدا بە چەند شێوازێك هاتووە، وەك (الضريح، يان الضريح المقدس، (التربة) (مدفن ) (المشهد)، يان (المرقد) (مقام) ، وەبەناوی (القبة) هاتووە وەکو قبەی سەلیبی لە سامەڕا (٢٤٥ه/٨٢٦ن) [٤]. هەندێك گۆڕ هەیە لاشەی مردووەکەی تێدا نییە پێی دەوترێت (تشريفية) واتە شوێنی ڕێزلێنان. هەروەها لە کۆندا بە تابووتی گۆڕی بەردیان وتووە ((الناووس)) (Sarcophagus))، ئەم دیاردەیە بیناکردنی گۆڕ لە بەرد یان هەڵکەندنی لە پێش ئیسلام باو بووە، لە کوردستان ئەم جۆرە گۆڕانە دروست کراوە، وەك گۆڕە بەردینییەکانی ئەشکەوتی (قزقاپان) لە گوندی زەرزی لە ناوچەی سووورداش سەر بە پارێزگای سلێمانی[٥]. لە زۆربەی شارستانیەتە کۆنەکاندا بەکاردەهات وەبەتایبەتی لە بیناسازی سەردەمی فیرعەونیەکان، بەڵام لە سەردەمی دەرکەوتنی ئایینی ئیسلام ئەم شێوازی ناشتنی مردوو لە ناوگۆڕی بەردین و دروستکردنی حەرام کرا ئەم دیاردەیە بەرەو نەمان چوو تەنها خاك بووە شوێنی ناشتنی مردووەکان [٦] .

وە بە هەمان شێوە لە بەشی باکووری ناوچەی (کفری) نزیك بەنداوی (باوە شاسوار) چەندین گۆڕی بەردین هەیە کە لە ناو تاوێرە بەردینییەکانی چیایی باوەشاسوار هەڵکۆڵدراون کە پێیان دەوترێت گۆڕدەخمەکان[٧].

## شوێنی جوگرافیای گوندی یالآنپیّ:

شوێنی جوگرافیای (Local) دەکەوێتە دامێنی چیای هەورامان لە بەشی باکووری ناحیەی خورماڵ بە دووری (٥کم)[٨]. لە ڕۆژهەڵاتیەوە هاوسنوورە لەگەڵ گوندی هانی قوڵکە، لە باکووری خۆرئاوایەوە هاوسنوورە لەگەڵ گوندی عامورە، لە ڕۆژئاوایەوە هاوسنوورە لەگەڵ گوندەکانی بانی شار و شیرەمەڕ[٩].

دەکەوێتە سەر هێڵی پانی (٣٥) باکوور وە هێڵی درێژی (٤٦) ڕۆژهەڵات[١٠]. هەڵکەوتەی ڕووی زەوییەکەی لە شێوەی بەرزی و نزمی پێکهاتووە لێژ دەبێتەوە تاوەکو سەر پێدەشتەکانی خورماڵ. کەش و هەوای ناوچەکە زستانی سارد و بەفروباراناوییە، لە ڕابردوودا لە کۆتایی مانگی چوار شوانکارەکانی ناوچەکە

کۆچیان دەکرد بۆگوندی یالآنپیێ دەچوونە هەوارگەی وشکە ناو تا کۆتـایی مـانگی شەش لەوێ دەبوون، دواتر لە مانگی حەوت دەچوونە شاخی ڕەنگین لـە وێشـەوە بـەرەو کوردسـتانی ڕۆژهـەلآت بـۆ ناوچـەیەك پێیانـدەوت مەیـدانی یـالآنپیێ، شـوانکارەکان لـە سـەرەتای مـانگی نـۆدا دەگەڕانـەوە خورمـالٚ و گونـدەکانی دەوروبەری[11]، ناوچەکە دەوڵەمەندە بە لەوەڕگا و دارسـتانی سروشـتی بەتایبـەت داری بـەڕوو، هـەروەها خەلٚکەکـەی بـە کشـتوکالٚ و باغـداریکردن خـەریك بـوون. ژمارەی دانیشتوانی ئەم گونـدە لـە ئێسـتادا نزیکـەی (٧) مـالٚ دەبێـت، لـە کۆنـدا نزیکـەی(٣٢٠) مـالٚی زیـاتر بـووە لـە ئێسـتادا زۆربـەیان لـە شارۆچـکەی خورمـالٚ نیشتەجێ بوون، ئەم گوندە چەندین جار ڕووبەڕووی کاولکاری بۆتەوە بەهۆی ئـەو شـەڕ و جەنگانـەی کـە ڕووی داوە بەدرێـژایی مێـژووی ناوچـەکە، وەك جـەنگی سـەفەوییەکان و عوسمانییـەکان، یـاخود ئـەو شۆڕشـانەی کـە لـە ناوچـەکەدا ڕوویانداوە وەك شۆڕشی (شـێخ مـەحمودی حەفیـد) لـە سـالٚی (١٩٢٦)دا مسـتەر (کورا نوالیس) و کاپتن (هۆلٚت) موفتی و ئیدارەی سلێمانی چوون بۆ لای شێخ بـۆ ڕێکەوتن لە گونـدی یـالآنپیێ. شۆڕشـی (مـەحموودخانی دزلـی) وەخـەلٚکی گونـدی یـالآنپیێ لـە شۆڕشـی ئـەیلوول لـە سـالٚی (١٩٦١-١٩٧٥ ) بەشـدارییان لـە شـۆڕش کردووە تووشی هێرشی حکومەت بۆتەوە [12]، جەنگی عێراق و ئێـران لـە سـالٚی (١٩٨٠-١٩٨٨) مالٚ وێرانی زۆری بەدوای خۆیدا هێنا بۆ ناوچـەکە بەگشـتی بـووە هۆی تێکچوون و ڕاگواستنی سـەرجەم هاولآتیـانی گونـد و شـار و شارۆچـکەکان و کاولکردنی پێکهاتەی شارستانیەتی ناوچەکە. بڕوانە نەخشەی ژمارە (١).

## واتای گوندی یالآنپیێ:

سەبارەت بـە نـاوی یـالآنپیێ بۆچـوونی جیـاواز هەیـە، یەکـەم: لـە یـەکێك لـە نووسراوەکانی پاشای ئاشووری (سارگۆنی دووەم/ ٧٢٥-٧٠٥ پ.ز) ناوی هەنـدێك هەرێمی هێناوە وەك ئیلليپی (Ellipi)، بەلآم ئیبراهیم حـاجی زەلٚمـی ناوەکـەی بـە هەلٚە تۆمارکردووە بەم شێوەیە نووسیویەتی (ئێلێمپی)[13]. بەبۆچوونی (م. دلٚشاد عەزیز زاموای، قوتابی دکتۆرا، لە زانکۆی لایدن لە هۆلٚەندا ) دوورە لە ڕاسـتی، بـە گوێرەی ئەو توێژینەوەی کە لـە تێـزی دکتۆراکەیـدا باسـی کـردووە ئـەم ناوچـەیە

دەکەوێتە ناوچەی لورستان نێوان سەرپوڵی زەهاو و کرماشان و پشکۆ. بۆچوونی دووەم: کە لە مامۆستا (عەبدولکەریمی مودەڕیس) وەرگیراوە، گوایە لە وشەی (هێلآنپیَ) یەکسانە بە (هێلیان پیا)، سەبارەت بە بۆچوونی سێیەم ئیبراهیم حاجی زەلمی دەڵێت گوایە ناوێکی تورکییە لەکاتی هاتنی کۆچی هۆزی (قەرەقۆینلۆ) مەڕی ڕەش بۆ ناوچەی شارەزوور ، کۆچ پێکردنیان لەگەڵ گوندەکانی (ئێلان قۆز، سوەیلەمێش ، ئووچقوپە، توت ئاقاچ ، ئیلآن — ئالان و حاصلَ ، ناوی (ئیلآنپیَ ) لەم گوندە نراوە[١٤]. لەگەڵ ئەم بۆچوونەی زەلمی هاوڕام ناوەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی عوسمانییەکان کە لە ناوچەکەدا فەرمانڕەوایان کردووە، بۆنموونە لە دەشتی پیرەمەگروون نزیك چیای پیرەمەگروون گوندێك هەیە بەناوی ( یالآن قۆزی)، وە گوندی (یالآن بەگ) لە هەمان ناوچە، وە هەڵکەوتەی تۆبۆگرافیای ناوچەکە بەرزی و نزمی و گردۆڵکەیە لەوانەیە ناوەکەی لە هەڵکەوتەی شوێنەکەوە هاتبێت، چونکە لە زمانی کوردیدا وشەی یالَ بۆ شوێنی بەرز بەکاردێت. هەروەها لە تۆماریساڵنامەی سەردەمی ئاشووریی نوێدا، ناوی هەندێك ناوچە تۆمار کراوە کە دەکەونە هەرێمی زاموای و دەشتی شارەزوور، ناوی (أیلانیو) (Elaniu) هاتووە بەناوی چیا (شاخ) لە لەشکرکێشییەکەی (ئاشوور ناصرپاڵی دووەم) لە ساڵی (٨٨٣– ٨٥٩) پ.ز[١٥].

## شوێنی گۆڕستانی شێخ سلێمان لە گوندی یالآنپیَ:

ئەم گۆڕستانە لەلایەن بنەماڵەی شێخانی گوندی یالآنپیَ دروستکراوە کە مردووی خۆیان تێدا ئەسپەردەی خاك دەکرد، ناوی گۆڕستانی شێخ سلێمانی بەسەردا براوە، چونکە شێخ سلێمان باپیرەگەورەی بنەماڵەی شێخانی یالآنپیَ بووە. دوای مردنی لەم شوێنەدا نێژراوە، لەبەرئەوەی خاوەن کەسایەتییەکی ئایینی گەورە بووە بەناوی شێخ سلێمانی بەسەردا براوە، وە لە ئێستادا دانیشتوانی ناوچەکە بەهەمان شێوە ناوی دەبەن. بەبۆچوونی دانیشتوانی گوندی یالآنپیَ شێخ سلێمان لە ناوچەی لهۆنی هەورامان لە کوردستانی ڕۆژهەلآت کۆچیان کردووە بۆ یالآنپیَ، لە ساڵی (٩٥٠ك/١٥٤٣ ز) بەهۆی زوڵمی (هەسانەکانی هەورامان) کە هاوکات بووە لەگەڵ فەرمانڕەوایی (هەسان سانی هەورامی ) کۆچیان کردووە بۆ هەورامان و ناوچەی یالآنپیَ، شێخەکان لە ڕووی ئایینی

ناکۆکییان هەبووە لەگەڵ (هەسان سان). لە نەوەکانی شێخ کە لە دوای خۆی ماونەتەوە وەك (شێخ عزالدین، شێخ عبدالرحیم، شێخ عبدالله، شێخ ابوبکر) کە ئێستا ناوی ئەم کەسایەتییانە لە دوای مردنیان لەسەر کێلی گۆڕەکان تۆمارکراوە، گوندەکە لە ئێستادا موڵکی یەکێك لە نەوەکانی شێخ سلێمانە[١٦].

ئەم گۆڕستانە دەکەوێتە باشووری خۆرئاوای گوندەکە لەسەر بەرزاییەك کە دەڕوانێتە سەر شارۆچکەی خورماڵ و گوندی بانی شار، ناوچەیەکی فراوان لەخۆ دەگرێت ڕووبەرەکەی نزیکەی (٥٠٠ تا ٧٠٠م٢ ) دەبێت، سروشتی گۆڕستانەکە تاوەکو ئێستا چەندین داری گەورەی بەڕووی تێدایە کە لەلایەن دانیشتوانی گوندەکەوە پارێزراوە وەك بەشێك لە پیرۆزیی گۆڕستانەکە دادەنرێت.

مێژووی ئەم گۆڕستانە بەگوێرەی نووسینی سەر کێلەکان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٢٠٨ك) بەرامبەر (١٧٩٣ز). مێژووەکەی نزیکەی سێ سەد ساڵێك دەبێت، پێدەچێت ئەم گۆڕستانە مێژووەکەی لەوە زیاتر بێت، بەڵام هیچ نووسین یاخود نەخش و زەخرەفەیەك لەسەر هەندێك لەو کێلانەی کە کۆنتر دەردەکەون تۆمار نەکراوە ناتوانین مێژووەکەی بەتەواوی دەستنیشان بکرێت تەنها پشت بەو کێلانە دەبەسترێت کە نووسینی لەسەر تۆمارکراوە بۆ ڕاستی مێژووی گۆڕستانی شێخ سلێمان.




نەخشەی پارێزگای سلێمانی و ناحیەی خورماڵ[١٧].



**خوێندنەوەیـەکی زانسـتییانە بـۆ کێلـە نەخشـکراوەکانی گۆڕسـتانی شـێخ سلێمان:**

ژمارەی کێلە نەخشـێنراوەکانی گۆڕسـتانەکە هەشـت کێلـە، گۆڕەکـان تـەنها یەك کێلیان ماوە جگەلە گۆڕێك نەبێت کە هەردووکێلەکـەی وەك خـۆی ماوەتـەوە، چـونکە زۆربــەی کێلــی مردووەکـان هــەردوو لای نــەخش و زەخرەفــەی لــە ســەر ئەنەخشێت، لە کێلی لای سەری ناوی مردوو و مێژووی مردنەکەی تۆمار دەکرێت وەکێلی لای خوارەوەی بەنووسینی هۆنراوە، یاخود بەئایەتی قورئـانی و نزاکـردن دەڕازێتــەوە وەك وەفایــەك یـاخود دەربڕینــی خــەمباری بەبۆنــەی کۆچــی دوایــی مردووەکـان، لـە هــەمان کاتـدا ڕازاندنـەوەی کێلـەکان بـە نـەخش و زەخرەفـەی ڕووەکی و ئەندازەیی وەك دەربڕینی خۆشەویستی و جیاکردنـەوە و ناسـینەوەی گۆڕەکان لە یەکتری.

## کێلی یەکەم:

ئەم گۆڕە تەنها یەك کێلی ماوە دەکەوێتە بەشی سەرەوەی. بەرزییەکەی (٨٠ سم)، پانی (٣٠ سم) ئەستووری (٥ سم )، جۆری بەردەکەی (مەڕمەڕە)، شێوەی کێل لاکێشەییە کۆتای بەشی سەرەوەی شێوە سێگۆشەیی تیژە، ڕووی ناوەوەی بە زەخرەفەی نووسین لە جۆری نووسینی (ثلث)[١٨]. بەزمانی عەرەبی نووسراوە پێنج دێڕ لەخۆ دەگرێت بەهەمان شێوەی کێلەکانی پێشوو کە هەریەك لە ناو جامەیەکی زەخرەفەی ئەندازەیی داتاشراوە. دێڕی یەکەم لە ناوەوە دەکەوێتە ناو چێوەیەکی لاکێشەیی کە هەردوو گۆشەکەی بە زەخرەفەی ڕووەکی بەگەڵای چەماوەی دوو پەلکی نووك تیژ نەخش کراوە. بڕوانە وێنەی ژمارە (٥) هێڵکاری ژمارە (٤).

١- سنة ١٢٠٨هـ .
٢- هذا قبر المرحوم المبرور.
٣- المغفور الشيخ عزيز.
٤- ابن المرحوم الشيخ نور .
٥- الله غفر الله لهما .

١- بەرامبەر ساڵی١٧٩٣ز.
٢ - ئەمە گۆڕی خوا لێخۆشبوو ڕێزدار.
٣- خودا لێی خۆش بێت شێخ عزیز .
٤- کوڕی خوا لێخۆشبوو شێخ نوراللە.
٥- خودا لێیان خۆش بێت .[١٩]


وێنەی ژمارە (٥) توێژەر


هێڵکاری توێژەر (٤)

ئەو كێڵانەی كە لەسەر گۆڕەكان مابوون ژمارەیان پێنج دانەیە. بەڵام چەند كێلێكی تر هەن كە لە سەر گۆڕەكان نەماون و شكاون لە دەوروبەی گۆڕەكان كەوتوون. ئەم كێڵانە بە شێوەی زنجیرە باس دەكەین یەك لە دوا یەك لەگەڵ كێڵەكانی تر.

### كێڵی دووەم:

ئەم كێڵە شێوەیەكی لاكێشەیی هەیە پێوانەی بەرزییەكەی (٧٠ سم) پانییەكەی (٤٠ سم) ئەستوورییەكەی (٧ سم) جۆری بەردی (كلسیی) ڕووی ناوەوەی ئەم كێڵە نەخش كراوە بەزەخرەفەی نووسین بەزمانی فارسی لە جۆری (خەتی نەستەعلیق) شێوە لاواز نووسراوە[٢٠]. نووسینەكە لە شەش دێڕ پێكدێت بەئاراستەی ئاسۆیی نەخش كراوە. هەریەك لە دێڕەكان دەكەوێتە ناو چێوەیەكی لاكێشەی ئەندازەیی، نووسینەكان بە هەڵكۆڵینی دیار (نحت بارز)[٢١]. نەخش كراوە. كاریگەری كەش و هەوا و باران و بەفر بۆتە هۆی تێكچوونی نووسینەكان، لە دێڕی چوارەمدا كونێك لەناو كێڵەكەدایە پێدەچێت سروشتی بەردەكە خۆی وابێت، تەنها چەند وشەیەكی كەمی نەبێت ناخوێندرێتەوە، نووسراوەكە بریتییە لە هۆنراوەیەكی فارسی.

لە دێڕی سێیەم و چوارەمدا نەخشی گەڵای شێوە یەك پەلكی بادامی لەسەر چێوەی هێڵەكان نەخش كراوە بەمەبەستی جوانی و پڕكردنەوەی بۆشایی ناو كێڵەكە، ئەم شێوازی پڕكردنەوەی بۆشایی یەكێكە لە خەسڵەتە تایبەتییەكانی هونەری زەخرەفی ئیسلامی[٢٢]. لە دێڕی پێنجەم نەخشی دوو سێگۆشەی بچووك لەسەر چێوەی هێڵەكان نەخش كراوە. ئەم شێوازی نەخشاندنە بەدیاركەوتووە لەسەر تابلۆ بەردییە نووسراوەكانی مزگەوتی گەورەی كۆیە (١٢٦١هـ/١٨٤٥ز) كە هاوسەردەمی ئەم كێڵە نەخشدارانەن[٢٣]. وێنەی ژمارە(١).

| | |
|---|---|
| ١- گل گر .....دم............. | ١- گوڵ ئەگەر ..دەم............ |
| ٢- ......................... | ٢- ................... |
| ٣- اگر صد سال گردی دربیابان | ٣- ئەگەر سەد ساڵ گەڕایت لە بیاباندا |
| ٤- ................خاك مبارك ....... | ٤- خاك پیرۆزە.................. |

٥- ......... دنیا مکانی کاروانسرا........ ٥- دونیا وەك کاروان سەرایە ..
٦- ...............مرحوم فی سنە١٢٢٠هـ ٦-خو الێی خۆشبێت لە ساڵی ١٢٢٠ك



وێنەی ژمارە (١)

## کێلی سێیەم:

ئەم کێلە دەکەوێتە بەشی سەرەوەی، پێوانەکەی بریتییە، بەرزی (٨٠ سم) پانی (٣٠ سم) ئەستووری (٥سم) جۆری بەرد (مەڕمەڕە). شێوەی کێل لاکێشەیی ڕووی ناوەوەی بە دوو جۆر زەخرەفە نەخش کراوە. یەکەم: نەخشی نووسین کە بە زمانی عەرەبی و خەتی (نسخ)[٢٤]. تۆمارکراوە، لە شەش دێڕ پێکدێت، بەهەمان شێوەی تەکنیکی کێلەکانی یەکەم و دووەم دروستکراوە. تۆمار هەڵکەندراوەکەی سەر بریتییە لە مێژوو و ناوی مردوو نازناو، ئەوەی جێگای تێبینییە جۆری مردنی کەسەکە دیاری کراوە کە بەنەخۆشی (تاعوون)[٢٥] مردووە، بە پێچەوانەی زۆربەی کێلە نەخشکراوەکانی کوردستان کە بە هیچ جۆرێك شێوازی مردنەکانی دیاری نەکردووە، ئەمە یەکەم کێلە کە دەستنیشانی ڕووداوەکە دەکات لە ساڵی (١٢٤٦ك /١٨٣٠ز) لە ناوچەی شارەزوور شارۆچکەی خورماڵ و گوندی یالانپێ ڕووی داوە. جۆری دووەم بریتییە لە زەخرەفەی ڕووەکی کە لە گەڵای سێ پەلکی کۆتا چەماوە و گوڵی شێوە پێنج پەلکی ناسراوە

بە گوڵی لالە (بەیبوون)، بەشێوەی ناو بەناو (متنـاوب) پێچـەوانەی یـەکتر نـەخش کراوە، لە نێوان گەڵاو گوڵەکاندا گـەڵای شـێوە بـادامی دوو پـەلکی نەخشـاوە[٢٦]. ئەم نەخشە ڕووەکییانە وەك چیوەیەك بە دەوری نووسـینەکان بـە پـانی (٦ سـم) هەڵکۆڵـدراوە. کۆتـایی چـیوەی نەخشـە ڕووەکییـەکان بەگـەڵای حـەوت پـەلکی ڕازاێنراوەتەوە، ناسراوە بە گەڵای شێوە پەرداخی (کأسي). هەروەها لە نـاو دێـڕی یەکەمدا زەخرەفەی گەڵای (محور) ی ناسروشـتی کـە نزیکـە لـە گـەڵای ئـەکانتس بەشـێوازی نیـو گـەڵای بەرامبـەر بەیـەکتر نـەخش کـراوە، لـە ناوەنـدی گەڵاکـەدا زەخرەفەی کەئسی سێ پەلکی نووك تیـژ نەخشـاوە. لـە بەشـی خـوارەوەی ئـەم گەڵایانـەدا دوو گـەڵای چـەماوەی کۆتـا تیـژ کێشـراوە. بڕوانـە وێنـەی ژمـارە (٤) هێڵکاری ژمارە (٣)، نووسینەکان بەم شێوەیە تۆمار کراوە.

| | |
|---|---|
| ١- سنة ١٢٤٦ هـ | ١- بەرامبەر (١٨٣٠ز) |
| ٢- هذه التربة المرحوم المغفور المبرور. | ٢- ئەمە گۆڕی خوا لێخۆشبوو ڕێزدار پاك. |
| ٣- الشيخ عبدالرحيم أبن الشيخ العابد. | ٣- شێخ عبدالرحیم کوڕی شێخ عابد. |
| ٤- الوارع الابي بكر البيرخضرى . | ٤- کە ناسراوە بە ئەبو بەکری پیر خزری. |
| ٥- وشهيد بالطاعون سنة الف و | ٥- شەهید بووە بە نەخۆشی تاعوون لە ساڵی هەزارو |
| ٦- مأتين وست وأربعين من هجر. | ٦- دوو سەد و چل و شەشی کۆچی |



وێنەی ژمارە (٤) تۆێژەر — هێڵکاری تۆێژەر (٣)

**کێڵی چوارەم:**

لێرەدا دەمانەوێت دەستنیشانی ئەوە بکەین کە کێڵی دووەم و سێیەم بۆ یەك گۆڕ دەگەڕێتەوە، کێڵی دووەم رووی ناوەوەی بە نەخش و زەخرەفەی نووسین پڕکراوەتەوە، ئەم کێڵە دەکەوێتە بەشی سەرەوەی مردووەکە، پێوانەی بەرزییەکەی (٧٠ سم) پانی (٢٨ سم) ئەستووری (٥ سم) جۆری بەرد مەڕمەڕ[٢٧]. شێوەی کێڵەکە لاکێشەیە کۆتایی بەشی سەرەوەی نووك تیژە (مدبب) کەمێکی شکاوە، نووسینە هەڵکۆڵدراوەکەی سەری شەش دێڕ لە خۆ دەگرێت هەریەکە لە ناو چیوەیەکی لاکێشەیی بەئاڕاستەی ئاسۆیی کۆتایی ئەم سەرو ئەوسەری شێوە لاکێشەیەکە نەخش کراوە بە کەوانەی زەخرەفەی بەش بەشی نووك تیژ (عقد مفصص مدبب)[٢٨]. بەمەبەستی ڕازانەوەی کێڵەکە و جیاکردنەوەی ڕستەکان لە یەکتری، ئەم شێوازە وەك دەربڕینی ڕێز و خۆشەویستی بۆ کەسی دەرچوو لە دونیا. نووسینەکە بەخەتی (تعليق المتداخل)[٢٩]. بە زمانی عەرەبی نووسراوە، لە هەندێك لە کێڵەکان زاراوەی (قبر) یان (تربة) بەکارهاتووە ئەم کێڵە ناوی مردوو، ساڵی کۆچکردنی بەنووسین و ژمارەی فارسی تۆمارکراوە، هەروەها نازناوی (شێخ)[٣٠] بەکارهاتووە کە بۆ پیاوی ئایینی و پیاوچاکان بەکاردێت. نازناوی بنەماڵەی (پیرخزری شاهۆی) کە یەکێکە لە بنەماڵەی شێخە ناودارەکانی ناوچەی هەورامان[٣١]. بەگوێرەی بۆچوونی هەندێك لە خەڵکی خورماڵ سەرچاوەی بەردی کێڵەکان لە شاری (سنە)وە هاتووە، لەبەرئەوەی نەخشەسازەکان لە شاری سنە بوون بۆ کارئاسانی بەردی سنە و نووسینی فارسییان بەکار هێناوە وە توانایەکی هونەریی باشیان هەبووە لەبواری زەخرەفەسازیدا، ئەگەرچی ناوچەکە خۆی دەوڵەمەندە بەجۆرەها بەرد، نووسینەکە بەم شێوازەی خوارەوە نەخش کراوە، وێنەی ژمارە (٢) هێڵکاری ژمارە (١).

| | |
|---|---|
| ١- سنة ١٢٦٢هـ. | ١- بەرامبەر (١٨٤٥) زاینی |
| ٢- هذه التربة المبرورة المرحومة الموسومة: | ٢- ئەمەگۆڕی خوا لێخۆشبوو خێرخواز ناوهێنراو. |
| ٣- نمه نجا بنت المغفور المبرور المشهور: | ٣- نمەنجا کچی خوا لێخۆشبوو ڕێزدار ناسراوبە. |
| ٤- شيخ أبوبكر البير خضري الشاهوي : | ٤- شێخ ابوبکر پیرخزری شاهۆیی . |

٥- قد توفت في سنة الف ومأتين .　　　٥- مردووە لەساڵی هەزار و دووسەدو.
٦-أثنين وستين بعد الهجرة النبوية .　　　٦- شەست و دووی دوای كۆچی پێغەمبەر (بۆ مەدینە).

دێڕی یەكەم بەهەمان شێوەی كێلی دووەم دەكەوێتە ناو شێوەیەكی نیمچە لاكێشەی كۆتا تیژ.


وێنەی ژمارە (٢) توێژەر　　　هێڵكاری توێژەر (١)

## كێلی پێنجەم:

ئەم كێلە ئەكەوێتە بەشی خوارەوەی مردووەكە ڕووی ناوەوەی نەخش كراوە بە نووسین، كێلەكە بەشێوەی ستوونی داتاشراوە بەشی سەرەوەی كەوانەكە كۆتا تیژە، پێوانەی بەرزییەكەی (٧٠ سم)، پانی (٢٨ سم)، ئەستووری (٥ سم)، جۆری بەردی مەڕمەڕ، نووسینەكەی بەخەتی (نەستعلیق) بەجوانترین شێوە بە نەخشی (بارز) دەرچوو هەڵكۆڵدراوە.

نووسینەكە بریتییە لە هۆنراوەیەكی فارسیی سۆفیگەری، دەگەڕێتەوە بۆ شاعیری فارسی "عطار"[٣٢]. سەبارەت بە موناجات (**دعاء**) لە نێوان خۆیی و خودای گەورەدا، شەش دێڕ لەخۆ دەگرێت هەریەك لە نێوان لاكێشەی شێوە ئاسۆیی كۆتایەكەی لە شێوەی (عقد مفصص ثلاثي) كەوانەی سێ بەشی نەخش كراوە. لە تەرزی سێیەمی سامەڕا (٢٢١هـ - ٨٣٥ز) نەخش و زەخرەفەكان لەنێوان چیوەی سەربەخۆدا نەخش دەكران[٣٣]. بەهەمان شێوە لە سەردەمی

ئەتابگییەكان (٥٢١ هـ - ١١٢٧ز) لە شاری موسڵ نەخشی سەر میحرابەكان لە ناو چـیوەی سـەربەخۆ دەكێشـران[٣٤]. بۆیـە لێـرەدا نەخشەسـازەكانی ناوچـەكانی كوردسـتان هـەمان شـێوازی هونـەرییان بـەكارهێناوە لـە ڕازاندنـەوەی چـیوەی كێلەكاندا. دێڕی یەكەم دەكەوێتە ناو چیوەیەكی شێوە نیمچە سێگۆشـەیی. بـەم شێوەیە، بڕوانە وێنەی ژمارە(٣) هێڵكاری ژمارە (٢).

| | |
|---|---|
| ١- پادشاها جرم ما رادرگزار . | ١- ئەی پاشای من لە گوناهی ئێمە خۆشبە. |
| ٢- ماكنه كاریم و تو امر زگار. | ٢- ئێمە گوناهكارین و تۆش لێخۆشبووی. |
| ٣- مغفرت دارم أمید از گف تو . | ٣- لە لێخۆشبوونت ئومێدمان پێتە. |
| ٤- از انكه خود فرموده لاتقنطوا . | ٤- خۆت فەرمووتە نائومێد مەبن لە ڕەحمەتم. |
| ٥- چشم دارم گر گنه پاكم كنی . | ٥- ئومێدم پێتە كە لە گوناهەكانم پاكم بكەیتەوە . |
| ٦- پیش از أن كاندر جهان خاكم كنی. | ٦- پێش ئەوەی لەم جیهانە بمنێژن لە خاكدا. |


هێڵكاری — وێنەی ژمارە (٣) تویژەر

## كێلی شەشەم:

شێوەی كێل لاكێشەیی كۆتاتیژە (مدبب). بەرزییەكەی (٥٠ سم)، پـانی (٣٤ سـم)، ئەسـتوورییەكەی (٥ سـم)، جـۆری بـەرد مەڕمـەڕە. ڕووی نـاوەوەی بەزەخرەفـەی نووسـین بـە خـەتی (نسـتعلیق) پـڕ كراوەتـەوە. چـیوەكەی

بەزەخرەفەی ڕووەكی نەخش كراوە، پێكدێت لە گەڵای سێ پەلكی كۆتا چەماوەی تیژ گەڵای بچووكی شێوە بادامی بە چڵی باریك و ناسك و كورت بەیەكتریەوە بەشێوەی زنجیرەی بەدوایەكدا نەخشاون، لەگەڵ بوونی گوڵی لالەی پێنج پەلكی. لە كۆتایی بەشی سەرەوەی كەوانە تیژەكەدا نەخشەكە كۆتایی هاتووە بەگەڵای كەئسی پێنج بەشی وە لە ناوەندەكەیدا نەخشی لەبزینەیی (مەعینی) ناو چاڵ دەركەوتووە. تەنیشتەكانی نەخش كراوە بە گەڵای سێ پەلكی چەماوە. پێكهاتەی ئەم زەخرەفانە لەسەر باوەڕی دووبارەكردنەوەی ناوبەناو نەخش كراوە، ڕەگەزە ڕووەكییەكان شێوازەكەی گونجاوە لەگەڵ یەكتردا وە لە ژێرەوە بەیەكەوە گرێدراون بە چڵی باریك و ناسك ، ئەم چڵانە چەماونەتەوە بەشێوەی نیو كەوانەیی بۆشایی نێوانیان بەگەڵای بادامی پڕكراوەتەوە بەدوایەكتریدا بەشێوەی زنجیرەیی[٣٥]. نووسینەكان ئەكەونە نێوان چیوە لاكێشەیە ئەندازەیەكەوە كۆتایەكەی بە كەوانەی پێنج بەشی بەئاراستەی ئاسۆیی نەخش كراوە.

دێڕی یەكەم دەوردراوە بە نەخشی گەڵای خورمایی دان دانی ناسروشتی بە شێوەی بەرامبەر، كۆتی گەڵاكان بە گەڵای كەئسی تەواو كراوە، بەهەمان شێوەی كێلەكانی پێشوو. كێلەكە تەنها چوار دێڕ نووسینی لەسەر ماوەتەوە. بەشی خوارەوەی بەتەواوی شكاوە و لەناوچووە. نووسینەكان بریتییە لە ناوی مردووەكە لەگەڵ یەكێك لە ناوە جوانەكانی خوای گەورە و دوو دێڕ هۆنراوە بەزمانی عەرەبی نووسراوە تێكەڵ بە چەند وشەیەكی فارسی كراوە. بڕوانە وێنەی ژمارە (٦)، هێڵكاری ژمارە (٥).

| | |
|---|---|
| ١- القضاء لله. | ١- قەزا لەلای خودایە . |
| ٢- سمین یعبد الرحیم وأرجوم بسین. | ٢- گوێی بیستە بەندەت لە بەخشندەیی گەورەی من داواكارم |
| ٣- اعناق ذمتی گرما من النار. | ٣- گەردنم بپارێزە لە ئاگر. |
| ٤- تبت من الذنب بعهد الشیاب أذ. | ٤- لە پیریدا لە گوناه گەڕاومەتەوە ئەگەر. |


هێڵکاری توێژەر (٥) وێنەی ژمارە (٦) توێژەر

بەشی خوارەوەی دێڕی نووسینەکان نەماوە. لەم نووسینەدا جۆرێك لە تێکەڵکردنی زمانی عەرەبی و فارسی بەدی ئەکرێت تاوەکو پارچە هۆنراوەکە لە رووی وەزن و قافیە واتا و مانای خۆشتر ببەخشێت بەخوێنەر، زۆرێك لە شاعیرانی کورد لە سەدەکانی ڕابردوو بە دوو شێوەی زمانی جیاواز هۆنراوەیان نووسیوە.

## کێلی حەوتەم:

ئەم کێلە تەنها پارچەیەکی کەمی نەبێت نەماوە پێوانەی بەرزییەکەی (٤٠سم)، پانییەکەی (٣٤ سم )، ئەستووری (٥ سم)، جۆری بەردەکەی مەڕمەڕی سپییە. ڕووی ناوەوەی نەخش کراوە بە نووسین بە زمانی عەرەبی بەخەتی نستعلیق، پاشماوەی دێڕەکانی کە لەسەریەتی چوار دێڕە، دێڕی یەکەم و چوارەم چەند وشەیەکی یاخود چەند پیتێك نەبێت نەیماوە، بەهەمان شێوەی کێلی ژمارە حەوت بەزەخرەفەی ڕووەکی ڕازێنراوەتەوە، هۆنراوەکە سۆفیگەرییە ئەم هۆنراوەیە لە ئێستادا لە زۆربەی بۆنە و ئاهەنگە دینییەکاندا دەخوێنرێتەوە . بەهۆی شکانی بەشی خوارەوەی دێڕەکانی تووشی لەناوچوون بۆتەوە. ئێمە لێرەدا تەواوی هۆنراوەکەمان نووسیوەتەوە بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی هۆنراوەکە

بۆ خوێنەر، بڕوانە وێنەی ژمارەی (٧) هیلكاری ژمارە (٦).

| | |
|---|---|
| ١-(الهي عبدك العاصى اتاك) | ١- خودایە من بەندەی تاوانبار بۆلات هاتووم. |
| ٢- مقرا بالذنوب (قد دعاك) | ٢ - بەكۆڵێ تاوانەوە داوات لێ دەكەم. |
| ٣- فأن ترحم (تغفر) فأنت اهل الذاكا. | ٣- ئەگەر تۆلێم خۆش بی ...... |
| ٤- وأن تطرد فمن يرحم سواكا. | ٤- وەئەگەر تۆ دەرم بكەی كێ هەیە بەزەیی بەمندا بێتەوە |
| ٥- غفر الله ...... | ٥- لێی خۆش بە |


وێنەی ژمارە (٧)    هێڵكاری توێژەر (٦)

## كێلی هەشتەم:

ئەم كێلە بەشێكی زۆری بە تەواوی تێكشكاوە تەنها بەشی ناوەندەكەی نەبێت كە ڕووی ناوەوەی بەزەخرەفەی نووسین لەگەڵ ڕووەكی كە پێكدێت لە گەڵا و گوڵ. پێوانی بەرزییەكەی (٣٠ سم )، پانی ( ٣٣سم)، ئەستووری (٥ سم)، جۆری بەردەكەی مەڕمەڕی شێوە ڕەنگی سپییە. بە خەتی (نسخ) نووسراوە بەزمانی عەرەبی ناوی مردوو لەگەڵ نازناوەكەی تۆماركراوە. هەروەها چیوەكەی بە زەخرەفەی ڕووەكی ڕازاوەتەوە وەك لە كێلەكانی پێشوودا باسمان كرد

بەهەمان شێواز و نەخش دووبارە کراوەتەوە. بڕوانە وێنەی ژمارە (٨) هێڵکاری ژمارە (٧).

١- الشیخ ابوبکر ابن .

٢- شیخ عبد العزیز[٣٦] .



هێڵکاری توێژەر (٧) وێنەی ژمارە (٨)

## خشتەی کورتکراوەی نووسینەکانی کێلی گۆڕستانی شێخ سلێمان لە گوندی یالآنپێ

| | ناو | جۆری نووسین | زمان | شێوازی هەڵکۆڵین | جۆری زەخرەفەکان | مێژووی | بابەتی نووسراو | جۆری بەرد |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| (١) | الشیخ عزیز ابن شیخ نوراللە | نسخ | عەرەبی | بارز | زەخرەفەی نووسین ئەندازەیی و ڕووەکی | ١٢٠٨هـ | ناو و مێژووی مردنی تۆمار کراوە | مەڕمەڕ |
| (٢) | ناو دیار نییە | نستعلیق | فارسی | (دیار) بارز | نووسین | ١٢٢٠ هـ | هۆنراوەی فارسی | کلس |
| (٣) | شیخ عبدالرحیم ابن شیخ ابوبکری پیر خضری | نستعلیق | عەرەبی | بارز | نووسین و زەخرەفیی ڕووەکی | ١٢٤٦هـ | ناو و مێژووی مردنی کە بەنەخۆشی تاعوون مردووە. | مەڕمەڕ |

| | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| (٤) | نمەنجا شیخ ابو بکری پیر خضری شاهۆیی | نستعلیق | عەرەبی | بارز | نووسین لەناو چیوەی ئەندازەیی | ١٢٦٢هـ | تەنها ناو و مێژووی مردوو تۆمارکراوە | مەڕمەڕ |
| (٥) | ناو دیار نییە | نستعلیق ونسخ | فارسی | بارز | نووسین لەگەڵ چیوەی ئەندازەیی | دیار نییە | شیعری فارسیی شاعیر عەتار مناجاتی خودا | مەڕمەڕ |
| (٦) | ناو نادیارە | نستعلیق | فارسی و عەرەبی | بارز | زەخرەفەی نووسین و چیوەی ئەندازەیی | نادیارە | هۆنراوەی سۆفیگەری | مەڕمەڕ |
| (٧) | ناو نادیارە | نسخ متداخل | عەرەبی | بارز | زەخرەفەی ڕووەکی و نووسین و چیوەی ئەندازەیی | نادیارە | هۆنراوەی سۆفیگەری | مەڕمەڕ |
| (٨) | شیخ ابوبکر ابن شیخ عبدالعزیز | نسخ | عەرەبی | بارز | زەخرەفەی ڕوەکی و ئەندازەیی و نووسین | نادیارە | تەنها ناوی مردووی لەسەری ماوە. بەهۆی شکانی کێلەکە | مەڕمەڕ |

**دەرئەنجام :**

پاش جێبەجێکردنی ئەم توێژینەوە (مەیدانییە) بەو ئەنجامانە گەیشتم:

**یەکەم** : کێلەکانی گوندی یالآنپێ تاوەکو ئێستا هیچ جۆرە توێژینەوەیەکی زانستی لە سەر نەکراوە .

**دووەم** : لەم توێژینەوەیەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت گوندی یالآنپێ بنەماڵەی شێخەکانی پیرخزری بۆ ماوەیەکی دوورو دێژ لەم ناوچەیەدا ژیاون، چەندین کەسایەتیی ئاییني و زانای بەناوبانگیان تیا هەڵکەوتووە بەگوێرەی نووسینە مێژووییەکان شوێنی پێگەیاندنی سەدان کەڵەپیاو و زانا بووە.

**سێیەم**: ئەم نووسینانە دەبێتە بەڵگەیەکی گرنگی مێژوویی بۆ ناوچەکە و گوندی یالآنپێ وەك بەشێك لە زیندوو کردنەوە و ڕاستکردنەوەی هەندێك لە هەڵە مێژووییەکانی ناوچەکە.

**چوارەم**: ئەم نووسینانە بەشێکی گرنگە لە بەدۆکیۆمێنتکردنی لایەنی مێژوویی و هونەری خەت خۆشی لەسەر بەرد.

**پێنجەم**: لە ئێستادا زۆر پێویستە ئەم کێلە شوێنەواری و مێژووییانە بپارێزرێن، ڕۆژبەڕۆژ بەرەو لەناوچوون دەبنەوە. بەهۆکاری مرۆیی و سروشتی دەبێتە هۆی لەناوچوونی سەرمایەی مێژووی نەوەکانی داهاتوو.

**شەشەم**: ئەم توێژینەوەیە ئەوەمان بۆ دەخاتە ڕوو کە کارەساتێکی ناخۆش لە ناوچەی شارەزوور و گوندی یالآنپێ ڕووی داوە، بڵاوبوونەوەی نەخۆشی تاعوون کە بەڕووداوێکی گرنگ دادەنرێت لە مێژووی ناوچەکەدا.

**حەوتەم**: ئەم کێلانە وەك تۆمارێکی پڕبەهای مێژوویی ئەژمار دەکرێن کە چەندین ناوی کەسایەتی و بنەماڵەی ناوچەکەمان بۆ ساغ دەکاتەوە .

**هەشتەم**: داواکارین لایەنی پەیوەندیدار و کارگێڕی ناوچەکە هەوڵ بدەن ئەم گۆڕستانە شوێنەوارییانە بپارێزن یاخود کۆکردنەوەیان لە مۆزەخانەیەك لە ناوچەکە.

**نۆیەم**: ئەم نووسینانە بەڵگەی ئەوەمان بۆ دەخاتە ڕوو کە دانیشتوانی سەدەکانی ڕابردووی ناوچەی شارەزوور و گوندەکانی زۆر گرنگییان بە ئەدەبیات و شیعر داوە، بەتایبەت هۆنراوەی فارسی بەهۆی تێکەڵاوی کوردانی ئەم

ناوچەیە لەگەڵ ولاتی فارس و نزیكییان لە ئەدەبیاتی فارسی، وە لەو سەردەمەدا هیچ شاعیرێك لە سێ زمان كەمتری نەزانیوە شارەزایی تەواویان لە ئەدەبیاتی فارسی و توركی و عەرەبی هەبووە. وەك حەمدی (١٨٥٣-١٩١٢ز)، (سلێمان بەگ)[٣٧].

**دەیەم:** سەرچاوەی دەركەوتنی هونەری خەت خۆشی و نووسین لە سەر گۆڕ هۆكارەكەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو قوتابخانە ئاینی و حوجرە و خانەقا و مزگەوتەكانی كە خەڵكانێكی زۆر فێری خوێندن و نووسین و خەت خۆشی دەبوون، لە سەدەكانی ناوەڕاست گرنگیی زۆر بەلایەنی ڕازاندنەوەی باڵەخانە و مزگەوت و كێلی گۆڕەكان دەدرا لە ڕووی جوانكاریی نەخش و زەخرەفە.

## پەراوێزەکان :

[1] علی، ثويني: معجم عمارة الشعوب الاسلامية، ط١، اعلام ومعلومات، دمشق ،٢٠٠٥،ص٣٩٣

[2] هەمان سەرچاوە،ص٥٠٦.

[3] برادۆستی، زێدان ڕشید خان ئاودل: بانیشار، عەلی عەبدولڕەحمان، (کێلە نەخشێندراوەکانی گۆڕستانی پیرغەیب (بانیشار) لە شارۆچکەی خورماڵ (توێژینەوەیەکی مەیدانییە) گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، ژ٣٣، چاپخانەی حاجی هاشم،هەولێر، ٢٠١٥، ل ٣٠٠.

[4] علی، **ثويني**: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٥٠٥–٥٠٦.

[5] مهدي، أحمد: (مواقع أثرية في ناحية سورداش بلواء السليمانية ). مجلة سومر، عدد، ٦، بغداد ١٩٥١، ج٣، ص٢٣٤.

[6] **علي، ثويني:** هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٣٨٨

[7] سوباری، محمد علی: مەجید، ارام محەمەد: ئارامگەکانی باوەشاسوار لە کفری، گۆڤاری سۆبارتو، ژمارە ٤– ٥، هەولێر، ٢٠١١، ل١١٣.

[8] خورماڵ. دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی باشووری شاری سلێمانی بەدووری ( ٧٦ کم) لێوەی. لە باشووریەوە پارێزگای هەڵەبجەیەبە دووری **(١٢ کم)**، لەساڵی (١٩٢٥) کراوە بە ناحیە،لە ڕووی کارگێڕییەوە سەر بەپارێزگای هەڵەبجەیە. سەبارەت بەناوی خورماڵ بە چەند شێوازێك ناوی هاتووە لە سەرچاوە مێژووییەکاندا، لە سەردەمی مادەکان لە هەزارەی یەکەمی پێش زاین پێی وتراوە (خۆرماد) لە سەردەمی ساسانەکان وەك شارێك بەناوی (نیم ئەزراە) هاتووە هەروەها بەناوی (گۆلاَ مبار) هاتووە (گوڵمار).. (خۆرماڵ ) (گوڵ عومەر).. (گوڵ ئەمار) لە سەردەمی میرنشینەکانی ئەردەلان و بابان و عوسمانیدا ناوی قەزای (گوڵ عەنبەر) بووە. بڕوانە، زەڵمی، ئیبراهیم حاجی : خورماڵ لێکۆڵینەوەیەکی سۆسیۆ **ئەنثرۆپۆلۆجییە**، سلێمانی، ٢٠٠٨ز، ل١١. بڕوانە، **بابان، جمال: أصول اسماء والمواقع العراقية، النجف،١٩٨٩، ج١، ص١، ٥.**

[9] عبدالرحمان، سەردار: هۆشیار محمد امین خۆشناو: نەخشەی پارێزگای سلێمانی، لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەوی سپاردنی (٤٤) پێدراوە، ساڵی ٢٠٠٩.

[10] www.google.com/google earth/ google map.khurmal.helanpe.

[11] زەڵمی: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٩.

[12] هەمان سەرچاوە، ل١١٣.

[13] قەرەداغی، فازیل. (گەشتێك بەولاتی سۆبارتۆدا) کۆڤاری کاروان، ژمارە، ٣٦، هەولێر، ١٩٨٥، ل٢٠

[14] زەڵمی، ایبراهیم حاجی: خورماڵ لێکۆڵینەوەیەکی سۆسۆئەنثرۆپۆلۆجییە، چاپەمەنی سیما، سلێمانی، ٢٠٠٨، بەرگی یەکەم، ل٤٣ .

[15] **حنون، نائل، مدن قديمة ومواقع اثرية دراسة في الجغرافية التاريخية للعراق الشمالي خلال العصور الاشورية، دارالزمان، دمشق، ٢٠٠٩، ص٣١٧–٣١٩.**

[16] چاوپێکەوتن: محمد سەلیم ئاوارە، دانیشتووی خورماڵ، لەدایك بووی (١٩٤١) نەخوێندەوار، ڕۆژی ٢٠١٤/١١/٤ .

(١٧) http://www.zagroz.org/

(١٨) **ثلث**: ئەم شێوازی نووسینە لە کۆتایەکانی دەسەلآتی ئومەوییەکان و سەرەتای دەسەلآتی عەباسییەکان دەرکەوت لەسەر دەستی **قطب المحرر**، لەساڵی (١٥٤هـ – ٨٤٧ ز) کۆچی دوایی کردووە. النعیمی، هەمان سەرچاوەی پێشوو،ص٧٢.

(١٩) توێژینەوەی مەیدانی.٢٠١٣.

(٢٠) فضائلی، حبیب الله: ت، محمد التوتنجی، أطلس الخط والخطوط، ط٢، دمشق، ٢٠٠٣، ص٤٩٠.

(٢١) نحت بارز (Highrelief) بریتییە لە هەڵکۆڵین یاخود دەرچوونی شێوازەکانی نەخشاندن لە سەر ڕووبەرێك بە شێوەی دیار یاخود وێناکردنی (جسم) بۆ نەخشەکان. **عاصم محمد** رزق: معجم مصطلحات العمارة والفنون الاسلامیة، ط١، مطبعة مدبولی، القاهرة ٢٠٠٠، ص٣١٦.

(٢٢) حمید، عبدالعزیز: صلاح العبیدي، وآخرون، الفنون الزخرفیة العربیة الاسلامیة، بغداد، ١٩٨٢، ص٢٥–٢٩.

(٢٣) مستەفا، مهدی جلال: هونەری نەخش و زەخرەفەی سەر بەرد لە پارێزگای هەولێر لە نێوان ساڵی (١٧٠٠–١٩٠٠ز) توێژینەوەیەکی مەیدانییە، نامەی ماستەر بلآونەکراوە، (زانکۆی سەلآحەدین ) کۆلێژی ئەدەبیات – بەشی شوێنەوار، هەولێر (٢٠١١)، ل٦٨.

(٢٤) نسخ ، ئەم جۆرە خەتە زیاتر تایبەت بووە بە نووسینی قورئان و نامە ڕەسمییەکانی دەوڵەت و نووسینی کتێبەکان. لە سەدەی دووەم و سێیەمی کۆچی بەرامبەر بە هەشتەم و نۆیەمی زاینی بەتەواوەتی یاسا و ڕێسای ڕێزمانی بۆ دانراوە لە سەردەمی الوزیر ابن مقلە (٢٧٨–٣٢٨هـ) بەباشی دەرکەوت. النعیمی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٧١.

(٢٥) تاعوون: تاعوون ئەو نەخۆشییە کوشندەیە کە چەندین جار بەرۆکی ناوچەی شارەزوور و خورماڵی گرتووە بە تەواوی گوندەکانیەوە. لە دەستنووسەکەی (مەلا محمد سەرگەتی)، لە ساڵی (١٢٩٠ ك) (١٨٧٣ ز) باس لە بلآوبوونەوەی نەخۆشییەکی کوشندە دەکات لە ساڵەکانی (١١٨٥ ك –١٧٧١ز/ ١١٨٦ ك– ١٧٧٢ز/ ١١٨٧ك– ١٧٧٣ز ) لە ناوچەی خورماڵ بلآوبۆتەوە، باس لەوە دەکات مەلا جەلالی گەورەی خورماڵ بە گەشتێکی هاوینەی چۆتە دەوروبەری هەوارگەکانی سورین و ناوچەی مەریوان، لەگەڵ بلآو بوونەوەی ئەم نەخۆشییە نەگەڕاوەتەوە، لەگەڵ ئەو خەڵکانەی کە خورماڵیان چۆڵ کردبوو تا ساڵی (١١٨٨ك– ١٧٧٤ز). محمود أحمد محمد: **حلقة مفقودة** من تأریخ شهرەزووز أو **مذکرات علماء** الدین البلباسیین **منذ** عام (٥٣٠ الی ١٢٩٠ك)، کاروان، ژمارە، ٣٦، هەولێر، ١٩٨٥، ل١٤٦. هەروەها لە ساڵی (١١٨٥ك– ١٧٧١ ز) نەخۆشی چاوەقووڵکە بلآو بۆتەوە، لە ساڵی (١٢٧٦ك/١٨٥٩ز) جارێکی تر نەخۆشی تاعوون بلآوبۆتەوە، لە ناوچەی خورماڵ ئەوکات پێیان وتووە نەخۆشی (قڕان). زەڵمی هەروەها لەسەر یەکێك لە کێلەکانی گوندی یالآنپێ ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە لە ساڵی (١٢٤٦ك) (١٨٣٠ك) جارێکی تر نەخۆشی تاعوون بلآوبۆتەوە، لە ساڵی ( ١٩٠٥ز) جارێکی تر نەخۆشی چاوە قووڵکێ بلآو بۆتەوە، کە حاجی خەلیفەی یالآنپێ لە یاداشتەکانی خۆیدا لە ساڵی ( ١٢٧٦ك– ١٨٥٩ز) تۆماری کردووە. زەڵمی. ل٢٦٤.

(٢٦) حامد، جاد محمد جاد: الزخارف للصناعة الزخرفیة والنسیجیة، مطبعة الاهرام التجاریة ، ١٩٩٦. ص٢٠.

[٢٧] مەڕمەڕ: (ڕوخام)، ئەو ماددەیە کە باکاردێت بە هەموو ڕەنگ و جۆرە و شێوەو قەبارەکانی لە دروستکردنی مینبەر و میحرابی مزگەوتەکان، لە دروستکردنی کۆڵەکە بەردینییەکان، بەکارهێنانی لە خانوو باڵەخانەکان، ڕازاندنەوەی دیوارەکان، هەڵکۆڵینی نەخش و زەخرەفە لەسەر مەڕمەڕ و تێکەڵکردن و متوربەکردنی بە مادەی تر، بۆ ڕووپۆشکردنی ڕووی زەوی بەکاردێت: عبدالرحيم غالب: موسوعة العمارة الاسلامية، عربي– فرنسي– انكليزي، ط١، بيروت، ١٩٨٨. ص٣٧٥.

[٢٨] عبدالرحيم غالب: هەمان سەرچاوە.ص٢٣٧.

[٢٩] فضائلی: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٣٩٠.

[٣٠] شێخ: ئەو زاراوەیە بەکاردێت بۆ گەورەی خانەقا و سۆفی و دەروێش، لە سەردەمی مەمالیکەکان لە سەدەی (٧ك/١٣ز) ئەم زاراوەیە جێگایەکی گرنگی هەبووە لە بواری قەزاوەت و گەورەی قازییەکان بووە، لە سەردەمی عوسمانی بەتایبەت سوڵتان سەلیمی یەکەم (١٥١٢–١٥٢٠ز) بە موفتی گەورەی ئەوکاتی ئەستەمبوڵ وتراوە (شێخ الاسلام) کە لە بواری فتوا و ئجتیها و ئیداری و یاسا و قەزاوەت کاری کردووە، کاریگەری لەسەرسوڵتان هەبووە، شێخ بەکەسی زانا و دادپەروەر و لەخواترس وتراوە، حسان حلاق، عباس صباغ: المعجم الجامع في المصطلحات العثمانية ذات الاصول العربية والفارسية والتركية والايوبية والملوكية، دارالنهضة العربية ، بيروت ٢٠٠٩.ص١٣٢.

[٣١] توێژینەوەی مەیدانی: گورستانی شیخ سلێمان، ٢٠١٣.

[٣٢] **(عطار):** فريد الدين ابو حامد محمد بن ابوبكر أبراهيم بن اسحق **عطاركدكنى** ، سەربە نيشابور لە ساڵی (٥٣٧ك/ ١١٤٢ز) لەدایك بووە، **عطار** لە قەتڵو عامەکەی نیشاپور لەساڵی (٦١٨ك/ ١٢٢١ز) لە سەردەستی مغۆڵەکان کوژراوە، چەندین کتێبی هەبووە، وەك: خسرو نامە، أسرانامە ، **كتاب تذكرة الاولياء**، الهی نامە ، مصيبت نامە، **جواهر ذات**، وصيت نامە، حيدرنامە، **منطق الطير**، بلبل نامە، شاهنامە، خسرونامە، ديوانی غزليات، وقصائد رباعيات. **سەرچاوە**.https://ar.wikipedia.org .

[٣٣] النعيمي، سنان عبد يونس: الزخارف والكتابة على الحجر في مدينة بلد اسكى موصل، رسالة ماجستير، مقدمة الى جامعة بغداد، كلية الاداب، قسم الاثار، غيرمنشورة، بغداد، ٢٠٠٦. ض٥٥.

[٣٤] الجمعة، أحمد قاسم: الدلالات المعمارية وتجذيرها الخضارية، موسوعة الموصل الخضارية، دار الكتب، موصل ٢٠٠٩، ج٣ ص٣٢٩.

[٣٥] الجمعة، أحمد قاسم: (الزخرفة الرخامية )، موسوعة الموصل الحضارية، موصل ٢٠٠٩، ج٣ ص٣٤٦ .

[٣٦] توێژینەوەی مەیدانی.٢٠١٣.

[٣٧] بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی شاعیران بڕوانە کتێبی، حەکیم مەلاسالح. هەڵەبجە لە ئامێزی مێژوودا، چاپخانەی دیلان، هەڵەبجە، ٢٠١٠. بەرگی دووەم.

## ملخص البحث

### الزخارف والنقوش على شواهد قبور مقبرة قرية يالانپى

هذه دراسة ميدانية في منطقة قرية يالانپى التابعة لقضاء خورمال في محافظة حلبجة. حيث قام الباحث بدراسة النقوش والزخارف والكتابات الموجودة على عدد من شواهد القبور في المقبرة المذكورة. وقد كانت الكتابات الموجودة على شواهد تلك القبور باللغة العربية او الفارسية، بخط النسخ او خط النستعلق.

تعرضت البعض من شواهد القبور في الجزء العلوي منها للكسر كما ان بعض سطور الكتابات للبعض الآخر قد زالت بسبب العامل الزمني والبيئي والبشري.

تحتوي الكتابات الموجودة على الشواهد على اسم المتوفي واسم والده وجده ولقبه. ولم يتم التعرف على بعض الاسماء بسبب فقدان اجزاء من الشواهد او تشويهها. والاسماء التي تم التعرف عليها هي لرجال ماعدا اسم واحد وهو لامرأة اسمها نمه نجا. احتوت البعض من تلك الشواهد على ابيات شعر فارسية او اشعار تصوف باللغة العربية . الزخارف الكتابية زينت بأفاريز و أُطر من الزخارف النباتية. والبعض من النقوش في السطر الاخير يذكر فيها سنة وفاة صاحب او صاحبة القبر. اقدم قبر من هذه المجموعة يعود إلى سنة ١٢٠٨هـ/ ١٧٩٣ز ، والقبور الاخرى ارخت بتواريخ تعود إلى القرن الثالث عشر الهجري/ التاسع عشر الميلادي بشكل عام تعود شواهد قبور مقبرة يالانپى الى القرنين الثامن والتاسع عشر الميلادي.

دراسة شواهد القبور في هذه المنطقة تزودنا بمعلومات تاريخية حول تاريخ وانساب اهالي المنطقة، كما تزودنا بمعلومات هامة عن المعتقدات والادب وفن الزخرفة والآثار المتبقية للاجيال السابقة.

# Abstract

**Arabesque and Ornaments on the grave stones of the Yalnpê village Cemetery**

This paper deals with Arabesque and Ornaments on the grave stones of the Yalnpê village Cemetery. In a field work the researcher studied the inscriptions and decorations on these graves stones. Yalnpê village located near the Iranian border, it is belong to Khurmal district (Nahia), which is belong to Halabja governorate. Eightgraves were studied; they are inscribed either in Arabic or in Persian language, in Nasikh, or Nastaliq scripts. Not all the grave stones are complete. Some of them their upper parts are missing, and on other gravestones some of the lines are damaged, on the other hand some of them are well preserved. The inscriptions are bear some details, in addition of mentioning name of the dead person and his family name, also, its dated, the year when the person died recorded in al-Hijri calendar. The oldest grave dated to 1208 H\ 1793A.D, and some of them to the $13^{th}$ century H, i.e. to the $18^{th}$ and $19^{th}$ century AD.

Because of the damages we couldn't be able to know some of the dead persons, but some of the names are well preserved, all are male, except one, which is a lady name, her name was Nimanaja.

some of the gravestones  are Persian or Sufi Arabic poems. Some of the inscriptions are framed with abstract ornaments of plant leaves. these The research are giving important details concerning the art of carving, religion, literature, and families and tribes of the area

# ڕەهەندە شارستانییەکانی کوردستان
# لە کتێبی (نزهة المشتاق)ی (الادريسي)

**پ. ی. د. حەکیم ئەحمەد مام بەکر** **م. ی. شەرمین کەریم عەبدولڕەحمان**
بەشی مێژوو- کولێژی ئەدەبیات
زانکۆی سەلاحەددین - هەولێر

**پێشەکی :**

کتێبی **(نزهة المشتاق)** لە سەدەی شەشەمی کۆچی/ دوانزەی زایینی نووسراوە، و کتێبەکە تەژییە لە زانیاریی جوگرافی و ئابووری و شارستانی و کۆمەڵایەتی، ئەگەرچی ڕووداوە مێژووییەکان کەمتر شوێنیان لە کتێبەکەدا بۆتەوە، بەمەش پڕکردنەوە و تەواوکردنی کتێبە مێژووییەکان لە (نزهة المشتاق)دا نموونەیەکی بەرچاو و زیندووە، نووسەر لە کاتی نووسینی کتێبەکەیدا تەنها پشتی نەبەستووە بە زانیاریی کتێبەکانی پێش خۆی بەڵکو بەیارمەتی تیمێک لە کەسانی شارەزا چەندین ناوچە گەڕاوە بە مەبەستی کۆکردنەوەی زانیاری ئەمەشی لە دووتوێی کتێبەکەیدا تۆمار کردووە، ئەگەر بڵێین زانیارییەکانی لە بارەی ڕۆژهەڵات تێکەڵە بە زانیاریی سەرچاوەکانی پێش خۆی بەڵام دەربارەی ڕۆژئاوا زانیاریی وای تێدا تۆمار کراوە کە لە پێشدا هاوشێوەی نەبووە هەر ئەمەش فاکتەر بووە، کە زوو کتێبەکە بە چاپ بگەیەنرێت و چەندین توێژینەوەی لەسەر بکرێت و چەندان دەستنووسی لەبەر بگیرێتەوە، سەرباری ئەمەش کتێبەکە بۆ سەردەمانێک لە لایەن ڕۆژئاواییەکانەوە وەک سەرچاوەیەکی زانستی بەکارهێنراوە.

سەبارەت بە ناوەڕۆکی ئەم بابەتە ئەوا لە دوو تەوەر و پێشەکی و ئەنجام پێکهاتووە.

تەوەری یەکەم ناساندنێکی (الادریسي) و کتێبەکەی، ئەویش دابەش بووە بۆ یەکەم: کورتەیەکی ژیاننامەی (الادریسي)، و دووەم: ناساندنی کتێبەکەی، هەرچی تەوەری دووەمە ئەویش بریتییە لە ڕەهەندە شارستانییەکانی کوردستان لە کتێبی (نزهة المشتاق)، کە چەند خاڵێک لە خۆ دەگرێت بریتین لە سیما و ڕواڵەتە شارستانەتییەکان وەک قەڵا و شوورا و بیناکان و چییەتی بنیادنانیان، هەروەها لە خاڵی دووەمدا باسی لایەنی ئابووریی کورد و ناوچە کوردنشینەکان کراوە کە لە کتێبەکەی (الادریسي)دا هاتوون لە کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و پیشەسازی و بازاڕ و بازرگانی، لە خاڵی سێیەمیشدا ئاماژە بەوە کراوە کە چەند ناوبراو لای کردۆتەوە لە لایەنی کۆمەڵایەتی وەک پێکهاتەی دانیشتوان و ئایین و ئاینزاکان و مۆرکە کۆمەڵایەتییەکانی تایبەت بە کورد و ناوچە کوردییەکان لە کتێبەکەیدا. لە کۆتاییشدا گرنگترین ئەنجامەکان خراونەتەڕوو.

## تەوەری یەکەم : ناساندنێکی (الادریسي) و کتێبەکەی

### یەکەم : کورتەیەکی ژیاننامەی (الادریسي):

ناوی تەواوی (محمد بن محمد بن عبدالله بن ادریس بن یحیی بن حمود بن میمون بن احمد بن علي بن عبیدالله بن عمر بن ادریس بن ادریس بن عبدالله بن حسن بن علي بن ابي طالب، الشریف الادریسي)یە [1].

هەرچەندە توێژەرێک ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە لە دەستنووسی ئۆکسفۆردی (نزهة المشتاق)دا، ناوی بە (ابو محمد عبدالله محمد بن محمد بن عبدالله بن ادریس امیر المؤمنین العالي بالله) هاتووە، هەروەک لە دەستنووسی (أنس المهج وروض الفرج)، بە (محمد بن محمد بن عبدالله بن ادریسي الحسیني العالي بالله) هاتووە[2]. بەڵام (ابن ابي اصیبعة) ناوی بە (ابو عبدالله محمد بن محمد بن

عبدالله بن ادریس الحسني) هێناوە[3]. ئەمە جگە لەوەی ناوی بە (محمد بن عبدالعزیز) تۆمار کراوە[4].

ئەوەی تێبینی دەکرێ بۆچوونی جیاواز سەبارەت بە ناوی ناوبراو هەیە، وا دیارە زۆربەی سەرچاوەکانی دواتر و ژێدەرەکانیش بۆ بەرچاو ڕوونییان پشتیان بە دەقەکانی (الصفدي) بەستووە چونکە نووسینەکانی ناوبراو تایبەتمەندیی خۆی هەیە، لەبەر ئەوەی ئەو پسپۆری ناسینی بواری کەسایەتییەکانی سەردەمانی پێش خۆی بووە، بۆیە زیاتر بە (محمد بن محمد بن عبدالله بن ادریس) ناساندوویانە.

ئەوەی تایبەت بێت بە ناساندنی ناوبراو، لە سەرچاوە و ژێدەرەکان بە شێوازی جیاجیا ئاماژەی بۆ کراوە، بۆیە یەکێک لەو ناسناوانەی کە بە (الادریسي) بەخشراوە (الشریف) بووە، چونکە ناوبراو یەکێک بووە لە بنەماڵەی (علي بن ابي طالب) (ر.خ). یەکێک لە ناسناوە هەرە دیارەکانی ناوبراو (الادریسي) بووە، کە ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە یەکێک بووە لە کوڕانی ئیدریس کە بە دامەزرێنەری دەوڵەتی (الادارسة)[5] دادەنرێت، بۆیە ئەم ناسناوەی بەسەردا براوە، بەڵام زیاتر ناوەکەی بە (الشریف الادریسی)[6]، ئاماژەی بۆ کراوە، هەرچی (ابن خلدون)یشە لە کتێبەکەی خۆیدا بە (العلوي الادریسي الحمودي) ناوی بردووە، ئەوەی تێبینی دەکرێ جگە لە ناوبراو هیچ سەرچاوە و ژێدەرێکی تر بەو شێوەیە ناویان نەبردووە[7]. دیارە ناسناوی (الحمودی)ش دەگەڕێتەوە بۆ باپیرانی کە ناوی (حمود)ە، هەروەک دەوڵەتی (بنی حمود )یش[8] بە ناوی ئەوەوە ناو نراوە، لەلایەکی دیکەوە (ابن ابی اصیبعة) ناسناوی (العالي بالله)ی داوەتە پاڵ[9]. سەرباری ئەمەش بە (الصقلي)یش ناوی هاتووە[10].

بێگومان ئەم ناسناوەش دەگەڕێتەوە بۆ دوورگەی (صقلیة) کە (الادریسي) ماوەیەک لەوێدا ژیاوە و ماوەتەوە[11].

هەروەهـا بە (ابـن الیثربـي)یش نـاوزەد کـراوە[١٢]. جـگە لەمـانە بە ناسناوی (القرطبي)یش هاتۆتە ناساندن[١٣].

سـەبارەت بە سـاڵی لەدایکبـوونی، لەڕاسـتیدا هـیچ یەکێـک لە سەرچاوەکان ئاماژەیان بۆ ساڵی لەدایکبوونی (الادریسي) نەکردووە، بەڵام زۆرینەی ژێدەرەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە ناوبراو لە ساڵی (٤٩٣ک/١١٠٠ز) لە شاری سەبتە (المغرب الاقصی)[١٤] لە دایک بووە[١٥]. ئەم زانیـارییەش بـۆ یەکەم جـار لە میخائیـل غزیـری وەرگیـراوە کە نـاوبراو ئەو سـاڵەی بە مێـژووی لەدایکبـوونی (الادریسـي) هەژمـار کـردووە[١٦]. هەرچـی دەربـارەی شـێوازی ژیـان و پێگەیشـتنیەتی ئەوا زانیارییەکی ئەوتۆ لەبارەی گەورە بوونی و خوێندنی لەم شـارە لەبەر دەستدا نییە، بەڵام دواجار ناوبراو ڕووی کردۆتە شاری (قرطبە)[١٧] کە مەڵبەندی ڕۆشنبیری بووە لەو سەردەمەدا، لەوێدا خوێندوویەتی و پێگەیشـتووە و زانیـارییەکی زۆر باشـی دەربـارەی (قـرطبە) هەبـووە هەروەک لە کتێـبەکەی خۆیـدا زۆر بە جـوانی وەصـفی ئەم شـارەی کـردووە[١٨]، دوای (قـرطبە) ڕووی کـردۆتە (صـقلیە) و لە نـاوچەی ژێـر دەسـەڵاتی ڕۆجەری دووەم مـاوەتەوە و کتێـبە بەناوبـانگەکەی بـۆ نووسـیوە[١٩]. پاشـان تـا ئەو کـاتەی ڕۆجەری دووەم لە سـاڵی (٥٤٨ک/١١٥٣ز) دەمرێت و کوڕەکەی بەنـاوی غلیـام[٢٠] دەسـەڵات وەردەگرێت، (الادریسي) لە (صقلیە) ماوەتەوە[٢١].

لەبـارەی بەهرەکـانی وەک ڕوونە (الادریسـي)یش هاوشـێوەی زاناکـانی سـەردەمانی پـێش خـۆی لە بـواری جۆراوجـۆر شـارەزایی هەبووە و شوێن پەنجەی لە چەند زانستێکدا دیارە و ستایشـی ناوبراو کراوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەی لەو سـەردەمەدا پسپۆری ورد و تایبەتمەند نەبوو، چونکە زاناکان هەموو زانستێکیان دەخوێند لە گەلێک بواری وەک مێـژوو و جوگرافیـا و ئەدەب و فەرموودەناسـی و فیقـە شارەزاییان پەیدا دەکرد، دواتریش هەروا دەناسران، ناوبراویش وەک

هەر زانایەکی سەردەمەکەی خۆی ئەم تایبەتمەندییانەی وەرگرتبوو، لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین بڵێین (الادريسي) وەک جوگرافیناس ئاشنایەتی زیاتر لەگەڵ ئەو بوارەدا هەبوو، سەرباری ئەمەش جگە لە بواری جوگرافیا لە چەند بوارێکی تریشدا ئەسپی خۆی تاوداوە، هەر لەبەر ئەمەشە (ابن العديم) (٦٦٠ک/١٢٦٢ز) ستایشی دەکات و دەڵێت: ((وكان أديبا، ظريفا، شاعرا، مغوى بعلم جغرافيا))[٢٢]. ناوبراو بە ئەدیب و لێهاتوو و شاعیر و خولیای زانستی جوگرافیا وەصفی کردووە، هەروەک بە گەشتیار و مێژوونووس و شارەزای ڕووەک پێناس کراوە چونکە کتێبی هەیە لە بارەی ڕووەک[٢٣]، تەنانەت یەکێ لە ژێدەرە بیانییەکان ئاماژەی بەوە داوە کە زانستی ڕووەکناسی لە ڕێگەی (الادريسي)یەوە ناوبانگی دەرکردووە، چونکە سوودی سێ سەد و شەست ڕووەکی بۆ دەرمانسازی ناساندووە[٢٤].

ئەمە جگە لە داهێنانە گەورەکەی (الادريسي) لە بواری جوگرافیادا کە لە پێشووتردا ئاماژەمان بۆ کرد، ئەوا لە بواری دیکەشدا شارەزایی هەبووە، وەک لەبواری پزیشکیدا شارەزا بووە بەتایبەت لەوەی کە کتێبێکی لەو بوارەدا نووسیوە، سەرباری ئەمەش لە بواری شیعر نووسیندا دەستێکی باڵای هەبووە.

هەرچی دەربارەی مردنی (الادريسي)یە سەرچاوەکان ئاماژەیان بە مێژووی مردنی ناوبراو نەکردووە، بەڵام ئەوەی ڕوونە ناوبراو تا ساڵی مردنی پادشای (صقلیه) ڕۆجەری دووەم لە (صقلیه) ماوەتەوە، بۆچوون هەیە کە لەتەمەنی پیریدا ڕووی کردۆتەوە سەبتە و لە ساڵی (٥٦٠ ک/١١٦٤ز ) کۆچی دوایی کردووە[٢٥] بەڵام هەندێ لە ژێدەرەکان لەسەر ساڵ و شوێنی مردنەکەی بۆچوونی جیاوازیان خستۆتەڕوو لەوانەش (مینورسکی) مێژووی مردنەکەی بە ساڵی (٥٦٢ک/ ١١٦٦ز) داناوە[٢٦]. هەروەها توێژەرێکی تر وای داناوە کە (الادريسي) لە (صقلیه)

مردووە چونکە هیچ شوێنەوارێکی گەڕانەوەی بۆ سەبتە دیار نییە، یاخود سەردانی هیچ شار و وڵاتێکی دیکەی نەکردووە[٢٧].

**دووەم: ناساندنی کتێبی (نزهة المشتاق)**

کتێبی (نزهة المشتاق) یەکێکە لە کتێبە هەرە گرنگ و بە بەهاکانی زانستی وڵاتناسی کە جێگەی بایەخ و تێڕامانە، لەبەر ئەوەی ماوەیەکی درێژ ئەم کتێبە وەک سەرچاوەیەکی زانستی لە وڵاتانی ڕۆژئاوایی ناسراو بووە لەبەر ئەوەی ساڵی (١٠٠١ک/١٥٩٢ز) لە ڕۆما بەچاپ گەیەنراوە[٢٨]، لەلایەکی دیکەشەوە بەیەکەم کتێب دادەنرێت کە بە زمانی عەرەبی لەسەر ڕۆژئاوا نووسرابێ[٢٩]، سەبارەت بە ناونیشانی کتێبەکە بریتییە لە (نزهة المشتاق في اختراق الآفاق)، ئەگەر سەیری ناونیشانی کتێبەکە بکەین ئەوا دەبینین کە لە دوو برگە پێکهاتووە (نزهة المشتاق) ئەوە دەردەخات کە حەز و ئارەزوو و خولیای نووسەر بۆ گەشتکردن لە ناونیشانەکە ڕەنگی داوەتەوە، هەروەک ئەم ناونیشانە بەو مانایە دێ کە زانیارییەکی زۆری جوگرافی تێیدا بەرجەستەیە، لە وەصف و باسکردنی بەشێکی زۆری ناوچە و وڵاتاندا، هەروەها بەشی دووەمی ناونیشانەکەشی (في اختراق الآفاق) بە واتای چوونە نێو وڵات و هەرێم و شار و نشینگە جیا جیاکان دێت، ڕەنگە ئەمەش ئەوە دەربخات کە خۆی سەردانی چەندین شاری کردووە، بەتایبەت لە دانانی کتێبەکەشیدا پشتی بەستبوو بەگەشتەکانی خۆی و ئەو لیژنە شارەزایەی کە پادشای سقلیە ناردبووی بۆ ناوچەکان بەمەبەستی کۆکردنەوەی زانیاری، بۆیە هەوڵی داوە ناونیشانێکی سەرنجڕاکێش بۆ کتێبەکەی هەڵبژێرێت کە ڕەنگدانەوەی ناوەڕۆکەکەی بێت، هەرچەندە ئاماژە بەوە دراوە کە ئەم کتێبە بەناونیشانی تریش هاتووە وەک (کتاب رجار)[٣٠].

دەربارەی هۆکاری نووسینی کتێبەکە دیارە وەک ئەوەی (الادریسي) خۆی لە پێشەکی کتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە ئەو کتێبەی بۆ پادشای سقلیە نووسیوە، وەک ئاماژە دەدات:(( فمن بعض

**معارفه السنية ونزعاته الشريفة العلوية أنه لما اتسعت أعمال مملكته وتزايدت همم أهل دولته وأطاعته البلاد الرومية ودخل أهلها تحت طاعته وسلطانه أحب أن يعرف كيفيات بلاده حقيقة))** [٣١].

بەو واتــايەی کە پادشـــای ســقلیە دوای ئەوەی ناوچەکــانی ژێــر دەســەڵاتی فـراوان بـووە حەزی کـردووە بـارودۆخی ناوچەکـان بزانـێ. ڕەنـگە ئەم هەوڵەی پادشـای سـقلیە ئەوەنـدەی بـۆ زانینـی بـارودۆخی ناوچەکـانی ژێـر دەسـەڵاتی بـووە، چـونکە خەڵکـانی جۆراوجـۆر لە ژێـر فەرمــانڕەوایی ئەودا بــوون، ئەوەنــدەش حەزی کردبــێ کە ئاگــاداری ناوچەکانی دەوروبەری خۆی بێت بەتایبەت ئەو ناوچانەی هاوسنووری بـوون لە ڕووی جـوگرافییەوە، بە پشـت بەسـتن بەو دەقەی (الادریسـي) کە دەڵێت: (( **أحب أن يعرف كيفيات بلاده حقيقة، ويقتلها يقينا وخبرة، ويعلم حدودها ومسالكها برا وبحرا، وفي أي إقليم هي، وما يخصها من البحار والخلجان الكائنة بها، مع معرفة غيرها من البلاد والأقطار في الأقاليم السبعة))** [٣٢].

دەکرێت بڵێین لەبەر ئەوەی سقلیە هەڵکەوتە جوگرافییەکەی نزیک بـوو لە جیهـانی ئیسـلامی، سـەرباری ئەمەش موسـڵمانان پاشـخانێکی سیاســی و شارســتانییان هەبــوو لەو شــوێنە، ئەمە لەلایەک، لەلایەکــی ترەوە ڕۆمەکان بەردەوام لە هەوڵی گرتنی ئەو ناوچانەدا بوون، ئەوەتـا لە ســەردەمی دەســەڵاتی موســڵمانان چەنـدین جـار هەوڵـی گرتنـی ئەم ناوچانەیان داوە، وەک لە پێشتردا ئاماژەمان بۆ کرد. بۆیە لەسەر داوای پادشــا ڕۆجەری دووەم ئەم کتێـبە گـرنگە هــاتۆتە بەرهەم هەر ئەمەش وای کـــردووە کە ئەم کتێـــبە هاوکـــات لەگەڵ ناونیشـــانەکەی خـــۆی ناونیشــانی (کتــاب رجار)یشــی بــۆ بەکاربێــت، ســەرباری ئەمــانەش نووسـینی ئەو کتێبە هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆری پێوە دیـارە، لەبەر ئەوەی ئەو کتێبە وەک شیکردنەوەیەک وایە بۆ ئەو نەخشـەیەی لەسـەر گــۆیە زیــوییەکەدا کێشــاویەتی، وادیــارە ســاڵی (٥٤٨ک/ ١١٥٣ز) لە نووسـینی کتێبەکەی تەواو بووە، کاتێک باسی لەوە کردووە کە پازدە

ساڵی پێچووە لە نووسینی ئەو کتێبە و دەڵێت:(( وأقام على ذلك نحوا من خمس عشرة سنة))[٣٣]. ئەمەش دەرەنجامی گەلاڵە بوونی ئەو کۆمەڵە زانیارییە بوو کە هەم لە هەوڵ و گەشتەکانی خۆی و هەمیش لە ئەنجامی کۆکردنەوەی زانیاری بوو لەلایەن ئەو لیژنەیەی پادشای سقلیە دیاری کردبوو.

ئامانج لە نووسینی کتێبەکە: زۆرینەی نووسەران لە کۆن و ئێستاشدا لە کاتی نووسینی کتێبەکانیان ئامانجی خۆیان دیاری کردووە، بەڵام ئەوەی لای (الادریسي) هەستی پێدەکرێ، ئامانجی ئەو کەسە دەردەخات کە کتێبەکەی بۆ نووسیوە نەک خۆی[٣٤]. ڕەنگە پادشا ڕۆجەر ئامانجی ئەوە بووبێ کە زانیاری پەیدا بکات دەربارەی وشکانی و دەریایی ناوچەکانی دەوروبەری سقلیە، بەتایبەت ئەو ناوچانەی لە ڕووی سیاسییەوە هەژموونیان بەسەر ناوچەکەی ئەودا هەبووە، چونکە هەڵکەوتەی ئەم ناوچەیە کەوتۆتە نێوان هەردوو جیهانی ئیسلامی و نەصرانی، هەر لەو پێودانگەشەوە هەوڵی داوە ڕەوتی ژیان و ژمارەی دانیشتوان و جلوبەرگ و زمان و ئایینزاکانیشیان بزانێ: ((مع ذكر أحوال أهلها وهيئاتهم وخلقهم ومذاهبهم وزيهم وملابسهم ولغاتهم))[٣٥].

هەرچی دەربارەی گرنگیی کتێبەکەیە لە ڕوانگەی نووسەرە بیانییەکان: کتێبی (نزهة المشتاق) خۆی لە خۆیدا شیکردنەوەیەکە بۆ ئەو نەخشە و ئەتلەس و گۆ زیوییەی کە (الادریسي) دروستی کردووە، لەبەر ئەوەی کتێبەکە جیا لە کتێبە ولاتناسییەکانی دیکە گرنگی و تایبەتمەندیی خۆی هەیە، چونکە بەشێک لە زانایانی موسڵمان زانیاریی نێو کتێبەکەی ناوبراویان بەکارهێناوە بۆ ئەوەی کتێبەکانی خۆیانیان پێ پڕ بایەختر و بە بەهاتر دەربخەن، کەچی ئاماژەیان بۆ گرنگیی ئەو کتێبە نەکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆربەی زانیارییەکانیان دەربارەی ڕۆژئاوا لە کتێبی (نزهة المشتاق) وەرگرتووە، بەڵام ڕۆژئاواییەکان بەچاوێکی پڕ بایەخەوە لەو کتێبەیان ڕوانیوە هەروەک یەکێک لە

ژێدەرە ڕۆژئاواییەکان ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە: (( کتێبەکە بەزۆری پڕە لە زانیاریی ڕاست و دروست، و بابەتگەلی زۆر لە بارەی وڵاتانی ئەوروپا کە میللەتانی نەسرانی تێیدا نیشتەجێن لەخۆ دەگرێ)) [٣٦].

هەروەک ژێدەرێکی تر ئاماژە بۆ ئەوە دەکات: (( لێکۆڵینەوە عەرەبییەکان پێویستییەکی زۆریان هەیە بەبڵاوکردنەوەی کتێبەکەی (الادریسي)، کە بە گرنگترین کتێبەکانی سەدەکانی ناوەڕاست لە بواری جوگرافیادا دادەنرێت)) [٣٧].

لە وتەیەکی تر دەربارەی کتێبەکەی (الادریسي)دا هاتووە: ((بە دڵنیاییەوە دانراوەکانی (الادریسي) لە بواری جوگرافیادا دیاردەیەکی نایابن بەتایبەت لە چوارچێوەی ئەدەبی جوگرافی عەرەبی و لە تەواوی چالاکی زانستی و کۆی سەدەکانی ناوەڕاست بەگشتی، لەبەر ئەوە بەڕاستی جێگەی سەرسوڕمانە کە بۆ ماوەی چەندین سەدەی دواتر بەرهەمەکانی بە نادیاری و باسنەکراوی بمێننەوە)) [٣٨].

لەلایەکی دیکەوە توێژەرێکی ئیتالی دەڵێت: (( باشترین پەیامێکە لەبارەی جوگرافیا لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە تاکو ئێستا پێمانگەیشتبێت)) [٣٩].

سەربارى ئەمانەش توێژەرێکی هیندی ئاماژە دەدات و دەڵێت: ((بەدڵنیاییەوە کتێبەکەی (الادریسي) نموونەیەکی بەرزی ئاوێتە بوونی زانیارییە کۆنەکانی جوگرافییە لەگەڵ زانیاریی نوێدا)) [٤٠].

هەروەها غوستاف لوبون ئاماژەی بەوە داوە: ((کتێبەکانی (الادریسي) وەرگێڕدران بۆ لاتینی، کە ئەوروپای لە سەدەکانی ناوەڕاستدا فێری زانستی جوگرافیا کرد)) [٤١].

**تەوەری دووەم: ڕەهەندە شارستانییەکانی کورد و کوردستان لە کتێبی (نزهة المشتاق)**

چەند لایەن و تەوەرەیەکی تایبەت بە کورد و ناوچە کوردنشینەکان لە کتێبی (نزهـة المشتاق)دا باسیان لێوە کراوە، بەڵام زۆربەیان کورتن و زانیاریی پێویست لەبارەیانەوە نەخراوەتەڕوو، ئەمەش بەپلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی کتێبەکە و میتۆدی نووسەر لە نووسینیدا، لێرەدا دەکرێت گرنگترین ئەم ڕواڵەتە شارستانییانەی تایبەت بەم باسە لەم خاڵانەی خوارەوە کورت بکەینەوە:

**یەکەم- سیما و ڕواڵەتە شارستانییەکان:**

گرنگترین ئەو سیما شارستانییانەی لە ناوچە کوردییەکاندا دەبینرێت خۆی لە قەڵا و قایمکاری و شووراکان دەبینێتەوە، کە ئەمانەن باسیان لێوە دەکەین:

**أ- قەڵاکان:**

یەکێک لە گرنگترین سیما شارستانییەکانە، بوونی ئەم قەڵایانەش لە زۆرێک لە شار و ناوچە کوردی و کوردنشینەکان وایکردووە بێتە بەر باس و هەڵوەستەی لەسەر بکرێت لەلایەن زۆرێک لە وڵاتناس و گەڕیدەکان، ئەگەرچی نووسەری (نزهـة المشـتاق) سەردانی ئەم ناوچانەی نەکردووە بەڵام بە سوود بینین لە سەرچاوەکانی پێش خۆی ئەم لایەنەشی خستۆتە بەر باس هەرچەندە ڕێژەیەکی زۆریشی فەرامۆش کردووە، ئەم قەڵایانەش زیاتر بۆ بەرگریکردن لە شارەکان بنیاد نراون تا وەک لەمپەر و ڕێگرێک بن بەڕووی دوژمناندا، ڕەنگە ئەمەش لەبەر ئەوە بووبێت هەڵکەوتەی کوردستان لە کۆنەوە تا ئێستاش جێگای چاو تێبڕینی هێزە دەرەکییەکان بووە، یاخود بنیادنانی ئەم قەڵایانە زیاتر بۆ خۆحەشاردان و پارێزگاری بەکارهاتبێت، لە

گرنگترین قەڵاکانیش کە ناوی هێناون، قەڵای ماردین (قەڵای بازی الاشهب).

(الادریسي) باس لەوە دەکات کە لەسەر چیای ماردین قەڵایەک بنیادنراوە لەلایەن (حمدان بن الحسن)[٤٢]، ئەم قەڵایە (بازی الاشهب)یشی پێ وتراوە، قەڵاکەش بە هیچ جۆرێک ناتوانرێت ببڕدرێت بەهۆی بەهێزی و قایمییەکەی و ڕێگری شوێنەکەی[٤٣].

**ب- شوورا و بیناکان:**

یەکێکی دیکە لە ڕواڵەتە شارستانییەکان بوونی شووراکانە، کە بۆ بەرگریکردن لە شارەکان و پارێزگاریکردن لە دەسەڵاتە سیاسییەکان و مانەوەی پێگە و هێزیان و خۆ قایمکردن بەکارهاتووە، هەروەک بە هێڵی بەرگری بە چواردەوری شار و هەر شوێنێکی مەبەست دانراوە[٤٤]، زیاتریش وەک لەمپەرێک بووە بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشی لە ناکاوی دوژمنان، ڕەنگە ئەمەش بەپێی شوێن و کات و سەردەم جیاوازییان هەبووبێت، سەرباری ئەوەی شووراکان قەبارە و بەرزایی و هێزی خۆڕاگری و شێوە و ماددە بەکارهاتووەکانی بنیادنانیان جیاواز بوون، (الادریسي) هەندێکیانی باس کردووە، هەروەها باسی بینا و خانووەکانی هەندێک لە شارەکانیشی کردووە، هەرچەندە وردەکاری لەبارەی بنیادنەر و تێکدەر و نۆژەنکەرەوەی شووراکان باس نەکردووە، یاخود تەنها تیشکێکی خستۆتەسەر شارەکە و بەوەی کە شوورایەکی هەبووە:

بۆ نموونە لەباسی شوورای شاری نەسێبیندا ئاماژەی بەوە داوە شارەکە شوورایەکی بەهێزی هەبووە[٤٥]، یاقوت ئاماژەی داوە ئەم شوورایە لەلایەن ڕۆمەکانەوە بنیادنراوە و (انوشیروان) تەواوی کردووە[٤٦]، هەروەها شاری گەنجەش شوورای هەبووە[٤٧]، بەڵام لە باسی شوورای شاری ئامەد باس لەوە دەکات کە شووراکە لە بەردی (الارحاء) ڕەنگ ڕەش دروستکراوە، و لەنێوانی شووراکەش جۆگەلەی

ئـاو هەیە[٤٨]. هەروەهـا شـوورای شـاری سـنجار (شـەنگال) لە بەردی بەهێز دروستکراوە[٤٩]، شاری نەهاوەند شوورا و خانوو و بیناکانی لە قـوڕ دروسـتکراوە[٥٠]، هەروەهـا باسـی لەوە کـردووە کە شـاری دویـن شوورایەکی بەرزی هەیە و زۆربەی خانوو و بنیادنراوەکانی لە قوڕ و خشتی سووره [٥١] بینا و خانووەکانی شاری (موصل) زیاتر لە گەچ و بەرد دروستکراوە[٥٢]، هەروەها لە باسی شارەکانی سیروان و سەیمەرە ئامـاژەی بەوە کـردووە زۆربەی خـانوو و سـاختمانەکانیان لە بەرد و گەچ دروست کراوە [٥٣].

**ج- مزگەوت و پەرستگاکان:**

نووسـەر تیشـکی زۆری نەخسـتۆتە سـەر ئەم بـابەتە، بەتـایبەت لە ناوچە کوردی و کوردنشینەکان تەنها چەند نموونەیەکی کەم نەبێ:

لە باسـی شـاری روهـادا ئامـاژەی داوە کە زیـاتر لە دووسـەد پەرسـتگا (بـیعە) و دێـری راهیبەکـان لەو شـارەدا هەبـووە[٥٤] هەروەهـا ئاماژە دراوە بە دێرێک لەو شارەدا بەناوی (دیر زکی) [٥٥].

لەلایەکی دیکەشـەوە (الادریسي) باسـی شـوێنی نوێژی سـابیئەکان دەکـات لە شـاری حەران بەوەی کە شـوێنی نوێژیـان کەوتـۆتە سـەر گردۆلکەیەکەوە[٥٦].

بێگومـان باسـکردن دەربـارەی هەریەکێـک لەمـانەی سـەرەوە ئاماژەیەکە بۆ بوونی پەیڕەوانی ئەو جۆرە ئایینانە لەم شارانەدا، کەواتە لە نێو شارە کوردی کوردنشینەکاندا موسڵمان و نەصرانی و سابئەش هەبـوون، بە باسـکردنی ئەوەی کە زۆریـنەی خەڵکـی شـاری روهـا نەصرانین، ئەوە دەردەخات کە ڕێژەی موسڵمانان لە شارەکانی دیکەدا زۆرینە بووە، بۆیە نووسەر هەر باسی ئەو لایەنە ئایینییەی کردووە کە لە نێو ئەو دوو شارەدا زۆرینە بوونە.

**دووەم- لایەنی ئابووری:**

ئەگەر لاپەڕەکانی زۆرێک لە بەرهەمەکانی وڵاتناسان هەڵبدرێتەوە دەردەکەوێت کە یەکێک لەو لایەنانەی باسی لێوە کراوە لایەنی ئابووری بووە، (الادریسي) خۆی لە قەرەی هەمان بابەت داوە و تیشکی خستۆتەسەر، ئەگەرچی ڕەنگە باسی زۆرێک لە ناوچەکانی نەکردبێت یاخود هەموو ڕەهەندەکانی ئەو لایەنەی زەق نەکردبێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کورتەیەکی دەربارەی هەندێک لە شار و ناوچە کوردی و کوردنشینەکانی خستۆتەڕوو کە دابەشیان دەکەین بۆ سەر چەند لقێک:

**أ- ئاژەڵداری و کشتوکاڵ:**

لە بارەی پیشەی ئاژەڵداری (الادریسي) زۆر کەم دەربارەی ئەم پیشە گرنگە لە ناوچە کوردییەکان دواوە و کە خۆی سەرچاوەی پیشەکانی دیکەیە و بەپێی ئەوە کە ناوچە کوردییەکان شاخاوییە و بە ڕێژەیەکی زۆر ئەو پیشەیە هەبووە، بۆ نموونە لە (مرج القلعة) ئاماژەی داوە کە مەڕ و ماڵات لەو شارەدا زۆر بووە(٥٧)، هەروەها لە بارەی زۆمە کوردییەکانیش باس لەوە دەکات کە مەڕو ماڵاتیان بەخێو کردووە(٥٨).

هەرچی لە بارەی کشتوکاڵە بەیەکێک لە چالاکییە سەرەکییەکانی ئابووری دادەنرێت بە جۆرێک میللەتان لە کۆنەوە گرنگییان بەو بابەتە داوە و لەگەڵیدا هەڵیان کردووە، ئەمەش بۆتە مایەی نیشتەجێبوون و بناغە و دەستپێکی شارستانی، هەرچی دەربارەی شوێنە کوردی و کوردنشینەکانیشە ئەوا بەهۆی بوونی خاکی باش و بەپیت و سروشتی کوردستان لە بوونی بەرز و نزمایی و بوونی بەفر و باران و توانەوەی بەفر و بوونی ڕووبار و کانی و چاوگە ئاوییەکان کە سوودیان لێ وەرگیراوە، ئەمانە هەمووی کاریگەرن بۆ بوونی چەندەها بەروبوومی کشتوکاڵیی جۆراوجۆر(٥٩).

ئەوەی (الادريسي) لە بارەی كشتوكاڵ و بەرهەمەكان لە ناوچەكاندا باسی كردووە ڕەنگە زۆر بە فراوانی باسی هەموو ناوچە و بەرهەمەكانی نەكردبێت، بەڵام لە هەندێك شوێندا ئاماژەی بە بوونی بێستان، یان كشتوكاڵ یاخود بوونی بەرهەم لە ناوچەكەدا كردووە بێ ناوهێنانی بەرهەمەكە.

بۆ نموونە لە شاری دینەوەردا باسی لەوە كردووە كە ئەو شارە بەرهەمی زۆرە و كشتوكاڵی بەپیتە و بێستانی زۆرە[٦٠]، لە شاری بەروجیرد میوەجاتی زۆرە و بازرگانیشی پێوە كراوە[٦١]، و بەڵگەشە لەسەر زۆریی میوەجاتی ئەو شارە، هەروەها (یاقوت) ئاماژەی بەوە داوە كە لەو شارەدا زەعفەران ڕواوە[٦٢]، هەروەها لەشاری سیروان و سەیمەرە میوەجاتیان زۆر بووە و بەرهەمی وەك خورما و گوێز و زۆربەی بەرهەمە زستانییەكانیشیان هەبووە[٦٣]، هەروەك (الادريسي) باسی لەوە كردووە هەندێك لە گوندەكانی مەراغە (شووتی) هەیە (الاردهری) پێ وتراوە و وەصفی ئەو بەرهەمەشی كردووە بەوەی كە شێوەكەی درێژە و ناوەكەی سوورە و توێكڵەكەشی سەوزە[٦٤]، وە لە شاری بەرزەعەش بەگشتی كۆمەڵێك بەرهەم هەن، بێ ئەوەی ڕوونكردنەوە لە بارەی بەرهەمەكان بدات و ئاماژەی داوە كە داری مێو لە شارەكەدا زۆرە[٦٥]، بەمەش وا دیارە كە بەرهەمی ترێ لە شارەكەدا زۆر بووە، (القزويني) ئاماژەی بە بوونی قەرنەفڵ لە شارەكە داوە[٦٦]، سەرچاوەكانیش جەخت لەسەر بە پیتی و پڕ بەرهەمیی شارەكە دەكەنەوە[٦٧]، هەروەها باسی لە شوێنێكی نزیك شاری بەرزەعە كردووە بەناوی (الاندرلاب) كە سێ میل لە بەرزەعەوە دوور بووە، لەوێدا بەرهەمی بوندوق و شاە بەلووت و ڕوقال كە جۆرێكە لە (غبیراو) [٦٨] ئاماژەی كردووە كە هاوشێوەی نییە لە هیچ شوێنێك[٦٩]، هەروەها بەرهەمی مێو لە هەردوو شاری گەنجە و شەمگوردا هەبووە[٧٠]، هەروەها لە شاری حلواندا دار و باری زۆرە و شارێكی

بەپیتە و داری خورما و هەنجیری زۆرە[٧١] هەرچەندە (الادریسي) باسی هەناری ئەو شارەی نەکردووە کە لە سەرچاوەکان جەختی لێکراوەتەوە بە جۆرێکی زۆر باش وەصف کراوە[٧٢]، هەروەها لە شاری سنجار (شەنگال)یش ئاماژەی داوە کە بەرهەمی زۆرە[٧٣]، هاوکات گەڕیدەیەکیش کە خۆی سەردانی شارەکەی کردووە بە دیمەشقی چواندووە[٧٤]، بە واتای خۆشی و پڕ بەرهەمی شارەکە بووە، لەگەڵ ئەوەی نووسەر زانیاری دەربارەی بەرهەمەکانی ئەو شارە نەخستۆتەڕوو بەڵام لەبەر زۆریی دار خورما لە شارەکە بە دۆڵی خورما ناسراوە[٧٥]، ئەمە سەرباری بوونی میوەی جۆراوجۆری وەک نارنج و ترنج و هەنار و هەنجیر و ترێ[٧٦]، هەروەها لە شاری (موصل) گوند و کێڵگەکانی درێژبووەوەی یەکترن و بەسەر یەکەوەن[٧٧]، واتە ئەو شارەش کشتوکاڵی هەبووە، هەروەها شاری دینەوەریش پڕ لە بەرهەم و کێڵگەی بەپیت بووە[٧٨]، لە لایەکی دیکەشەوە لە باسی شاری شێروان ئاماژەی داوە میوە لە نێویاندا هەرزانە[٧٩]. بەو واتایەی ئەو شارە بە میوەجاتەوە دەوڵەمەند بووە کە ڕەنگە لەبەر زۆرییەکەی نرخەکەی هەرزان بووە، هەروەها لە باسی شاری دارا ئاماژەی بەوە داوە کە کێڵگە و باخاتی زۆر بووە[٨٠] و لە شاری هەمەدان ئاو و بێستانی زۆر بووە[٨١].

**ب- بازرگانی و بازاڕ:**

ئەمیش یەکێکە لە پاژە گرنگەکانی ئابووری، کە لە سەردەمانی کۆنەوە ئەو چالاکییە ئەنجام دراوە هەرچەندە سەرەتا ڕەنگە بە ئاڵوگۆڕکردنی شتومەک دەستی پێکردبێت، دواتر بۆتە کڕین و فرۆشتن و زیاتر لەوەدا هاتۆتە کایەوە کە بەرهەمی ناوچەیەک زیادی کردووە، ناوچەیەکی دیکەش ئەو بەرهەمەی نەبووە، بۆیە هەوڵدراوە لەڕێگەی ئاڵوگۆڕەوە پێویستی یەکتر پڕ بکەنەوە، هەروەک ناوچە کوردی و کوردنشینەکان لەمە بەدەر نەبووە، بەتایبەت بەهۆی هەڵکەوتەی

جوگرافیی کوردستان کە کەوتۆتە سەر ڕێگاکانی بازرگانی و هەروەها تۆبۆگرافیای خاکەکەی کاریگەر بووە بۆ چەندیەتی و جۆراوجۆریی بەروبوومەکان، کە دواجار بوونەتە هۆی بازرگانی لە نێوان ناوچەکاندا، هەرچەندە (الادریسي) تیشکی کەمی خستۆتەسەر ئەو بابەتە، سەربارى ئەمەش جۆری بازرگانییەکە و لایەنەکانی بازرگانییەکەشی باس نەکردووە بەتایبەت لە نێوان چ شار و شارێکدا ئەنجام دراوە، بەڵام بەلایەنی کەمەوە هەندێکیشی باس کردووە کە دەیخەینەڕوو:

شاری نەسێبین ئامانجی بازرگانەکان بووە[٨٢]، هەروەها بازرگانی لە نێوان (جزیرة ابن عمر) و شاری (الموصل)دا کراوە، بەتایبەت باس لەوە دەکات کەوا بەلەمەکان بە (جزیرة ابن عمر) دەگەن کە بازرگانی لەگەڵ شاری (الموصل)دا دەکەن[٨٣]، هەروەک بازرگانی هەنگوین و کونجی و گوێز و لۆز و بوندق و پەنیر کراوە[٨٤]، هەروەها لە شاری هەمەدان بەردەوام بازرگانی تێدا کراوە[٨٥]، لە ئەسەد ئابادیش بازرگانی کراوە[٨٦]، لە کرمانشاهیش بازرگانی هەبووە پارەشیان زۆر بووە[٨٧]، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە شارێکی دەوڵەمەند بووە، لە شاری بەروجیرد بازرگانی کراوە لەگەڵ (کەرەج) [٨٨] گورجەکان بە تایبەت بازرگانی میوە[٨٩]، و لە شاری دوین بازرگانی بە کەلوپەلی ناشەرعی کراوە[٩٠]، لە شاری ماردیندا گەوهەری شووشە هەبووە و بازرگانی پێکراوە لەگەڵ تەواوی شارەکانی هەرێمی جەزیرەدا[٩١].

هەرچی دەربارەی بازاڕە ئەوا شوێنی کڕین و فرۆشتن و ئاڵوگۆڕکردنی کەلوپەلەکانە، بەهۆی هەڵکەوتەی جوگرافی کوردستان کە کەوتۆتە سەر ڕێگا بازرگانییەکان ئەمە ڕێخۆشکەر بووە کە کاروانە بازرگانییەکان بەو شارەدا تێبپەڕن و ڕەنگە هەندێک لە کەلوپەلەکانیان لە شارە کوردییەکاندا ساغ کردبێتەوە بەو واتایەی کە جوگرافیای کوردستان و بوونی ئاو و هەوای لەبار و خاکی بەپیت ڕێخۆشکەر بووە لە بوونی بەرهەمی زۆر لە ناوچەکاندا ئەمەش بۆتە هۆی ئاڵوگۆڕ

و بازرگانی، هەروەها هاوردە و ناردەنی کراوە بۆ وەدەستخستنی کەلوپەلەکان بۆ بەکاربەر، بێگومان هەموو ئەو کارانەش شوێنێکی گرنگی پێویست بووە ئەویش بازاڕەکانە، (الادریسي) لە هەندێک لە شارە کوردی و کوردنشینەکاندا ئاماژەی بە بوونی بازاڕ کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زانیاری لە بارەیانەوە نەخستوەتەڕوو، بەڵکو زۆر بە کورتی ئاماژەی داوە کە بازاڕ یاخود چەند بازاڕێک لە شارەکاندا هەبووە کە دەیانخەینەڕوو:

بۆ نموونە ئاماژەی بە بوونی بازاڕ کردووە لە شاری هەمەدان کە چەند بازاڕێکی هەبووە و نرخیش لەگەڵ ڕۆژگار بەرز دەبێتەوە(٩٢). بێ ئەوەی ئاماژە بە ناوی بازاڕەکە و کاتەکەی بکات (المقدسي) باسی لەوە کردووە کە لە شارەکە چەند بازاڕێک هەبووە و بازاڕەکانیش سێ چین بوون و بازاڕێکیشی مزگەوتی تێدا بووە، هەروەک درێژە دەدات بەوەی کە لەوێدا نان هەرزان بووە(٩٣)، هەرچەندە (الادریسي) ئاماژەی کردووە کە نرخ بەرز بووە. لە ئەسەد ئابادیش چەند بازاڕێک هەبووە(٩٤)، لە شاری کرمانشا چەند بازاڕێک هەبووە(٩٥)، لەلایەکی دیکەشەوە لە سیروان و سەیمەرە بازاڕ هەبووە(٩٦) کاتێک (الادریسي) باسی لەو دوو شارە کردووە ئاماژە دەدات کە ئاو بەنێو بازاڕەکانیاندا تێپەڕیوە ئەمەش بەو واتایە کە هەردووکیان بازاڕیان هەبووە.

ئەو بازاڕانەی کە نووسەر ناوی هێناون و زانیاری لەبارەیانەوە داوە ئەویش بازاڕی (کرکی)یە، ئەو بازاڕە لە شاری بەرزەعەیە هەموو ڕۆژی یەکشەممە خەڵکێکی زۆر لێی کۆبۆتەوە، لە هەموو ئاراستە و لایەکەوە خەڵکی بۆ هاتووە و لەوێدا ئاڵوگۆڕ کراوە و کەلوپەل و شتە دروستکراوەکانیان فرۆشتووە(٩٧). ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو بازاڕە هەفتەیی بووە و لە هەفتەیەکدا یەک جار بازاڕەکە کراوەتەوە.

بازاڕێکی دیکەش کە نووسەر ناوی بردووە (سوق الاحد)ە ، کە ئاماژەی داوە لە روستاق (المرج) کە بەرامبەر روستاقی (نینوا)یە و

روستاقێکی گەورەیە، لەو روستاقەدا شارێک هەیە بەناوی (سوق الاحد) لەو شارەشدا بازاڕێک هەیە کە هەموو یەکشەمەیەک لە کاتێکی دیاریکراودا کوردەکان ڕوو دەکەنە ئەو بازاڕە[98]. لێرەدا (الادریسي) ناوی بازاڕەکەی بە شار بردووە، هەروەها لە بارەی شاری ڕەقە ئاماژەی داوە کە ئەو شارە چەند بازاڕ و فرۆشگایەکی هەبووە و هاوردە و ناردەنی تێدا کراوە[99].

**ج- پیشەسازی:**

یەکێکی دیکە لە پایە گرنگەکانی ئابووری کە بەهۆی تێپەڕینی کات و زیادبوونی پێداویستی و گۆڕانکاری لە ژیاندا و گرنگیدان بە بابەتە کەمالییەکان هاتە کایەوە، ڕەنگە ئەو سەردەمەی ئێمە لەبارەیەوە قسە دەکەین ئەو بوارە ئەوەندە پێشکەوتوو نەبووبێت، بەڵام لەچاو سەردەمانی کۆنیشیدا گۆڕانکاری هەبووە، ڕەنگە بە تێپەڕینی کات و گۆڕانکاری بەسەر بیرکردنەوەی مرۆڤ و گەشانەوەی باری ئابووریی کۆمەڵگاکان بۆتە هۆکاری سەرهەڵدانی ئەم بزاوتە ئابوورییە، لە ناوچەکانی کوردیشدا ئەم بزاوتە ڕۆڵی خۆی بینیوە، بەتایبەت لەبەر هەبوونی مادده سەرەتاییەکان و پێداویستی مرۆڤ بۆ بەرهەمە پیشەسازییەکان لەگەڵ ڕۆژگار لە زێدەدا بووە، بۆیە بیری ئەم بزاوتە لای کوردیش کارا بووە. کە چەند نموونەیەک لەلایەن (الادریسي)یەوە باس کراوە:

لە شاری ئامەد چەندەها ئاشی ئاو هەبووە کە لەسەر کانییە ئاوەکان دانراوە[100]، و هەروەها ئاماژەی بە جۆرە دۆخینێک کردووە کە لەو شارە دروست کراوە[101]، هەروەک لە شاری میافارقین جۆرە دۆخینێک دروست دەکرێت کە شان لە شانی ئەو دۆخینە دەدات کە لە سەلماس دروست دەکرێت، بگرە لەڕووی چاکی و نایابییەوە لە سەرووی ئەویشەوە بووە، هەروەک دەسماڵی فرە و (السبنیات)یشی لێ دروست دەکرێت[102]، هەروەها ئاماژە بە دروستکردنی جۆرە دۆخین

دەکات لەو شارە[١٠٣]، هەروەها لە شاری دوین جۆرەها مافوور و ڕایەخ و پشتی و سەرین و پشتێن و قوماشی کر و چەندین جۆر کاڵا لە سووفی ئەرمەنییان دروست کردووە، هەروەک بەناوبانگ بووە بە پۆشاکی سوندس کە هاوشێوەی نەبووە لە وڵاتی ڕۆم، بەگشتی بەرهەمە دروستکراوەکانی ئەو شارە بێ وێنە بووە لە هەموو دونیا[١٠٤]، هەروەها دەڵێت: (( لە شاری نەسیبین کۆمەڵێک پیشەوەر و خاوەن کاری کارامە و شوێنی چنین و دوورینی جلوبەرگی چاک و باش هەن))[١٠٥]، لەلایەکی دیکەوە هەمەدانیش بە هۆی زۆریی ماڵاتەوە ماست و پەنیر و ڕۆنی زۆری لێ بەرهەم هاتووە[١٠٦]، هەروەها لە شاری ماردینیش گەوهەری شووشە هەبووە[١٠٧].

**د- لایەنی کۆمەڵایەتی:**

(الادریسي) زۆر نەپرژاوەتە سەر ئەو لایەنە بە گشتی و بە تایبەت ناوچە کوردی و کوردنشینەکان، بەڵام چەند ئاماژەیەکی کورتی لەو بارەیەوە داوە هەرچەندە ئاماژەکان زۆر کورتن و ڕوونکردنەوەی لەبارەوە نەداوە:

سەرەتا سەبارەت بە نەژادی کورد (الادریسي) لەلای خۆیەوە بە پشت بەستن بە وتەکانی (ابن درید) باسی لە نەژادی کورد کردووە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە کوردەکان لە عەرەبەکانن و بنەچەیان دەگەڕێتەوە بۆ (کرد بن مرد بن عمرو بن عامر)[١٠٨]. ئەوەی ڕوونە ناوبراو بنەچەی کوردی گەڕاندۆتەوە بۆ عەرەبەکان، وا دیارە لەو سەردەمەدا ئەم بابەتە بە تەواوی لە نێو نووسینەکانی کتێبە ئیسلامییەکان بەرچاو دەکەوێت کە بەهۆی بڵاوبوونەوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام هەندێک کەس بەتایبەت ئەوانەی زانیارییان داوە بە نووسەرەکان خۆیان گەڕاندبێتەوە بۆ عەرەبەکان، یان نووسەرەکان هەر لە خەیاڵاتی خۆیان ئەو بنەچانەیان بۆ میللەتان دروست کردووە، بێ هەبوونی بەڵگەی پێویست، دەکرێت بڵێین ئەم لێکدانەوانە تەواو بێ

بنەما و ئەفسانەیین و شایانی ئەوە نین پشتیان پێ ببەسترێت و هەڵوەستەیان لەسەر بکرێت[١٠٩].

لەبارەی نەتەوەکانیش ئەوا ناوبراو باسی نەکردوون کە کام شارە لە هەرێم و ناوچە کوردی و کوردنشینەکان چ ڕەگەزێکی لێ نیشتەجێیە، تەنها هەندێک ئاماژەی بەلایەنی ئایینییان داوە وەک ئەوەی لە شاری (کفر عزی) موسڵمان و نەصرانی لێ نیشتەجێیە، و نەصرانییەکانیش بە (الشهارجه) ناسراون[١١٠]، هەروەها ئاماژەی داوە کە زۆربەی خەڵکی روها نەصرانین، شوێنی پەرستشە ئایینییەکانیشی لەو شارەدا دەرخستووە بەتایبەت کاتێک باسی لەوە کردووە کە نزیکەی دووسەد دێر و شوێنی پەیمانـدانی نەصرانییەکانی لێیە تەنانەت نەصرانییەکان لە هیچ شوێنێک هاوشێوەی شاری روها دێر و شوێنی پەرستشی ئایینی وا گەورەیان نییە وەک ئەوەی کە لە روهادا هەیانە[١١١]، لەلایەکی دیکەشەوە ئاماژەی داوە کە شاری حەران بە شاری سابئە ناسراوە باس لەوە دەکات ئەو شارە شاری سابئەکانە و شوێنی نوێژکردنیان لەسەر گردۆڵکەیەکە، و کە خۆیان بە گەورەی دەزانن و خۆشیان دەگەڕێننەوە بۆ (ابراهیم) پێغەمبەر (د.خ)[١١٢]، و ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بوونی ڕێژەیەکی زۆری سابیئەکان لەو شارەدا.

هەروەها باسی مۆرکە گشتییەکانیش لەلایەن (الادریسي)یەوە باسی لێوە کراوە، دیارە مرۆڤەکان بە گشتی هاوشێوە نین، بەڵکو هەریەکەیان لەوی تر جیاوازە، بەڵام ڕەنگە میللەتێک یان نەتەوەیەک خاڵی هاوبەشی زیاتریان تێدا بێ لە میللەتانی دی، یاخود خەڵکی ناوچەیەک خووڕەوشتیان لەیەکەوە نزیک بێت و ئەم خووڕەوشتەش بۆتە مۆرکی گشتیی خەڵکی ناوچەکە، جا ئەم جیاوازی و وێکچوونەش بەهۆی کاریگەریی ئاو و هەواوە بێت یان بەهۆی جیناتەوە دروست بووە، لە دووتوێی کتێبی (نزهة المشتاق)دا مۆرکی دوو شاری دەرخستووە کە باسی سیفەتی خەڵکی ئەو شارانەی کردووە.

لە باسی شاری هەمەداندا سیفەتی خەڵکەکەی بە باش وەصف کردووە. کە دەڵێت: ((خەڵکەکەی خەڵکی خانەدان و گەورە و خاوەن ئەدەب و پیاوەتین)) (١١٣).

(الادریسي) لە باسی دینەوەریشدا دەڵێت: ((خەڵکەکەی مۆرک و سروشتیان لە خەڵکی هەمەدان نەرم و ناسکترە)) (١١٤).

**ئەنجام:**

١- (الادریسي) یەکێکە لە جوگرافیناس و گەڕیدەکانی سەدەی شەشەمی کۆچی/ دوانزەی زایینی، ناوبراو لە بنەماڵەی (الادارسە)یە، و نەژادی دەگەڕێتەوە بۆ (علي بن ابي طالب) (ر.خ) بەو پێیەش نووسەر لە بنەماڵەی پێغەمبەرە (د.خ). ئەوەی باسی لێوە کراوە ئەو لە ساڵی (٥٦٠ک/ ١١٦٤ز) کۆچی دوایی کردووە، ناوبراو ژیانێکی تایبەتمەند ژیاوە، و ئەو لە خزمەتی پادشای (صقلیة) بووە، و کاری لەگەڵ ئەودا کردووە ڕەنگە ئەمەش هۆکاری سەرەکی بووبێت ژیاننامەکەی لەلایەن نووسەرانی ژیاننامە و سەربوردەکانی ئیسلامی بەتەواوی پشتگوێ بخرێت.

٢- بەگشتی زانیارییەکانی (الادریسي) لە بارەی کورد و ناوچەکانی نیشتەجێبوونیان، کەم و کورتن بە بەراورد لەگەڵ سەرچاوە وڵاتناسییەکانی تر، لەوانەیە ئەمەش بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە کتێبەکەی دوور لە ڕۆژهەڵات نووسیوە.

٣- بە گشتی زانیارییەکانی (الادریسي) سەبارەت بە ڕەهەندە شارستانییەکانی کورد و ناوچە کوردنشینەکان کەم و سنووردارن.

٤- (الادریسي) لە کتێبەکەیدا چەند ڕواڵەتێکی شارستانی و بیناسازیی کوردستانی دەستنیشان کردووە وەک ئاماژە کردن بە چەند قەڵایەک و شوورەی شارەکان و مزگەوت و کڵێساکان و ..... هتد.

٥- لایەنی کشتوکاڵ لە کوردستان پێگەیەکی دیاری لە کتێبی (نزهة المشـتاق)دا هەیـە و زۆر لـە بەرهەمـە کشـتوکاڵییەکان ناویـان هـاتووە، وێڕای تیشک خستنەسەر جۆری خاک و ڕاددەی پیت و بەرەکەتەکەی.

٦- هـەر سـەبارەت بـە ڕەهەنـدە ئابوورییـەکانیش، (الادریسـي) لای کردۆتەوە لە چەند لایـەنێکی بازرگانی و پیشـەسـازیی تایبـەت بـە چەند شارێکی کوردی.

٧- لـە کتێبەکەیـدا، چەنـد ئاماژەیـەکی کـورتی کـردووە بـە چەنـد لایەنێکی کۆمەڵایەتی کورد وەک ڕەگەز و ئـاییني و سروشت و مۆرکە کۆمەڵایەتییەکان.

## پەراوێزەكان:

(١) ابن العديم، بغية الطلب في تاريخ حلب، تحقيق، سهيل زكار، دار الفكر، ( بيروت : د.ت)، ج١، ص ٤٠٣؛ الصفدي؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، تحقيق، أحمد الأرناؤوط وتركي مصطفى، دار إحياء التراث، (بيروت : ٢٠٠٠ )، ج ١، ص ١٣٨؛ نفيس احمد، جهود المسلمين في الجغرافية، تحقيق، فتحي عثمان، مراجعة، علي ادهم، دار القلم، (كلكتا: ١٩٧٤)، ص ٨١.

(٢) احمد سوسة، الشريف الادريسي في الجغرافيا العربية، (بغداد: ١٩٧٤)، الباب الثاني، ص ٢٧٣.

(٣) عيون الأنباء في طبقات الأطباء، تحقيق، نزار رضا، ( بيروت : د.ت)، ص ٥٠١؛ عبدالرحمن حميدة، اعلام الجغرافيين العرب، دار الفكر، (دمشق: ١٩٨٤)، ص٣٨٨؛ سيبولد، دائرة المعارف الاسلامية، مادة (الادريسي)، مركز الشارقة للابداع الفكري، (شارقة: ١٩٩٨)، ج ٢، ص ٥٧١؛ ميشيل اماري، المكتبة العربية الصقلية نصوص في التاريخ والبلدان والتراجم والمراجع، (ليبسك : ١٨٥٧)، ص ١٧٤.

(٤) احمد رمضان احمد، الرحلة والرحالة المسلمون، دار البيان العربي، (جدة: د.ت)، ص ١٦١.

(٥) دەوڵەتی (الادارسة): ئەم دەوڵەتە لە (مغريب) لە ساڵی ( ١٧٢ك/ ٧٨٩ز) لەلایەن چەند هۆز و تیرەیەكەوە دامەزرا، بە سەرۆكایەتی (ادريس بن عبدالله) كە لە نەوەكانی (علي بن ابي طالب)ە (ر.خ)، كە لە دوای شەڕی (وادي الفخ) (١٦٩ك/٧٨٦ز) لە ژێر دەسەڵاتی عەباسییەكان رزگاری بوو و ڕووی كردە ئەو ناوچەیە و دەوڵەتەكەی ڕاگەیاند، هەرچەندە هەندێك دامەزراندنی دەوڵەتەكە دەدەنە پاڵ (الادريسي) دووەم كە توانی شاری فاس بنیادبنێ و بیكات بە پایتەختی دەوڵەتەكەی، ئەم دەوڵەتە لە ساڵی( ٣٧٥ ك/ ٩٨٥ز) كۆتایی بە حوكمڕانی هاتووە. ابن عذاري المراكشي، البيان المغرب، ج٢، ص ص ٢١٠–٢١٢؛ ابن خلدون، تاريخ، ج٦، ص٢٩٥؛ بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: محمود اسماعيل، الادارسة ١٣٢–٣٧٥ الحقائق الجديدة، مكتبة مدبولي، (القاهرة : ١٩٩١) ؛ محمود شاكر، تاريخ الاسلامي، ط٦، (القاهرة :٢٠٠٠)، ج٥، ص ص١٦٢–١٦٣.

(٦) ياقوت الحموي، معجم الأدباء، تحقيق إحسان عباس، دار الغرب الإسلامي، (بيروت :١٩٩٣)، ج ١، ص ٤٠٣؛ انخل جنثالث بالنثيا، تاريخ الفكر الاندلسي، ت: حسين مؤنس، مكتبة الثقافة الدينية، (القاهرة : ١٩٥٥)، ص ٣١٢؛ محمد عبدالله عنان، موسوعة اعلام الفكر الاسلامي، ( القاهرة: ٢٠٠٤)، ص٤٨٩.

(٧) مقدمة، تحقيق، عبدالله محمد الدرويش، دار يعرب، ص ١٥٢؛ تاريخ ابن خلدون،ج١، ص ٦٨.

(٨) دەوڵەتی بەنی حەمود: ئەم دەوڵەتە لە ساڵی (٤٠٧ك/١٠١٦ز) لەلایەن (علي بن حمود) لە (قرطبة) دامەزرا، دوای ئەوەی ناویراو لەساڵی (٤٠٦/١٠١٥) توانی دەست بگرێت بەسەر شاری مەلەگە (مالقە) و دەسەڵاتێكی سیاسی بەهێزی دامەزراند و پاشان سوودی لە

بارودۆخی خراپـی ئومەوییـەکانی ئەنـدەلوس وەرگـرت و بەسـەر دوایـن خەلیفـەیان بـەناوی (سـلیمان مسـتعین)دا زاڵ بـوو، بناغـەی دەوڵەتەکـەی لـە (قرطبـة) دامەزرانـد، هـەروەها دامەزرێنەری ئـەم دەوڵەتـەش لـە زنجـیرەی بنەماڵـەی حاکمـەکانی دەوڵـەتی (الادارسـە)ن فەرمانڕەوایانی مەغریب، هەروەك فەرمانڕەوایانی ئەم دەوڵەتە بەردەوام لە ململانێدا بـوون تائـەوەی لـە سـاڵی (٤٤٧ك/١٠٥٨ز ) لەلایـەن (بـادیس بـن حبـوس) فـەرمانڕەوای غەرناتـە هێرش دەکاتە سەریان و کۆتایی بەم دەوڵەتە دەهێنێ. ابن بشكوال، الصـلة في تـاريخ أئمـة الأندلس، مكتبة الخانجي، ط٢، (القـاهرة: ١٩٥٥)، ص: ١٩٥، ٣١٠، ٣١٣؛ بـۆ زیـاتر زانیـاری بڕوانە: ابن الأثير، الكامل في التاريخ، تحقيـق، عمـر عبدالسـلام تـدمري، دار الكتـاب العربـي، (بــيروت: ١٩٩٧)، ج٧، ص ص ٦١٥–٦١٩،ص٦٢٢، ص ص ٦٢٩–٦٣٠، ص٦٣٧؛ ابــن التميمي المراكشي، المعجب في تلخيص أخبار المغرب مـن لـدن فـتح الأنـدلس إلى آخـر عصـر الموحدين، تحقيق صلاح الدين الهواري، المكتبة العصرية، صيدا، (بيروت: ٢٠٠٦)؛ سـيبولد، دائرة المعارف الاسلامية، مادة (بنو حمود)، ج١٤، ص ٤٣٣٣.

(٩) لەڕاستیدا (ابن ابي اصيبعة) بەهەڵەدا چووە لە پێدانی ئەم ناسناوە بە (الادریسـی) چـونکە ئەم ناسناوە خۆی لە خۆیدا ناسناوی باپیری (الادریسی) بووە بەناوی (ادريس بن يحيى بـن حمود) ( ت٤٤٧ك/ ١٠٥٥ز) کە حوکمڕانی دەوڵەتی (حمودی) بـوو لـە مەلەگـە (مەلقـە) لـە ئەندەلوس. الشنتريني، الذخيرة في محاسن أهل الجزيرة، تحقيق، إحسان عباس، (طـرابلس: ١٩٧٨)، ج٢، ص ٨٦٠؛ الذهبي، سير أعلام، ج ١٣، ص ٢٧٢.

(١٠) البغـدادي، هديـة العـارفين أسمـاء المـؤلفين وآثـار المصـنفين، دار إحيـاء الـتراث العربـي، (بيروت: ١٩٥١)، ج٢، ص٩٤.

(١١) حاجي خليفة، كشف الظنون عن أسامي الكتب والفنون، مكتبة المثنـى، ( بغـداد : ١٩٤١)، ج٢، ص ١٩٤٧؛ محمد عبدالغني حسـن، الشـريف الادريسـي اشـهر جغـرافي العـرب والاسـلام، الهيئـة العامـة للنشـر، (القـاهرة: ١٩٧١)، ص٩؛ محمـد السـيد غـلاب، الجغرافيـون المسـلمون ودورهم في تطور الفكـر الجغـرافي، بحـوث المـؤتمر الإسـلامي الأول، مـج ٣، مركـز البحـوث بجامعـة الإمام محمد بن سعود الإسلامية، (الرياض: ١٩٨٤م)، ص ١٤٤.

(١٢) عمادالدين كاتب الاصفهاني، خريدة القصر وجريدة العصر، قسم الشعراء المغرب والانـدلس، دار تونسـية، ط٢، (تـونس: ١٩٨٦)، ج٢، ص ٢٦٠. هەرچـەندە یـەکێك لـە ژێـدەران وەك احمد سوسة، الشريف الادريسي، البـاب الثـاني، ص٢٧٣؛ ئاماژەیـان بـەوە داوە کـە گوایـە عمادالدين الكاتب الاصفهاني ناسناوي الادريسي بە ( ابن الثيري ) بردووە بـەڵام لـە ڕاسـتیدا لەئـــەنجامی ســـەیرکردنی چـــەند چـــاپێك لـــە کتـــێبی (خريـــدة القصـــر وجريـــدة العصـــر) ڕاستییەکەمان دەرخست کە بە (ابن اليثربي) ناوی هێناوە.

(١٣) عماد الدين كاتب الاصفهاني، خريدة القصر، ج٢، ص ٢٦٠. هەرچـەندە یـەکێ لـە ژێـدەران وەك احمد سوسـة، الشـريف الادريسـي، البـاب الثـاني، ص٢٧٣؛ ئاماژەیـان بـەوە داوە کـە

گوایە عمادالدین الکاتب الاصفهاني ناسناوي الادریسي بە ( ابن الثيري ) بردووە بەڵام لە ڕاستیدا لەئەنجامی سەیرکردنی چەند چاپێك لە کتێبی (خريدة القصر وجريدة العصر) ڕاستییەکەمان دەرخست کە بە (ابن اليثربي) ناوی هێناوە.

(١٤) سەبتە: ئەم شارە کەوتۆتە سەر دەریای زوقاق (گەرووی جبل طارق) لە سێ لاوە بە ئاو دەورە دراوە تەنها یەك ڕێگای وشکانی هەیە لە ڕووی ڕۆژئاوایەتی. البكري، المسالك والممالك، دار الغرب الإسلامي، (د.م: ١٩٩٢)، ج٢، ص٧٧٩؛ كاتب مراكشي، الاستبصار في عجائب الأمصار، دار الشؤون الثقافية، (بغداد: ١٩٨٦ ) ص١٣٧.

(١٥) سيبولد، دائرة المعارف، (مادة الادريسي)، ج٢، ص٥٧١؛ كراتشكوفسكي، تاريخ الادب الجغرافي العربي، نقله الى العربية، صلاح الدين عثمان هاشم، (لينينكراد: ١٩٥٧)، ق١، ص٢٨٠؛ عبدالله كنون، موسوعة مشاهير رجال المغرب، مكتبة المصرية للنشر والتوزيع، (القاهرة: د.ت)، مج ٣، ج ٢٤، ص٨؛ حربي عباس عطيتو محمود و حسان حلاق، العلوم عند العرب، دار النهضة العربي، (بيروت: ١٩٩٥ )، ص٣٧٠؛ احمد سكري، موسوعة علماء العرب، دار الصفاء، (عمان: ٢٠٠٤)، ص١٣١؛ بەڵام ئەم ژێدەرە ساڵی لەدایکبوونی بە ساڵی کۆچی هەڵە نووسیوە کە بە (٤٩٩ك / ١١٠٠ ز) داناوە لە ڕاستیدا ساڵی زاینییەکەی تەواوە لەوانەیە هەڵەی چاپ بێ کە ساڵی کۆچییەکەی هەڵە نووسیبێت. محمد مؤنس عوض، الجغرافيون والرحالة المسلمون في بلاد الشام زمن الحروب الصليبية، ( عين الشمس: ١٩٩٥)، ص١٧.

(16)Michailes Cafiri, Bibliotheca _arabico_hispana_Escurialensis, (Hispania: 1444), p, 13, RDOZY ET M.J.DE GOEJE, DESCRIPTION DE LAFRIQUE ET DE LESPANG Edrisi, (leden: 1866), pIII.

(١٧) (قرطبة): یەکێکە لە شارە گەورە و گرنگەکانی ئەندەلوس (ئیسپانیا) کەوتۆتە ناوەڕاستی ناوچەکە، و سەردەمانێك مەڵبەندی دەسەڵاتی موسڵمانان بووە، کە شارێکی هاوشێوەی ئەو نەبووە لە مەغریب لە گەورەیی و خۆشیدا. ابن خرداذبة، المسالك والممالك، دار صادر، (بيروت: ١٨٨٩)، ص ٨٧؛ ابن حوقل، صورة الارض، دار صادر، (بيروت : ١٩٣٨)، ص١١١؛ ياقوت الحموي، معجم البلدان، دار صادر، ط٢، (بيروت: ١٩٩٥)، ج٤، ص٣٢٤.

(١٨) الادريسي، نزهة المشتاق في اختراق الافاق، مكتبة الثقافة الدينية، القاهرة، (القاهرة : ٢٠١٠)، مج٢، ص ٥٧٤؛ شكيب ارسلان، الحلل السندسية في الاخبار و الاثار الاندلسية، مؤسسة هنداوي للتعليم والنشر، (القاهرة : ٢٠١٢)، ج١، ص ٨٧.

(١٩) الزركلي، اعلام، دار العلم للملايين، ( بيروت : ٢٠٠٢)، ج ٧، ص ٢٤؛ عمر رضا كحالة، معجم المؤلفين، دار إحياء التراث العربي، (بيروت: د.ت )، ج ١١، ص ٢٣٦.

(٢٠) غلیام (غليالم، وليەم): یەکێکە لە پادشاکانی (صقلية) لە دوای باوکی ڕۆجەری دووەم لە ساڵی (٥٤٨ك/١١٥٤ز) دەسەڵاتی وەرگرتووە، ئەم پادشایە بە پادشایەکی بێ هێز ناسراوە

و کەوتۆتــە ژێــر کاریگــەریی وەزیرەکــەی، بەمــەش ئــەم بارودۆخــە لەلایــەن گــەلانی ژێــر دەســـەڵاتی وەك هــەلێك قۆزراوەتــەوە و توانیویانــە خۆیــان لــەژێر دەســەڵات و حــوکمی فەرەنجییەکان رزگار بکەن، وا دیارە لە سـەردەمی ئـەودا مامەڵـەی لەگـەڵ موسـڵمانان زۆر باش بووە، و لە ساڵی (٥٨١ك/ ١١٨٥ز) کۆچی دوایی کردووە. ابن الاثیر، الکامـل، ج٩، ص ٢٠٨؛ المقریـزي، السـلوك لمعرفـة دول الملـوك، تحقیـق، محمـد عبـدالقادر عطـا، دار الکتـب العلمیة، (بیروت: ١٩٩٧)، ج١، ص١٦٤.

(٢١) ابن الأثیر، الکامل، ج٩، ص ٢٠٨؛ ابن خلکان، وفیات الأعیان وأنباء أبناء الزمان، تحقیـق، إحسان عباس، دار صادر، (بیروت: ١٩٠٠)، ج ٦، ص ٢١٨؛ الذهبي، تـاریخ الإسـلام ووفیـات المشاهیر والأعلام، تحقیق، بشـار عـواد معـروف، دار الغـرب الإسـلامي، ( د.م: ٢٠٠٣)، ج ١، ص ٩٢٧؛ ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب في أخبار من ذهب، تحقیق، محمـود الأرنـاؤوط، دار ابن کثیر، (بیروت : ١٩٨٦)، ج ٦، ص٢٤٤.

(٢٢) بغیة الطلب، ج١، ص ١٩؛ الصفدي، الوافي بالوفیـات، ج١، ص ١٣٨؛ نفـیس احمـد، جهـود المسلمین، ص٨١.

(٢٣) یوسـف الیـان بـن موسـي سـرکیس، معجـم المطبوعـات العربیـة والمعربـة، الناشـر مطبعـة سـرکیس، ( القـاهرة: ١٩٢٨)، ج٢، ص ٤١٤؛ عبدالسـلام الحمیـد، موسـوعة العلمـاء العـرب، الاهلیة للنشر والتوزیع، (بیروت: ٢٠٠٥)، ص٦١.

(٢٤) جاك ریسلر، الحضارة العربیة، ت، خلیل احمد خلیل، منشورات عویدات، (بـیروت: ١٩٩٣)، ص ١٨٣.

(٢٥) الزرکلــي، الاعــلام، ج٧، ص٢٤؛ عمــر رضــا کحالــة، معجــم المــؤلفین، ج١١، ص٢٣٦؛ عبدالرحمن حمیدة، اعلام الجغرافیین العرب، دار الفکر، (دمشق: ١٩٨٤)، ص ٣٨٩.

(٢٦) الجغرافیة والرحالة المسلمون، ت: عبدالرحمن حمیـدة، (الکویـت: ١٩٨٥)، ص ٢٠؛ شـوقي ضیف، الرحلات، الناشـر دار المعـارف، (القـاهرة: ١٩٥٦)، ص ٢١؛ هـەروەها جرجـی زیـدان ساڵی مردنی بە (٥٤٨ك/١١٥٣ز) تۆمار کردووە کە خـۆی لـە ڕاسـتیدا ئەمـە سـاڵی مردنـی رۆجەری دووەمە، تـاریخ آداب اللغـة العربیـة، دار الهـلال، ( القـاهرة: د.ت)، ص ٩٢. ڕەنگـە سـاڵی (٥٦٠ك/ ١١٦٤ز) لـە ڕاسـتییەوە نـزیکتر بـێ، لەبـەر ئـەوەی توێژینـەوەکان ئەمـەیان پشتڕاست کردۆتەوە، هەرچەندە هیچ بەڵگەیەکیان نەداوە لەو بارەیەوە.

(٢٧) محمد عبدالغني، الشریف الادریسي، ص ٤٩.

(٢٨) انخل جنثالث بالنثیا، تاریخ الفکر، ص ٣١٣.

(٢٩) علي نایف الشحود، مشاهیر اعلام المسلمین، (د.م: ٢٠٠٨)، ص ٢٩٤.

(٣٠) الصفدي، الوافي بالوفیات، ج١، ص ١٣٨.

(٣١) نزهة المشتاق، مج١، ص ٥.

(٣٢) المصدر نفسه، مج١، ص ٤.

(٣٣) المصدر نفسه، مج١، ص ٦؛ بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی میتۆدی (الادریسي) بڕوانە: احمد محمد شعبان، منهجیة الادریسي في کتابه نزهة المشتاق في اختراق الآفاق، دراسة جغرافیة، مجلة تاریخ العربي، (د.م: ٢٠١٢).

(٣٤) نزهة المشتاق، مج١، ص ٥.

(٣٥) المصدر نفسه، مج١، ص ٧.

(٣٦) انخل جنثالث بالنثیا، تاریخ الفکر، ص ٣١٤.

(٣٧) سیبولد، دائرة المعارف، مادة الادریسي، ج١، ص ٥٧٢.

(٣٨) کراتشکوفسکي، تاریخ الادب، ق١، ص ٢٩١.

(39) Michele Amari, Storia dei Musulmani di sicilia,(Firenze: 1872), volume terzo, part secondo, p 689.

(٤٠) نفیس احمد، جهود المسلمین، ص ٨٦.

(٤١) الحضارة العربیة، نقله الی العربیة، عادل زعیتر، طبع بمطبعة عیسی البابي الحلبي وشرکائه، (د.م.ت)، ص٤٧٠.

(٤٢) (حمدان بن الحسن): لە سەرچاوەکان هیچ زانیارییەك لەسەر ئەم ناوە نەدراوە ڕەنگە ئەمەش هەڵەی ئەو کەسە بێت کە کتێبی (نزهة المشتاق)ی لەبەر گرتۆتەوە. بەڵام لە سەرچاوە مێژووییەکان باسی کەسایەتییەك بەناوی (حمدان بن حمدون) کراوە کە ڕەنگە هەمان ئەو کەسە بێ کە (الادریسی) ناوی بەو شێوەیە بردووە، کەچی سەرچاوەکان باس لەوە ناکەن ئەو بنیادنەری شارەکە بووبێت، بەڵکو لە ماوەیەکی مێژووییدا فەرمانڕەوای ئەو شارە بووە، بە تایبەت لەکاتی باسکردنی ڕووداوێکی مێژوویی ئەم قەڵایەش ئاماژەی پێدراوە. لە سەردەمی خەلیفەی عەباسی (المعتضد) ( ٢٩١ك/ ٨٩٤ز) باس لەوە کراوە کورد و عەرەبەکان یەکیان گرتووە دژی خەلیفە، خەلیفەش بە سوپایەکەوە هێرشی کردوونەتە سەر و زۆری لێ کوشتوون، پاشان ڕووی کردۆتە قەڵای ماردین کاتێك (حمدان بن حمدون) فەرمانڕەوای ئەو شارە بەمەی زانیوە، ڕای کردووە و کوڕەکەی لە شوێنی خۆی جێ هێشتووە ئەویش لەبەر زۆری سوپای (المعتضد) کە دە هەزار کەس بووە خۆی نەگرتووە و قەڵاکەی ڕادەست کردوون و ئەوانیش هەرچی سەروەت و سامان هەیە بردوویانە و قەڵاکەشیان ڕووخاندووە . الطبري، تاریخ الرسل والملوك، دار الکتب العلمیة، (بیروت: ١٤٠٧ه)، ج٥، ص ٦٠٩؛ ابن مسکویه، تجارب الامم وتعاقب الهمم، تحقیق، أبو القاسم إمامي، سروش، ط ٢، (تهران: ٢٠٠٠)، ج٤، ص ٤٩٧ ؛ ابن الجوزي، المنتظم في تاریخ الملوك والأمم دار صادر، (بیروت: ١٣٥٨)، ج٥، ص ١٤٧ ؛ ابن الاثیر، الکامل، ج٦، ص٤٨٠.

(٤٣) الادریسي، نزهة المشتاق، مج٢، ص ٦٦٢. هەروەها هەمان بۆچوونی (الادریسي) لەلایەن ابن حوقل لە بارەی کوردەکانەوە باس کراوە. صورة الارض، ص ٣٠٩.

(٤٤) شاكر مصطفى، المدن في الاسلام حتى العصر العثماني، ( الكويت: ١٩٨٨)، ج١، ص ٤٤٩.
(٤٥) نزهة المشتاق، مج٢، ص٦٦١.
(٤٦) معجم البلدان، مج٥، ص٢٨٨.
(٤٧) ابن حوقل باسی لەوە کردووە لەبەر بەهێزی شووراکە ناونراوە (میمونا)، صورة الارض، ص٢٢٢ ؛ نزهة المشتاق، مج٢، ص ٨٢؛ الحميري، الروض المعطار في خبر الأقطار، تحقيق، إحسان عباس، مؤسسة ناصر للثقافة، ط٢، (بيروت: ١٩٨٠)، ص٣ .
(٤٨) نزهة المشتاق، مج٢، ص ٦٦٣.
(٤٩) المصدر نفسه، مج٢، ص ٦٦٠ ؛ ابن عبدالحق، مراصد الاطلاع على أسماء الأمكنة والبقاع، دار الجيل، (بيروت: ١٩٥٤)،، ج٣، ص١٣٧٤ ؛ ابن شداد، الاعلاق الخطيرة في ذكر أمراء الشام و الجزيرة، تحقيق، يحيى العبارة، (دمشق: ١٩٧٨)، ص١٣٩.
(٥٠) نزهة المشتاق، مج٢، ص ٦٧٦ ؛ الحميري، الروض المعطار، ص٥٧٩ .
(٥١) نزهة المشتاق، مج٢، ص ٨٢٤.
(٥٢) المصدر نفسه، مج٢، ص ٦٥٩.
(٥٣) المصدر نفسه، مج٢، ص ٦٧٧ ؛ الاصطخري، المسالك والممالك، ص ١١٨.
(٥٤) نزهة المشتاق، مج٢، ص ٦٦٣.
(٥٥) ابو الفرج الاصفهاني، الديارات، (د.م.ت)، ص ١٣ ؛ ياقوت الحموي، معجم البلدان، مج٢، ص ٥١٢.
(٥٦) نزهة المشتاق، مج٢، ص ٦٦٤. محمد كرد علي، خطط الشام، مكتبة النوري، ط ٣، (دمشق: ١٩٨٣)، ج٦، ص٢٥١.
(٥٧) نزهة المشتاق، مج٢، ص ٦٧٣.
(٥٨) المصدر نفسه، مج٢، ص ٤١٩.
(٥٩) كانار، مادة الجزيرة، دائرة المعارف، ج١٠، ص ٢٦٩٧ ؛ ئاكۆ بورهان محەمەد، ئابووری کوردستان لە سەردەمی عەباسیدا، کتێبخانەی غازین (هەولێر: ٢٠١٢)، ل ٨.
(٦٠) نزهة المشتاق، مج٢، ص ٦٧٣. ابن حوقل هاوڕایە لەگەڵ (الادریسی)دا بڕوانە: صورة الارض، ص ٣٦٢.
(٦١) نزهة المشتاق، مج٢، ص ٦٧٥.
(٦٢) معجم البلدان، مج١، ص ٤٠١.
(٦٣) الاصطخري، المسالك والممالك، ص٢٠٠ ؛ نزهة المشتاق، مج٢، ص ٦٧٧.
(٦٤) نزهة المشتاق، مج٢، ص ٦٨٠. هەروەها لەلایەن ابن حوقل ئەمە باس کراوە صورة الارض، ص ٣٣٥.
(٦٥) الاصطخري، المسالك والممالك، ص ١٨٢ ؛ ياقوت الحموي، معجم البلدان، مج١، ص ٣٧٩.
(٦٦) اثار البلاد، ص٥١٢.

(٦٧) الاصطخري، المسالك والممالك، ص ١٨٢ ؛ ياقوت الحموي، معجم البلدان، مج١، ص ٣٧٩.

(٦٨) غبيراء: جۆرە دارێکە وەکو برنج لە ناو ئاودا دەڕوێت. ابن الوردي، خريدة العجائب وفريدة الغرائب، تحقيق، أنور محمود زناتي، مكتبة الثقافة الإسلامية، (القاهرة: ٢٠٠٨)، ص ٣١٥.

(٦٩) نزهة المشتاق، مج٢، ص ٨٢١.

(٧٠) المصدر نفسه، مج٢، ص ٨٢٣.

(٧١) المصدر نفسه، مج٢، ص ٦٧٠.

(٧٢) الجاحظ، التبصرة بالتجارة في وصف ما يستظرف في البلدان من الأمتعة الرفيعة والأعلاق النفيسة والجواهر الثمينة، تحقيق، حسن حسني عبدالوهاب التونسي، (القاهرة :١٩٩٤م)، ص ٣٤؛ ابن عبدالحق، مراصد، ص٤١٨.

(٧٣) نزهة المشتاق، مج٢، ص ٦٦٠.

(٧٤) ابن بطوطة، رحلة ابن بطوطة، أكاديمية المملكة المغربية، (الرباط: ١٤١٧ هـ)، ص ١٨٢. لە بارەی ئەو شارە بڕوانە: موسى مصطفى الهسنياني، سنجار دراسة في تاريخها السياسي والحضاري من (٥٢١–٦٠٠هـ/ ١١٢٧– ١٢٦١م)، (اربيل :٢٠٠٥ م).

(٧٥) البكري، المسالك والممالك، دار الغرب الإسلامي، (د.م: ١٩٩٢)، ص ٣٦٧.

(٧٦) القزويني، آثار البلاد وأخبار العباد، دار صادر، (بيروت: د.ت)، ص٣٩٣؛ حمدالله مستوفى القزويني، نزهة القلوب، دنياى كتاب، چاپخانە ارمغان، (تهران: ١٣٤٢ ش.ه)، ص ١٢٤.

(٧٧) نزهة المشتاق، مج٢، ص ٦٥٩.

(٧٨) المصدر نفسه، مج٢، ص ٦٧٣.

(٧٩) المصدر نفسه، مج٢، ص ٨٢٢.

(٨٠) المصدر نفسه، مج٢، ص ٦٦٢.

(٨١) المصدر نفسه، مج٢، ص ٦٧٣.

(٨٢) المصدر نفسه، مج٢، ص ٦٦١.

(٨٣) المصدر نفسه، مج٢، ص٦٦٤.

(٨٤) ابن حوقل، صورة الارض، ص٢٢٥.

(٨٥) ابن حوقل تەنها ئاماژەی بە بوونی بازرگانی لەو شارە داوە نەك بازرگانی نێوخۆیی، المصدر نفسه، ص٣٦٢، نزهة المشتاق، مج٢، ص٦٧٢.

(٨٦) نزهة المشتاق، مج٢، ص ٦٧٢.

(٨٧) المصدر نفسه والصفحة.

(٨٨) کەرەج: شارێکە لە نێوان هەمەدان و ئەسفەهان، لە هەمەدانەوە نزیکترە، نێوانیشیان سێ فەرسەخ (١٨کم) بووە. ياقوت الحموي، معجم البلدان، مج٤، ص ٤٤٦.

(٨٩) نزهة المشتاق، مج٢، ص٦٧٥ ؛ ياقوت الحموی، معجم البلدان، مج١، ص٤٠٤.
(٩٠) نزهة المشتاق، مج٢، ص٦٨٠. مەبەست بازرگانیکردنە بە کەلوپەلە ناشـەرعییەکانی وەکـو خواردنەوە کحولی و گۆشتی بەراز و .. هتد.
(٩١) ابن حوقل، صـورة الارض، ص ٢١٤ ؛ نزهـة المشـتاق، مـج٢، ص٦٦٢. لـە سەرچـاوەکانی تردا ئامـاژە بـە گەوهـەری شووشـەی ئـەو شـارە دراوە بـەڵام باسـی بازرگـانی پێـوەکردنی نەکراوە.
(٩٢) نزهة المشتاق، مج٢، ص ٦٧٢.
(٩٣) احسن التقاسيم في معرفة الأقاليم، تحقيق، غازي طليمات، وزارة الثقافـة والارشـاد القـومي، (دمشق:١٩٨٠)، ص ٢٦٤.
(٩٤) المصدر نفسه، ص ٣٩٣ ؛ نزهة المشتاق، مج٢، ص ٦٧٢.
(٩٥) نزهة المشتاق، مج٢، ص ٦٧٧.
(٩٦) المصدر نفسه والصفحة.
(٩٧) الاصـطخري، المسـالك والممالـك، ص ١٨٢ ؛ نزهـة المشـتاق، مـج٢، ص ٨٢١ ؛ يـاقوت الحموي، معجم البلدان، مج١، ص٣٧٩.
(٩٨) ابن حوقل، صورة الارض، ص٢٢٢ ؛ نزهة المشتاق، مج٢، ص ٦٦٣.
(٩٩) نزهة المشتاق، مج٢، ص ٦٤٩.
(١٠٠) ابن حوقل، صورة الارض، ص٢١٧ ؛ المصدر نفسه، مج٢، ص ٦٥٩.
(١٠١) نزهة المشتاق، مج٢، ص ٨٢٥.
(١٠٢) المصدر نفسه، مج٢، ص ٦٦٣ ؛الحميري، الروض المعطار، ص ٥٦٧.
(١٠٣) نزهة المشتاق، مج٢، ص ٨٢٥.
(١٠٤) المقدسي، احسن التقاسيم، ص ٣٨٠ ؛ المصدر نفسه، مج٢، ص ٨٢٤.
(١٠٥) نزهة المشتاق، مج٢، ص ٦٦١.
(١٠٦) ابن حوقل، صورة الارض، ص٣٥٨ ؛ المصدر نفسه، مج٢، ص ٦٧٢.
(١٠٧) الاصطخري، المسالك والممالك، ص ٧٣ ؛ نزهة المشتاق، مج٢، ص ٦٦٢.
(١٠٨) نزهـة المشـتاق، مـج١، ص ٤١٩. هەرچـەندە نووسـەر ئامـاژەی بـەوە داوە کـە ئـەو زانیارییـەی لـە (ابـن دريـد) وەرگرتـووە، بـەڵام لـە ڕاسـتیدا (ابـن دريـد) ڕەگ و ڕیشـەی کوردەکانی گەڕاندۆتەوە بۆ (كرد بن عمـرو بـن عـامر) واتـە نـاوی (مـرد)ی بـەکار نـەهێناوە بەڵکو ئەو ناوە لەلایەن (الادریسي)یەوە زیاد کـراوە. بـۆ زانیـاریی زیـاتر بڕوانـە: ابـن دريـد، جمهرة اللغة، تحقيق، رمزي مـنير بعلبكـي، دار العلـم للملايـين، (بـيروت: ١٩٨٧م)، ج٢، ص ٦٣٨.
(١٠٩) بـۆ زیـاتر زانیـاری دەربـارەی نـەژادی کـورد بڕوانـە: المسـعودي، مـروج الـذهب ومعـادن الجوهر، دار احياء التراث العربي، (بيروت: د.ت)، ج٢، ص ٣٣٧ ؛ الزبيدي، تاج العروس مـن

جـواهر القـاموس، تحقيـق، مجموعـة مـن المحققـين، دار الهدايـة، (د.م.ت)، ج٩، ص١٠٤ ؛ ئیحسان نوری پاشا، مێژووی ڕەگ و ڕەچەڵەکی کورد، و: حەمە کەریم عارف، چاپخانەی سایە، چاپی سێیەم، (سلێمانی: ٢٠٠٨).

(١١٠) ابـن حوقـل، صـورة الارض، ص ٢١٧ ؛ نزهـة المشـتاق، مـج٢، ص ٦٦٠. هەرچەندە لە سەرچاوەکان ئەمە پشتڕاست نەکراوەتەوە کە مەسیحی شهارجە لەو شارە هەبووبن.

(١١١) نزهة المشتاق، مج٢، ص ٦٦٣ ؛ المقريزي، المـواعظ والاعتبـار بـذكر الخطـط والآثـار، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٤١٨ ه)، ج٤، ص٣٩٩ ؛ ابن الوردي، خريدة العجائب، ص١١٢.

(١١٢) نزهة المشتاق، مج٢، ص٦٦٤ ؛ ابن عبدالحق، مراصد الاطلاع، ص ٣٨٩.

(١١٣) نزهة المشتاق، مـج٢، ص٦٧٢. لـەو بارەیـەوە ابـن حوقـل لەگـەڵ (الادریسـي)دا هاوڕایـە صورة الارض، ص٣٥٨.

(١١٤) الاصطخري، المسالك والممالك، ص١٩٨؛ نزهة المشتاق، مج٢، ص٦٧٣.

## سەرچاوەکان:


١// بە زمانی عەرەبی:

*ابن الاثير: عزالدين ابي الحسن علي بن محمد عبدالكريم الشيباني (ت ٦٣٠ هـ /١٢٣٢م).

١- الكامل في التاريخ، تحقيق، عمر عبدالسلام تدمري، دار الكتاب العربي، (بيروت: ١٩٩٧).

* الادريسي: محمد بن محمد بن عبدالله بن ادريس بن يحيى الحسني (ت:٥٦٠هـ /١١٦٥م)

٢- نزهة المشتاق في ذكر الامصار والاقطار والبلدان، مجهول مكان وسنة الطبع.

٣- نزهة المشتاق في اختراق الآفاق، مكتبة الثقافة الدينية، (القاهرة : ٢٠١٠).

* ابن أبي أصيبعة: ابو العباس موفق الدين احمد بن القاسم الخزري (ت: ٦٦٨هـ/ ١٢٦٩م).

٤- عيون الأنباء في طبقات الأطباء، المحقق: نزار رضا، ( بيروت: د.ت).

* الاصفهاني: عمادالدين بن صفى الدين الكاتب (ت:٥٩٧هـ/١٢٠٠م).

٥- خريدة القصر وجريدة العصر، قسم الشعراء المغرب والاندلس، دار تونسية للنشر، ط٢، (تونس: ١٩٨٦).

* ابن بشكوال: خلف بن عبدالملك بن مسعود بن بشكوال (ت:٥٧٣هـ/ ١١٧٧م).

٦- الصلة في تاريخ أئمة الأندلس، مكتبة الخانجي، ط٢، (القاهرة: ١٩٥٥م).

* البغدادي: محمد أبو جعفر البغدادي (ت: ٢٤٥هـ/٨٥٩م)

٧- المحبر، تحقيق، إيلزة ليختن شتيتر، دار الآفاق الجديدة، (بيروت: د.ت).

* البكري: عبيدالله بن عبدالعزيز الاندلسي (ت:٤٨٧هـ /١٠٩٥م).

٨- المسالك والممالك، حققه، جمال طلبة، دار الكتب العلمية، (بيروت: ٢٠٠٣م).

* ابن بطوطة: محمد بن عبدالله بن محمد بن إبراهيم اللواتي الطنجي، (ت: ٧٧٩هـ/١٣٧٧م)

٩- رحلة ابن بطوطة، أكاديمية المملكة المغربية، (الرباط: ١٤١٧ هـ).

* ابن التميمي المراكشي: عبدالواحد بن علي التميمي المراكشي، محيي الدين (ت:٦٤٧هـ/ ١٢٥٠م).

١٠- المعجب في تلخيص أخبار المغرب من لدن فتح الأندلس إلى آخر عصر الموحدين، تحقيق صلاح الدين الهواري، المكتبة العصرية، صيدا، (بيروت: ٢٠٠٦م).

* الجاحظ: عمرو بن بحر بن محبوب الكناني (ت: ٢٥٥هـ/ ٨٦٨م).

١١- التبصرة بالتجارة في وصف ما يستظرف في البلدان من الأمتعة الرفيعة والأعلاق النفيسة والجواهر الثمينة، تحقيق، حسن حسني عبدالوهاب التونسي، (القاهرة: ١٩٩٤م).

* ابن الجوزي: جمال الدين أبو الفرج عبدالرحمن بن علي الجوزي (ت: ٥٩٧هـ/ ١٢٠٠م).

١٢- المنتظم في تاريخ الملوك والأمم دار صادر، (بيروت: ١٣٥٨).

* حاجي خليفة: مصطفى بن عبدالله القسطنطيني (ت: ١٠٦٧هـ/ ١٦٥٦م).

١٣- كشف الظنون عن أسامي الكتب والفنون، مكتبة المثنى، ( بغداد : ١٩٤١م).

* الحميري: ابو عبدالله محمد بن عبدالمنعم الصنهاجي (ت: ٧١٠هـ/ ١٣٠٩م).

١٤- الروض المعطار في خبر الأقطار، تحقيق، إحسان عباس، مؤسسة ناصر للثقافة، ط٢، (بيروت: ١٩٨٠).
* ابن حوقل: ابو قاسم بن حوقل النصيبيني (ت: ٣٦٧هـ/ ٩٧٧م).
١٥- صورة الارض، دار صادر، (بيروت : ١٩٣٨).
* ابن خرداذبة : ابو القاسم عبيدالله بن عبدالله (ت: ٢٨٠هـ/ ٨٩٣م).
١٦- المسالك والممالك، دار صادر، ( بيروت : ١٨٨٩م).
* ابن خلدون: ابو زيد عبدالرحمن بن محمد (ت: ٨٠٨هـ/ ١٤٠٥م).
١٧- مقدمة، تحقيق، عبدالله محمد الدرويش، دار يعرب.
١٨- ديوان المبتدأ والخبر في تاريخ العرب والبربر ومن عاصرهم من ذوي الشأن الأكبر، تحقيق، خليل شحادة، دار الفكر، ط٢، (بيروت: ١٩٨٨).
ابن دريد: أبو بكر محمد بن الحسن بن دريد الأزدي (ت: ٣٢١هـ/ ٩٣٣م)
١٩- جمهرة اللغة، تحقيق، رمزي منير بعلبكي، دار العلم للملايين، (بيروت: ١٩٨٧م).
* الذهبي: شمس الدين أبو عبدالله بن قايماز الذهبي (ت: ٧٤٨هـ/ ١٣٤٧م).
٢٠- تاريخ الإسلام ووفيات المشاهير والأعلام، تحقيق، بشار عواد معروف، دار الغرب الإسلامي، ( د.م: ٢٠٠٣).
٢١- سير اعلام النبلاء، دار الحديث، (القاهرة : ٢٠٠٦).
* الزبيدي: محمّد بن محمّد بن عبدالرزّاق الحسيني الزَّبيدي (ت: ١٢٠٥هـ/ ١٧٩٠م).
٢٢- تاج العروس من جواهر القاموس، تحقيق، مجموعة من المحققين، دار الهداية، (د.م.ت).
* ابن شداد: عزالدين أبو عبدالله محمد بن علي الأنصاري الحلبي (ت: ٦٨٤هـ / ١٢٨٥م).
٢٣- الأعلاق الخطيرة في ذكر أمراء الشام والجزيرة، تحقيق، يحيى العبارة، (دمشق: ١٩٧٨).
* الشنتريني: علي بن بسام الشنتريني الأندلسي (ت: ٥٤٧هـ / ١١٥٢م).
٢٤- الذخيرة في محاسن أهل الجزيرة، تحقيق، إحسان عباس، (طرابلس: ١٩٧٨).
* الصفدي: صلاح الدين خليل ايبك (ت: ٧٦٤هـ / ١٣٦٣م).
٢٥- الوافي بالوفيات، أحمد الأرناؤوط وتركي مصطفى، دار إحياء التراث، (بيروت: ٢٠٠٠).
* الطبري: محمد بن جرير (ت: ٣١٠هـ/ ٩٢٢م).
٢٦- تاريخ الرسل والملوك، دار الكتب العلمية، (بيروت:١٤٠٧).
* ابن عبدالحق البغدادي: صفي الدين عبدالمؤمن بن عبدالحق (ت: ٧٣٩هـ/ ١٣٣٨م).
٢٧- مراصد الاطلاع، دار الجيل، (بيروت: ١٩٥٤).
* ابن العديم: عمر بن أحمد بن هبة الله بن أبي جرادة العقيلي (ت: ٦٦٠هـ / ١٢٦٢م).
٢٨- بغية الطلب في تاريخ حلب، تحقيق، سهيل زكار، دار الفكر، ( بيروت : د.ت).
* ابن عذاري المراكشي: أحمد بن محمد المراكشي أبو عبدالله ( ت: ٦٩٥ هـ / ١٢٩٥ م).

٢٩- البيان المغرب في أخبار الأندلس والمغرب، تحقيق ومراجعة، ج. س. كولان، إ. ليفي بروفنسال، دار الثقافة، ط٣، (بيروت: ١٩٨٣).
* ابن العماد الحنبلي: ابو الفلاح عبدالحي (ت: ١٠٨٩هـ / ١٦٧٨م).
٣٠- شذرات الذهب في أخبار من ذهب، تحقيق، محمود الأرناؤوط، دار ابن كثير، (بيروت: ١٩٨٦).
* القزويني: ابو عبدالله زكريا بن محمد (ت:٦٨٢هـ/١٢٨٣م).
٣١- آثار البلاد واخبار العباد، دار صادر، (بيروت: د.ت).
* كاتب مراكشي: (ت: ق ٦هـ/ ١٢م).
٣٢- الاستبصار في عجائب الأمصار، دار الشؤون الثقافية، (بغداد: ١٩٨٦ ).
* المسعودي: أبو الحسن على بن الحسين بن على (ت: ٣٤٦هـ/ ٩٥٧م).
٣٣- مروج الذهب ومعادن الجوهر، دار الاحياء التراث العربى، (بيروت: د.ت ).
* المقدسي: شمس الدين محمد بن ابي بكر (ت: ٣٨١هـ/ ٩٩١م).
٣٤- أحسن التقاسيم في معرفة الأقاليم، تحقيق، غازي طليمات، وزارة الثقافة والارشاد القومي، (دمشق: ١٩٨٠).
* ابن مسكويه : **أبو علي أحمد بن محمد بن يعقوب مسكويه (ت: ٤٢١هـ/ ١٠٣٠م).**
٣٥- تجارب الأمم وتعاقب الهمم، تحقيق، أبي القاسم إمامي، سروش، ط ٢، (تهران: ٢٠٠٠).
* المقريزي: تقي الدين ابو العباس احمد بن علي (ت: ٨٤٥هـ/ ١٤٤١م).
٣٦- السلوك لمعرفة دول الملوك، تحقيق، محمد عبدالقادر عطا، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٩٩٧).
٣٧- المواعظ والاعتبار بذكر الخطط والآثار، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٤١٨ هـ).
* ابن الوردي: زين الدين عمر بن مظفر بن عمر بن محمد (ت: ٧٤٩هـ/ ١٣٤٨م).
٣٨- خريدة العجائب وفريدة الغرائب، تحقيق، أنور محمود زناتي، مكتبة الثقافة الإسلامية، (القاهرة: ٢٠٠٨).
* ياقوت الحموي : شهاب الدين ابو عبدالله الرومي (ت: ٦٢٦هـ/ ١٢٢٨م).
٣٩- معجم البلدان، دار الصادر، ط٢، ( بيروت : ١٩٩٥).

**٢// سەرچاوەکان بە زمانی ئینگلیزی:**

(1)Michailes Cafiri, Bibliotheca _arabico_hispana_Escurialensis, (Hispania: 1444).
(2) Michele Amari, Storia dei Musulmani di sicilia,(Firenze: 1872), volume terzo, part secondo, p 689.
(3) R DOZY ET M.J.DE GOEJE, DESCRIPTION DE LAFRIQUE ET DE LESPANG Edrisi, (leden: 1866).

**٣//سەرچاوەی فارسی:**

* حمدالله مستوفي القزويني: ابو بكر بن محمد بن نصر (ت: ٧٥٠ه/ ١٣٤٩م).
١٢٠– نزهة القلوب، سعي واهتمام وتصحيح، گای لسترنج، دنیای كتاب، چاپخانه ارمغان، (تهران: ١٣٤٢ ش ه).

**لیستی ژێدەرەکان: بە زمانی عەرەبی**

١– احمد رمضان احمد، الرحلة والرحالة المسلمون، دار البيان العربي، (جدة: د.ت).
٢– احمد سكري، موسوعة علماء العرب، دار الصفاء، (عمان: ٢٠٠٤).
٣– احمد سوسة، الشريف الادريسي في الجغرافيا العربية، (بغداد: ١٩٧٤).
٤– احمد محمد شعبان، منهجية الادريسي في كتابه نزهة المشتاق في اختراق الآفاق، دراسة جغرافية، مجلة تاريخ العربي، (د.م: ٢٠١٢).
٥– انخل جنثالث بالنثيا، تاريخ الفكر الاندلسي، ت: حسين مؤنس، مكتبة الثقافة الدينية، (القاهرة : ١٩٥٥).
٦– البغدادي، هدية العارفين أسماء المؤلفين وآثار المصنفين، دار إحياء التراث العربي، (بيروت: ١٩٥١).
٧– جاك ريسلر، الحضارة العربية، ت، خليل احمد خليل، منشورات عويدات، (بيروت: ١٩٩٣).
٨– جرجي زيدان، تاريخ اداب اللغة العربية، دار الهلال، ( القاهرة: د.ت).
٩– حربي عباس عطيتو محمود و حسان حلاق، العلوم عند العرب، دار النهضة العربي، (بيروت: ١٩٩٥ ).
١٠– الزركلي، اعلام، دار العلم للملايين، ( بيروت : ٢٠٠٢).
١١– شاكر مصطفى، المدن في الاسلام حتى العصر العثماني، ( الكويت: ١٩٨٨).
١٢– شكيب ارسلان، الحلل السندسية في الاخبار والاثار الاندلسية، مؤسسة هنداوي للتعليم والنشر، (القاهرة: ٢٠١٢).
١٣– شوقي ضيف، الرحلات، الناشر دار المعارف، (القاهرة: ١٩٥٦).
١٤– عبدالرحمن حميدة، اعلام الجغرافيين العرب، دار الفكر، (دمشق: ١٩٨٤)
١٥– عبدالسلام الحميد، موسوعة العلماء العرب، الاهلية للنشر والتوزيع، (بيروت: ٢٠٠٥).
١٦– عبدالله كنون، موسوعة مشاهير رجال المغرب، مكتبة المصرية للنشر والتوزيع، (القاهرة: د.ت).
١٧– علي نايف الشحود، مشاهير اعلام المسلمين، (د.م: ٢٠٠٨).
١٨– عمر رضا كحالة، معجم المؤلفين، دار إحياء التراث العربي، (بيروت: د.ت )، ج ١١، ص ٢٣٦.
١٩– غوستاف لوبون، الحضارة العربية، نقله الى العربية، عادل زعيتر، طبع بمطبعة عيسى البابي الحلبي وشركائه، (د.م.ت).

٢٠- كراتشكوفسكي، تاريخ الادب الجغرافي العربي، نقله الى العربية، صلاح الدين عثمان هاشم، (لينينكراد: ١٩٥٧).
٢١- محمد السيد غلاب، الجغرافيون المسلمون ودورهم في تطور الفكر الجغرافي، بحوث المؤتمر الإسلامي الأول، مج ٣، مركز البحوث بجامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية، (الرياض: ١٩٨٤م).
٢٢- محمد عبدالغني حسن، الشريف الادريسي اشهر الجغرافي العرب والاسلام، الهيئة العامة للنشر، (القاهرة: ١٩٧١).
٢٣- محمد عبدالله عنان، موسوعة اعلام الفكر الاسلامي، ( القاهرة: ٢٠٠٤).
٢٤- محمد كرد علي، خطط الشام، مكتبة النوري، ط ٣، (دمشق: ١٩٨٣).
٢٥- محمد مؤنس عوض، الجغرافيون والرحالة المسلمون في بلاد الشام زمن الحروب الصليبية، ( عين الشمس: ١٩٩٥).
٢٦- محمود اسماعيل، الادراسة ١٣٢-٣٧٥ حقائق الجديدة، مكتبة مدبولي، (القاهرة : ١٩٩١).
٢٧- محمود شاكر، تاريخ الاسلامى، ط٦، (القاهرة :٢٠٠٠).
٢٨- موسى مصطفى الهسنيانى، سنجار دراسة في تاريخها السياسى والحضارى من (٥٢١-٦٠٠هـ/ ١١٢٧- ١٢٦١م)، (اربيل :٢٠٠٥ م).
٢٩- مينورسكي، الجغرافية والرحالة المسلمون، ت: عبدالرحمن حميدة، (الكويت: ١٩٨٥).
٣٠- ميشيل اماري، المكتبة العربية الصقلية نصوص في التاريخ والبلدان والتراجم والمراجع، (ليبسك : ١٨٥٧).
٣١- نفيس احمد، جهود المسلمين في الجغرافية، تحقيق، فتحي عثمان، مراجعة، علي ادهم، دار القلم، (كلكتا: ١٩٧٤).
٣٢- يوسف اليان بن موسي سركيس، معجم المطبوعات العربية والمعربة، الناشر مطبعة سركيس، ( القاهرة: ١٩٢٨).

**ژێدەرەکان بە زمانی کوردی:**

١- ئاكۆ بورهان محەمەد، ئابووری كوردستان لە سەردەمی عەباسیدا، كتێبخانەی غازین (هەولێر: ٢٠١٢).
٢- ئیحسان نوری پاشا، مێژووی ڕەگ و ڕەچەڵەكی كورد، و: حەمە كەریم عارف، چاپخانەی سایە، چاپی سێیەم، (سلێمانی: ٢٠٠٨).

**فەرهەنگ و ئەنسكلۆپیدیاكان:**

دائرة المعارف الاسلامية، مركز الشارقة للابداع الفكري، (الشارقة: ١٩٩٨م).
١- سيبولد، مادة (الادريسي).
٢- كانارد، مادة الجزيرة.

**ملخص البحث:**

يعد كتاب (نزهة المشتاق في اختراق الآفاق) للأدريسي احد اهم الكتب البلدانية في القرن السادس الهجري/ الثاني عشر الميلادي كونه يحوي معلومات جغرافية واقتصادية واجتماعية هامة تشمل مجتمعات المسلمين وغيرهم، وكون مؤلفه صاحب اقدم خارطة للكرة الارضية وأقدمها في ذلك الوقت، وتعدد المصادر التي رجع اليها الادريسي في تنظيمه للكتاب.

وقد شغل الكورد وبلادهم حيزاً ملحوظاً في هذا الكتاب، وهو موضوع هذا البحث الذي يتناول عدة محاور: فالمبحث الاول تناول موجزاً عن سيرة الادريسي صاحب الكتاب ثم التعريف بالكتاب وأهميته، وفي المبحث التالي تطرقنا الى ابرز الابعاد الحضارية التي تم رصدها في الكتاب والتي شملتها بعض الملامح الحضارية العمرانية للمدن الكوردية في القلاع والأسوار والجوامع والكنائس، وفي المبحث الآخر أشرنا الى النواحي الاقتصادية في الزراعة والتجارة والصناعة والاسواق وما يتعلق بها، واخيراً عرجنا على الملامح الاجتماعية للكورد ألمح اليها في الكتاب ما يتعلق منها بعناصر المكونات الدينية والطائفية وكذلك بعض الطبائع الخاصة بأهالي بعض المدن الكوردية، وختم البحث بأهم النتائج وقائمة المصادر والمراجع المستخدمة.

## Abstract

Accordingly this subject was chosen to be tackled and to be the title of our study. The present title of this paper is (Al-Idrisi)'s method and position of the kurds and their areas in (Nuzhat Al- Mushtaq) book. (Al-Idrisi) was an Islamic writer who passed away in (560/ 1164A.D). His book includes different types of subjects. A large part of the book is controlled by Geographical description in spite of that talking about economics, civilization, habit and norms of people and measuring among cities and defining them. Apparently choosing this topic is not done randomly, but it is chosen to discuss (Al-Idrisi)'s method in writing his book and also specifying Kurdish situation and Kurdish areas in the book. Writing about kurds at 12th century is significant, because all over the Islamic world at that time a person like Al-Idrisi he had talked about kurds and their areas, in detail without neglecting them as a nation. Thus we chose his book as a title of our research in order to be able to show and make our generation to be familiar to that book. We follow the applied methods to show his style and analyzing & comparing its materials.

The subjects of the research arranged according to the presentations, thus it comprises a preface and two conclusions:

The first chapter is about biography of (Al-Idrisi), this part talks about his name and nickname of (Al-Idrisi) his birth and background and his growth has been talked about. Also it's contains his book known as (Nuzhat Al- Mushtaq) and the form of the division of the book according to the title and the content of the book, the reasons of writing the book, the aim of the writing and the importance of the book.

The second chapter is indicated to Kurds and Kurdish areas from the book (Nuzhat Al- Mushtaq) and it talks about Kurdish location in the book, region, city and Kurdish villages, such as (Ardh Al- Jazeera) and western region of mountains, Azarbaijan, Arminia and Aran regions. It also talks about the Kurds in other areas such as Khurasan (Al- Ahwaz), Fars and Krman region. On the other hand his book talks about the Geography of Kurds in (Nuzhat Al- Mushtaq). He mentions kurds' mountains, rivers, valleys and weather. Al-Idrisi does not neglect kurds' civilization aspects from citadels, walls, buildings and religious place of worshiping. Moreover, remarks their economical side from agriculture, business, marketing and industry. Finally, he pinpoints to social side in Kurdish areas.

# شا نەرسی (٢٩٣ز -٣٠٣ز)
# و شوێنەواری پەیکۆڵی لە وڵاتی کورداندا

**م. کەلسوومە جەمیل عەبدلواحید**
مامۆستا لە بەشی مێژوو– کۆلیجی ئەدەبیات
زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

**پوختە**

شوێنەوار و زمان و مێژوو لە پەیکەری پەیکۆڵی کۆبۆتەوە. شوێنەوارەکە وەك شوناسی کەلتووری فارسی– پارسیە، بەڵام هەڵکەوتەی شوێنی پەیکەرەکە لە نێو جوگرافیای باشووری کوردستان، چونکە شوێنەکە هەردەم جێگەی سەرنجی سەرکەوتووان و ئیمپراتۆران بووە، کە شوێنی هاموشۆ و تێپەڕبوونی خەڵکان و کاروانەکان بووە، هەروەها شوێنەکە وای کردووە کە ئاسەوارەکان زیاتر بمێننەوە، لە لایەکی تر کوردی دەڤەرەکە شوێن دەستیان دیارە لە یادەوەریی پەیکۆڵی، ئەمەش ئەوە دەردەخات، کە لە نێو کوردان کرێکارانی فەننی کوردستان هەبوونە بە تایبەتی لە بواری بەردبڕی و بەردتاشی، سروشتی شوێنەکە لە هەبوونی کێوەکان پانتایی و ڕووبەرێکی زۆر فراوان و سەرنجڕاکێشی داگیرکردووە، ئەو هەمووە بوونەتە پاڵنەر تا شاکان یادگار و وێنە و شانازییەکانیان تێدا تۆمار بکەن.

زمانی شوێنەوارەکە فارسی ناوەڕاست و پارسیە، بەڵام ناوەڕۆکی یادگارییەکە قسەکردنە لە سەر سەرکەوتنی شا نەرسی ساسانی بە سەر بەهرامی سێیەم.

توێژینەوەکە لە سێ بەشدا هەرسێ فاکتەری دروستکردنی نەخشەکەی تاوتوێ کردووە. ئەو سێ بکەرەی ناو هەناوی نەخشەکە تەنیا وەك شوێن لە خاکی کوردین، ئەگینا هەرسێك هەڵگری شوناس و ئاماژەی غەیرە کوردین.

باوەڕ دەکرێ کە پەیوەندییەکی نهێنی لە نێوان ئەرکیۆلۆجی و زمان هەبێت. ئەو پەیوەندییە شوناسی کەلتووری دروست دەکات. ئەم توێژینەوەیە هەوڵ دەدات شوناسی پاشماوەی پەیکۆڵی لە ناوچەی قەرەداغی باشووری کوردستان بدۆزێتەوە تا بە یەك لە شوێنەواری کوردستان ناوی بنێت هەرچەندە بە فارسی ناوەڕاست و پارسی نووسراوە.

لە میانی توێژینەوەکەدا توێژەر بە هەندێ ئەنجام گەیشتووە لەوانە نەشونماکردنی ناسیۆنالیزمی فارسی لە نەخشەکە.

چاوەڕێ دەکرێ ئەم تاوتوێکردنە و ئەنجامانە بەسوود بن بۆ قوتابیانی شوێنەوار و ئیسنۆلۆژی و زمانەوانی.

**١. دەروازە**

**پەیوەندیی مێژوو و شوێنەوار هەروەها پەیوەندیی زمانی شوێنەوارەکە و دانیشتوانی دەڤەرەکە، کرۆکی بنەڕەتی ئەم توێژینەوەیە پێکدەهێنێت.**

**هۆکاری بنەڕەتی هەڵبژاردنی ئەم بابەتە ئەوەیە، کە شوێنەواری پەیکۆڵی هەڵگری سێ ئەدگاری: مێژوویی، ئارکیۆلۆژی هەروەها زمانەوانییە.**

**ئەم توێژینەوەیە لە (سێ) بەشدا پێکهاتووە لەگەڵ ئەنجامی توێژینەوەکە.**

**ئەم توێژینەوەیە هیوا وایە جێگای سوود و مفا بێ بۆ توێژەرانی بواری مێژوو، ئارکیۆلۆژی، هەروەها زمانەوانی، چونکە توێژینەوەکە هەرسێك تاوتوێ دەکات هەتا وێنەیەکی زەلاڵی شوێنەواری پەیکۆڵی لە نێو شوێنەوارەکانی وڵاتی کورد بخاتە ڕوو. لە هەمووش گرینگتر، شوێنەوارەکە لە ناو خاکی کوردە، بەلاّم بە زمانی فارسی نووسراوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە دەسەلاّتی فارسی بە شوێنەواری و مێژوو و زمانیش داگیرکردنی خۆی لە یادەوەری کوردی تۆمارکردووە.**

### ١. ١ شوێنەوارناسی و شوناس: Archeology & Identity

ئاركیۆلۆژی هەڵگری گەلێك ئەدگارە وەك ئەدگاری نەتەوەیی، چینایەتی، كەڵچەری هەتا جێندەری. ئەوەی ناسراوە بە شوێنەواری ئیمپراتۆریەتی ساسانی، مێژوونوسی وەك (Fattah) بە شوێنەواری "فارسی نوێ " ناوی دەبات."[١] بالآدەستبوونی فارسی ناوەڕاست، ناسراو بە پەهلەوی لە ماوەی ٤٢٧ ساڵی حوكمڕانی ساسانی ٢٢٤–٦٥١ ز، ئەو ئاماژەكردنە دەسەلمێنن.[٢] كۆمۆنیستەكان كە باس لە شوێنەوار دەكەن، یەكسەر دەرك بە حزووری چینێكی دەسەلآتدار دەكەن، هەرچی چینی خوارەوەیە وەك كۆیلە و خزمەتكار لە شوێنەوارەكە دەردەكەون بە تایبەتی شوێنەواری مصری كۆن[٣] و شوێنەواری فارسی. لە لایەكی تر بۆ دەوڵەمەندكردنی ڕەگی كەلتووری لە شوێنەوارەوە گامبل، هەر خودی كتێبەكەی ناوناوە شوناسی كەلتووریی شوێنەوار — The Cultural Identity of Archeology [٤]. حاڵەتێكی تر، كە زۆر زەقە لە شوێنەواری ساسانیدا، شوێنەواری جێندەری نێر سالارییە. بروس تریگەر " دەركی بەوە كردووە كە ئاركیۆلۆژی جێندەری جیاوازە لە پرانسیپی شێوەكانی دی كە لە هەمان وەختدا پەرەی سەندووە وەك ئاركیۆلۆژی چینایەتی، ئاركیۆلۆژی ئایدیۆلۆژی وە ئاركیۆلۆژی مەشاعەتی–گشتگیری."[٥] لەوەش زیاتر لە هەردوو كارەكانی بەهرامی دووەم و نەرسی*[٦] دا دەرك بەئامادەبوونی هەموو ئاركیۆلۆژییەكانی نەتەوەیی و كەلتووری و چینایەتی و جێندەری دەكرێت. كەواتە شوێنەواری پەیكۆڵی وەك نەخش و مێژوو و زمان هەڵگری شوناسی نەتەوەی فارسە لە وڵاتی كوردان ناسراو بە هەرێمی چیاكان.[٧]

چونكە دەسەلآتی ساسانی دەسەلآتێكی فارسی بووە قبوڵی دوو قەومەكەی تر ئەشكانی و میدی نەكردووە.

### ١. ٢ گرینگی پاشماوەی پەیكۆڵی:

پەیكەری پەیكۆڵی یەكێكە لە شوێنەوار و كەلاوەكانی ساسانی لە وڵاتی كورداندا. نەجاتی عەبدوڵلآ لە بیبلۆگرافیای كوردناسی لە وتارێكی ئیدمۆندز بەناوی Two more Ancient Monuments in Southern Kurdistan دەگوازێتەوە كە ئیدمۆندز وتوویەتی " دوو شوێنەواری كۆن لە كوردستانی خواروودا، كە بریتین لە

باسێکی کورتی دوو شوێنەواری مێژوویی یەکەمیان لە ناوچەی دەربەندی پەیکۆڵی (بوتخانە) کە لە ساڵی ١٨٤٤ز ڕاولینسۆن دۆزیویەتیەوە و تیمێکی ئارکیۆلۆژی ئەڵمانی بە سەرپەرشتی دوکتۆر (ئێرنست هێرزفیلد) لێیان کۆڵیوەتەوە و دووەمیشیان بەردنووسێکە لە ناوچەی قەرەداغ (دەربەندی گاور)–ە. "[٨]

نووسینەکەی ئیدمۆندز لە کتێبی ناسراوی نووسەر بەناوی (کرد تورك عەرەب)[٩] دووبارە کراوەتەوە. ئەم نووسینە دەرگای لە سەر ناساندنی شوێنەوارەکە کردەوە، بە واتای تاکی خوێنەواری کورد لە ڕێگای ئەم دوو سەرچاوەی ئیدمۆندزەوە بە شوێنەوارەکەی دەربەندی پەیکۆڵی ئاشنابوو، نەك لە ڕێگای خودی نووسینەکەی ڕاولنسن و هیرزفیلدەوە.

چیرۆکی دۆزینەوەی پاشماوەی پایکۆڵی دەگەڕێتەوە بۆ چەرخی نۆزدە کاتێك کۆمەڵە گەڕیدە و گەشتیارێکی ئەوروپی بە ناوچەکە تێپەڕیون. فریزەر و ڕاولنسۆن و هیرزفیلد و ئیدمۆندز هەمان شت دووبارە دەکەنەوە لە سەر دۆزینەوەی پەیکەرەکە، بۆنموونە لە نووسینەکەی ئیدمۆندز دەردەکەوێت شوێنەواری پەیکۆڵی لە وڵاتی کوردە – باشووری کورستان لە بناری چیاکانی زاگرۆس.

ئەم دەربەندە دەکەوێتە شوێنێکی جوگرافی ستراتیژی مێژوویی، ئەویش سەر ریزە شاخەکانی خۆرئاوای شارۆچکەی قەرەداغ لە قەزای دەربەندیخان بە دووری (٨ کم) لە بەشی لای ڕاستی ڕووباری دیالە[١٠]. گرینگیی ئەو شوێنەوارە لەوەدایە، کە ئەو دەربەندەی ڕێڕەوی شوێنەوارەکەی لەسەرە بەرزییەکەی (١٧٠٠) پێیە، یەکێکە لەو سێ ڕێگایە مێژووییانەی شاخی قەرەداغ [١١] لە سەر ڕێگای سەرەکی بەغدا –سلێمانی–تەورێز لە سەرە[١٢]یان لەوانەیە ڕێگای بەردەم ڕێگایەکی مێژوویی بێت لە وڵاتی بابل بۆ شارەزوور یا هەروەکو هێرزفیلد ئاماژەی پێدەکات کە ئەو شوێنە ڕێگای کۆنی نێوان تەیسەفۆن و ئازەربێجان بووبێت[١٣].

هەڵبژاردنی ئەو سەرە ڕێیە ستراتیژییە لە کاتی فەرمانڕەوایی ساسانیدا هەر تەنها بۆ ناساندنی سەرکەوتنی نەرسی پاشا نەبووە، بەڵکو دەڤەرەکە نزیك بووە لەو ڕێگایەی کە (تەیسەفۆن) و (گەنجە)ی پێکەوە گەیاندووە. هەروەها ئەو ڕێگایە لە سەردەمی نوێش گرینگیی خۆی هەبووە وەك ئیدمۆندز دەڵێ: ئەم شوێنەوارە

نزیك بووە لە رێگای هۆزەکانی جاف لە کۆچی هاوینەیاندا. ئەم گەشتەش بە بڕینی دەربەندی پەیکۆڵی، وەك قەدەرێ وا بووە کە نزیکترین شوێنە لە شاخەکانی قەرەداغ [١٤]. لە لایەکی تر لەوانەیە ئەو شوێنە، هەر تەنیا نەخشی پەیکۆڵی لێ نەبووبێ، بەڵکو یەکێك لە پەرستگاکانی ئاگری ساسانی لێ بووبێ کە لەوێوە بۆ مەڵبەندی سەرەکی پەرستنی ئاگر لەشاری (شیز) دەچێ. کە لە رۆژگاری ئەمڕۆ بە تەختی سلیمان ناسراوە دەکەوێتە ئازەربێجانی ئێران [١٥]. هەندێکی تر وای بۆی دەچن کە لەوانەیە گۆڕی یەکێ لە پاشایانی ئێرانی لێ بووبێ، بۆیە ئەو شوێنە گرینگ بووە تا ئەو رادەی پاشا نەرسی ئەم یادگارییەی تێدا تۆمار کردبێت. یان بە قسەی ئالان بۆومان و پیتەر گارنێسی و کامیرۆن بێت "نەخشی پەیکۆڵی هەر تەنیا وێنەی شا نەرسی لە خۆ نەگرتووە، بەڵکو وێنەی شاپووری باوکی و هاوپەیمانەکانی ناوخۆشی لەخۆگرتووە"[١٦]. بە شێوەیەکی گشتی هەڵکەوتەی شوێنی جوگرافیای کوردستان هەردەم جێگەی سەرنجی سەرکەوتووان و ئیمپراتۆران بووە، کە شوێنی هاموشۆ و تێپەڕبوونی خەڵکان و کاروانەکان بووە، هەروەها بەهۆی حەساس بوونی شوێنەکە وای کردووە کە ئاسەوارەکان زیاتر بمێننەوە، لە لایەکی تر ئامادە بوون و شارەزایی کرێکارانی فەننی کوردستان بە تایبەتی بەردبڕ و بەردتاشەکان، پانتایی و رووبەری کێوەکان زۆر فراوان و سەرنجڕاکێش بوونە کە ئەمانە هەموو پاڵنەر بوونە تا شاکان یادگار و وێنە و شانازییەکانیان تێدا تۆمار بکەن.[١٧]

**١. ٣ ئەوانەی باسی پەیکۆڵییان کردووە:**

**پاش ساخبوونەوەی ئەوەی کە شوێنەوارەکە و مەدلوولەکانی، بەرهەمی ساسانییە، نەك کوردی. تاکی کورد زۆر خۆی لەو شوێنەوارە نەکردۆتە خاوەن، بەڵکو وەك (بتخانەیەك) سەیری کردووە، داگیرکەرانی تورکی و عەرەبی –ش لە پێناو شوون بزرکردنی کورد لەو پاشماوانە، ئەم شوێنەوارەیان دوورخستۆتەوە لە یادەوەریی کوردی. دووربوونی کورد و داگیرکەرە نوێیەکانی باشووری کوردستان، دەرفەتی بۆ بیانییەکانەوە ڕەخساندووە، کە لە زۆر شوێنەواری باشووری کوردستان بدوێن لەوانە شوێنەواری پەیکۆڵی.**

**سەیر لەوەدایە، کە گەڕیدەیەکی وەك (ریچ)، کە لە ساڵی ١٨٢٠ دا گەشتێك بۆ کوردستان دەکات، ناوی پەیکۆڵی ناهێنێت. ریچ لە گەشتەکەیدا باسی زۆر شوێنەوار دەکات لەوانە کەلاوەکانی ساسانی هەروەها لە چەند لاپەڕەیەکی پێشوو ئاماژە بە چەند شوێنەوارێکی ساسانیی نزیك پەیکۆڵی دەکات، بەلاّم نە ئەو و نە وەرگێڕی کوردی یاداشتنامەکەی (محەمەد حەمە باقی) ئاماژە بە پەیکۆڵی ناکەن.[١٨]**

فریزەر لە گەشتەکەی سەدەی نۆزدەدا لە پێشەنگی ئەو ئەورووپییانە دێت، کە قسەی لە سەر پەیکۆڵی کردووە. (ج. ب. فریزەر) لە باسی شارەزووردا ئاماژەی بەو شوێنەوارەی پەیکۆڵی کردووە، بە جۆرێك کە لە یەکی تشرینی دووەم لە ساڵی ١٨٣٤ ز. دا بە ناوچەکە ڕەت دەبێت و دەڵێ: پیاوێکی بەتەمەن باسی بتخانە یان پەرستگایەکی پەیکەری بۆ کردم لە دەشتاییەکەدا هەیە و بەردی نووسراوی تێدا هەیە، بەلاّم کەس ناتوانێت بیانخوێنێتەوە. [١٩].

هەروەها ڕاوڵنسن تەنها دوو ساڵ دوای فریزەر لە کاتی گەشتەکەی بۆ دیدەنی شەمێران لە ساڵی ١٨٣٦، ئاماژەی بەو پەیکەرە– بتخانەیە کردووە و وتوویەتی لەوپەڕی رووباری سیروان لە دووری سێ فەرسەخ*[٢٠] نەخش و پەیکەر هەن. هەر گەڕیدەیەك لە دوارۆژدا بیەوێت بۆ ئەو وڵاتە بڕوات دەبێت بایەخیان پێ بدات. جەمال بابان ئاماژە بەو شوێنەوارە دەکات و دەنووسێت : "کە توێژەری بەناوبانگ (ولسن) لە ساڵی ١٨٤٤دا ئەو پەیکەرەی دۆزیوەتەوە."[٢١] دوای هەشت ساڵ لە دوای گەڕانەوەی بۆ وڵاتەکەی (فلیکس جونز) ڕووداوەکانی بۆی نووسیوەتەوە هەروەها گەلێك وێنە و کۆپی زانیاریی سی و دوو بەردی نووسراوی بردۆتەوە. وەسفێکی پوختی شوێنەوارەکەی لە گۆڤاری (الجمعیة الاسیویة الملکیة) لە ساڵی ١٨٦٨ ز. وەکو پاشکۆیەك بۆ نووسینێکی درێژی قەشە (ئێدوار تۆماس) بلاّو کردۆتەوە. لە پێش و پاش یەکەم جەنگی جیهانیدا هێرزفیلد لە دوو ماوەی جیاوازدا ١٩١١ و ١٩٢٣ سەردانی ئەو پەیکەرەی کردووە و ئاشنای کردووە بە مرۆی ئەهلی قەڵەم. لە دوای حوکمڕانی شێخ مەحموود ١٩١٩، ئیدمۆنز لەگەڵ مێجەرسۆن وەك دوو ئەفسەری خوێندەواری ئینگلیز چەندان کتێب و نامیلکە و وتاریان لە سەر کورد و زمانی کوردی و شوێنەواری کوردی نووسیوە.

مێجەرسۆن هەر زوو لە ساڵی ١٩٢٣ مرد، بەڵام ئیدمۆنز لە کتێبی (کرد، ترك، عرب) دا بە درێژی لە سەر ئەو پەیکەرە دەدوێت هەتا لە ڕووی سیاسییەوە بە (قەڵای شوێنەوارئامێز) ناوی دەبات.(٢٢)

لە ساڵی ١٩٥٤ کریستینسن دەربارەی ئەو پاشماوە دەنووسێت : " یەکێك لە دوورودرێژترین بەردەنووسەکانی سەردەمی ساسانی، نەخشە هەڵکەندراوەکانی پایکۆڵی کوردستانە کە کەوتۆتە باکووری قەسری شیرین " کریستینسن لە بارەی زمانی شوێنەوارەکە دەنووسێت : " بەردەنووسەکە بە دوو زمانی ڕەسمیی ئەو چاخە، واتە پەهلەوی ئەشکانی و پەهلەوی ساسانی." نووسراوە، لە ڕووی مێژووییەشەوە: "پەیکەری داتاشراوی پاشا نەرسی پادشای ساسانی لە سەر هەر چوارلای قەڵاقووچەکە ئاسۆگی داوە."(٢٣)

پرۆد سکاڤا–Prods Skjarve لە ساڵی ١٩٨٣ هەر دەقی نووسینەکەی پەیکۆڵی نەکردۆتە ئینگلیزی، بەڵکو وەسفی کۆن و ئێستای نەخشی پەیکۆڵی ئەوها دەکات : " نەخشەکە پێکهاتووە لە پاشماوەیەکی کەلاوەی بەرفرە، بورجێکی چوارگۆشەیی لە چوارلاوە بە بلۆکی بەردی داپۆشراوە، لە کاتی ئێستادا مۆنیومێنتەکە لە ناوچەکە پەرش و بڵاوبووە."(٢٤) (بنواڕە وێنەی ژمارە ١). هەندێ لەو پارچانە لە مۆزەخانەی سلێمانی هەڵگیراون. لەو دوایە، ساڵی ٢٠١٤ گرووپێکی ئیتالی خوێندنەوەیەکی تریان بۆ هەمان شیکرنەوەکەی هێرزفیلد کردووە زانیاریی تازەیان خستۆتە ڕوو(٢٥).

### ١. ٤ بیرۆکەی بتخانە و دەربەندی گاور لە یادەوەری کورد یدا:

زۆربەی شوێنەوارە پەرستگا و پەیکەر ئامێزەکانی تەواوی کوردستان، جیا لە ناوە ڕەسەنەکانی خۆیان بە نازناوی ماڵی (بت)، (گاور)، (ئارتەشگاه) لە لایەن کوردی موسڵمان ناسێندراون. مێژوونووسە موسڵمانەکان ئاماژە بە هەبوونی ماڵی ئاگر لە دەڤەرەکانی کوردستانی بندەستی ساسانی دەکەن، لەوانە ئیبن رستە باس لەوە دەکات کە لە حەلوان ماڵێکی گەورەی ئاگر هەیە، کە بۆ پەرستن بەکاردێت.(٢٦) هەروەها دینەوەریش باس لە هەبوونی گوندێك دەکات نزیك نەهاوەند بە ناوی (خوارجان) کە پەرستگایەگی ئاگری تیایە کە لە ژێرەوە پڕیەتی لە جوانکاری و گەوهەر .(٢٧) " لە سەردەمی نوێشدا، لە سەر ئەو نازناوانە

هەر بەردەوامن، لەم بارەیەوە ڕیچ لە گەشتنامەکەی سەدەی نۆزدەی میلادی، دەنووسێت : "خەڵکەکە ئەو ئاسەوەرانە بە هی (گاور)، یان کافر دەزانن، لە ڕاستیدا زانیاریی ناتەواوی ئێمەش دەربارەی ئیمپراتۆریەتی ساسانی، ڕێ نادات شتێك دەربارەی ئەم جێگایە بڵێین. " هەر لە هەمان لاپەڕەدا دەنووسێت : "لای ژووروی باکووری خۆرئاوای سەروو چەمەکەشەوە، شوێنەواری پشکنین لە بەردێکدا هەیە، پێی دەڵێن (ماڵی کافر)"[٢٨] دەربەندی گاور و کەفر و بتخانە، نموونەی واقعی کوردن. جەمال بابان لە تۆفیق وەهبی دەگوازێتەوە کە وشەی بیکلی دەبێت ئاری بێت و لە پەیکەر هاتبێت، کورد وەك ناوێك لە بیکلی و گەرووەکەی دەنێن. ئەو ئەسەرە لای کورد بتخانەیە..."[٢٩]

پەیکۆڵی لای کورد هەر پەیکەر نەبووە، بەڵکو باوەڕە دینییەکە پاڵی پێوەناوە کە دەربەندی پەیکۆڵی بە دەربەندی گاور و ماڵی کافر ناوزەد بکات.

**٢. ١ شوێنەوارناسی و زمان: Language & Archeology**

شوێنەوار بە تایبەتی دوای دۆزینەوەی زمان وەك میکانیکی نووسین، بووە تابلۆ و تێکستێك لە سەر مێژووی حاکمێکی دەسەڵاتداری نێر هەروەکو پێشتر ئاماژەی پێکرا کریستال و دورانتی وا باسی حزووری ڕەگەکانی زمان لە شوێنەوار دەکەن، کە زمان هەژموونێکی باڵای هەیە بە سەر شوێنەوارەوە، وەك کریستال لە An Encyclopedic dictionary of language and languages دەنووسێت: جۆرە زمانەوانییەك هەیە بە ناوی مرۆناسی زمانەوانی کە لقێکە لە مرۆناسی لە شوێنی زمان لە کۆمەڵگا دەکۆڵێتەوە."[٣٠] دۆراتی باوەڕی وایە ئەو تێکەڵبوونەی مرۆناسی و زمان نمایندەی کەلتوورێك دەکات بۆ دروستکردنی نەتەوەیەك."[٣١]

فرانز بۆس و ساپیر و ۆرف لە مێژووی زمانەوانی ئەمەریکیدا قسە لە سەر زمان و کەلتوور دەکەن. بۆس باوەڕی وابوو کە لە کەلتووری نەتەوەیەك ناگەی، هەتا زمانی ئەو نەتەوەیە نەزانی [٣٢]، چونکە ساپیر باس لەوە دەکات کە پەیوەندییەکی دوولایەنە لە نێوان زمان و بەشەکانی کەلتوور هەیە.[٣٣]کەواتە زمانی پەیکۆڵی تەنیا زمانی پەیکەرێکمان بە ناوی پەیکۆڵی بۆ ناگوێزێتەوە، بەڵکو کەلتوورێکی فارسی، نێرسالاری و بەشێك لە مێژووی حوکمڕانی فارسی لە ٢٩٣ ز. دەگوازێتەوە.

### ٢ . ٢ زمانی پەیکەری پەیکۆڵی:

پاشماوە و شوێنەواری زۆری دەسەڵاتدارانی ساسانی وێنەی سەر بەردەکانیان بۆ بەرژەوەندیی خۆیان بەکارهێناوە، کە لە کێوی چیاکان کێشراون. ئەو پەیکەرانە زۆربەی لە شوێنی دژوار نەبوونە، بەڵکو لە سەر ڕێی کاروانسەرا بوونە بۆ ئەوەی سەرکەوتن و شانازییەکانی خۆیان بە نەتەوەکانی تر بناسێنن. لەو هەموو نەخشانەدا هۆکاری مێژوویی و شوێنەواری و شوناسی زمانەوانییان بەرجەستەکراوە ، بۆ نموونە ئەو هەموو شوێنەوارەی کوردستان لە سەردەمی کۆرشەوە هەتا سەردەمی پاشاکانی ساسانی نموونەی زەقی بۆچوونی سەرەوەن.

ئەو سێ ئەدگارە هەر تەنیا لە باشووری کوردستان نین، بەڵکو زۆربەی شوێنەوارەکانی ڕۆژئاوای ئێران–ڕۆژهەڵاتی کوردستان و هەرێمی کوردستان گرتۆتەوە وەك ئەوانەی لە پارێزگاکانی وەك ئازەربایجانی ڕۆژئاوا، پارێزگای کوردستان – سنە، پارێزگای کرماشان، پارێزگای لوڕستان، پارێزگای ئیلام هەن... بەڵگەی ئەو ڕاستییەن [٣٤]

لە لایەکی دی شوێنەوارەکانی ساسانی هەر لە دەڤەری کوردی نەبوون، بەڵکو ڕووبەرێکی گەورەیان لە دەڤەری فارسی داگیرکردووە، هەروەکو روقیە بەهزادی ئاماژەی پێدەکات و دەڵێ کە " زۆربەی نووسراوە بەردینەکانی فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی ساسانی کەوتوونەتە ناوچەکانی حاجی ئاوەی پارێزگای فارس لە باکووری ڕۆژهەڵاتی تەختی جەمشید، نەخشی ڕەجەبی پارێزگای فارس لە باکووری ڕۆژئاوای تەختی جەمشید، نەخشی رۆستەمی پارێزگای فارس، تاقی بوستان لە باشووری هەمەدان [٣٥]." بە حوکمی ئەوەی فەرمانڕەوای ساسانی ٢٢٤ ز–٦٥١ ز. دوا فەرمانڕەوایی فارسی بوو، بۆیە زۆربەی پاشماوەکان کە لە دەڤەرەکە دۆزراونەتەوە، دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی ساسانییەکان ئەو شوێنەوارانە نووسینی بەردینی تایبەتین، کە فەرمانڕەوایانی ساسانی بە چەند زمانێکەوە تۆماریان کردووە. یەکێ لەو پاشماوانە شوێنەواری پەیکۆڵییە کە بە (خەتی ئارامی) و بە (زمانی فارسی) بە هەردوو لقی پەهلەوی ئەشکانی (پارتی، پەرسی، ئەشکانی)*[٣٦] و (پەهلەوی ساسانی) نووسراوە. دەرکەوتنی زمانی

فارسی لە نەخشی وڵاتی کوردان مەدلوولێکی نەتەوەیی هەیە. بەپێی سەرچاوەکان فارسی ئەخمینی و فارسی ساسانی، فەرسی بە دایکی ساسانییەکان دادەنرێن." لقی دووەمی زمانی شوێنەوارەکە پەهلەوییە. پەهلەوی شرۆڤەیەك هەڵدەگرێت، تا شوناسی نەتەوەیی زیاتر ئاشکرا ببێت، ئالان بۆومان و ئیدمۆندز بە جیا دەنووسن : " نەخشی پەیکۆڵی بە دوو زمانی پارسی Parthian و فارسی ناوەند Middle Persian نووسراوە"[٣٧] زۆربەی نووسەرەکانی ئەو بوارە ئەو دوو زمانە بە پەهلەوی ئەشکانی و پەهلەوی ساسانی ناوزەد دەکەن. زوبێر بیلال باوەڕی وایە کە تەنیا پەهلەوی ئەشکانی نزیکە لە زارەکانی کوردی نەك پەهلەوی ساسانی.[٣٨]

## ٢. ٣ شرۆڤەی زمانی پەهلەوی:

زمانی پەهلەوی، زمانێکی کۆنی "ئێرانی"*[٣٩] بوو. ئەو زمانە بە زمانێکی هیند و ئێرانی دادەنرێ، لێرەوە ناسنامەی "فارس" و "کوردی" ئەو زمانە تێکەڵ یەك دەبێ، چونکە مێژووی (ئێران) لەدوای ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی (میدی)یەوە، خوێندنەوەیەکی "نەتەوەیی" بۆ کراوە و وشەی "ئێران" بە فارس و وڵاتی فارس" شرۆڤەکراوە، بەڵام لەبنەڕەتدا وشەکە ئەو واتا تەسکە نابەخشێ!

زمانی پەهلەوی هەمان زمانی پارسییەکانە هەروەکو Olshausen دەڵێ زمانی پەهلەوی هەمان زمانی پارسییەکان دوای ئەوەی بە چەند قۆناغێك تێپەڕیوە و گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە و شێوە و وێنەی لە خۆی نزیك وەرگرتووە، وەك (پەرهو) Parhva و (پەلهو) Palhav و (پەهلو) Pahlav . بەڵام ناوەکە لە لای جوگرافیناس و گەڕۆکە عەرەبەکان بوو بە (فەهلو) کە ئەم ناوەیان بەو شارانە وتووە کە دەکەوتنە بەشەکانی ناوەڕاست و ڕۆژئاوای ئێران وتووە وەك شارەکانی: ئەسفەهان، ڕەی، هەمەدان، نەهاوەند، بەشێك لە ئەزەربێجان.[٤٠]

هەروەها دەوترێ کە لە سەدەی سێهەمەوە، هەتا سەدەی هەشتەم نووسین و قسەی پێکراوە، لە ئێران — وڵاتی ئاریان، بەڵام ئەو زمانە ڕێنووسێکی script زۆر دژوار و زەحمەتی هەبووە، بۆیە هەر لە سەردەمانێکی ساسانییەکانەوە نووسینی (کەم)ی پێکراوە، هەر زیاتر زمانی ئاخاوتن بووە.

## ٢. ٤ شوناسی ئایندەیی زمانی پەهلەوی لە دوای پەیکۆڵی:

ڕۆژهەڵاتناسە ئەوروپییەکان زمانی پەهلەوی pehlevi بە زمانی فارسی ناوەڕاست ناوزەد دەکەن.[٤١] بەڵام د. نەبەز خۆی زمانی پەهلەوی بە "زمانێکی سەربەخۆ" دادەنێ، بەوەی نزیکترە لە زمانی کوردی وەك لە فارسی. ئەو ڕایەی د. نەبەز لە سەر بنەما و شەنگست نییە، تەنیا نزیکیی وشەکانی زمانەکە و شوێنەکەی کردۆتە مەرج! سەدیق بۆرەکەیی لەبەرگی یەکەمی مێژووی وێژەی کوردی لاپەڕە (٢٤–٢٥) دا دەڵێ: زمانی پەهلەوی لە زمانی کوردی دەچێ و نزیکترین زاراوەی (زار)ی کوردی، کە لەگەڵ ئەم زمانەدا هاوچەشنە، زاراوەی گۆرانی و لوڕیە. "[٤٢] بۆرەکەیی و زوبێر بیلال هەندێ "بەڵگە" دەهێننەوە بەوەی، کە زمانی پەهلەوی زمانی کوردییە، یان زارێکی کوردییە. گیوی موکریانی بانگەشەی ئەوە دەکات، کە کتێبی (دین کەرد) بە زمانی پەهلەوی نووسراوە، ئەو زمانەش زمانی لوڕ و کەلهوڕ و شوانانە.[٤٣] مەردۆخی مێژوو نووسی کوردیش دەڵێ: "زمانی پەهلەوی یەکێ لە (شێوەکانی کوردی) بووە، کە گەلێ لە زاراوەی لوڕی و گۆرانیەوە نزیکە".[٤٤]

زوبێر بیلال دەڵێ: "پەهلەوی سەردەمی ئەشکانی ٢٤٧پ. ز – ٢٢٤ز. ئەو شێوەیان لە (هەورامی) و (فەیلی) دەکات، پەهلەوی ساسانی ٢٢٤–٦٣٠. کە بە زمانی فارسی ناوەڕاست ناسراوە "[٤٥]

لای هەندێ توێژەری مێژووی ئیسلامی زمانی فارسی و زمانی پەهلەوی لە یەك جیاکراونەتەوە وەك : د. فرست مرعی ئاماژە بەوە دەکات و دەنووسێ " لە سەرچاوە عەرەبییە موسڵمانەکانیشدا زمانی (فارسی) و (پەهلەوی) لەیەك جیاکراونەتەوە، بەتایبەتی لە سەردەمی ئیسلامیدا". [٤٦]

بەکورتی، پەهلەوی زمانێکی ڕێنووس ئاڵۆز و گران بووە، لەو بارەیەوە صالح قەفتان لەلاپەڕە (١٠٥)ی کتێبی (مێژووی گەلی کورد لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ) دەربارەی "ڕێنووس"ی پەهلەوی دەنووسێ... ***ئەلف و بای پەهلەوی زۆر سەخت و گران بوو، چونکە وەها دەرکەوتووە، کە لە نووسینی پەهلەویدا هەزار پیت (حەرف) زیاتر بەکارهێنراوە***[٤٧].

***هەر لە سەر ئەو ئەدگارە زمانی فارسی ناوەڕاست هێدی هێدی لە ماوەی حوکمڕانی ساسانی شوێنی زمانی پەهلەوی لە کاروباری دەوڵەت گرتەوە .***

فارسیی ناوەڕاست ئەو زمانەیە کە لە ناوچەکانی ئێرانی رۆژئاوایی– باشووری باو بوو و زمانی دانیشتوانی ئیستەخری پارێزگای فارسی ئێستایە بە پاشماوەی زمانی فارسی کۆن و ڕیشەی سەرەکی زمانی فارسی ئەو سەردەمە دادەنرێت. شاکانی ساسانی تەنها بە زمانی فارسی ناوەڕاست تۆمارەکانیان دەنووسی، بە واتای فارسی ناوەڕاست جگە لەوەی ببووە زمانی کارگێڕیی دەوڵەتی ساسانی، هەر لە سەردەمی شا نەرسی ببووە زمانێکی نەتەوەیی نەخشی ساسانی.

یەکێ لە پاشماوەکانی ساسانی لە هەرێمی چیا – باشووری کوردستان شوێنەواری پەیکۆڵییە، کە بەو زمانە نەتەوەیی و کارگێڕییە نووسراوە، کەواتە پەیکۆڵی هەڵگری شوناسی کەڵچەری و نەتەوەیی فارسی بووە (ئەمە لە بەشی یەکەم ئاماژەی پێکرا).

**ماری بۆیس لە کتێبی تأریخ الزرادشتیة دەنووسێت:"ساسانییەکان لە پاش دانانی پەیکەری پەیکۆڵی هەندێ ئیجرائاتی یەکلاکەرەوەیان کرد بۆ ئەوەی زمانی فارسی وەك تاکە زمانی ڕەسمی لە ئێران بێننە ناوەوە و بە یەکجاری زمانی پارسی – زمانی ئەشکانی لە نووسینی کاروباری دەوڵەت دوور بخەنەوە"(٤٨)**

**لە دوای زمانی ئەو پەیکەرەش، ساسانییەکان هەوڵیاندا هەتا ماوەی لاوازی ئیمپراتۆریەت، دەوڵەتی ئێرانی وەك دەوڵەتێکی تاك نەتەوەی دەسەڵاتدار و زمانێکی ئەو نەتەوەیە بناسێنن هەروەکو ئەردەشێری کوڕی بابك هەر لە بەرایی دروستکردنی دەوڵەتی ساسانییەوە کەوتۆتە تەمبێکردن و کوشتنی پاشای پارسییەکان و میدییەکان، هەتا حوکمڕانی فارسی لە ئێران دابمەزرێنێت (٤٩)**

### ٣. ١ شوێنەوار و مێژوو یا حزووری شا بەهرام شا نەرسی (٢٩٣ ز – ٣٠٣ ز):

شوێنەوار و مێژوو وەك جمکی جیانەکراوەن، چونکە هەردووك پاڵپشتی یەك دەکەن. کتێبی مێژوویکی شاراوە لە ڕەگەزی مرۆیی – The Hidden History of Human Race، کە لە ساڵی ١٩٩٨ لە لایەن گراهام هانکۆك دیڤۆن نووسیویەتی و مایکل کرێمۆ هەڵسەنگاندنێکی بۆ نووسیوە، دەنووسێت : ئەو کتێبەی هانکۆك پانتاییەکی گەورە داگیر دەکات لە قسەکردن لە سەر کەیسەکانی مێژوو، هەندێك

لەو کەیسانە هەڵگری ئارکیۆلۆژی قەدەغەیین هەروەها لە نێو ئارکیۆلۆژییەکاندا (تێکست) بۆ پشت ڕاستکردنەوەی نەخشەکان کراون ، تاوتوێ دەکات."[٥٠]

لە نێو نەخشی پەیکۆڵیشدا مێژووی بردنەوە و حوکمڕانی پاشایەکی ساسانی بەرجەستە کراوە.

شانشینی ساسانی لە ماوەی حوکمڕانیدا، کۆمەڵە شایەك بەشدارییان کردووە لە حوکمی ٤٢٧ ساڵەی ئەو شانشینە. لەناو ئەو شانشینەدا پاشای بەهێز و لاواز هەبووە. بە گوێرەی سەرچاوەکان هەر لە دوای مردنی شاپووری یەکەم لە ساڵی ٢٧٢ ز تا هاتنی شاپووری دووەم ٣١٠ ز، بە ماوەی لاوازی یەکەمی حوکمڕانی ساسانی دادەنرێ[٥١]. هورمزدی یەکەم (٢٧٢ ز– ٢٧٣ ز) و بەهرامی یەکەم (٢٧٣ ز – ٢٧٦ز) و بەهرامی دووەم (٢٧٦ز – ٢٩٣ ز) لەو ماوە لاوازییە دەسەڵاتداربوونە.[٥٢]

لە ژیانی بەهرامی دووەمدا سێ ڕووداوی ترسناك ڕوویدا، ئەوانیش :

١. دووبارە هەڵگیرسانەوەی شەڕ لەگەڵ ڕۆمەکان شکستی دەوڵەتی ساسانی و نزیکبوونەوەیان لە پایتەختی دەوڵەت (مەدائین – تەیسەفۆن).

٢. ڕووداوێکی دی ترسناك لەم ماوەیەدا بەرپا بوو، ئەویش هەڵگەڕانەوەی یەکێك لە براکانیەتی لە خۆراسان بە هاندانی میرەکانی کۆشان کە دوژمنی کۆن و سەرسەختی ساسانییەکان بوون، ئەمەش وای لە بەهرامی دووەم کرد کە مل بدات بۆ مەرجەکانی دەوڵەتی ڕۆمی و لەگەڵیان ڕێککەوت وازی لە ئەرمێنیا و جەزیرە بهێنێت.

٣. بەو پێیە ئەرمەنستان و بەشی باکوری کوردستان کە ویلایەتی نیمچە – سەربەخۆ بوون، خرانە سەر ڕۆم.

دواتر هەموو سوپاکەی بەرەو ڕۆژهەڵات برد، دەڤەرەکەی لە براکەی سەندەوە. "توانی سەرکەوتن بە دەست بهێنێ و شۆڕشەکەی دامرکاندەوە، بەهرامی دووەم ئەو سەرکەوتنەی لە سەر بەردێك نەخشاند یان هەڵکۆڵی.[٥٣]

سەرچاوەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە ماوەی حوکمڕانی نەرسی و مێژووی بنیاتنانی پەیکەری پەیکۆڵی دیارن، هەروەکو حسن پیرنا و ئەوانی تر دەنووسن : "بەهرام ماوەی چەند مانگێك فەرمانڕەوایی کرد، نەرسی کوڕی شاپووری یەکەم

مامی بەهرام، کودەتای سەربازی لە سەر برازاکەی کرد و لە دەسەلأت لایدا، نەرسی ئەو سەرکەوتنەی خۆی لە نەخشی پەیکۆڵی لە ساڵی ٢٩٣ز. دەربڕی."[٥٤]

لە دوای مردنی شاپووری یەکەم لە ساڵی ٢٧٢ز تا سەردەمی شاپووری دووەم بە ماوەی لاوازی و بێ هێزی یەکەم دادەنرێت لە مێژووی ئێراندا هەروەکو پێشتر ئاماژەی پێکرا، چونکە دەوڵەتی ساسانی دووچاری ڕەوشێکی خراپی سیاسی و تێکچوونی باری گشتی و لەدەستدانی بەشێکی زۆری هەرێمەکانی بووە، ئەویش بە هۆی هاتنی چەند شایەکی لاواز و بێهێز کە نەیاندەتوانی گشت جومگەکانی دەوڵەت بەڕێوەبەرن. لە لایەکی تر دەسەلأتی پیاو ماقوولأن و دەسەلأتداران یەکجار زۆر ببوو. جگە لەمانە کێشە لەسەر دەسەلأت لە نێوان بنەماڵەی فەرمانڕەوا سەری هەڵدا بەوەی کوشتن و تیرۆرکردن ببووە کارێکی ئاسایی بەمەبەستی گەیشتن بە دەسەلأت. لە ساڵی ٢٩٣ز بەهرامی سێیەم دەبێتە دەسەلأتدار. بەڵام ماوەی فەرمانڕەوایی ئەم پاشا لاوە تەنها چوار مانگی خایاندووە، چونکە (نەرسی) کوڕی شاپووری یەکەم کە مامی باوکی (بەهرامی سێیەم) بوو، کودەتای لە سەر برازای خۆی کرد لە دژی ڕاپەڕی و شۆڕشی لەدژی هەڵگیرساند خانەدانان و پیاوماقوولأن پشتیوانییان لێ کرد [٥٥]. لە ڕوانگەی تەبەرییەوە ماوەی حوکمڕانی نەرسی تەنها نۆ ساڵی خایاندووە [٥٦]بەوەی لە ساڵی ٢٩٣ ز تا ساڵی ٣٠٩ز بەردەوام بووە. وێنەی تاج لەسەرنانی نەرسی و هەواڵی بوونی بە شای دەوڵەتی ساسانی لە پاشماوەی پەیکۆڵی تۆمار کراوە، بە واتای پەیکەری پەیکۆڵی سەرەتای مێژووی حوکمڕانی نەرسی هەڵگرتووە.

نەرسی بەو سەرکەوتنەی بە سەر برازای، هێزێکی وەهمی پێ بەخشی، بۆیە "هەر زوو شەڕێکی تری لەگەڵ ڕۆما هەڵگیرساند ویستی ئەو ناوچانەی لە سەردەمی (بەهرامی دووەم) لە دەستی دابوو بیگەڕێنێتەوە.[٥٧] تا وڵاتی ئەرمێنیا و کردۆئین کشا. نەرسی حاکمی ئەرمێنیا (تریداتس) کە لایەنگیر و سەر بە ڕۆما بوو لایدا [٥٨]. لە نزیك شاری (حەڕان) لەگەڵ سوپای ڕۆما تێکئالأن و لەشکری ڕۆمایان لە ساڵی ٢٩٦ ز خراپ شکاند.[٥٩] شەڕەکە دوو ڕۆژی خایاند گالێریۆس سەرکردەی سوپای ڕۆما و تریداتس زۆر بە زەحمەت خۆیان دەرباز کرد[٦٠] ئەو خۆ لێگۆڕینە وای لە نەرسی کرد کە لە ئەرمینیا و میسۆپۆتامیا بەرەو پێش

نەچێت، چونکە لە زستانی ٢٩٧ ز (دیوکلتیانۆس ٢٨٤ – ٣٠٥ ز) ئیمپراتۆری رۆما داوای لە گالێرۆس کرد، کە دووبارە هێرش بکاتەوە سەر سوپای ئێران تا تۆڵەی ئەو شکستەی بکاتەوە کە لە حەڕان دووچاری ببوو[٦١] ئەمەش دەرفەتێکی بۆ گالێریوس دروست کرد، کە لە ئەرمینیاوە هێرش بکات و خۆی لە سوارەکانی ئێران بە دوور بگرێت و لە شەودا هێرشێکی توند لە باکوری میسۆپۆتامیا بکاتە سەرلەشکری ئێران، گالێریوس بە هاریکاریی لۆکالی توانی شکست بە سوپای ساسانی بهێنێت، (نەرسی) بریندار بوو زۆر بە ئەستەم توانی خۆی دەرباز بکات، سوپای ڕۆمی توانی دەست بە سەر سەربازگەکەی بگرێ و حەرەمی نەرسی وەکو خێزانەکەی بە ناوی (ارسان) و ئەندامانی تری ماڵباتی نەرسی بە دیل بگرن ،[٦٢] و بەرەو میدیا و ئادیابێن هەڵکشێت. نەرسی ناچار بوو سەفیری خۆی بۆ لای گالێریوس بنێری و داوای گەڕانەوەی ماڵباتەکەی بکات و مل کەچ بکات بۆ ئاگربەستێکی تر کە زۆر قورس بوو لەسەر ئێران گشت سەرچاوە فارسییەکان لەسەر ئەوە کۆکن مەرجەکانی ئەو رێکەوتنە ئەوەندە خراپ بوو بۆ ئێران هەر لە سەردەمی ئەشکانی تا دواتر دووچاری ئەو شکستە نەبۆوە.[٦٣] پاش ئەوەی ڕۆمانەکان مەرجە قورسەکانی خۆیان لەو ئاگربەستە سەپاند داوایان لە نەرسی کرد دەست هەڵگرێت : لە پێنج ویلایەتی ساسانی لە ئەرمینیا (باکووری کوردستان) کە بریتین لە ئەرزان (ئاغ درنیك)، زابدسینە (نزیك هەکاری)، کوردوئین (وڵاتی کاردۆخیەکان)، مۆکس*[٦٤]، ریهیم." لە سەرچاوە مێژووییەکاندا ئاماژە بەوە کراوە ئەو پێنج هەرێمە دەکەونە نێوان دیجلە و ئەرمینیا (باکووری کوردستان). هەروەها رازی بوو کە رووباری دیجلە سنووری نێوان هەردوولا بێ.[٦٥] پاش ئەو شکستە گەورەیە، نەرسی بەڵێنی دا دەست لە کاروباری ئەرمینیا و جۆرجیا وەرنەدات. لە ئەنجامدا نەرسی وازی لە عەرشی ساسانی هێنا و ساڵێك دواتر مرد و بەرگەی ئەو خەمە گەورەیەی نەگرت و کوڕەکەی هورمزی دووەم بوو بە شای ئێران.[٦٦]

### ٣. ٢ ناوەڕۆکی مێژوویی دەقی پەیکۆڵی:

هیرزفێلد لە وەسفی وردی شوێنەوارەکەدا دەڵێت ، کە ئەو پاشماوەیە کە ناسراوە بە پەیکۆڵی شێوەی بورجێکی گەورەی چوارگۆشە بووە لە هەر لایەوە

بـە بـەردی چـاککراوی شـێوە لاکێشـەیی داپۆشـراوە، لـە هـەر چـوار ڕووی ئـەم بورجەدا، لە بەشی سەرەوەی وێنەی شـا نەرسـی کـە بـۆ پێشـەوە دەڕوانێـت بـە شێوەیەکی دەرپـەڕیو دەبینرێـت هـەروەکو بەرجەسـتە کرابـێ وایـە درێژییەکـەی زیاتر لە مـەتر و نیوێك و پانییەکەشـی زیـاتر لـە مەترێکـە (بنـواڕە پاشـکۆی ٤). بەردە نووسراوەکان پەرشوبڵاو بوون لە دەوری پەیکەرەکە کە ژمارەیان ٣٢ تاشە بـەردی نووسـراوبووە بەهـەردوو زمـانی بـاکور (پەهلـەوی پارسـی – ئەشـکانی) و باشوری ڕۆژئاوای ئێران (پەهلەوی ساسانی، فارسی ناوەڕاست) بـووە. بـە گشـتی پەیکەرەکە بە سەردانی ڕاولنسن و هـەردوو سـەردانەکەی هیرزفیلـد ١٩١١ و ١٩٢٣ بەم شێوەیە بوو : هێرزفیلد لە جاری یەکـەم (٩٧) تاشـەبەردی نووسـراوی تۆمـار کرد، کە (٥٤)ی بە فارسی ناوەڕاست و (٤٣)ی بە پارسی بـوو، بـەڵام لـە گەشـتی دووەمی هیرزفیلـد بـۆ پـەیکۆلی – ١٩٢٣، (٣٠) تاشـەبەردی تـری دۆزییـەوە، کـە (٢٠)یان بە فارسی ناوەڕاست بوو، (١٠)یەکەی تر بە زمانی پارسی بوو، بەم جۆرە سەرجەمی تاشـەبەردە نووسـراوەکان بوونـە (١٣٣)، کـە (٧٤) بـە فارسـی بـوون، (٥٣)شی بە پارسی بوو[٦٧]، دیارە نەرسی بەهەردوو زمانی فارسی و پارثیـة کـان واتا (ئەخمینییەکان و ئەشکانییەکان) ویستیتی ئـەو دوو نەتەوەیـە لـە یـەك نزیـك بکاتـەوە بـە تایبـەتی ئەوانـەی پشـتیوانییان لێ کـردووە و لایـەنگیری بوونـە لـە شـازادەکان و ئازاکـان و ئازادەکـان و گـەورە پیـاوان و ناودارەکـان. دوای ئـەوەی بڕیاریان دا شۆڕش لە دژی بەهرامی سێیەم بکەن هـەروەکو نەرسـی دەڵـێ ئـەوان واتا پارسی (پارثیةکان) لە دیوەخانی ئێمە بوون (سەربەئێمە بوون) بەهێزتر بوون یەزدان پشتیوانی لێ کردین.

دوای سەرکەوتنی بەسەر بەهرامی سێیەمی برازای، لە پەیکۆڵی سـەرکەوتن و بوونی بە شـای ئێـران تۆمـار دەکـات، پەیکـەرێکی درێـژی خـۆی تێدا هەڵکەنـد. نووسینەکانی سـەر تابلۆکـە درێـژترین و تـەواوترین تۆمـاری ساسـانییە تـا ئێسـتا مابێتەوە[٦٨]. کۆتا نووسینیشـە بـەزمانی پـارثی بێـت. هەرچـەندە نووسـینەکەی پەیکۆڵی دەقێکی ئایینی نییە، بەڵام نەرسی هەروەکو شاکانی پێش خۆی نازناوی (مەلیك ملوك) شاهەنشا لـە خـۆ دەنێـت: "مەزداپەرسـت و خواکـانی شـاپوور، کـە وێنەی لای یەزدان هەیە و نەوەی ئەردەشێر" [٦٩]. ئەو قسـانە لـە دێـری یەکـەمی

پـەیكۆڵی ئـاوا هـاتووە: " مـن، نەرسـی مەزداپـەرێس پاشـای پاشـاكانی ئێـران و ئـەنێران (غـەیری ئێـران) كـە ئەصـڵەكەم دەگەڕێتـەوە بـۆ خوداوەنـدەكان كـوڕی مەزدا. خاوەنشكۆ شاپوور شای شاكان، ڕەچەڵەكی دەگەڕێتەوە بۆ ئەردەشێر[٧٠]. تەختی شایەتی لەلایەن شاپووری باوكیەوە پێگەیشتووە. ئەو دەمەی (شـاپووری یەكەم) بووە به حوكمڕان، وەسیەتی كردووە كە نەرسی دەبێتە پارێزگـار شـای (ئێران شەهر)*[٧١] ئەویش بەڕێز و حورمەتەوە قبوڵی كردووە. دیـارە نەرسـی لـەو ماوەیەدا حاكمی ئەرمەنستان بووە، بەڵام دوای ئەوەی هەواڵی ئـەوەی پێـدەگات، كە بەهرامی دووەم دەمرێ (بـەهرامی سـێیەم كـوڕی بـەهرامی دووەم كـە حـاكمی سەجسـتان (سكسـتان یـا سیسـتان)[٧٢]* بـووە، بـەبێ پرسـی نەرسـی، بـەهرامی سێهەم دەكرێتە پاشا، بەهرامی سێیەم دەگەڕێتەوە تا ببێ بە شای ئێـران دیـارە ئەمەش بە هاندانی دەسەڵاتدارانی ئەو هەرێمە واتـا هـەرێمی سكسـتان بـووە، كـە هـەموو كـات ئـەوان بـە دوای هـەلێك دەگـەڕان تـا دەسـت بخەنـە نـاو دەوڵـەتی ساسانی.[٧٣] ئەمەش بووە هۆی ئەوەی نەرسی بـە یارمـەتی لایـەنگیرانی لـە پیـاو مـاقووڵان و خانـەدانان شـۆڕش لـە دژی برازاكـەی هەڵگیرسـێنێ، لـە ئـەرمێنیاوە گەڕایەوە، چەند ڕۆژێك مابوو بگاتەوە پایتەخت، هەواڵی بۆ هەموو گەورە پیاوان و موختاری گوندەكان نارد بێنە ئۆردوگاكەی دانی پێدابنێن. ئـەوانیش پشـتیوانییان لـێ كـرد و لـە كۆتاییـدا لـە دژی بـەهرامی سـێیەم ڕاپـەڕی و بەسـەریدا زاڵ بـوو. مەبەستی بەردەنووسی گەورەی نەرسیش لە پەیكۆڵیـدا، گێڕانـەوەی ئـەم ڕووداوە بوو.[٧٤] لە دێڕی حەڤدەهەمی نووسراوی پەیكۆڵی، نەرسی هەم شوناسی قەومی و هەم جوگرافیای ئەو شوێنانە دیاری دەكا كە بەشدارییان كردووە لـە شۆڕشـەكەی لە دژی بەهرامی سێیەم: "پاشماوەی ئەو فارس و پارسییانەی كە لە ئاشوورستان (وڵاتـی ئاشـووری كـۆن) خۆزسـتان (ئـەحواز) گـەرمای (گـەرمیان) سـیارزوور (شارەزوور) هەموو پێكەوە كۆبوونەوە و بەرەو لای من هـاتن، پشـتیوانیی خۆیـان بۆ من دەربڕی لەبەردەم مۆنیمێنتەكە".[٧٥] دیوی دووەمی نەخشـەكە، هـەر تـەنها گێڕانەوەی ئەو سەركەوتنەی شا نەرسـی نییـە بـە سـەر بـەهرامی برازایـدا، بـەڵكو بوونی نەخشەكە لە وڵاتی كوردان، بێجگە لە هەبوونی هیچ هاوكارییەكی كوردی لە كودەتاكە، گوزارشت لـە گەلـەكۆمی فـارس– پـارس دەكـات، بەمـەش هەیمەنـەی

قەومی لە وڵاتی كوردان دروست بكات. لە لایەكی دی، ئەو هەوڵە سەربازییەی نەرسی بە سەر برازاكەی كودەتا بوو بەسەر شەرعیەتی ماڵباتی دەسەڵاتدار لە ئیمپراتۆریەتی ساسانی. ئەو كودەتایە كودەتای كۆرش بە سەر ئەستیاكمان بیر دەهێنێتەوە، هەر لەو ساوە (٥٤٩ پ.ز) هەتا كۆتایی حوكمڕانی ساسانی (٦٥١ ز) بە واتای ١٢٠٠ ساڵ كورد لە خاكی خۆی حوكمڕان نەبووە.

## دەرئەنجام

لە كۆتاییدا لێكۆڵینەوەكە بە چەند ئەنجامێك گەیشتووە، كە دەكرێ لە چەند ناونیشانێكدا كورتی بكەینەوە :

**یەكەم. شوێنەوار و شوناسی كەلتووری:**

لەم توێژینەوەیە بەوە گەیشتووین، كە پەیوەندییەكی تۆكمە لە نێوان ئاركیۆلۆژی و شوناس هەیە. ئەو پەیوەندییە زەن دەبرێ، كە دروستكەری شوناسە !

كودەتاكەی نەرسی لە پەیكۆڵی نەبووە، بەڵام حوكمڕانی فارسی وایكردووە پەیكەرێكی سەركەوتن و گەلەكۆمی لە قەرەداخ–ی وڵاتی كوردان هەڵكۆڵی. بەمەش دەسەڵاتی ساسانی، فارسی ویستوویەتی كەلتوورێكی بەهەژموونی فارسی بۆ وڵاتی كوردان بگوازێتەوە. هەبوونی ئەو هەموو شوێنەوارە فارسییە، لەوانە دەربەندی گەور، ماڵی ئاگر، ئاتەشگاە، پەیكۆڵی گوزارشت لە هەبوونی ساسانی (فارس) لە وڵاتی كوردان دەكەن. ئەو پەراوێزخستنەی كورد لە دەسەڵاتی فارسیدا هەموو ماوەی حوكمڕانی (كۆرش –یەزگرد) گرتۆتەوە.

**دووەم. شوێنەوار و زمان**

شوێنەوار لە هەرێمی چیاكاندا بە دوو شێوە دەردەكەوێت : بەشی یەكەم، بە شێوەی نەخش و نیگارە، كە گوزارشت لە ڕەوشی نەخوێندەواری تاكەكان دەكات هەروەها ئاماژەیە بە قۆناغی پێش مێژوو . بەشی دووەم، حزووری نووسینی سەر شوێنەوارەكەن، ئەوانەش ئاماژەن بۆ سەردەمانی نزیك و دەوروبەری ولادەتی عیسای مەسیحەوە.

ئـەوەی جێگـای مشـتومڕ و تێڕامانـە، زمـانی شـوێنەواری جـۆری دووەمـە، چونکە لەو پرۆسەیەدا، شوناسی ناسیۆنالی شوێنەوارەکە دەردەکەوێت.

لـە شوێنەوارناسـیدا —Archeology ئـەوەی گرینگـە حاڵـەتی مرۆناسـی — Anthropology مێژووی شوێنەوارەکەیە، نەك زمانی شوێنەوارەکە، کەواتە مەبەست لە شوێنەوارناسیدا، زمانی مێژووییە، نەك زانستی Ethnology.

لە لایەکی دی، لە ڕوانگەی ئیسنۆلۆژییەوە، شوێنەوار ناوەندێکی کەلتوورییـە بـۆ ئاشـنابوون بـە زمـانی نەتـەوە، تـا شـوێنەوارەکە ببێتـە بەشـێك لـە مێـژووی مەعریفیی نەتەوە.

زمانی نەخشەکە لە پاشماوەی پەیکۆڵیدا، تەفرەیەك یـا نوقتـە گۆڕانێـك لـە هزری سیاسی و ئیسنۆگرافی فارس دروست دەکات، زمانی فارسـی ناوەڕاسـت هـەر تەنیا نابێتە زمـانی بەردەنووسـەکە، بـەڵکو دەبێتـە زمـانی ڕەسمیـی دەوڵـەتیش. زمـانی نەخشـەکە وەك دەقێکـی قـەومی زۆر گرینگـە لـە دیـارکردنی شوناسـی کەلتووری و نەتەوەیی دەقدا، کەواتە نووسینی زۆربەی بەردەکانی نەخشەکە بـە فارسیی ناوەڕاست لە خاکی کوردان، گوزارشت لە هـەژموونی فارسـی دەکـات. لـە لایەکی تر هەرچەندە نەخشی پەیکۆڵی وەك شوێن بەشێکە لە مێژوو و زەخـیرەی مەعریفەی کوردی، زمانی شوێنەوارەکە مێژووی دەرکەوتنی ناسیۆنالیزمی فارسـی دەردەخـات، نـەك ناسـیۆنالیزمی کـوردی، چـونکە زمانەکـە زمـانی فارسـیی ناوەڕاستە.

### سێیەم. شوێنەوار و مێژوو:

شوێنەوارەکە مێژووی یەکێ لە دەستکەوتەکانی فـەرمانڕەوایی فارسـییە لـە ساڵی ٢٩٣ ز. لـە ڕووی مێژووییـەوە، هـەبوونی پاشمـاوەی پـەیکۆڵی لـە خـاکی کـوردا تـەنها دەقەرەکـە لـە شـوێنەوار دەوڵەمەنـد دەکـا، ئـەگینا خـودی شوێنەوارەکە، چ باس لە سەرکەوتنی (نەرسی) بەسەر (بەهرامی) برازای بکات یا قەبرێکی یەکێ لە پاشا فارسەکان بێت، مێژوویێك دەگێڕێتەوە، کە کورد تیایـدا لـە خاکی خۆی دەسەڵاتی نەبووە.

## پاشکۆ:

**ئەو وێنانە لە لایەن ئەرنست هێرزفیلد کێشراوە**
**لەکاتی سەردانەکەی لە نێوان ١٩١١ – ١٩٢٣**



لە سایتی **Htt//www.google.iq/url** وەرگیراوە.



مۆنیمۆنتی پەیکۆڵی لە سنووری نێوان باشوور و رۆژهەڵاتی کوردستان. لە سەر رێگای نێوان قەسری شیرین و سلێمانی لە سەر رێگای کۆنی نێوان تەیسەفۆن (مەدائین) و ئازەربێجان. لە گوگل وەرگیراو.





- هێڵکاری تاوەری پەیکۆڵی لە لایەن ئێرنست هێرزفیلد وێنەکیشراوە، لە ساڵی ١٩١١ – ١٩٢٣
.







**چەند نموونەیەکی بەردە نووسراوەکانی پەیکۆڵی:**

E. Thomas, "Sasanian Inscriptions," *JRAS*, 1868, pp. 241-358; printed separately as *Sasanian Inscriptions*, London, 1868 (includes a note by Rawlinson, pp. 56-60).

**لە سایتی ئەلیکترۆنی گوگل وەرگیراو لە.**

## پەراوێزەکان:

[١] –Fattah‹-History of Iraq‹ H.M.. A Brief ‹Tahran_ 2009‹ p 49.

[٢] – مالکۆم کالێج، ئەشکانییەکان (پارتەکان) وەرگێڕان، سەلاحەددین ئاشتی، سلێمانی، ٢٠١٠، ل ٢٦.

[٣] – ابراهیم نمیر وآخرون،مصر في العصور القدیمة، القاهیرة، ١٩٨٨، ص ٢٨.

[٤] –Gamble.‹-n.p.)Psychology press .C. et al. Cultural Identity and Archeology شوێن نادیار( ) ‹p.26 ‹1996.

[٥] –Trigger ‹B.G‹ **Thought**‹ History of Archeological .‹**New York** .**edition** **2nd** ‹ **2007‹p14.**

[٦] – ناوەکە لە سەرچاوە فارسییەکان بە دوو جۆری (نیرسة) و (نەرسی) هاتووە، کە لە بنەڕەتدا بە شێوەی پەهلەوییەکەی (نایریوسانگها)یە کە بە واتای پەیامنێری خوداوەند دێ، بۆ زانیاریی زیاتر بنواڕە.ماری بویس، تاریخ الزرادشتیة من بدایاتها حتی القرن العشرین، ت. د. خلیل عبدالرحمن، السلیمانیة،٢٠١٠،ص ١٣٤.

[٧] – ئەم بەشەی کوردستان دەگرێتەوە کە لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی ساسانیدا بووە. هەردوو بەشی ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستانە. بەڵام گەڕیدە موسڵمانەکان (هەرێمی چیایی)یان بەو بەشانە وتووە بە هۆی زاڵبوونی چیا لە هەرێمەکە هەروەکو ئبن حەوقەڵ دەڵێ (چیای بەرز و بڵند بەسەریدا زاڵە) صوره الارچ، بیروت، ١٩٧٩، ص ٣١٥.

[٨] – کوردو کوردستان لە سەرچاوە ئینگلیزیەکاندا، هەولێر، ٢٠٠٩، لا ٢٥.

[٩] – ت. جرجیس فتح الله، ط ٢، اربیل، ١٩٩٩، ص ١٥١.

[١٠] – سامي سعید الاحمد ورضا جواد الهاشمي، تاریخ الشرق الادنی القدیم، ایران والاناضول، بغداد، ١٩٨٥، ص ١٥٨.

[١١] _ ئەو سێ ڕێڕەوە مێژووییە سەگەرمە بەرزییەکەی ٥٠٠٠ پێیە ڕێڕەوی بازیانی بە ناوبانگ بەرزییەکەی ٣٠٠٠ پێیە ئەویی تریش ڕێڕەوی پەیکۆڵیە.

[١٢] – جمال بابان،اصول اسماء المدن والمواقع العراقیة، بغداد، ١٩٨٩، ص ٧٧.

[13] – HERZFELD ‹THE PAIKULI I: The Monument and INSCRIPTION of The early History of the Sassanian Empire‹ Berlin‹1924‹p.8

[١٤] – کرد ترك عرب، ص١٥١.

[١٥] – جمال بابان، المصدر السابق، ص ٧٧.

[16]– Alan‹ K. et als ‹The Cambridge Ancient History‹London‹2007‹p494.

[١٧] – حەبیبوڵای تابانی، هاونەتەوەیی قەومی کورد و ماد، و. جەلیل گادانی، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل ١٢٨.

[١٨] – کلۆدیـۆس جـێمس ریـچ، گەشـتنامەی ریـچ بـۆ کردسـتان، و. محەمـەد حەمـە بـاقی، هەولێر،٢٠٠٢، ل ٥٥.

[١٩] – کرد ترك عرب، ص ١٥١.

[٢٠] – سێ فەرسەخ نزیکەی ١٨ کم بەوەی هەر فەرسەخێك نزیکەی ٦ کم..

[٢١] – المصدر السابق، ص ٧٨.

[٢٢]– کرد ترك عرب، ص ١٥١.

[٢٣] – ئێرانی سەردەمی ساسانییەکان، و. سەلاحەدین ئاشتی، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل ٦٧ – ل٦٨.

[24]– The Sassanian Inscription of Paikuli،،Munich،1983،p.4

[٢٥] _ لە دکتۆرە (رافیدە عبـدالله عبدالصـمد ) مامۆسـتا لـە زانکـۆی سـلێمانی بەشـی شـوێنەوار وەرگیراوە.

[٢٦] – الاعلاق النفیسة، بیروت، ١٩٨٨، ص١٥١.

[٢٧] – الاخبار الطوال، القاهرة، ١٩٦٠، ص ١٣٨.

[٢٨] – گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان، ل ٤٤.

[٢٩] - اصول اسماء المدن والمواقع العراقیة، ص ٧٨.

[30].– Crystal، D. An Encyclopedic dictionary o f Language & languages،Cambridge ،1992،p 22

[31]– ..Duranti، A. Companion to Linguistic Anthropology، MA. Malden،2004،p54.

[32] – R.H.Robins،،A Short History of Linguistics،New York،1996،P166.

[33]– Sapir، E.Language . Tahran 2002،p21.

[٣٤] عوبەید سورخابی، مێژووی شوێنەوارناسیی ڕۆژهەڵاتی کوردسـتان، سـلێمانی، ٢٠١٣،ل٧– ل١٠.

[٣٥] – روقیە بهزادی، ئاریایی و نا ئاریاییەکان لە ڕوانگەی کۆنی مێـژوودا، و. فـەرهاد خۆشـناو، هەولێر، ٢٠١١، ل١٣٥.

[٣٦] – فەرپی بارپی یان بارنی یان ئەشکان: لـەو سـەردەمەی کـە ئەخمینییـەکان لەئـەنجامی شەڕی ئەربێلای نێوان ئەسـکەندەری مەکـدۆنی و دارای ئـەخمینی لـە سـاڵی ٣٣١ پ.ز لـە ناوچوون، دواتر ئەسکەندەر زوو مرد جێگرەوەی نەبوو کێشە لە نێوان سەرکردەکانی سوپا دروست بوو دواتر هەرێمە ژێر دەستەکانیان لە نێوان خۆیان دابەش کرد. ئێران و ڕۆژهـەڵات کەوتە ژێر دەسەڵاتی سلوکس. جا ئەو ماوەیەی کە سلوکییەکان دەسەڵاتدار بوون لە ئێران بە ماوەی سـلوکی ناسـراوە لـە نێـوان ٣١١ –٢٤٧پ. ز بـووە. بـەڵام لـە کـاتی لاواز بـوونی سلوکییەکان بەهۆی شەڕیان لـە نێـو خۆیـان بـە تایبـەتی لـە بەتلیمیـەکان لـە میسـر. جـا شەڕی بەردەوامیان بووە هۆی لاواز بوونیان. لەو ماوەیەدا و لەو هەلومەرجەدا بنەماڵەیـەك کە بە چەند جۆرێك ناویان هاتووە سەرکردایەتی شۆڕشیان لە دژیان گرتە ئەستۆ. ئەوانیش

هۆزی بارنی کە لقێکی هۆزانی (داهین) ن دەگەڕێنەوە بۆ ئەسکیتیەکان کە لە بنەڕەتدا هیندۆ ئەوروپین، ناوی (بارتوا)یشی پێدەڵێن کە بۆ هەرێمێك دەگەڕێتەوە کە لە ناوچەی خۆراسانە. هەروەها ناوی بە(ئەشکان)یش هاتووە کە ئەمەش بۆ ناوی ئەو سەرکردە دەگەڕێتەوە کە سەرکردایەتی شۆڕشەکەی گرتبووە ئەستۆ. بۆ زانیاریی زیاتر بنواڕە، تەها باقر و ئەوانی تر، تاریخ ایران القدیم، بغداد، ١٩٨٠، ص ٩٣ – ص٩٦" حسین فهد حماد،موسوعة الاثار التاريخية، الاردن، ٢٠٠٨، ص ٤٨٠ – ص ٤٨٤.

[٣٧] –Ibd،p494؛ ئیدمۆنز،سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٤.

[٣٨] – زوبێر بیلال، مێژووی زمانی کوردی، و. حەمە کەریم هەورامی، بەغداد، ١٩٨٤، ل ١٥.

[٣٩] – هیندۆئێرانی لەگەڵ هیندۆ ئەوروپی جیاوازییان لەوەدایە ئەو خێڵانەی لە هەزارەی دووەمی پێش زایین لە زێدی خۆیان واتا باشووری روسیای ئەمڕۆ (قەفقاسیا) کۆچیان کرد کۆمەڵێکیان ڕێڕەوی کۆچەکەیان بەرەو هیند بوو لەوێوە بەرەو ئەوروپای ئەمڕۆ ڕۆیشتن، ئەوان بە هیندۆئەوروپی ناسران. بەڵام کۆمەڵێکی تریان بۆ چەند سەدەیەکی کەم لە ڕۆژهەڵاتی دەریای قەزوین مانەوە ئەمانە بەخۆیان دەگوت (ئاریا) کە مانای (خانەدان)ی دەگەیاند. شەپۆلی یەکەمی کۆچی ئەو ئارییانە لە ناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پێش زایین بوو بەرەو هیند چوون و نەتەوەی هیندیان لێ کەوتەوە. کەچی ئەوی تر ڕێڕەوەکەیان بەرەو باکوری میزۆپۆتامیا گۆڕی ئیمپراتۆریەتی (میتانیەکان) لە خابوور دامەزراند. شەپۆلی دووەمی کۆچی ئارییەکان لە سەدەی نۆیەمی پێش زایین بوو بۆ دامێنی ڕۆژهەڵاتی چیاکانی زاگرۆس، لە کۆمەڵێك خێڵ پێکهاتبوون لە هەموویان گرینگتر میدییەکان و فارسییەکان (ئەخمینییەکان) جا لەبەر ئەو پەیوەندییە مێژووییە کە لە نێوان هەردوو هۆزەکە هەبووە بووە هۆی ئەوەی زمانەکەشیان وەکو یەك بێ یاخود لەیەك نزیك بێ. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە تۆفیق وەهبی. کوردو زمانی کوردی، و. عەزیز گەردی، سلیمانی، ٢٠٠٢، ل١٥ –ل ١٧ " حسين فهد حماد، المصدر السابق، ص ٦٣٧.

[٤٠] – ادوارد براون، تاريخ الادب في ايران، ت. احمد كمال الدين حلمي، القاهرة، ٢٠٠٥، ص١٤٦.

[٤١] – جەمال نەبەز، بێدەسەڵاتە کوردەکان و برا موسڵمانەکانیان، و: سوارە قەڵادزەیی، سلێمانی، ١٩٩٧، ل ٩٢.

[٤٢] – سەدیق بۆرەکەیی، مێژووی زمانی کوردی، هەولێر، ٢٠٠٨.

[٤٣] – کۆلکە زێڕینە، هەولێر، ١٩٦٦، ل ٥ – ل ٦.

[٤٤] – مەردۆخی، مێژووی کورد و کوردستان، وەرگێڕانی: زانەر محەمەد، هەولێر، ٢٠١١، ل ٢٤.

[٤٥] – زوبێر بیلال، مێژووی زمانی کوردی، ل ٣٤.

[٤٦] – الكرد، مصادر ومعالم تاريخهم في صدر الاسلام مرحلة الفتوحات ١٦هـ – ٢١ هـ. رسالة ماجستير غير منشورة كلية الاداب – جامعة الخرطوم، ١٩٩٧، ص ٢٤.

[٤٧] – سلێمانی،١٩٩٠،ل ١٠٥.

